## دەروازەیەك بۆ

# پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییە هاوچەرخەکان


د. دانا عەلی ساڵح بەرزنجی

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی سلێمانی





لە بڵاوکراوەکانی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥٦)


دەروازەیەك بۆ پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییە هاوچەرخەکان

د. دانا عەلی ساڵح بەرزنجی

**ئەم پەرتوکە:** دەلاقە و ڕێبەرێکی گرنگە لەسەر بابەتی پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییە هاوچەرخەکان بۆ خولیایان و فێرخوازان و هەڵسووڕاوانی ئەو بوارە، بە زمانی شیرینی کوردی، هەوڵێکە بۆ:

– تێگەیشتن لە پرەنسیپ و ڕێساکانی مامەڵەکردن، لەنێوان یەکە نێودەوڵەییەکان و نوێنەرەکانیان.

– ئاشنابوون بە پرس و دۆزە نوێیەکانی ژیانی دبلۆماسیی ئەمڕۆ و کاریگەریی شۆڕشی گەیاندن و زانیارییەکان لەسەر پەیوەندییە دبلۆماسییەکان.

– ئاشنابوون بە دانوستان و ئامراز و ئامانج و ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکە جیاوازەکانی، تێگەیشتن لە قۆناغ و پێداویستییەکانی و پەیبردن بە ڕۆڵی پەیوەندییە نازارەکییەکان لە پڕۆسەی دانوستاندا.

– تێگەیشتن لە ڕێساکانی موجامەلە و ئەتەکێت و پڕۆتۆکۆل.

– ئاشنابوون بە کۆی ئەو جیاوک و پارێزبەندییانەی کە دبلۆمات و کونسوڵ و نێردراوی دبلۆماسی و کونسوڵی و بارەگاکانیان و جانتای دبلۆماسی و کونسوڵی هەیانە.

سەرباری ئەمانە تیشکێک خراوەتە سەر ئاست و پێگەی (هەرێمی کوردستان) لە کایەی دبلۆماسیدا، شیکردنەوەیەک بۆ پایەو مەرجەکانی هەڵکشانی ڕۆڵی لەو بوارە گرنگەدا کراوە.



نرخ: (٨٠٠٠) دینار



# دەروازەیەك بۆ
# پەیوەندییە دبلۆماسی و
# کونسوڵییە هاوچەرخەکان

# دەروازەیەك بۆ
# پەیوەندییە دبلۆماسی و كونسوڵییە هاوچەرخەكان

.................................................................................

لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی
ژمارە (56)

- نووسینی: دكتۆر دانا عەلی ساڵح بەرزنجی.
- بابەت: سیاسی، پەیوەندییە دبلۆماسییەكان.
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد.
- چاپ: یەكەم ٢٠١٧ ـ ناوەندی ڕێنوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە (١٥٢٨)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

**ئیمەیلی نووسەر:**
dana.salih@univsul.edu.iq
**لاپەڕە و هەژماری تایبەتی نووسەر لە فەیسبوك:**
www.facebook.com/Dr-Dana-Ali-Salih
www.facebook.com/danabarznjy



## ئەم هەوڵە پێشکەشە بە:

- مامۆستا سەربەرزەکانم.
- خوێندکارە ئەزیزەکانم.
- هاوڕێ خۆشەویستەکانم.
- دبلۆماتکارانی کورد لە هەر کوێ بن.
- شەیدایانی ڕاستی و ڕێبوارانی ڕێی مەعریفە.

# سوپاس و پێزانین

هـەر هـەوڵێکی مـرۆڤ، وێـڕای پشـتیوانیی خـوای گـەورە، پێویسـتی بـە هاریکـاریی کەسـانی دەوروبـەری دەبێـت، جـا دامـەزراوە و کۆمەڵگـە بێـت بەگشتی، یان خانەوادەو هاوڕێ و دۆستان و دڵسۆزان بن بەتایبەتی.

من لێرەدا، پاش سوپاس و ستاییشی نەبڕاوە، بۆ خوای مەزن و دلۆڤان، کە هەموو کار و تەوفیق و چالاکییەکمان هەر بە پاڵپشتیی ئەوە، بە پێویستی دەزانم ڕیز و سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی زانکۆی سلێمانی، زانکۆی دایك لە کوردستان، بکەم، کە بۆ یەکەمجار لەم زانکۆیەدا دەستم بە خزمەتی زانکۆیی کرد، تا هەنووکەش تێیدا بەردەوامم، هەروەها سوپاسی بێپایانم بۆ فاکەڵتیی یاسا و رامیاری و بەشی زانستە رامیارییەکان بۆ کارئاسانی، بۆ پشتگیریکردنی زانستیی ئەم پەڕتووکە.

سوپاس و پێزانینی تەواوم، بۆ بـرای بـەڕێز و خۆشەویسـتم پرۆفیسـۆری یاریـدەدەر (دکتـۆر بێسـتون حەسـەن)، بـۆ پێداچـوونەوەی، بـەڕێنووس و خاڵبەندی و دروستیی لایەنی زمانەوانیی ئەم نووسینە، هیـوادارم تەمەندرێـژ بێت و هەمیشە بەختەوەر و تەندروست بێت.

سوپاسی تایبەتیم بۆ هەریەك، لە مامۆستای خۆشەویست (مامۆستا ڕەجا موحەمەد) و برایانی بە ڕێزم (دکتۆر سەروەر عومەر) و (مامۆستا سەرکان فایەق)، هەر یەکەیان بە جۆرێك لە جۆرەکان هاوکارم بوون.

جوانترین گوزارشتی سوپاسیش ئاڕاستەی (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی) دەکەم، کە ئەم هەوڵەیان خستە ریزی ئەو چالاکییە گرنگ و بەپێزانەی، لە بواری چاپ و بڵاوکردنەوە، وەکو خزمەت، پیشکەش بە کۆمەڵگەی دەکەن.

سوپاسی نەبڕاوەی هەموو ئەو هاوڕێ و دۆستانەم دەکەم، کە بە شێویەك لە شێوەکان هاوکاربوون، بۆ بەپایانگەیشتنی ئەم بەرهەمە، بەتایبەتییش سوپاس و خۆشەویستیم بۆ هەموو خوێندکارەکانم هەیە، کە لێیانەوە فێربووم.

دواجار، لە دڵەوە، ڕێز و سوپاس و خۆشەویستیم بۆ خێزان و خانەوادەکەم هەیە، کە هەمیشە هاوکار و پاڵپشتم بوون و بەرگەی شەونخوونی و سەرقاڵی و ئەرکەکانی منیان گرتووە.

# ناوەڕۆک

# ناوەڕۆکی خشتە و هێڵکارییەکان و نووسراو و وێنەکان

# نەخشەی سیاسیی جیهان




Source:http://www.mapsofworld.com/world-map-image.html(01/04/2017)

# پێشەکی

بواری زانستە سیاسییەکان بوارێکی فرەئاست و فرەڕەهەند و فرەجۆر و هەمەلایەنە، دبلۆماسی لە لایەکەوە یەکێکە لە کێڵگە بەپیتەکانی لێتوێژینەوە لەو بوارەدا، لەلایەکی ترەوە لەسەر ئاستی واقیعی گەورەترین شوێنەواری لەسەر مێژووی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان جێهێشتووە.

دبلۆماسی، بە چەمکە فراوانەکەی، لە کاتی ئاشتی و جەنگیشدا، کاریگەریی لەسەر سیاسەتی دەوڵەتان و یەکە نێودەوڵەتییەکانی تریش جێهێشتووە، بە شێوەیەك کە زنجیرەی رووداوەکانیش بەستراونەتەوە بە مومارەسەکردنی دبلۆماسی، بە هەموو جۆر و ئاستەکانییەوە، بۆیە دوای پەرەسەندنی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان و فراوانبوونی پەیوەندییەکان، دەوڵەتان ناچاربوون رێساگەلێکی دبلۆماسی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی هاوبەش و چەسپاندنی پرەنسیپی یەکسانی، لە مومارەسەکردنی سەروەریدا و دوورکەوتنەوە لە کێشەو ناکۆکی لەو بارەیەوە دابڕێژن، لە لایەکی ترەوە زانایان و پسپۆڕ و شارەزایانی ئەو بوارە، هەوڵیانداوە شیکردنەوەی ورد بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان و ئەو رێسا و یاسایانە بکەن، کە پێویستە یەکە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان پێیانەوە پابەندبن، بەتایبەت پاش ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی، کە بواری زانستە رامیارییەکان بەگشتی و پەیوەندییە نێودەوڵەتی و دبلۆماسییەکان بەخۆیانەوە بینیویانە.

لە لایەکی ترەوە، شۆڕشی زانیارییەکان و گەیاندن دبلۆماسی کرد، بە پێویستیی ژیانی سیاسی بەگشتی، بە شێوەیەك، کە ئەگەر هەریەکەیەکی سیاسیی گۆشەگیر بمێنێتەوە، ناتوانێت لەگەڵ رەوتی گۆڕانکارییە خێراکانی

سـەردەمدا هـەڵبکات، چـونکە دبلۆماسـی میکـانیزمی بـەهێز و شـادەماری بەیەکگەیشتنی یەکە نێودەوڵەتییەکان و پەرەپێدانی پەیوەنـدیی نێوانیانـە، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی دبلۆماسـی، بـۆ کێشـەو نـاکۆکی و ململانێیـەکان بـە ئاشتییانە، باشترین ڕێگەچارەیە. بۆیـە وڵاتـان هـەوڵیان خسـتووەتەگەڕ بـۆ بەدەسـتهێنان و زیـادکردن و پاراسـتنی بەرژەوەندییـەکانیان لـە ڕێگـای پەیوەندیی دبلۆماسی و کونسوڵییەوە.

ئەگەر پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، ئامانج لێیان پاراستنی بەرژەوەندییە سیاسییە باڵاکانی وڵات و پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی بێت، ئەوا پەیوەندییە کونسوڵییەکان ئامانج لێیان پاراستنی ماف و بەرژەوەندیی هاووڵاتییانیەتی، لە دەرەوە لەپاڵ پەرەپێدانی پەیوەندییە ئابووری و بازرگانییەکان.

دبلۆماسـی بـە دیـوێکی تریـدا ڕێگـوزەرێکی گونجـاو و پێویسـتە، بـۆ دروستبوون و لـەدایکبوونی یاسـا نێودەوڵەتییـەکان، بۆیـە ئێسـتا زانسـتی دبلۆماسـی و بنـەماو ڕێسـاکانی پەرەسـەندنێکی بەرچـاویان بەخۆیانـەوە بینیـوە، هـەر بۆیـە پێویسـتیی ئـەوە پەیـدابوو، کـە لەچوارچـێوەی یاسـای گشـتیی نێودەوڵەتیـدا وەك بابـەت و یاسـایەکی تایبـەت و سـەربەخۆ دەربکـەوێت، سـێ پەیماننامـەی گرنگـی نێودەوڵـەتییش، بـوون بـە بنـەمای یاسایی پێویست، بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، کە بـریتین لـە هەریـەك لـە پەیماننامـەی ڤیـەننا بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکانی سـاڵی (١٩٦١)، پەیماننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکانی ساڵی (١٩٦٣) و پەیماننامەی نێردراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩).

یـەکێکی تـر لـە گرنگییـەکانی دبلۆماسـی ئەوەیـە تـەنیا لـە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانـدا بەکارنایـەت، بـەڵکو پـەلی بـۆ مەیـدانی هـەموو جـۆرە

پەیوەندییە ڕامیاری و بازرگانی و سەربازی و کولتوورییەکان کێشاوە، ئەمە وێڕای پەیوەندیی نێوان کۆمپانیا و ڕێکخراو و پارتە رامیارییەکان، بەمەش گرنگی و بواری پراکتیزەکردنیشی زیادی کردووە، بووەتە بابەتێکی پڕپایەخی زانستە رامیارییەکان، چونکە پەیوەندیی راستەوخۆی بەزۆربەی کایەکانی ژیانی سیاسییەوە هەیە، گرنگترین زانست و بوارە بۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتیی جێبەجێکردنی زانستی رامیاری و ڕێگاکانی گرێدانی پەیوەندیی نێودەوڵەتی لەسەر بەرژەوەندیی هاوبەش.

گرنگیی ئەم بابەتە لەوەدا چڕدەبێتەوە، کە تا ئێستا بە زمانی شیرینی کوردی، بابەتێکی ئاوا گشتگیر و فراوان لەسەر بابەتی پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییە هاوچەرخەکان –بەپێی زانیاریی لێکۆلەر–نەنووسراوە، ئەمەش وا دەکات، ئەم پەڕتووکە ببێتە دەلاقە و ڕێنماییەکی بنچینەیی و گرنگ خولیایان و فێرخوازانی ئەو بوارە، لەپێناو تێگەیشتن لە پرەنسیپ و ڕێساکانی مامەڵەکردن، لەنێوان یەکە نێودەوڵەییەکان و نوێنەرەکانیان بەشێوەیەکی دروست و بەپێی ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتیی دبلۆماسی و دابونەریتی نێودەوڵەتی.

لێرەوە، بەهۆی ئەو گرنگییە زۆرەی، کە ئەم بابەتە هەیەتی، دەتوانین گرنگترین ئامانجەکانی ئەم بابەتە بەم شێوەیە دەستنیشان بکەین:

✓ ڕێبەرێکی زانستیی گرنگە، بۆ ئاشنابوون بە هەنگاوەکانی دروستکردنی پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییەکان و شێوازی بەڕێوەبردنیان.

✓ بابەتێکی گرنگە بۆ چالاکوان و هەڵسووڕاوانی ئەو بوارە، تا بتوانن لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان تووشی هەڵەوکەموکورتی نەبن و باشترین

ئەنجام بەدەست بهێنن، لـە هـەمان کاتـدا رێبـەرێکی روون و ئاشـناکەرە بـۆ فێرخوازانی رامیاری.

- ✓ یاریدەدەرێکی باشە بـۆ سیاسـەتوانان و چـالاکوانە سیاسـییەکان و خوێنـدکارانی رامیـاری، تـا شـارەزای چـۆنێتیی بەڕێوەچـوونی پەیوەندییـە دبلۆماسـییە نێودەوڵەتییـەکان بـبن و بتـوانن جیاکـاری لـەنێوان کـاری دبلۆماسیی نێودەوڵەتی و ئیدارەی ناوخۆی وڵات بکەن.

- ✓ رێنماییەکـەبۆ تێگەیشـتن لـە جیـاوازیی نێـوان، پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان و پەیوەندییـە کونسـوڵییەکان و جیـاوازیی کـاری بـاڵوێز و باڵوێزخانەلەسەر کونسوڵ و کونسوڵخانە.

- ✓ رێگەیەکی ئاسانە بۆ ئاشنابوون بـە پـرس و دۆزە نوێیـەکانی ژیـانی دبلۆماسیی ئەمڕۆ، دۆزینەوەی کاریگەریی شۆڕشـی گەیانـدن و زانیارییـەکان لەسـەر پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان و پرۆسـە دبلۆماسـییەکان و پیشـەی دبلۆماسی بەگشتی، ئەمە وێڕای ئاشنابوون بەو ئاراستەو پێشهاتە نوێیانەی، لـە جیهـانی ئـەمڕۆدا کاریگـەرییان دروسـتکردووەو پێویسـتە دبلۆماسـییش مامەڵەی هاوچەرخیان لەگەڵدا بکات، وەك: پرسەکانی پەیوەست بە تـیرۆر و کۆچی نایاسایی و مافەکانی مرۆڤ و ژینگە و...هتد.

- ✓ دەروازەیەکـە بـۆ ئاشـنابوون بـە دانوسـتان و ئـامراز و ئامـانج و سـتراتیج و سیاسـەت و تەکتیکـە جیاوازەکـانی و تێگەیشـتن لـە قۆنـاغ و پێداویسـتییەکانی و پـەیبردن بـە رۆڵـی زمـانی جەسـتە و پەیوەندییـە نازارەکییەکان بەگشتی لە پڕۆسەی دانوستاندا.

- ✓ دەروازەیەکە بۆ تێگەیشتن و جیاکاریکردن، لە رێساکانی موجامەلەو ئەتـەکێت و پرۆتۆکـۆل، لـە بـواری دبلۆماسـی و لـە کـاتی پەیوەندییـە

فەرمییەکان و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانداو ئاشنابوون بە ڕێسا گشتییەکانی پێشبەندی و پێشوازیکردن لەکاتی کۆنگرەو کۆبوونەوە فەرمییەکان و لەکاتی داوەتی خوان و سەردانە جیاوازەکاندا. لە هەمان کاتدا ڕێنماییەکە بۆ ناسینی جۆر و شێواز و ئاستە جیاوازەکانی گوتارە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان دبلۆماتکاران بەگشتی.

✓ ڕێگەیەکی ئاسانە بۆ ئاشنابوون، بە کۆی ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی کە دبلۆمات و نێردراوی دبلۆماسی و بارەگای دبلۆماسی و جانتای دبلۆماسی هەیانە، هەروەها بۆ زانینی جیاوازیی نێوان دبلۆمات و کونسوڵ و بارەگاکانیان لەو جیاوك و پارێزبەندییانەی پێیان دەبەخشرێت.

✓ هەوڵێکە بۆ زانینی ئاست و پێگەی (هەرێمی کوردستان) لە کایەی دبلۆماسیدا و ئاشنابوون بە پایەو مەرجەکانی هەڵکشانی ڕۆڵی (هەرێمی کوردستان) لەو بوارە گرنگ و زیندووەدا.

ئەم بەرهەمە بەرەنجامی هەوڵی (٥) پێنج ساڵی لەسەریەك و بەرەوامە، لە هەوڵ و ماندووبوون و بەدواداچوون، بەتایبەت لە چوارچێوەی وتنەوەی وانەی (پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییەکان) لە قۆناغی چوارەمی بەشی زانستە رامیارییەکانی کۆلێجی یاسا و رامیاریی زانکۆی سلێمانی، پاشان وتنەوەی وانەی (پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان/ دانوستانی نێودەوڵەتی) لە کۆرسی دکتۆرا. دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی و پشتگیریی زانستیی (تعضيد) زانکۆی سلێمانی، هەوڵماندا ئەو ئەزموون و هەوڵانە، لە شێوەی پەرتووکێکی زانستیی میتۆدیدا، دوای کاری کۆکردنەوەو زیادکردن و شرۆڤە و وردبینیکردن و پاشان پوختەکردن و ڕێکخستنەوەی بابەتەکانی، بە شێوازێکی میتۆدییانە و ئاسان، بخەینە بەردەست تۆی بە ڕێز و سەنگین.

لەم پەرتووکەدا ناوەڕۆك و ئامانجی بابەتەکان، بە پۆلێنێکی تایبەت، لە (١١) یازدە بەشدا، خراونەتەڕوو. بەشی یەکەمی بۆ پێناسە و بنەڕەتی دبلۆماسی و پەیوەندی بە بوارەکانی ترەوە تەرخانکراوە. لە بەشی دووەمدا تیشکخراوەتە سەر مێژووی دبلۆماسی و پەرەسەندنی، هەر لە چاخە دێرینەکان و چاخەکانی ناوەڕاست و دبلۆماسیی نوێ، تا دەگاتە دبلۆماسیی هاوچەرخ.

لە بەشی سێیەمدا، باس لە جۆرەکانی دبلۆماسی کراوە. بەشی چوارەمیش بۆ باسکردن لە دبلۆمات تەرخان کراوە، چەمکەکەی، جۆرەکانی و ئەو پۆلێنە جیاوازانەی بۆیان کراوە. بەشی پێنجەمیش تایبەتکراوە بە تاووتوێکردنی سەرەتای دەستپێکردنی، نوێنەرایەتیی دبلۆماسی و کۆتاییهاتنی، هەر لە مەرجەکانی ئالوگۆڕکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسیی و هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێنەری دبلۆماسی، تا ڕۆڵی دبلۆماسی و کار و ئەرکەکانی نوێنەری دبلۆماسی و جۆرەکانی گوتارو پەیامگۆڕینەوەی دبلۆماتکاران و شێوازەکانی کۆتاییهاتنی کاری دبلۆماسی. لە بەشی شەشەمدا پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان خراونەتە بەر باس، سەرەتا واتا و جیاوازیی نێوان جیاوك و پارێزیەندی تاووتوێ کراوە، دواتر بنچینەی یاسایی پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان و پاشان جۆرەکانی جیاوکە دبلۆماسییەکان و پارێزبەندییە دادوەرییەکان.

لە بەشی حەوتەمدا بابەتەکان باس لە نێراوە کونسوڵییەکان دەکەن، هەر لە پەرەسەندنی سیستمی کونسوڵیی کونسوڵەکان، ئەرك و کاری کونسوڵی، تا دەگاتە جیاوك و پارێزبەندییە کونسوڵییەکان و شێوازی کۆتاییهاتنی کاری کونسوڵ.

لەبەر گرنگیی دانوستان لە دنیای دبلۆماسیدا، بەشی هەشتەممان بۆ باسی دانوستان تەرخانکرد، کە تێیدا پێناسەی دانوستان، رەگەز و قۆناغەکانی، ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکەکانی تاووتوێ کراون، ئەمە وێڕای باسی رۆڵی زمانی جەستە و پەیوەندیی نازارەکیی لە دانوستاندا.

بۆ گرنگیدان بە پەرەسەندنە هاوچەرخەکانی بواری دبلۆماسی، بەشی هەشتەممان تایبەت کردووە، بە خستنەڕوو و شرۆڤەکردنی ئاراستەو پەرەسەندنە نوێیەکانی دبلۆماسییەتی هاوچەرخ، لەوانە: دبلۆماسی و تەکنۆلۆجیای پەیوەندی و زانیاری، دبلۆماسی و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان، دبلۆماسی رێکخراوە ناحکومییە نێودەوڵەتییەکان و دبلۆماسی و رەهەندی ئایینی.

هەرچی بەشی نۆیەمە، باس لە بابەتێکی زۆر پێویست و گرنگ و هەستیار کراوە، کە بریتییە لە رێساکانی پرۆتۆکۆل و ئەتەکێت و پێشبەندی و پێشوازیکردن و پرۆتۆکۆلەکانی یەکترناسین و سەردان و سڵاو و تەوقەکردن و پێشوازیکردن لە کاتی داوەتی خواندا. لە بەشی دەیەمدا هەوڵمانداوە، تیشکێك بخەینە سەر پێگەی (هەرێمی کوردستان) لە کایەی دبلۆماسیی نێودەوڵەتیدا.

هیوادارم توانیبێتم بەم پەرتووکە، کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی پڕبکەمەوەو خوێندکاران و پسپۆڕان و سیاسەتوانان و تۆی بەرێزیش، لێی سوودمەند و بەهرەمەند بیت.

**دانا بەرزنجی**

**سلێمانی/ ٢٠١٧**

# بەشی یەکەم
# پێناسە و بنەڕەتی دبلۆماسی و پەیوەندی بە بوارەکانی ترەوە

**باسی یەکەم:**

بنەڕەتی زاراوەی دبلۆماسی

.....................................

**باسی دووەم:**

جیاکردنەوەی زاراوە و چەمکی دبلۆماسی

لە چەند زاراوە و چەمکێکی تر

# بەشی یەکەم

# پێناسە و بنەڕەتی دبلۆماسی و پەیوەندی بە بوارەکانی ترەوە

- **ئامانجەکانی ئەم بابەتە:**

١. زانینی بوونی پێناسە و روونکردنەوەی چەمك و زاراوەکان، لە سەرەتای هەموو بابەتێکدا رێگا رۆشندەکەن، بۆ تێگەیشتن و ناسینی بابەتەکەو هەبوونی بەرچاوڕوونی بۆ خوێنەر، بۆیە ئامانجی سەرەکیمان ئاشنابوونە بە بنەماو سەرەتا و رەگوڕیشەی دبلۆماسی.

٢. دەرخستنی پێناسە جیاوازەکانی ئەم بابەتە و سوودوەرگرتن، لە هەموو بیربۆچوونی زانایان و فەرهەنگەکان لەم رووەوە.

٣. گەیشتن بەیەك پێناسەی تەواو و گشتگیر، کە هەموو رەگەزو بنەما گرنگەکانی چەمکی دبلۆماسی تێدا کۆببێتەوە.

٤. شارەزابوون لە پەیوەندیی دبلۆماسی، بە بوارەکانی ترەوە.

- **ناوەڕۆکی بابەتەکە:**

## باسی یەکەم: بنەڕەتی زاراوەی دبلۆماسیی

پێویستی لۆجیکی وا دەخوازێت، کە دەستپێکی هەربابەتێکی زانستی — تیۆری، بە ناساندن و وردکردنەوەو شیکردنەوە و دۆزینەوەی رەگوریشەی چەمك و زاراوە سەرەکییەکانو دیاریکردنی پەیوەندییان، بە چەمکە نزیکەکان لێیانەوەو جیاکاریکردن لەنێوانیاندا، دەستپێبکات.

هەرچەندە چەمکەکانی بوارە جیاوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بەردەوام جێی مشتومڕی زانایان و پسپۆڕان و بوون و ناکۆکی هەبووە، لە دیاریکردنی رەگەزە سەرەکییەکانی پێناسەکانیان، کە ئەمەش لێکەوتەیەکی سروشتی و ئاساییە، بۆ ئەو دیدجیایی و میتۆدجیاییەی، کە پسپۆڕان و زانایان لە مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتەکاندا هەیانە، ئەم بارەش وایکردووە، کە دیاریکردنی پێناسەی گشتگیر بۆ چەمکەکان –هەرچەندە ئەستەم نییە– کارێکی ئاسان نەبێت، چونکە دیاریکردن و داڕشتنی پێناسەی ورد بۆ چەمکەکان، بە شێوەیەك کە پێناسەکە هەموو رەگەزەکانی بابەتەکە لەخۆبگرێت ورێگریش بێت لەوەی چەمکی تر بڕژێتە چوارچێوەی ئەو پێناسەیەوە، کارێکە پێویستی بە خوێندنەوەو لێکدانەوەی دید و تێڕوانینە جیاوازەکانی چەمکەکان هەیە، لەلایەك، لە لایەکی ترەوە پێویستی بەوە هەیە، کە رەگوریشەی مێژوویی چەمکەکە و شێواز و شوێنکاتی لەدایکبوونی و ئاستی پەرەسەندنی لە دێرینەوە تا رۆژگاری ئەمرۆ هەیە، چونکە بەگشتی ئەو چەمکانەی، کە پەیوەندییان بە مرۆڤ و زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە هەیە، مادام مرۆڤ لە بەرەوپێشچوون و پەرەسەندنی

بەردەوامدایە، ئەوانیش پێویستە زیندووبن، لە یەك بار و قاڵبدا نەمێننـەوە و گەشەبکەن. لەم سۆنگەیەوە هەوڵدەدەین، چەمکە سەرەکییەکان بناسـێنین و پەیوەندییان بەو چەمکانەوەی لێیانەوە نزیکن دیـاریی بکـەین و جیاکـاری لەنێوانیاندا بکەین.

## یەکەم: بنەڕەتی دبلۆماسی:

دبلۆماسـی (Diplomatie) زاراوەیەکـە، لـە بنەڕەتـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ وشەی (Diploma)ی یۆنانی، کە لە کرداری (Diplon)ەوە داتاشـراوە، و گواستراوەتەوە بۆ لاتینی و لەوێشەوە بۆ زمانەئەورووپییەکان. لـە بنەڕەتـدا بـەواتای بەڵگەنامـەی پێچـراوە "الوثیقـة المطویـة" دێـت[١]. کـاتێکیش گواستراوەتەوە بۆ لاتینی بە دوو واتا بەکارهاتووە[٢]:

١. بە واتای ئەو بڕوانامە، یان وەسیقەیە بـەکارهاتووە، کـە پاشـاکان لـە پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکانیاندا ئاڵوگۆڕیـان پێکـردووە، کـە هەڵگرەکـەی جیاوکێکی دیاریکراوی پێبەخشراوە، بەباشی و ڕێزەوە پێشوازی لێکراوە. لە سۆنگەی ئەم بەکارهێنانەشەوە زمانی فەڕەنسی و دواتریش زمـانی عـەرەبی وشەی (Diploma)ی بەواتای ئەو بڕوانامەیە ناسـاندووە،کە لـە یـەکێك لـە قۆناغەکاندا دەبەخشرێتە خوێندکاران.

---

(١) د. فاضل زكي محمد، الدبلوماسية في عالم متغير، جامعة بغداد، كلية العلوم السياسية، ١٩٩٢، ص٢٥.

(٢) د. علي حسين الشامي، الدبلوماسية: نشأتها وتطورها وقواعدها ونظام الحصانات والإمتيازات الدبلوماسية، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٩، ص٣١.

٢. پەیوەندی بە بەکارهێنانی ڕۆمانەکانەوە، هەیە بۆ وشـەی دبلۆماسـی بەوەی، کە مانای سروشتی نوێنەری دبلۆماسی ببەخشێت، ئەمە وێـڕای ئـەو خاڵانــەی ئــەم ســیفەتە دەیخوازێــت، وەك ئاکاربــەرزی و خۆشەویســتیی دروستکراو و دوورکەوتنەوە، لە هۆکارەکانی دووچارهاتن بە رەخنە، ئەمەش ئـەو مەبەسـتەیە، کـە وشـەی (Diplome)ی لاتـینی دەیخوازێـت، کـە بـە واتای" پیاوی دووڕوو" دێت، هـەر لـەو وشەیەیشـەوە لـە زمـانی فەڕەنسـیدا وشەی (Diplorae) داتاشراوە بە واتای "فێڵاوی".

واتــە بەگشــتی دبلۆماســی بــە واتــای لێکۆڵینــەوە دێــت، لــەو بەڵگەنامــە کۆنانەی، کە پەیوەندییان بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە هەبووە، ئـەم وشەیە تا ئێسـتا وەك خـۆی ماوەتـەوە، بـە رای هەنـدێك لـە زانایـان یەکـەم بەکارهێنانی وشەی (Diplomacy) لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ ساڵی (١٦٤٥) دەگە ڕێتەوە، وەك مانایەك بۆ دانوستان (المفاوضات) بەکارهاتووە[1]، بەڵام وشــەی دبلۆماســی تــا ســاڵی (١٧٩٦) بــە واتــای بــەڕێوەبردنی پەیوەندییــە نێودەوڵەتییــەکان، بەکارنــەهات. تــا شۆڕشــی فەڕەنسـایش ئـەم چـەمکە بـە تێکەڵی بە واتای دانوستان و هونەرەکەی بەکاردەهات، تەنانەت وایلێهـاتبوو زاراوەی دبلۆمــات واتــای دانوســتانکاری دەگەیانــد، تــا لــەدوای کـۆنگرەی ڤیەننای ساڵی (١٨١٥) چەمك و واتا و تایبەتمەندی و رێسا و مەراسـیمەکانی وردە وردە گەڵاڵە بوون[2].

---

(١) المصدر نفسه (م. ن)، ص٣١.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، العلاقات الدبلوماسية والقنصلية، دار الشراع للنشر، الكويت، ١٩٨٥، ص٣٨.

لەگەڵ ئەو هـەموو گەشـەکردنەی وشـەی دبلۆماسـی بەخۆیـەوە بینیـوە، دەبیـنین لـە هـەموو زمانـەکانی دنیـادا، لەوانـە کـوردی و عـەرەبی، وشـەی دبلۆماسی بە یەك واتا بەکاردێت، کە گوزارشت لە چەمکێکی زانستی دەکات، کە خاوەنی بنچینەو ڕێسای ڕێکخراوی خۆیەتی.

لـە زمـانی کوردیـدا هـەردوو وشـەی (دبلۆماسـی) و (دیپلۆماسـی) بـۆ بەکاردێت، کە لە بنەڕەتدا یەکەمیان لـە وشـە عەرەبییەکـە (الدبلوماسـیة) و دووەمیشیان لە وشە ئینگلیزییەکە (Diplimacy) وەرگیراوە. ئێمە لێرەدا وشەی دبلۆماسـی بـەکاردەهێنین، کـە زیـاتر لـە نووسـین و توێژینـەوەکان و میدیا و زاری خەڵکیشەوە باوەو بەکاردێت.

## دووەم: بەکارهێنانە جیاوازەکان و پێناسەی زاراوەی دبلۆماسی:

چەمکی دبلۆماسی هێندە پەرەیسەندووە، کە بە چەندین جۆر و شێواز و بۆ چەندین واتا بەکارهێنراوە، کە هەندێکیان واتا زانستییە وردەکـەی نـادات بەدەستەوە، زانایانی یاسای دبلۆماسییش، لەسەر پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ دبلۆماسی کۆك نـین، ئەمـەش وایکـردووە لـە پێناسـەکردنی ئـەم زاراوەیـەدا چەند ئاڕاستەیەك دروستبێت، دیارترینیان[1]:

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر, سەبارەت بە ئاڕاستە و دیدە جیاوازەکان لەسەر دبلۆماسی بڕوانە: د. سهیل حسین الفتلاوي، الدبلوماسية بين النظرية والتطبيق، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦، ص٩٢. و: د.مأمون الحموي، الدبلوماسية، مؤسسة النوري، بلا مكان الطبع، ط٢، ١٩٥٨، ص٢. هەروەها: د. فؤاد شباط، الدبلوماسية، مطبعة جامعة دمشق، دمشق، ١٩٩٨، ص ص٩-١٠. و: د.عطا محمد صالح زهرة، في النظرية الدبلوماسية، الإصدار الثاني، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤، ص ص١٥-١٦. و: د. عدنان البكري، م. س.ذ، ص ص٣٩-٤٠. و:د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٣٤-٣٩.

١. دبلۆماسی پیشەیە، واتە دبلۆماسی بەواتای ئەرکی دبلۆماسی دێت، کە کەسانێك وەك پیشە پیادەی دەکەن.

٢. دانایی و وریای و لێزانی و فێلبازییە، واتە توانای کەسێك، کە بتوانێت ئەرکەکەی بەجێبهێنێت و رۆڵی خۆی ببینێت و ئامانجەکانی بە لێزانی و وریای و فێڵبازی و نەرمی بەدیبهێنێت، لە راییکردنی کارەکەیدا لەپێناو گەیشتن بەو ئامانجەی هەوڵی بۆ دەدات.

٣. هونەری دانوستانە لە رێگەی نوێنەری دبلۆماسیی نێردراوەوە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوان دەوڵەتان بەو رێگەیە.

٤. زانست و هونەری نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەت و ئەنجامدانی دانوستانە، لە رێگەی نوێنەری نێردراوەوە بۆ ئەو مەبەستە.

٥. سیاسەتی دەرەکیی دەوڵەتە، واتە ئەو سیاسەتەی هەژموونی هەیە بەسەر سیاسەتی دەرەکیی دەوڵەتدا، وەك سیاسەتی بێلایەنی، یان لایەنگرینەکردن یاخود لایەنگریکردن و جەنگ و پارێزگاریکردن لە سیاسەتی بالآنسی نێودەوڵەتی.

٦. سیاسەتی دەرەکیی دەوڵەتە لە کاتی ئاشتیدا.

٧. مێژووی دبلۆماسیی دەوڵەتێك، یان ماوەیەکی دیاریکراو. (بۆ نموونە: مێژووی دبلۆماسیی ئەمەریکی، مێژووی دبلۆماسیی ئەورووپا لە شکستی ناپلیۆنەوە، تا بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی).

٨. رەوتی سیاسی لە ماوەیەکی دیاریکراودا. (بۆ نموونە: دەوترێت دبلۆماسییەتی ئەمەریکی لەدوای یانزەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ەوە).

یەکێك لە پێناسە وەسفییە ناڕاستەخۆکانی دبلۆماسی وتە بەناوبانگەکەی (معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان)ـە، کە پێش پتر لە سیازدە سەدە وتویەتی:

"ئەگەر لەنێوان من و خەڵکیدا تاڵەموویەك هەبووبێت نەپچڕاوە، ئەگەر ئەوان شلیان کردبێتـەوە، مـن تونـدم کردووەتـەوەو هـەرکاتێکیش ئـەوان تونـدیان کردبێتەوە من شلم کردووەتەوە"، ئەم وتەیە گوزارشتێکی قووڵی سەبارەت، بـە دیـارترین تایبەتمەندییـەکان دبلۆماسـی و دبلۆمـات تێدایـە، چـونکە دبلۆماسی وەرگرتن و بەخشینە و گەیشتن بە ئامانجی خوازراو پێویسـتی بـە بەردەوامبوونە لەسەر پەیوەندی و دانوستان و نەپچڕانی پەیوەندی تەنانەت ئەگـەر لەسـەر تاڵـە موویـەکیش مابێتـەوە، لێزانـی و زیرەکـی و لێهـاتوویی دبلۆمـات و ئارامگرییەکـەی پـاڵی پێـوەدەنێن، بۆئـەوەی لەبەرانبـەر نەیارەکانیدا توندی بنوێنێت، کاتێك کـە هەسـتیکرد ئـەوان نـەرمن و نـەرمی بنوێنێت کاتێك هەست بکات ئەوان توندی دەنوێنن(١).

له سۆنگەی ئەرك و ئامانجـەکانی دبلۆماسـییەوە (د. سـوهەیل حوسـەین ئەلفەتلاوی) لە پێناسەی دبلۆماسیدا دەڵێت: "دبلۆماسی بریتییە لە زانسـت و هونـــەری نوێنەرایـــەتیکردنی هەڵوێســـتەکانی کەســـە یاســـاییە نێودەوڵەتییەکان، لە پەیوەندییە دەرەکییەکانیاندا لە ڕێگەی دەزگاگـەلێکی تایبەتمەندەوە، کە پێیاندەوترێت نێراوە هەمیشەیی، یان کاتییەکان"(٢).

هەروەها (د. حەسـەن سـەعب) لـە پێناسـەیەکی کـورت و فرەڕەهەنـددا، بـۆ دبلۆماسی دەڵێت: "دبلۆماسیی زانسـت و هونـەر و یاسـا و مێـژوو و دامـەزراوەو پیشەیە"(٣).

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص٤٢.

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص٩٢.

(٣) وەرگیراوە لە: د. هاني الرضا، العلاقات الدبلوماسية والقنصلية: تأريخها - قوانينها وأصولها، دار المنهل اللبناني، بيروت، ط٢، ٢٠١٠، ص٩.

کەواتە دبلۆماسی زانست و هونەری نوێنەرایەتیکردن و گفتوگۆکردنە، واتە زانست و هونەریشە، زانستە، چونکە ڕێسا و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە، ئەو کەسەی ئەم کارە دەکات، پێویستە شارەزایی لە هەردوو لایەنی مێژوویی و یاسایی دبلۆماسی هەبێت، ئەمە وێڕای ئاگاداری لە وردەکاریی ئەو ڕێسایانەی، کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ڕێکدەخەن، هەروەها هونەرە، لەبەرئەوەی کەسی دبلۆمات دەبێت، زۆر زیرەك و وریا و خاوەن تێبینیی ورد و تێگەیشتنی فراوان بێت، بۆئەوەی پەی بە نهێنییەکانی ببات[1]. ئەم کارەش پێویستی بە دەزگای تایبەتمەند هەیە، کە یەکە نێودەوڵەتییەکان بەفەرمی دیارییان دەکەن، بۆئەوەی بەو کارە هەستن بۆ نوێنەرایەتیکردنی هەڵوێستەکانیان.

بەگشتی ئەم پێناسانە جەخت لە دوو ڕەگەز دەکەنەوە[2]:

یەکەمیان ئەوەیە، کە دبلۆماسی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لەنێوان کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی پیادەدەکرێت و ڕێسا گشتییەکانیشی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لەلایەن یاسای نێودەوڵەتیی دبلۆماسییەوە دیاری دەکرێن، ئەمە لەکاتێکدا پەیوەندیی نێوان ویلایەتەکانی دەوڵەتە فیدڕاڵییەکان، بە دەستوورو یاسای نێوخۆیی خۆیان بەڕێوەدەبرێت، نەك بە ڕێسا و یاسا نێودەوڵەتییە دبلۆماسییەکان.

---

(١) بەراورد بکە لەگەڵ: د. علي صادق أبو هيف، القانون الدبلوماسي، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠٥، ص ص١٣-٢٣.

(٢) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١١.

دووەمیان ئەوەیە، کە دبلۆماس "بیرۆکەی دانوستان" لەخۆدەکرێت، واتە دبلۆماسیی هەوڵی دۆزینەوەی میکانیزمی گەیشتن بەرێککەوتن و بەدیهێنانی ئامانجە جیاوازەکانی یەکە نێودەوڵەتییەکان و دوورخستنەوەی مەترسییەکان دەدات لە ڕێگەی گفتوگۆوە.

لە ئێستا پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان فراوان بوون، یەکە نێودەوڵەتییەکانیش تەنیا لە دەوڵەت پێکنایەن، بەڵکو چەندین جۆری تری ئەکتەری کارا، لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی هاتوونەتەکایەوەو کاریگەرییان لە بوارە جیاجیاکاندا هەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین، ئەو پێناسانەی، کە دبلۆماسی تەنها بە دەوڵەتەوە گرێدەدەن، پێناسەگەلێکی کلاسیکین، هەرچەندە بەپێی دەقی یاسای نێودەوڵەتی، دبلۆماسی بێت، ئەو پێناسانە ڕاستن، بەڵام بەهۆی زیادبوونی یەکە نێودەوڵەتییەکان لەڕووی چۆنێتییەوە، چەندین پێناسەی هاوچەرخ بۆ دبلۆماسیکراون، کە یەکەنێودەوڵەتییەکانی غەیری دەوڵەتیش دەخەنە چوارچێوەی پێناسەکەوە، چونکە واقیعی نێودەوڵەتی لە بواری دبلۆماسی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا لەپێش تێکستەکانەوەیە، ئەویش لە دەرەنجامی پێشکەوتنی خێرای کۆمەڵگەو ژیانی مرۆڤایەتی و میکانیزم و شێوازی مامەڵەکردنیان، بەتایبەت لە سایەی شۆڕشی زانیارییەکان و بەجیهانیبووندا.

هەر لەم سۆنگەیەوە، جیوفری ئالێن پیگمان ( Geoffery Allen Pigman) زۆر بەروونی لە پەرتووکەکەیدا (دبلۆماسیی هاوچەرخ Contemporary Diplomacy) لە پێناسەی دبلۆماسیی هاوچەرخدا دەڵێت: "بریتییە لە نوێنەرایەتیکردن و پەیوەندیی نێوان، ئەکتەرە جیهانییە

کاراکان لەنێویاندا: (بۆ نموونە، نەك بـۆ کورتهـەڵهێنان) حوکومـەت و دامـەزراوە فرەلایەنەکان و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمپانیا گەورەکان"[١].

لە سۆنگەی ئەو تێبینییانەوە دەتوانین، لە پێناسەیەکی گشتگیردا بڵێین: ***"دبلۆماسی بریتییە لە هونەر و زانست و یاسای بەڕێوەبردنی پەیوەندیی نێوان، کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی لە کاتی ئاشتی و جەنگدا، بە ئامانجی بەدیهێنان و پەرەپێدانی بەرژەوەندییە تایبەت و هاوبەشەکان و دوورخستنەوەی مەترسییەکان".***

## سێیەم: تایبەتمەندییەکانی دبلۆماسی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا:

ئەگەر دبلۆماسی بریتیی بێت لە هونـەر و زانسـت و یاسـای بـەڕێوەبردنی پەیوەندیی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی، لە کـاتی ئاشـتی و جەنگـدا، بـە ئامـانجی بـەدیهێنان و پەرەپێـدانی بەرژەوەندییـە تایبـەت و هاوبەشەکان، دوورخستنەوەی مەترسییەکان، ئـەوا دبلۆماسـیی نـوێ چـەند تایبەتمەندییەکی دەبێت، کە بریتین لە[٢]:

١. دبلۆماســی ئــامرازێکی زانســتیی پســپۆڕییە، زانســتێکە ڕێســای بنچینەیی خۆی هەیە: پاش ئەوەی دبلۆماسی بە شێوازێك لـە فڕوفێـڵ و درۆ لەقەڵەم درابوو، بەهۆی بەکارهێنانی بە شـێوازی خـراپ، بەتایبـەت لەلایـەن بیزەنتییەکانەوە، دەبینین ئێستا مۆرکێکی زانستی و پسـپۆڕی وەرگرتـووە،

---

(1) Geoffrey Allen Pigman, Contemporary Diplomacy, Polity Press, Cambridge, 2010, p.11.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م. س. ذ ص٩٣. و: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٢٩-٤٠.

دبلۆماتكاران پشت بە ڕێسا و بنەماكانی كاری دبلۆماسی دەبەستن، لە هەمان كاتدا دەوڵەتان پرۆگرامی خوێندن بۆ ئەم زانستە لە زانكۆ و پەیمانگاكانیان دادەنێن، هەروەها وەزارەتی دەرەكیی دەوڵەتان پەیمانگەی تایبەت بە دبلۆماسی دەكەنەوە، بۆ پێگەیاندنی كارمەند و فەرمانبەرەكانیان و ئاشناكردنیان بە ڕێساكانی دبلۆماسی، سیفەتی زانستیبوونی دبلۆماسی وایلێكردووە، كە شیاوی پەرەسەندنی بەردەوام بێت.

٢. دبلۆماسی زانستێكی كردارەكییە، واتە ڕێساكانی ئەم زانستە لە ئەنجامی جێبەجێكردنی كردارەكییانەی ئەو پەیوەندییانەوە هاتوون، كە بەكردەوە لەنێوان دەوڵەتاندا بوونیان هەیە، چونكە دووبارەكردنەوەی پەیوەندییەكانی نێوان دەوڵەتان لەسەر ڕێسایەكی دیاریكراوی دبلۆماسی، و هەستكردن بە پابەندكەریی ئەو ڕێسایە وایان كردووە، كە ببێتە یاسایی و پابەندكەر.

٣. دبلۆماسی هونەرە، واتە بەهرەیەكە كە كەسانێك هەیانە، كە چەند تایبەتمەندییەكیان هەیە، كە شیاویان بكات بۆ مومارەسەكردنی پیشەی دبلۆماسی، بۆیە هەمووكەسێك ناتوانێت بەم كارە هەستێت، چونكە پشتدەبەستێت، بە زیرەكی و وریایی و لێزانی و وردی و توانای هەڵسەنگاندنی هەڵوێست و جموجووڵەكان و ڕووبەڕووبوونەوەی بارودۆخەكان بە وریایی و لەسەرخۆیی و نەرمییەوە.

٤. دبلۆماسی نوێنەرایەتیی هەڵوێستی كەسە یاساییە نێودەوڵەتییەكان دەكات، لە دەوڵەتان و ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان و كەسەكانی تری یاسای نێودەوڵەتی، لە پەیوەندییە دەرەكییەكانیاندا.

٥. دبلۆماسی ئـامرازێکی شارستانیی ناسـیخوڕییه، کـه لـه ڕێگـەی دەزگاگـەلێکی تایبەتـەوە، مومارەسـەدەکرێت، کـە پێیانـدەوترێت کەناڵـە دبلۆماسـییەکان، کـە بـریتین لـە نێـردراوە هەمیشـەیی، یـان تایبەتـەکان (کاتییەکان).

٦. کـاری دبلۆماسـی پەیوەسـتە بـە کـاری سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتی و سـەربازیی کەسـە یاسایی نێودەوڵەتییەکانـەوە، ئەمـەش لـە کارە کونسوڵییەکان جیای دەکاتەوە، کە بریتییە لە پاراستنی بەرژەوەندیی تاکەکان لە دەرەوە.

٧. دبلۆماسـی ئـامرازی بـەدیهێنانی ئامانجـە باڵاکانـە، لـە بـوارە جیاوازەکانـدا لـە کـاتی ئاشـتی و جەنگـدا، واتـە لـە کـاتی هاریکـاری و ململانێشدا، بە شێوازی هەمەچەشن ڕۆڵی خۆی دەبینێت.

٨. ئامانجی سەرەکیی دبلۆماسی، تـەنیا لـە بـەدیهێنان و پەرەپێـدانی بەرژەوەندییە تایبەتەکاندا کورتهەڵنایەت، بەڵکو ئامرازێکە بۆ گەیشـتن بـە ئامانجە هاوبەشەکان، لە چوارچێوەی یەکە نێودەوڵەتییەکاندا، بەتایبەت لـە چوارچێوەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و برەودان بـە ئاساییشـی مرۆیـی و ژینگەی جیهانی.

٩. دبلۆماسـی باشـترین میکانیزمـە، کـە یەکـە نێودەوڵەتییـەکان بـۆ ڕووبەڕووبوونەوە و دوورخستنەوەی هەڕەشـە و مەترسـییەکان، جـا تایبـەت بن، یان گشتی و سنووربڕ و جیهانی بن، پشتی پێدەبەستن.

ماوەتەوە بڵێین: دبلۆماسی وشە و زاراوە و چەمکێکی زیندووە، بەردەوام لە گەشەکردن و نوێبوونەوەدایە، بەو پێیەش بەپێی پەرەسەندنی بوارەکەی شـێوازی مومارەسـەکردن و میکانیزمـەکانی پڕاکتیزەکردنـی و بوارەکـانی

بەکارهێنانی و ئەکتەرەکانیشی، لە گەشەی بەردەوامدا دەبن، واتە وشەیەکی بزواو و فرەئاست و فرەمیکانیزمە. لە هەمان کاتدا رێساکانیشی، لە گەشەی بەردەوامدان، هەروەك چۆن لە ڕووی زانستییشەوە شانبەشان لەگەڵ لایەنە پراکتیکییەکەی لە گەشەکردندایە، چونکە وەك باسمانکرد، دبلۆماسی هونەرە، زانستە، یاسایە، هەرسێ ئاستەکەشی بەدوای یەکدا پەرەسەندن بەخۆیانەوە دەبینن.

## باسی دووەم: جیاکردنەوەی زاراوەو چەمکی دبلۆماسی لە چەند زاراوەو چەمکێکی تر

دبلۆماسی پەیوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ چەند بوارێکی تـردا هەیـە، کـە لەهەمان کاتدا ناتوانین وەك هاوواتا، یان لەجێی یـەکتری بـەکاریان بهێـنین، بۆیە پێویستە تیشکێك بخەینە سەر جۆری پەیوەندییەکانیان:

### یەکەم: جیاوازیی دبلۆماسی و دانوستان[1]:

زۆرجـار لـە پێناسـەی دبلۆماسـی و سـیفەتەکانی کەسـی دبلۆماتـدا، تێکەڵییەك لەنێوان دبلۆماسـی و دانوسـتاندا روو دەدات. لـە ڕاسـتیدا ئەگـەر ئەمە لە چاخە کۆنەکانی پەرەسەندنی دبلۆماسیدا رەوا بووبێت، بەهۆی ئـەو پەیوەندییە توندەی بەیەکەوە هەیانە، ئەوا بۆ رۆژگاری ئـەمڕۆ کـارێکی رەوا نییە، چونکە دبلۆماسی بەو وەسفەی زانست و هونەریشە پەرەسەندنی زۆری بەخۆوە بینیوە.

دەکرێـت کەسـێك دانوسـتانکارێکی سـەرکەوتوو بێـت، بـەڵام هەنـدێك لـە سیفەتەکانی تری کەسی دبلۆماسی و ئەرکەکانی تێدا نەبێت. هەروەك چـۆن دەگونجێت کەسێکی دبلۆمات، توانای ئامادەکردنی راپـۆرت و رەچـاوکردنی بەرژەوەندیی وڵاتەکەی و داڕشتنی پەیامانامەی هەبێت، بـەڵام لـە هونـەری دانوسـتاندا کەسـێکی کارامـە نـەبێت. ئەگـەر دبلۆماسـی یـەکێك بێـت لـە ئامرازەکانی سیاسەتی دەرەکی، ئەوا دانوستان یەکێکـە لـە میکانیزمـەکانی دبلۆماسـی. کەواتـە دانوسـتان یەکێکـە لـە میکانیزمـەکانی دبلۆماسـی و

---

(١) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص٩٣.

رەگەزێکە لە رەگەزەکانی سەرکەوتن و بەردەوامبوونی. بەمەش دانوستان دەبێتە بەشێك لە پرۆسەی دبلۆماسی[١].

## دووەم: پەیوەندیی دبلۆماسی و جەنگ:

زۆرجار پەیوەندیی بەهێزی دبلۆماسی بە دانوستانەوە وا دەکات، کە وابزانین دبلۆماسی تەنها لە کاتی ئاشتیدا جێبەجێ دەکرێت، بەلاّم لەراستیدا دبلۆماسی لە کاتی جەنگیشدا مومارەسدەکرێت، چونکە لەگەڵ ئەوەی جەنگ سەردەکێشێت بۆ پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، بەلاّم دبلۆماسیی وەك یەکێك لە میکانیزمەکانی رێکخستنی جەنگ دەمێنێتەوە، چونکە زۆر کار هەیە، لەکاتی جەنگدا لە رێگەی دبلۆماسییەوە ئەنجام دەدرێت، لەوانە: راگەیاندنی جەنگ و بەستنی رێککەوتننامەی پەیوەست بە بەڕێوەبردنی ئەو جەنگەو ئەو چەکانەی، کە بەکارهێنانیان قەدەغە، یان رێگەپێدراوە و دیاریکردنی ناوچەی ئاساییش و ناوچەی مەدەنی و گۆڕینەوەی دیل و وەستاندنی جەنگ و ئاگربەست و ئاشتبوونەوە. ئەمە وێرای ئەوەی، کە هەموو رێساکانی تری یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی، لە رێگەی دبلۆماسیی راستەوخۆ، یان لە رێگەی دەوڵەتی سێیەم، یان رێکخراوێکی نێودەوڵەتییەوە نەبێت، جێبەجێ ناکرێن. کەواتە دبلۆماسی میکانیزمێکە لە ناکۆکییە چەکدارییەکاندا بەکاردێت، هەروەك چۆن لەکاتی ئاشتیشدا بەکاردێت[٢].

---

(١) لەبەر گرنگیی دانوستان و پەیوەندیی راستەوخۆی بە دبلۆماسییەوە، بەشی هەشتەمی ئەم پەرتووکە, بۆ دانوستان و پێناسە و جۆرکانی و تەکتیك و سیاسەت و ستراتیجەکانی و رۆڵی زمانی جەستە تێیدا و پەیوەندی بە دبلۆماسییەوە، تەرخاندەکەین.

(٢) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص٩٣.

لەگـەڵ دبلۆماسـی و ئاشـتی پەیوەنـدی و وابەسـتەییەکی بـەهێز هەیـە لەنێوانیانـدا، لـە هــەمان کاتــدا دبلۆماســی و جــەنگیش دوو شــتی تــەواو لێکجیـاکراوە نـین، بـەڵکو دەگونجێـت دبلۆماسـی کـار بـۆ دروسـتکردنی بارودۆخێکی گونجاو بکات بۆ جەنگ و بۆ بردنەوەی جەنگ و بەدەستهێنانی باشترین تایبەتمەندی بۆ بردنەوەی جـەنگ، یـان کەمکردنـەوەی زیانـەکانی. بەو شێوەیە دەتوانرێت بوترێت: "دبلۆماسی تەواوکەری جەنگە، هەروەها لە هەنـدێك بارودۆخـدا ئەلتەرناتیڤیـەتی"(١). لــە لایــەکی تــرەوە، -وەك "کلاوزفیتـز" ئامـاژەی بـۆ دەکـات- جـەنگ بەردەوامیدانـە بـە سیاسـەتی دەوڵەت بە ئامرازگەلێکی تر، کە ئامرازی توندوتیژییە. واتە گۆڕینی پێنووسە بـە شمشـێر(٢). بۆیـە دبلۆماسـی کـاری ئامادەسـازی و جێبـەجێکردنی ئـەو سیاسەتە باڵایەیە، کە دەوڵەت دەیگرێتەبـەر، جا ئـەو سیاسـەتە ئاشـتییانە بێت، یان لە رێگەی توندوتیژی و جەنگەوە بێت.

کەواتە ئەگەر جەنگ هونەری زۆرکردن و ناچارکردن بێـت، ئـەوا دبلۆماسـی و دانوســتان هونــەری قــابیلکردن و قەناعــەتپێکردنن(٣)، جــەنگیش هەرچــەند درێژەبکێشێت، دواجار لایەنەکانی دەبێت لـە رێگـەی دبلۆماسـی و دانوسـتانەوە هەم جەنگەکە بەڕێوە ببەن وهەم چارەسەریش لەسەر مێزی گفتوگـۆ بدۆزنـەوە، بۆ کۆتاییهێنان بە جەنگەکە.

---

(١) وەرگیراوە لە: د. السيد أمين شلبي، في الدبلوماسية المعاصرة، عالم الكتب، القاهرة، ط٢، ١٩٩٧، ص ص ٣٠-٣١.

(٢) بڕوانە: كارل فون كلاوزفيتز،الوجيز في الحرب، ترجمة: أكرم ديري والهيثم الأيوبي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٧٤، ص ص٨٩-٩٠.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٤٥-٥٠.

### سێیەم: پەیوەندیی دبلۆماسیبە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە:

دبلۆماسی رۆڵێکی گرنگ لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دەگێڕێت، چونکە بەهۆیەوە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دروستدەکرێن و بەهێز دەکرێن و کێشە نێودەوڵەتییەکانی پێ چارەسەردەکرێن، هەر بەهۆی ئەویشەوە دیدە جیاواز و بەرژەوەندییە دژیەکەکان یەکدەخرێن، یان لانیکەم لێك نزیك دەخرێنەوە.

پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەگشتی دوو دیاردەی سەرەکیی دژبەیەك لەخۆدەگرن، کە بریتین لە هاریکاری و ململانێ و هەروەها ئەوەی لەنێوانیاندایە. لە هەمان کاتدا هەموو کارلێکەکانی نێوان ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان دەچنە بازنەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، مەبەستیش لە کارلێکەکان ئەو رووداوە یەك لە دوای یەك و پەیوەندیدارانەیە، کە لە زنجیرەی کار و کاردانەوەی ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان، لە بەرانبەر یەکتری پێکدێن. واتە ئەو کارلێکانە، یان بە ئاڕاستەی هاریکاریی نێودەوڵەتین بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی و ئامانجی هاوبەش، یاخود گوزارشتن لە ململانێ و لە چوارچێوەی ناکۆکی و دژیەکیی ئامانج و بەرژەوەندییەکاندا بەرجەستەدەبن(١). لە هەریەکێك لە بارەکانی کارلێکدا (هاریکاری و ململانێ) دەوڵەتان ناچارن پەنا بۆ میکانیزمی دبلۆماسی ببەن، جا بە ئاڕاستەی بەهێزکردنی پەیوەندییەکان بێت، یان بۆ بەڕێوەبردنی ململانێ و قەیران و تەنگژەکان بێت. واتە دبلۆماسی بە یەکێك

---

(١) بڕوانە: د. لطفي لبيب شاكر و مصطفى كافي، مبادىء العلوم السياسية، دار الحامد للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٦، ص ص٢٥٨-٢٥٩.

لـه شـادەمارەكانی ژيـان و پەيوەنـديی نێودەوڵـەتی هـەژماردەكرێت، بـەبێ دبلۆماسی پەيوەندييە نێودەوڵەتييەكان نـاتوانن بـە وێنـە تەندروسـتەكەيان بەردەوام بن.

كەواتە پەيوەندييەكی ئۆرگانيی بەهێز لەنێوان دبلۆماسـی و پەيوەندييـە نێودەوڵەتييـەكان، بـە واتـا فراوانەكـەی هەيـە. بۆيـە زۆرێـك لـە پسـپۆڕانی دبلۆماسی بڕوايان وايە، كە دبلۆماسی بريتييە لە: "بەرێوەبردنی پەيوەندييە نێودەوڵەتييەكان لە رێگەی دانوستانەوە"، ئـەويش لـە رێگـەی ديـاريكردنی كەسانێكی تايبەتمەنـد بـۆ بـەڕێوەبردنی پەيوەنـديی نێـوان حوكومەتـەكان، كەواتــە دبلۆماســی ئــەو رێگەيەيــە، كــە پەيوەندييــە نێودەوڵەتييــەكانی پێبەڕێوەدەبرێت.

## چوارەم: پەيوەنديی دبلۆماسی بە سياسەتی دەرەكييەوە[1]:

چــەمكی سياســەتی دەرەكــی بەرتەســكترە لــە چــەمكی پەيوەندييــە نێودەوڵەتييەكان، چونكە سياسەتی دەرەكـی چـالاكييەكی تايبەتمەنـدە بـە يەكەيەكی نێودەوڵەتييـەوە، بەرانبـەر بـە يەكـەكانی تـر، بـەڵام پەيوەندييـە نێودەوڵەتييەكان كۆی سياسەتی دەرەكيی يەكە نێودەوڵەتييەكان بەرانبـەر بــە يــەكتری لــەخۆدەگرێت، لــە بــوارە جياجياكــانی سياســی و ئــابووری و كولتووری وسەربازی و...هتد.

(1) بۆ زانياريی زياتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص١٩-٢٣. و د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ٢٨-٢٩.

توێـژەران رای جیاوازیـان هەیـە سـەبارەت بـە پەیوەنـدیی دبلۆماسـی و سیاسەتی دەرەکی، هەنـدێکیان (لەوانـە: هـانز مۆرگینسـاو) پێیانوایـە، کـە هەردووکیان یەك شتن، لـەو سـۆنگەیەوەی کـە دبلۆماسـی هەڵدەسـتێت، بـە سیاسەتی دەرەکی و جێبەجێکردنی بەهاوبەشی لەگەڵ وەزارەتی دەرەکـی، بەڵام هەندێکی تریان (لەوانە: نیکلسون) بڕوایان وایە، کە دوو شتی جیاوازن.

ئـەم رایـەش پەسـەندە، چـونکە لەگـەڵ ئـەوەی پەیوەندییـەکی بـەهێز لەنێوانیاندایـە، دەبیـنین سیاسـەتی دەرەکـی ئـامرازێکی سیاسـەتدارێژەری تیۆرییە، هەڵدەستێت بە دارشتنی سیاسەتی دەرەکی یەکە نێودەوڵەتییەکە، لە بواری تیۆریدا، هەرچی دبلۆماسییشە هەڵدەستێت بە پێدانی زانیـاری بـە دارێــژەرانی سیاســەتی دەرەکــی و بەمــەش یارمەتیــدەریان دەبێــت لــە ئەنجامدانی کارەکانیان، ئەم هەوڵـەی دبلۆماسـییش رێگـە بـۆ دروسـتکردنی سیاسەتی دەرەکی خۆشدەکات، بەڵام ناچێتە چوارچێوەی ئەو پرۆسەیەوە.

لــە لایــەکی تــرەوە، وەزارەتــی دەرەکــی بەشــێکە لــە دەســەڵاتی جێبەجێکردن و سیاسەتی دەرەکیی وڵاتەکەی پراکتیزەدەکات، بـۆ ئەمـەش دامەزراوەکانی خـۆی رادەسـپێرێت، نێـراوە دبلۆماسـییەکانیش بەشـێکن لـە ئـامرازی جێبـەجێکردنی ئـەو سیاسـەتە دەرەکییـە، لـە هـەمان کاتیشـدا برووسـکەو راپـۆرت دەنێرنـەوە بـۆ وڵاتەکـەیان سـەبارەت بـە کاردانـەوە نێودەوڵەتییەکان لەمەڕ سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکەیان.

کەواتــە ئەگــەر کــارە گرنگــەکانی ئــامرازی دبلۆماســی بــریتیبن لــە (کۆکردنــەوەی زانیــاری، پێشکەشــکردنی راوێــژ لەمــەڕ سیاســەتەکان، نمایندەکاری، دانوستان، پێشکەشکردنی خزمـەتگوزاریی کونسـوڵی)، ئـەوا دوو کاری یەکەمیان رۆڵـی گەوهـەری لـە دروسـتکردنی سیاسـەتی دەرەوەدا

دەبینن، سێ کارەکەی کۆتاییش دەبنە ئامرازی جێبەجێکار، بۆ ئەو سیاسەتە دەرەکییەی کە دەوڵەت هەیەتی[(١)].

لێرەوە ڕەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەوە لەسەر دبلۆماسی، وەك ڕەنگدانەوەی سیاسەتی ناوخۆ وایە لەسەر سیاسەتی دەرەوە. واتە ئەگەر سیاسەتی دەرەوە ئاشتییانە بێت، دبلۆماسییش بە هەمان ئاڕاستە کاردەکات، پێچەوانەی ئەمەش دروستە.

لێرەوە پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان دبلۆماسیی و سیاسەتی دەرکیدا هەیە، بەوەی دبلۆماسی هۆکار و ئامرازەرێخۆشکەرە بۆ داڕشتنی سیاسەتی دەرەکی، لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە ئامرازێکە لە ئامرازەکانی پراکتیزەکردنی ئەو سیاسەتە دەرەکییە، چونکە دبلۆماسیی لە کاتی ئاشتی و جەنگیشدا ئامرازی سەرەکیی جێبەجێکردنی سیاسەتە دەرەکییەکانی دەوڵەتە، بەو پێیەی کە دبلۆماسیی لە کاتی ئاشتی و جەنگیشدا هەر بەردەوام دەبێت[(٢)]، بەڵام بە شێوازی جیاواز.

واتە دبلۆماسیی مەبەستە گەورەکە نییەو ئامانجە نیشتمانی و نەتەوەییەکان لەودا وێناناکرێن، واتە بە پێچەوانەی سیاسەتی دەرەکی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە دبلۆماسی بڕیارەکان دروستناکات، هەروەك چۆن یەکێك لە بژاردەکانیش هەڵنابژێرن، بەڵکو بەشداری لە دیاریکردنیدا دەکەن. واتە دبلۆماسی ئامرازێکی رێکخراوە بۆ سەرخستنی هەربژاردەیەك،

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: برايان وايت، الدبلوماسية، ضمن كتاب: جون بيليس و ستيف سميث، عولمة السياسة العالمية، مركز الخليج للأبحاث، دبي، ٢٠١٤، ص ص٥٤١-٥٤٤.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص٤٥.

کــە ناوەنــدی دەســـەڵات بڕیــاری لێبــدات، بــە کــەمترین تێچــوون و بــە دوورخســتنەوەی مەترسییەکان. کەواتــە دبلۆماســی و سیاســەتی دەرەکــی لەوەدا یەکدەگرنــەوە، کــە هــەردووکیان ئامانجیــان پاراســتنی بەرژەوەنــدیی نیشــتمانیی دەوڵەتــە. کاتێــك کــە سیاســەتی دەرەکــی بــۆ بــە دیهێنــانی ئامانجــەکان پــەنای بــۆ ئــامرازی ســەربازی بــرد، ئــەوا پێویســتە دبلۆماســی یارمەتیدەری بێت بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە(١).

## پێنجەم: پەیوەندی دبلۆماسی بە ستراتیجییەوە(٢):

ستراتیجی و دبلۆماسی دوو رووی تەواوکاری هونەری سیاسەتن. هونــەری سیاسەتیش بریتییە لە هونــەری بــەڕێوەبردنی مامەڵــە لەگــەڵ یەکــەکانی تــر بەپێی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان. هەردووکیشیان توانا و سەنگ و هێــزی دەوڵــەت هەڵدەســەنگێنن و هــەمووی کۆدەکەنــەوە، ئاڕاســتەی بــەدیهێنانی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانیان دەکەن، بــە کــەمترین تێچــوون و قوربــانی و زۆرترین دەستکەوت و بە کورتترین رێگای گونجاو.

لەگــەڵ ئــەوەی ســتراتیجی لــە کۆنــدا بــۆ بــواری تەســکی ســەربازی بەکارهاتووە، بە مانای "جەنەڕاڵ، یــان ســەرکردایەتیکردنی جــەنگ، یــاخود بەڕێوەبردنی جەنگ" بەکارهاتووە، دەبینین ئێستا بووەتە بوارێکی گشتگیر و چــووەتە هــەموو بوارەکــانی ژیــانی سیاســی و ئــابووری و کۆمەڵایــەتی و فەرهەنگی و...هتدەوە. بە شێوەیەك کــە ســتراتیجی بریتییــە: لــە زانســت و

---

(١) بڕوانە: د. كاظم هاشم نعمة، العلاقات الدولية، الجزء الأول، جامعة بغداد، كلية القانون والسياسة، بغداد، ١٩٧٩، ص١٥.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص١٩-٢٣.

هونەری گەشـەپێدان و ئامـادەکردن و بـەکارهێنانی هێـز و توانـای سیاسـی، ئابووری، سەربازی، تەکنۆلۆجی و کولتوورییەکانی دەوڵـەت بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجەباڵاکان، کە لەپرۆسەیەکی هەمەلایەنەدا، دروستکەرانی بڕیار، پـلان و نەخشە و ئەلتەرناتیڤی بۆ دیاریدەکەن[١].

بەمەش دەکرێت دبلۆماسییەتی هـەر یەکەیـەکی نێودەوڵـەتی سـتراتیجی خــۆی بـــۆ پراکتیزەکردنـــی هـــەبێت، ئـــەویش بـــە رەچـــاوکردنی ڕەگەزەسەرەکییەکانی ستراتیجی کە بریتین لە[٢]:

١. پلان: واتە پلانێك، کە شیاوی جێبەجێکردن بێت.

٢. ئامانج: ئەو ئامانجانەی، کە دەخوازرێت بەدیبێن.

٣. ئــامرازو هۆکــارە جۆراوجۆرەکــان بــۆ جێبــەجێکردنی پلانەکــەو بەدیهێنانی ئامانجەکان بەپێی گونجانیان لەگەڵ بارودۆخ و ئامانجەکان.

٤. بەکارخستن و بەکارهێنانی سامان وتواناکان: بەپێی پلانەکە (توظيف الموارد).

لەهــەمان کاتــدا دەگونجێــت دبلۆماسـیی یــەکێك بێـت لـە ئامرازەکـانی پراکتیزەکردنــی ســتراتیجییەتی نیشــتمانیی بــاڵای دەوڵــەتێك، ئــەویش بــە بەدیهێنانی ئامانجە باڵاکانی ئەو ستراتیجییەتە بە ڕێگەی دبلۆماسی.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عبدالقادر محمد فهمي، المدخل إلى دراسة الاستراتيجية، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان – الأردن، ٢٠٠٦، ص ص١٢-٢٣.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٢٠-٢٦.

## شەشەم: پەیوەندیی دبلۆماسی و یاسای دبلۆماسی
## بە یاسای گشتیی نێودەوڵەتییەوە:

ئەگەر یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بریتی بێت لەو: "کۆمەڵەڕێسا یاساییەی، کە پەیوەندیی یەکە نێودەوڵەتییەکان ڕێکدەخات و ئەرك و مافەکانیان دیاریدەکات"[1]، ئەوا یەکێك لەو گۆڕاوانەی شوێنەوار لەسەر دبلۆماسی و تەنانەت سیاسەتی دەرەکی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش بەجێدەهێڵێت، بریتییە لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی، چونکە یاسای گشتیی نێودەوڵەتییە، کە ڕێساکانی کاری دبلۆماسی لە کاتی ئاشتی و جەنگدا دیاریدەکات، لە هەمان کاتدا نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت، کە هەر دبلۆماسییە دەبێتەڕێگوزەرو میکانیزم بۆ لەدایکبوونی ڕێسا ئیتتیفاقی و نەریتییەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی، کە پشکی شێری سەرچاوەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی پێکدەهێنن، ئەویش لەڕێگەی ڕێوشوێنە دبلۆماسییەکان و دانوسان و دانیشتن و گفتوگۆ و ڕێککەوتنەکانی دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە[2].

کەواتە پەیوەندییەکی دوولایەنەی بەهێز هەیە، لەنێوان دبلۆماسی و یاسای گشتیی نێودەوڵەتیدا، دبلۆماسی لەنێوان کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتیدا پیادەدەکرێت، یاسای دبلۆماسی لقێکە لە لقەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی و تەحەککوم بە پەیوەندیی کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتییەوە دەکات، هەروەك چۆن ئەو دبلۆماسییەتەش ڕێکدەخات،

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.عصام عطية، القانون الدولي العام، وزراة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة بغداد، ط٦، ٢٠٠٦، ص١٦.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عبدالعزيز بن ناصر بن عبدالرحمن العبيكان، الحصانات والامتيازات الدبلوماسية والقنصلية في القانون الدولي، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٧، ص ص٨٩-٩١.

یاسای دبلۆماسییش بەدیاریکراوی: "بریتییە لەو کۆمەڵە ڕێسا یاساییەی، کە گرنگی بە ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان ئەو دەزگایانەی کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی دەدەن، کە پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئەو کەسانەیان پێ سپێراوە، ئەمە وێڕای گرنگیدانی بە گرێنتیکردنی مومارەسەی ئازادانەی ئەرکی ئەو دەزگایانە".

بەگشتی، کاریگەریی یاسای نێودەوڵەتی لەسەر دبلۆماسی لە دوو ڕووەوە دەردەکەوێت(١):

یەکەم/ گەشەدان بە ئامرازە ئاشتییانەکان بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان: ئەو ئامرازانەش بریتین لە: دانوستان، هەوڵە سوپاسکراوەکان (المساعي الحميدة)، نێوەندگیری، لێکۆڵینەوە، پێکهێنانەوە (التوفيق) و تەسوییەی دادوەریی. ئەم ئامرازانەش، جگە لە دووانەکەی کۆتایی، هەموویان بە ئامرازی دبلۆماسی ناودەبرێن. تەنانەت دادوەری (التحكيم)یش، کە ئامرازێکی دادوەری (قضائي)یە، هەر سروشتی دبلۆماسیی بەسەریدا زاڵە، چونکە دەستە دادوەرییەکە و ئەو یاسایەشی جێبەجێی دەکەن، بە ڕێککەوتن لەنێوان لایەنەکانی ناکۆکییدا دیاریدەکرێن.

دووەم/ فراوانبوونی چوارچێوەی دبلۆماسی: ئەو پەرەسەندنەی کە یاسای نێودەوڵەتی،لە ئەنجامی دەرکەوتنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، بەخۆیەوە بینیوە، لەپاڵ ئامرازە دبلۆماسییە کلاسیکییەکان (نێردراوە دبلۆماسی و کونسوڵییەکان) و دانوستانی دووانەییدا، دبلۆماسییەتی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.غازي حسن صباريني، الدبلوماسية المعاصرة: دراسة قانونية، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ط٣، ٢٠١١، ص١٩.

کۆنگرەکــان و ڕێکخــراوە نێودەوڵەتییەکانیشــی زیــادکرد، ئــەو کــۆنگرە نێودەوڵەتییانەی، کە ڕێکخراوە نێوەوڵەتییەکانیش دەیبەستن، دەرفـەتێکی گەورە بۆ نوێنەری وڵاتان دەڕەخسێنن، بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆی نافـەرمی و چارەسەرکردنی کێشەکان و دەرکردنی بڕیاری هاوبەش.

لێرەوە دەگەینە ئـەو دەرەنجامـەی کـە: پەیوەنـدیی نێـوان دبلۆماسـی و یاسای گشتیی نێودەوڵەتی پەیوەندییەکی تەواوکارییە، دبلۆماسی بناغە بـۆ یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دادەنێت، هەرچی یاسای گشتیی نێودەوڵەتیشە، دبلۆماسی ڕێکدەخات و بەردەوامی پێدەبەخشێت. کەواتە چوارچێوەی کاری دبلۆماسی، بە یاسای دبلۆماسی ڕێکدەخرێت، کە بەشێکە لە یاسای گشـتیی نێودەوڵـەتی، هـەر هەڵەیـەکیش کەسـی دبلۆمـات، یـان دەزگـای دبلۆماسـی ئەنجامی بدات، ئەوا دووچاری لێپێچینەوە دەبێت، بەپێی ڕێسـاکانی یاسـای گشتیی نێودەوڵەتی[١].

بەگشــتی سەرچــاوەکانی یاســای دبلۆماســی بــریتین لــە: نــەریت، ڕێککەوتننامـە و پەیماننامـە دووانـەیی و فرەلایەنـەکان، یاسـای نێوخـۆیی وڵاتــان، و پێشــینەی دادوەری (وەك: بڕیــار و فــەتواکانی دادگــای دادی نێودەوڵەتی) و ئیجتیهاد و فیقهی نێودەوڵەتین[٢].

کەواتە هـەموو ڕێسـاکان و ئەحکامـەکانی یاسـای دبلۆماسـی، لـە یاسـای گشـتیی نێودەوڵەتییـەوە سەرچـاوەناگرن، بـەڵکو هەنـدێکیان لـە سیسـتم و

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٢٦-٢٨. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٤٠-٤٢.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص٤١-٥٠. و: د. فاضل زكي محمد، م. س، ذ، ص ص١٠٠-١١٠.

یاسای نێوخۆیی وڵاتانەوە سەرچاوەیان گرتووە، کە دەکرێت لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازبن، لە شێوازی دیاریکردنی دبلۆمات و راسپاردنی و دەسەڵاتەکانی و رێوشوێنەکانی دامەزراندن و بەشاندکردنی دبلۆمات و ئەرکەکانیان، ئەمە وێڕای شێوازی پێشوازی و موجامەلەی نێودەوڵەتی، کە بە یاسا جێهێڵراوە بۆ رێسا نێوخۆییەکانی وڵاتان[1].

لێرەوە، پاش لێکدانەوەی واتای دبلۆماسی و روونکردنەوەو شرۆڤەی جۆری پەیوەندی لەگەڵ کایە نزیکەکان لێیەوە، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی، کە دبلۆماسی گرنگی و بایەخێکی یەکجار زۆری لە کایە جۆراوجۆرەکانی ژیانی نێودەوڵەتیدا هەیە، کارلێك و کاریگەریی راستەوخۆ، لەسەر کۆی پرۆسە جیاوازەکانی هاریکاری و ململانێی یەکە نێودەوڵەتییەکان دروستدەکات، دەبێتە ئەو سووتەمەنییەی کە کایەکانی پەیوەندیی ژیانی سیاسی و ئابووری و کولتووری و سەربازی و ئەمنی و...هتد دەوڵەتان و ئەکتەرەکانی تری گۆڕەپانی نێودەوڵەتی و جیهانی، لەسەری وەستاون.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س. ذ، ص ص٢٢-٢٣.

# بەشی دووەم
# مێژووی دبلۆماسی و پەرەسەندنی

**باسی یەکەم: چاخــە دێرینــەکان**

**باسی دووەم: دبلۆماسی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا**

**باسی سێیەم: دبلۆماسیی نوێ**

**باسی چوارەم: دبلۆماسیی هاوچەرخ**

# بەشی دووەم
# مێژووی دبلۆماسی و پەرەسەندنی

## ➢ ئامانجەکانی ئەم بابەتە :

١. گەڕانەوە بۆ مێژوو لە هەموو بابەتێك زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە و چۆنێتیی دروستبوون وپەرەسەندنی بەپێی قۆناغە مێژوییەکان.

٢. دیاریکردنی قۆناغەکانی پێشکەوتنی دبلۆماسی و تێگەیشتن لە بایـەخ و گرنگیی ئەم بابەتە لە مێژوودا.

٣. ئاشنابوون بەو پەرەسەندنە گەورەیەی، کە بواری دبلۆماسی بەخۆیـەوە بینیـوە، تـا گەیشـتووەتە ئـەوەی رێسـاو یاسـاگەلێکی فـراوان و ورد هـەبێت، بـۆ رێکخسـتنی پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکانی نێـوان ئەکتـەرە نێودەوڵەتییەکان.

## ➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە :

**دەستپێك..**

دەرکەوتنی دبلۆماسی لە چاخە سەرەتاییەکانەوە پێویستییەك بـوو، کـە سروشـتی ژیـان و پێویسـتیی مـرۆڤ بـە یـەکتری و پێویسـتییان بـە زمـانی تێگەیشتن بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپاند، لەپێناو بەدیهێنانی پێداویستییەکانی و رێکخستنی بەرژەوەندییـە ئاڵوگۆڕکراوەکـان، لـە ژینگەیەکدا کـە ململانـێ تێیدا باوبووە.

گەلە سەرەتاییەکان هەستیان کردووە، بە گرنگیی ڕێگەچارە ئاشتییانەکان، لە بەدیهێنانی بەرژەوەندیی هاوبەشدا، بە پەنابردنە بەر دانوستان و بەستنی ڕێککەوتننامە، یاخود قبوولکردنی یەکێك لەم دوو حاڵەتە: تەسلیمبوون بە لایەنی نەیار، یان دژایەتیکردنی، کاتێکیش ڕێگەی دانوستان و گفتوگۆیان هەڵبژارد، بە پێویستیان زانی کە کەسانی شارەزا و لێهاتوو لەنێو خۆیاندا، بۆ ئەو کارە دیاریبکەن، کە سیفەتەکانی دبلۆماتێکی سەرکەوتوویان تێدابێت. هەروەك چۆن زانییان کە ناگەنە دەرەنجام، گەر دەستدرێژی بکەنە سەر وەفدە نێراوەکان، واتە بە پێویستیان زانی، کە پارێزبەندی (حەصانە)ی کەسی و ماددییان پێبدەن، ڕێزیان لێبگرن بۆئەوەی دبلۆماسییەت بەرەنجامێکی هەبێت. بەو شێوەیە ئەرك و وەزیفەی دبلۆماسی قودسییەتێکی پێدرا، تەنانەت ئەو قودسییەتە لە وەزیفەیەکەوە، کە پێویستی دەیسەپاند، گۆڕا بۆ مەسەلەیەکی دینی، کە خواوەندەکانیان فەرمانی پێدەکەن[(١)].

پەرەسەندنی دبلۆماسی بەستراوەتەوە بە پەرەسەندنی مێژووی مرۆڤایەتی و پەیوەندییەکانی و دۆزینەوەی بەرژەوەندیی هاوبەش و پێداویستیبوونی ڕێساگەلێك، کە هەموولایەك لەسەری بڕۆن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی، کە هەرلایەك هەوڵدەدات، لە ڕێگەی دبلۆماسییەوە بەدیبهێنێت.

لەپێناو بەدواداچوون بۆ ئەو پەرەسەندنەی مێژووی دبلۆماسی و قۆناغەکانی، تیشکێك دەخەینە سەر (چاخە دێرینەکان، چاخەکانی ناوەڕاست، چاخی نوێ، چاخی هاوچەرخ).

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٩-٢٠.

## باسی یەکەم: چاخە دێرینەکان

### یەکەم: دبلۆماسییەتی میسر و شام و رافیدەین:

مەبەست لە ڕۆژهەڵاتی نزیکی دێرین ژیارەکانی میسرو وڵاتی شام و رافیدەین و حیسییەکان و یۆنانە. زۆربەی مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە لە سێ هەزار ساڵ پێش زایینەوە سیستمی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا دروستبووە، ئەو پەیوەندییانە لەسەر پرەنسیپی باڵانسی سیاسی بونیادنراون. هەروەها مێژوونوسان جیاکارییان لەنێوان دوو سەردەمدا کردووە، یەکەمیان سەردەمێکی دێرین و دووەمیان سەردەمێکی پێشکەوتووترە، کە لە هەردووکیاندا دبلۆماسی بە جۆرێك لە جۆرەکان بوونی هەبووە.

لە چاخە دێرینەکەدا ویستی فراوانخوازیی کیانەکان بەربەست بووە، لەبەردەم ئارامی ورێکخستندا و بووەتەهۆی داگیرکاری و دروستبوونی پەیوەندییەکی نێودەوڵەتی، لەسەر بنەمای پاشکۆیەتیی لاوازەکان بۆ بەهێزەکان، ئەویش لە چوارچێوەی بنەمای باڵانسی هێزدا.

لەم چوارچێوەیەدا چەندین رێککەوتننامە بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکان و سنووری کیانەکان بەستراوە، لەوانە: ئەو رێککەوتنەی، کە لە ساڵی (٢٥٠٠پ.ز) لەنێوان (نارام سین)ی پادشای ئەکەدی و یەکێك لە میرەکانی (ئافان) بەسترا، کە دەوڵەتێکی پاشکۆبووە بۆی[١].

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص٥١.

له چاخێكی نوێتردا جێگیری و ویستی پەرەپێدانی پەیوەندییە سیاسی و بازرگانییەكان پەرەیسەند، بەتایبەت لەنێوان میسری و حیسییەكاندا. بۆ نموونە: لە یەك ئاستدا لەنێوان هەریەك لە پادشای میسر (ررەمسیسی دووەم) و پادشای حیسیەكان (حاتوسیلی سێیەم)، رێككەوتننامەی (قادش) مۆركرا، نووسینەكەی لەسەر زیو نەخشێنرا، هەریەكەیان لەسەر دانەیەكیان واژۆی كرد، ئاڵوگۆڕیان كرد. ئەو رێككەوتننامەیە لەپێناو پەیوەندییەكی دۆستانەو رێزگرتن لە خاكی یەكتری واژۆكرا، چەندین بابەتی گرنگی لەخۆ گرت، لەوانە دانان بە میراتگرێتیی عەرش و هاوپەیمانێتیی بەرگرییانە و كاری هاوبەش دژی شۆڕشگێڕان و رادەستكردنی تاوانباری سیاسی[1].

## ئەم پەیماننامەیە گرنگییەكی تایبەتی هەیە، چونكە[2]:

١. كۆنترین رێككەوتننامەی نووسراوەیە لە مێژوودا، كە لە ساڵی (١٢٧٨پ.ز) مۆركراوە، لەساڵی (١٨٨٦ز) لە (تەللعەمارینە) لەسەر دیواری (پەرستگای كرەنك) دۆزراوەتەوە.

٢. نموونەیەكە بۆ ئەو پەیماننامانەی، كە پەیوەندییە سیاسییەكانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیكی دێرینی رێكخستووە لەو چاخەدا، هەروەها ئاماژەیە بە ئاستی كاری دبلۆماسیی نێوان ئەو دەوڵەتانە، كە چۆن زمانێكی بەرزی تێدا بەكارهاتووە و "دیباجە" و "ناوەڕۆك" و "كۆتایی" لەخۆ دەگرێت، هەروەها بوو بە نموونەیەك، كە گەلانی دواتر پەیڕەوییان دەكرد.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٦٣-٦٥. و: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص٥١.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: المصدرين نفسهما.

٣. وێنەیەکی ڕاستگۆیانەمان لەمەڕ بارودۆخی میرنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی دێرینی ئەو سەردەمە و شێوزای توانەوەی دەوڵەت، لە کیانی پادشای حوکمڕاندا بۆ دەکێشێت.

## دووەم: دبلۆماسییەتی هندی:

هندییەکان بەچاوێکی دوژمنکارانە سەیری بیانییان دەکرد، ئەمەش وایکردبوو، کە دوژمنایەتیکردنیان بە کارێکی پێویست بزانن، بۆیە لە کاری دبلۆماسییاندا جەختیان لە دوو بواری گرنگ دەکردەوە، کە بریتیبوون لە **سیخوڕی و بەستنی هاوپەیمانێتی**، بەو پێیە ئەرك و کاری یەکەمی دبلۆماتە هندییەکان بریتیبوو، لە **کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر گەلانی دی**. هەرچی ئەرکی دووەمیشان بووە بریتیبووە، لە **مۆرکردنی هاوپەیمانی بۆ بەهێزکردنی هێزی سەربازی**، چونکە ئەقڵیەتێکی سەربازی زاڵبوو بەسەر هندییەکاندا، ئەم عەقڵییەتەش ئاڕاستەی پەیوەندییەکانیانی بە گەلانی ترەوە دیاریدەکرد.

لەو چوارچێوەیەدا یاسای (مانو Manou)[1] گرنگیی بە دبلۆماسی دا و شێوازی دیاریکردنی نێراو و سیفەت و ئەرکەکانیانی دیاریکرد. بەپێی ئەم یاسایە پێویستە پاشاکان نێراوەکانیان لەو کەسانە دیاریی بکەن، کە پێگەیەکی بەرز و توانایەکی باشیان هەیە، بۆ نمایندەییکردنی پاشاکانیان بە جوانترین شێوە، تەنانەت پێویستە لەو کەسانە بن، کە فیراسەت و

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.ن، ص ص٦٦-٦٧. و: د. عطا محمد صالح زهرة، م.ن، ص٥٠.

توانایەکیان هەبێت، کە وایان لێبکات لە چرپە و ئاماژەو جووڵەی جەستەو دەموچاوی بەرانبەرەکانیان تێبگەن[(١)].

## سێیەم: دبلۆماسییەتی چینی:

چینییەکان گرنگییان بە دبلۆماسی داوەو لەگەڵ دراوسێکانیاندا نێراوی دبلۆماسییان ئاڵوگۆڕ کردووە، بە ڕێساگەلێکەوە پابەندبوون، کە پەیوەست بووە بە پێشوازیکردنی نێردراوە دبلۆماسییەکان و ریزبەندیی پێشبەندی (الأسبقية). ڕێنماییەکانیشیان بۆ نێراوەکانیان ورد و یەکلاکەرەوە و توند بوون. هەروەك چۆن گرنگییەکی زۆریان بە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر گەلانی تر داوە.

---

(١) وشەی (مانو) وەکو وشەی (فیرعەون) وایە، پێشتر بە پادشا بەخواکراوەکان وتراوە. هندییە کۆنەکان بڕوایان وابووە, کە لە رابردوودا حەوت پادشای بەخواکراو حوکمڕانیی جیهانیان کردووە، خواوەند (براهما)بە نیگا ئەو یاسایەی بۆ یەکەم پادشایان (واتە بۆ یەکەم مانو) ناردووە، پاشان ئەو پادشایە ئەحکامەکانی یاساکەی بۆ کاهینەکان گواستووەتەوە، ئەوانیش پاراستوویانە، دواتر نەوە دوای نەوە گواستراوەتەوە، پاشان لە پەڕتووکێکی گەورەدا بە زمانی سەنسکریتی، کە زمانی هندییە کۆنەکان بووە، نووسیویانەتەوە. مێژووەکەی جێی ناکۆکیی پسپۆڕانە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن یاساکە دەگەڕێتەوە بۆ (٢٠٠٠) ساڵ پێش زایین. ئەوەی ئەم یاسایە جیادەکاتەوە ئەوەیە, کە لە شێوەی شیعردا نووسراوەتەوە و ژمارەی بەیتەکانی دەگاتە (٢٦٨٣) بەیتی شیعری، کە ڕێسا ئاینی و ئەخلاقییەکانی لەخۆگرتووە و بۆ ڕێکخستنی رەفتاری مرۆڤ هاتووە. تێیدا کۆمەڵگە بۆ پێنج چین دابەشکراوە، بەم ریبەندییە: کاهینە بەراهیمەکان، جەنگاوەران، جووتیار و بازرگانان، کرێکاران، دەرکراو و بێزراوان (المنبوذون)، ئەو چینانەش بوون بە بنەمای ماف و جیاوکەکان و جیاوازییەکی زۆریان تێدایە، بۆ نموونە: چینی یەکەم مافی تەواویان هەبووە و توانیویانە چوار ژن بهێنن، بەڵام چینی کۆتایی مافیان نەبووە, بە توندوتیژی مامەڵەیان لەگەڵ کراوە. بڕوانە: د. منذر الفضل، تأريخ القانون، مطبعة ئاراس، أربيل، ط٢، ٢٠٠٥، ص ص٣٧-٣٨.

تەنانەت فەیلەسووفی چینیی بەناوبانگ (کۆنفۆشیۆس) لە چوارچێوەی ئەوەی، لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا نووسیویەتی ئاماژەی بەوە کردووە، کە "سیستمی دروست بۆ یاسای گەلان ئەوەیە، کە کۆمەڵێکی نێودەوڵەتی دروستبێت، ئەو دەوڵەتانەی کە دەبنە ئەندام تێیدا شاندی نوێنەری خۆیانی بۆ بنێرن، کە لەنێو رەوشتبەرزترین و شایستەترین هاووڵاتییەکانیان هەڵیبژێرن"(١).

## چوارەم: دبلۆماسییەتی یۆنانی:

گریکەکان تەنیا لە بواری مێژوو و فەلسەفەو فیکری سیاسیدا رۆڵی گەورەیان نەبینیوە، بەڵکو لە بواری دبلۆماسییشدا زۆریان پێشکەشکردووە، ئەوەتا زۆرێك لە رێسای دبلۆماسییان بۆ ژیارەکانی دوای خۆیان بەجێهێشتووە، هەر لە چۆنێتیی هەڵبژاردنی باڵوێز و ناردنییەوە، تا چەمکی پارێزبەندی (حەصانە)ی دبلۆماسیی،– وەك ملکەچنەبوونی نوێنەری دبلۆماسی بۆ یاسا و دادگای ئەو دەوڵەتە، کە بۆی دەنێرێت– هەروەك چۆن نازناو و وەزیفەی "کونسولٚ"یان دانا، داری زەیتوونیشیان کرد بە رەمزی ئاشتی، ئەمە وێرای دارشتنی شێوازگەلێکی نوێ بۆ دانوستان و بەستنی کۆنگرە و هاوپەیمانێتی و گفتوگۆکردن لە رێگەی (پەرلەمان)ەوە، ئەمە جگە لە دامەزراندنی (رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان)، ئەوەشمان لەیاد بێت،

---

(١) وەرگیراوە لە: د. علي صادق أبو هيف، م.س. ذ، ص٨١.

که تەنانەت وشەی "دبلۆم"یش کە وشەی دبلۆماسی لێ داتاشراوە لە بنەڕەتدا وشەیەکی گریکییە[١].

پەیوەندییە دەرەکییەکان لە سەردەمی یونانییەکاندا جێگیری و بەردەوامییەکی زیاتریان بەخۆیانەوە بینی، ئەویش لە ئەنجامی بەرژەوەندیی هاوبەشی شارە یۆنانییەکان پێکەوە و ویستی مانەوەی پەیوەندیی دۆستانە لەنێونایاندا. بۆیە نێردراو و دانوستانکاریان بۆ لای یەکتری دەنارد، گرنگییان بە ئاستەکانیان لە هەڵبژاردنیاندا دەدا، ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ دانانی بەردی بناغەی کۆمەڵێك ڕێسای دبلۆماسی، بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەندی بە پارێزبەندیی دبلۆمات و مامەڵەو پێشوازیکردنییەوە هەیە[٢].

بەڵام لەگەڵ ئەمانەدا ئەو سیستمە دبلۆماسییەی، کە گریکەکان هێنایان لە بەجێهێنانی کارەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە نێردراوە دبلۆماسییەکانیان لە کۆمەڵە باڵوێزێك پێکدەهاتن، کە هەموویان لە پلەدا یەکسان بوون و هەریەکەیان نمایندەی ئاراستەی سیاسیی شارەکەی خۆی بوو، هەریەکەشیان لە بۆسەدا بوو بۆ ئەوانی تر، هەوڵی دەدا لە ڕێزی ئەوانی تر کەم بکاتەوە، دەگەڕا بۆ هەر هەڵەو کەموکوڕییەك، کە لەوانی تردا هەبێت، تا لەکاتی گەڕانەوەی بۆ نیشتمان بیکاتە بەڵگە بۆ ناوزڕاندنی و تۆمەتبارکردنی بە نەشیاوی و گەندەڵی و تەنانەت خیانەتکردن. ئەمەش وایکرد، کە باڵوێزەکان نەوێرن ئەوەی کە پێویستە بیڵێن، لە ترسی دەرەنجامەکەی، جۆرێك لە هونەری پێچوپەناکردن و درێژدادڕی لە

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٧٤-٧٥.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س. ذ، ص ص٨١-٨٢.

قسـەكردندا دەركـەوت تـا وايليّهـات، كـە هەمووشـتيّك بوتريّـت و لـە بابەتـە سەرەكييەكە دووربكەونەوە لە ترسـی ئـەوەی نـەبادا وتەبيّژەكـە بـە قسـەی خۆيەوە بيّـت، يـان ولاّتـەی پيّـوە پابەنـدبكريّت. بۆيـە ميّـژووی دبلۆماسـيی گريكەكان ليّوانليّوە لە نموونەی وتاری دوورودريّژ و رەوانبيّژانـە، كـە ئەگـەر هەركەسـيّك لـە وشـەكانی وردببيّتـەوە دەبينيّـت هـيچ واتـا و ناوەرِۆكيّكيـان نييە[1].

لەرِاستيدا بـارودۆخی شـارەكانی يۆنـان كەشـيّكی لـەباری رەخسـاند، بـۆ دەركەوتنی چالاكيی دبلۆماسيی ريّكخراو، چونكە سيسـتمی دەولّـەت—شـار، زۆريّـك لـە دەولّـەتانی خـاوەن بەرژەوەنـديی هاوبەشـی كۆكردبـووەوە، كـە تيّكەلّيی زۆريان كيّبركیّ، يان هاوكاری لەنيّوانياندا زيـاتردەكرد. لـە هـەردوو بارەكەشدا پيّويستيان بە ريّساگەليّكی گشتيی دبلۆماسيی بوو بۆ ريّكخستنی پەيوەندييە سياسييەكانيان.

**دیارترین ئەو بنچینانەی، کە دبلۆماسییەتی یۆنانی پیّ جیادەکریّتەوە بریتین لە(٢):**

١. هەلّبژاردنی كەسی دبلۆمات لەنيّو ئەو كەسـانەی، كـە بـە وتاربيّـژی چـاك جيادەكرانـەوە، بـەهۆی زيرەكـی و ليّزانـی و زانـينی هونـەری وتـەو رەوانبيّژييان و پاشان كاريگەرييان لەسەر گويّگرەكانيان.

---

(١) برِوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص٢٢.

(٢) بۆ زانياريی زياتر برِوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٥٢-٥٣.

٢. هەڵبژاردنی چەند کەسێك بۆ یەك نێراو (البعثـة)، بـە شـێوەیەك کـە نمایندەی هۆزە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵەی نیشتمانی بکات، ئەمەش زۆرجـار دەبووە هۆی نەبوونی یەك ئاڕاستەیی و یەکڕایی.

٣. کۆمەڵەی نیشتمانی بە شێوەیەکی فەرمی باڵوێزەکـانی ڕادەسـپارد، دیاریدەکردن و سەرپەرشتیی دەکردن، بۆیە هەرکەسێك بە درۆوە بیگوتایە: "باڵوێزم"، دەکوژرا، پاش گەڕانەوەشیان باڵوێزەکـان راپـۆرتی خۆیـان بـەو کۆمەڵەیە دەدا.

٤. نێراوەکـان دۆکیـومێنتی سـەفەرکردنیان پێـدەدرا، بـۆ هاتوچـۆکرن لەنێوان وڵات و شوێنە جیاوازەکاندا و دەسەڵات خۆی خـەرجیی نێراوەکـانی لەئەستۆ دەگرت.

٥. بوونی پارێزبەندی بۆ کەسی دبلۆمات، کـە ڕێـزی پـارێزراو بـوو، بـۆ نموونە: دبلۆمات ملکەچی دادگای لۆکاڵی نەدەبوو.

٦. قەدەغەکردنی وەرگـرتنی دیـاری لەلایـەن دبلۆماتەکانـەوە، لـەکاتی ئەنجامدانی کارەکانیان، تەنانەت شاری (ئەسینا) بڕیـاری لەسـێدارەدانی بـۆ یـەکێك لـە باڵوێزەکـانی دەرکـرد، کـە لـە کـاتی کارەکەیـدا لـەلای فـارس دیارییەکی وەرگرتبوو، چونکە ئەو کارە بە بەرتیل وەرگرتن لەقەڵەم درا.

## پێنجەم: دبلۆماسییەتی رۆمانی:

لەرووی تیۆرییەوە رۆمانییەکان لە رێگەی یاسا جۆراوجۆرەکانیانەوە، زۆریان پێشکەشی دبلۆماسی کردووە، چونکە ئەو کاتە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی یەکگرتوو تاکە دەوڵەت بوو، کە لە ئەورووپا و باکووری ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەراستدا هەبوو، بۆیە تاکە هەژموونکار بوو بەسەر گەلانی ئەو ناوچانەدا و چەندین یاسای بۆ دەرکردن، لەوانە: **یاسای شارستانی،** کە تەنیا بەسەر گەلانی لاتینیدا جێبەجێ دەکرا، هەروەها **یاسای گەلان،** کە بەسەر ئەو گەلانەدا جێبەجێ دەکرا کە شارستانی و پێشکەوتوو بوون، لەوانەی کە سەربەخۆیی خۆیان هەبوو، لەوانەش کە پاشکۆی رۆما بوون، وەك گەلە یۆنانییەکان، لەرووی تیۆرییشەوە **یاسای سروشتی** بەبێ ریزپەڕ بەسەر هەموو لایەکدا جێبەجێ دەکرا، بەلام بەپێی بارودۆخی ئیمپراتۆرییەت و ویستی فەرمارەوا سەربازی و مەدەنییەکانی.

رۆمانییەکان بەشدارییان لە پەرەپێدانی تیۆری دبلۆماسی کردووە، زیاتر لە بەشدارییان لە مومارەسەکردنیدا. ئەوان جەنگاوەرو داگیرکەر بوون و دەسەلاتی سەربازییان وایکردووە ویستی خۆیان بەسەر گەل و هۆزە دوراوەکاندا بسەپێنن، ئەمەش لە پەیماننامەکانیان و شێوازی بەستنیان و سووربوونیان لەسەر رێزگرتنیان رەنگی دابووەوە، چونکە ئەو پەیماننامانە زیاتر گوزارشت بوون لە سەپاندنی ویستی سەرکەوتوو، بەسەر شکستخواردوودا، نەك گوزارشت بێت لە ویستی ئازادانە و بەرژەوەندیی ئالوگۆڕکراوی لایەنەکانی پەیماننامەکان. رۆمانییەکان چەمکی رێزگرتنی رێککەوتننامەیان پەرەپێدا، چونکە بەردەوامبوونی رێککەوتننامەکان لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێك لە پرۆتۆکۆلیان

پەرەپێدا، کە شێوازی پێشوازیکردن لە باڵوێزەکان و شوێنی مانەوەیانی لە ڕۆما ڕێکدەخست. بەزۆری ڕۆمانییەکان لە کاری دبلۆماسییدا نەریتە یۆنانییەکانیان بۆ مابووەوە[(١)].

**دەتوانین دیارترین بنچینەکانی دبلۆماسییەتی ڕۆمانی لەم چەند خاڵەدا پوخت بکەینەوە[(٢)]:**

١. ئەنجوومەنی پیران سیاسەتی دەرەکی بەڕێوەدەبات و پەیماننامەکان ئیمزا دەکات، کۆمەڵەی نیشتمانییش مۆریان دەکات.

٢. دروستکردنی دیوانێك بۆ کاروباری دەرەکی بۆ چاودێریکردنی پەیوەندییە یاساییەکانی نێوان ڕۆما و دەوڵەتانی تر و چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانەی، کە لەسەر پارێزبەندیی نێراوە دبلۆماسییەکان دروستدەبوون.

٣. دیاریکردنی ژمارە ئەندامانی وەفدی نێردراو، بەپێی گرنگیی ئەو بابەتەی وەفدەکەی بۆ دەنێرێت، کە بەگشتی لەنێوان (٢–١٠) کەس بوو، ئەنجوومەنی پیرانیش هەڵدەستا بە ناردنی نێردراوە دبلۆماسییەکان بۆ دەرەوە و ئەوانیش نماییندەیی ئەو ئەنجوومەنەیان دەکرد.

٤. دروستکردنی دەستەیەکی ڕاهێنراو بۆ سەرپەرشتیکردنی بەڵگەنامەکان و ئەرشیف (أمناء المحفوظات) ریزبەندکردنی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و لێکۆڵینەوە لێیان.

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٢٣-٢٤.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٥٤-٥٥. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٧٦-٧٧.

٥. پێشکەشکردنی راپۆرت لەلایەن باڵوێزەکانەوە بۆ ئەنجوومەن بۆ گفتوگۆلەسەرکردنیان و هەڵسەنگاندنیان.

٦. پێشوازیکردنی ئەنجوومەنی پیران لە باڵوێزی دەوڵەتانی بیانی و گوێبۆگرتنیان، لە حاڵەتی رەتکردنەوەی بینینیشیاندا، مۆڵەتێکیان پێدەدرا بۆ جێهێشتنی رۆما، گەر لەو مۆڵەتە تێپەری بکردایە، پارێزبەندیی دبلۆماسییان نەدەما.

٧. بەخشینی پارێزبەندییەکی کەسی بە نێراوە دبلۆماسییە بیانییەکان، کە یاسای گەلان ئاماژەی پێداوە.

٨. گێڕانەوەی باڵوێز بۆ وڵاتی خۆی لە کاتی سەرپێچیکردنی یاساکانی رۆمادا، ئەمەش بۆ دادگاییکردنیان وسزادانیان.

## هەڵسەنگاندنی دبلۆماسی لە چاخە دێرینەکاندا:

بەگشتی دبلۆماسی لە چاخە دێرینەکاندا بەپێی رێساگەلێکی دیارکراو بەرێوەنەچووە، رێکخراو نەبووەو لە سنوورێکی بەرتەسکدا ماوەتەوە، کە چوارچێوەی دەوڵەتانی دراوسێ و دەوڵەتە هەرێمییەکانی تێنەپەڕاندووە، هەر بۆیە کاریگەرییەکی سنوورداریشی هەبووە[١].

لەگەڵ ئەوەی دبلۆماسی لە شارە یۆنانییەکاندا جۆرێك لە جێگیری و رێکخستنی بەخۆوە بینی، بەڵام سیستمی دبلۆماسی یۆنانی شکستی هێنا، بەهۆی نەبوونی یەکسانی لە سەروەریی شارە یۆنانییەکاندا لەلایەك، هەروەها بوونی جۆرێك لە پەیوەندیی ناوخۆیی لەنێوان ئەو گرووپانەی، کە

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.ن، ص٥٥.

چەند رایەڵێکی نەتەوەیی پێکەوە دەیبەستنەوە لەلایەکی تر، ئەمە وێڕای نەبوونی هێزێك بۆ ئەو رێکخستنانەی، کە دروستیانکردووە، کە بتوانێت بڕیارەکانی خۆی بەسەر ئەو شارانەدا بسەپێنێت[١].

لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین دبلۆماسی رۆلێکی گرنگی لە بەدیهێنانی ئاشتی گێڕاوە، دبلۆماتەکان پەیماننامەگەلێکیان مۆرکردووە، کە سەری کێشاوە بۆ دروستبوونی بالانسی نێودەوڵەتی، ئەمەش بەڕوونی لە دەوڵەتانی رۆژهەلات و شارەکانی یۆناندا دیاربووە[٢].

بەلام نەبوونی دبلۆماسییەتی بالانس لە سەردەمی رۆمانییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی، کە پەیوەندییان لەگەڵ گەلانی تردا پەیوەندییەکی یاسایی بووە نەك سیاسی، واتە پەیماننامەکانیان پشتی بە بنەمای یاسایی وەك "رێزگرتنی پەیمان" بەستووە، نەك بنەمای سیاسیی وەك "بنەمای بالانسی نێودەوڵەتی"، هۆی ئەمەش ئەوە بووە، کە رۆما خۆی سەروەری هەبووە بەسەر گەلانی تردا و لە بەرژەوەندی نەبووە بالانس بکات[٣].

ئەوەی لەم سەردەمانەدا جێگیر بووە، بریتیبووە لە بنەمای پارێزبەندیی کەسیی، کەسی دبلۆمات[٤].

لەکۆتایی ئەم باسەدا، بەگشتی دەتوانین بڵێین: دبلۆماسی لە چاخە دێرینەکاندا ئاست و پلە و شێوازی مومارەسەکردنی لە شوێنێك بۆ شوێنێکی

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص٥٥.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن.

(٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٥٥-٥٦.

تر جیاواز بووە، بـە ڕێسـاگەلێکی جـێگیر و گشـتگیر ر ڕێکنـەخراوە، بـەڵکو هەردەسەڵاتێك، دەوڵەتێك، ئیمپراتۆرییەتێك بە جـۆر و شـێوازێك دبلۆماسـی بـۆ بــەڕێوەبردنی پەیوەنــدیی خــۆی لەگــەڵ هێزەکــانی تــر و زیــادکردنی قەڵەمڕەوی خۆی بەکارهێناوە، واتە بە شێوازێك کە لە بەرژەوەنـدیی خۆیـدا بووبێـت، بـەو شـێوەیە جـۆری مومارەسـەکردنەکەی جێگیرنـەبووە، بـەڵکو تەنانـەت لـە چوارچـێوەی یـەك ئیمپڕاتۆرییەتیشـدا، لـە سـەردەمێکەوە بـۆ سەردەمێکی تر، گۆڕاوە.

بەشێکی زۆر ئەو مامەڵەکردنەش لەسـەر چـەند بنەمایـەك بـووە، لەوانـە: باڵانسی هێز، جۆری پەیوەندیی هێزەکانی ئەو سەردەمە دێرینانە، شـێوازی سیستمی حوکمڕانی و ئاستی دەسەڵات و قەڵەمڕەویی هێزەکانی ئەو دەمە.

## باسی دووەم: دبلۆماسیلە چاخەکانی ناوەڕاستدا

چاخەکانی ناوەڕاست چوار هێزی دیاری لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بەخۆوە بینی: دەوڵەتی عەباسی لە ڕۆژهەلات[1] و دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس[2] و دەوڵەتی بیزەنتی[3] و ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی. هەریەکێك لەمانەش چالاکیی دبلۆماسیی دیاری هەبووە، ئێمە لێرەدا باس لە دبلۆماسییەتی ئیسلامی و دبلۆماسییەتی بیزەنتی دەکەین:

---

(١) چاخی عەباسی: ئەو دەوڵەتەیە, کە لەسەر دەستی عەباسییەکان دوای رووخانی دەوڵەتی ئومەوی دامەزرا، عەباسییەکان نیسبەتیان دەگەڕێتەوە بۆ عەباسی مامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەم دەوڵەتە لە ماوەی ساڵانی (١٣٢-٦٥٦کۆچی، ٧٥٠- ١٢٥٨زایینی) حوکمڕانی کرد. مێژوونووسان جێنشینیی عەباسییان کردووە, بە سێ چاخەوە کە هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە:

أ. چاخی عەباسیی یەکەم (١٣٢-٢٣٢ ك)، کە دەسەڵات لە دەستی خەلیفەکاندا بووە.

ب. چاخی عەباسیی دووەم (٢٣٢-٥٩٠ ك)، کە دەسەڵاتی سیاسیی تێیدا گوێزرایەوە, بۆ چەند هێزێکی تری وەك بوەیهییەکان (٢٣٢-٣٣٤ ك) و تورکەکان (٣٣٤-٤٤٧ ك) و سەلجوقییەکان (٤٤٧-٥٩٠ ك).

ت. چاخی عەباسیی سێیەم (٥٩٠-٦٥٦ ك)، دەسەڵات تێیدا گەڕایەوە دەستی خەلیفەکان، بەڵام لە بەغداد و دەوروبەری.

(٢) دەوڵەتی ئومەوی، یان بەنی ئومەییە (٤١-١٣٢ك ٦٦٢-٧٥٠ز) دووەم جێنشینییە لە مێژووی ئیسلامدا، پایەتەختەکەی لە شاری دیمەشق بووە. بەڵام دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس (١٣٨-٤٢٢ك-٧٥٦-١٠٣١ز) پایەتەختەکەی لە قورتوبە بوو.

(٣) ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی، یان بیزەنتە: ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی ڕۆژهەڵاتە هەر لە کۆتاییەکانی چاخە دێرینەکانەوە, تا چاخی ناوەڕاست، پایەتەختەکەی لە قوستەنتینە بوو، خەڵکەکەی و دراوسێکانیشی بە ناوی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، یان ڕۆمانیاوە ناسیبوویان. ئەم ئیمپراتۆرییەتە درێژکراوەی راستەوخۆی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی دێرین بووە. ئێستا بیزەنتە بەوە لە ڕۆمای دێرین جیا دەکرێتەوە, کە کولتووری یۆنانی تێدا زاڵبووە و گاور بووە, نەك بتپەرست، هەروەها زۆرینەی دانیشتووانەکەی لەبری زمانی لاتینی بە زمانی یۆنانی قسەیان دەکرد.تەمەنی ئەم ئیمپراتۆرییەتە زیاتر لە هەزار ساڵ بووە، هەر لە سەدەی چوارەوە تا ساڵی (١٤٥٣).

## یەکەم: دبلۆماسییەتی ئیسلامی:

ئـاینی ئیسـلام گرنگیـی تـەواوی بـە بـواری لێکتێگەیشـتن و گفتوگـۆ و پەیوەندیی و هاوکاری داوە، واتـە لایـەنی دبلۆماسـی –گەرچـی وەکـو وشـە دبلۆماسیی زادەی کولتووری ئیسلامی نییە– وەکو ناوەڕۆك گرنگیی تەواوی پێدراوەو وشەی (الرسول) واتە (نێراو) بۆ نێردەی دبلۆماسی بەکارهاتووە.

بەگشتی، بنەماکانی ئیسلام بانگەواز بۆ ئاشتیی جیهانی دەکەن، ئـەویش لـە سـۆنگەی لاوازی و تـرس لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی دوژمنـان نییـە، بـەڵکو ئاشتییەك کە لە هێزی ڕاستی و توانای بەرپەرچدانەوەی دەسـتدرێژیکاران و سەرخستنی چەوساوانەوە سەرچاوەبگرێت. ئاشتییەك لەسەر بنەمای ڕاستی و دادوەری بوەستێت، سەربکێشێت بۆ پێکـەوەژیانی ئاشـتییانە و بێلایـەنی ئیجابییانە لەگەڵ نەتـەوە و گـەلانی تـری جیهـان، بـەڵکو دادگـەری و چـاکە لەگەڵ کردنیان[١].

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّـهُ عَنِ الَّذِينَ لَـمْ يُقَـاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَـيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّـهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّـهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (الممتحنة: ٨–٩)

واتە: خـوا قەدەغـەی ئـەوەتان لـێ ناکـات، کـە چـاکەفتاری و دادپـەروەری لەگەڵ ئـەو کەسـانەدا بکـەن، کـە جـەنگیان دژ نـەکردوون و دژایـەتیی ئاییـنیـان

---

(١) بڕوانە: خديجة النبراوي، موسوعة أصول الفكر السياسي والاجتماعي والإقتصادي، المجلد الخامس، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع والترجمة، القاهرة، ٢٠٠٤، ص ص٢٧٠١-٢٧٠٢.

نـەکردوون و لـە شـوێن و وڵاتتـان دەریـان نـەکردوون، چـونکە بەراسـتی خـوا دادپەروەرانی خۆشدەوێت. بەراستی خـوا تـەنیا قەدەغـەی ئـەوەتان لێـدەکات، کە پشتیوانیی لەوانە بکەن، کە جەنگیان لە دژی ئاییننتان بەرپاکرد و لـە شـوێن و وڵاتی خۆتان دەریان کردن و پشتیوانیی ئەوانەیان کرد، کـە لـە دەرکردنتانـدا رۆڵیـان هــەبوو، ئەوەشــی پشــتیوانییان بکــات و خۆشــی بــوێن ئەوانــە هــەر ستەمکارن. پاش هـاتنی پێغەمبـەر موحەممـەد (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) و بڵاوبوونەوەی ئیسلام و دروستکردنی کیانێکی بـەهێزی موسـڵمانان لـە مەدینـە، چـــالاکییە سیاســـی و دبلۆماســـییەکان، تەنانـــەت دروســـتکردنی وەفـــدە دبلۆماسییەکان و پەیوەندیی دبلۆماسی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، یـەکێك بـووە لە کارە گرنگەکانی پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، کـە لـە رێگەی گفتوگۆی راستەوخۆ و پەیامناردن و ناردنی وەفدی دبلۆماسـی بـۆ هـۆزو ژیــارو کیانـــەکانی دەوروبـــەر ئەنجامـــدەدرا، لـــەپێناو ناســـاندنی ئیســـلام و بانگەشـــەبۆکردنی. کـــاری دبلۆماســـی لەســـەردەمی یەکـــەمی ئیســـلامدا و دوای دروستبوونی یەکـەم دەوڵـەتی ئیسـلامی لـە مەدینـە، لـە شـێوەی نوێنەرایـەتیی دبلۆماسـیی کـاتی بـوو، کـە بریتیبـوو لـە نـاردنی نوێنــەر، یـان بـاڵوێز بـۆ بەجێگەیانـدنی کارێـك و گەڕانـەوەی بـۆ وڵاتەکـەی خـۆی. ئـەوەتا پێغەمبـەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێـت) نێـردراو و وەفـدەکانی نـاردووە بـۆ لای هەریەك لـە (نەجاشـیی پاشـای حەبەشـە، موقەوقـەس پاشـای میسـر، هیرەقـل ئیمپڕاتۆری رۆم، کیسـرای پاشـای فـارس، سـەرکردەکانی جوولەکـەی خەیبـەر، پاشاکانی عوممان و بەحرەین و یەمەن، و...هتـد)، نامەکانیشـی بـەپێی ئاسـتی بۆ نێراوەکە و قۆناغەکان گۆڕاون، بە زمانێکی رەوانی پڕمانـا و کـورت و بابـەتی و سادە نووسراون. بڕوانە وێنەی ژمارە(١).

**وێنەی ژمارە (١)**

**نموونەیەك لە نامەكانی پێغەمبەر موحەممەد**

**(دروودی خوای لەسەر بێت)**




ئەم پۆلەی یەكەم لە وەفدی دبلۆماسی ڕۆڵی نمایندەكردنیان گێڕا، وەك "نێراوی تایبەت" بۆ ئامانجێكی دیاریكراو لە كاتێكی دیاریكراودا، واتە هەستاون بە گەیاندنی پەیامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆ گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام. بۆ ئەمەش پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) نووسەری تایبەتی هەبووەو نامەكانی بە مۆری تایبەتی خۆی مۆركردووە. بەو شێوەیە لە سەردەمی پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) میكانیزم و مومارەسەركردنی دبلۆماسی، لەڕووی فۆرم و ناوەڕۆكیشەوە، پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی، تەنانەت پێغەمبەر (دروودی

خوای لەسەر بێت) لە مزگەوتەکەی خۆیدا لـە مەدینـە، شـوێنێکی تایبـەتی تەرخان کردبوو بۆ پێشوازی لە شاندە دبلۆماسییەکان[١].

پـۆلی دووەم لـە دبلۆماتکـارانی دبلۆماسـیی ئـەو کاتـەی ئیسـلام، کـاری دووەمی دبلۆماسییان راپەڕاندووە، کە بریتیبووە لە "دانوستان" بە ئامانجی ئاگربەســـت و دیلگۆڕینـــەوەو ئازادکردنیـــان و بەســـتنی رێککەتننامـــە و پەیماننامە و ئاشتیی دوای جەنگ، ئەمە وێڕای کۆکردنەوەی زانیاری لەسـەر دەوڵـەتانی تـر، شـیاوی باسـە پەیماننامـەکان مـۆری تایبـەتی پێغەمبـەری (دروودی خوای لەسەر بێت) لێدەدرا.

**کەواتە ئامانجەکانی دبلۆماسییەتی ئیسلامی بریتیبوون لە:**

١. گەیانـدنی بانگـەوازی ئیسـلام و دروسـتکردنی پەیوەنـدیی دۆسـتانە لەگەڵ گەلان و کیانەکانی تر.

٢. کۆکردنـەوەی زانیـاری و هـەواڵ لەسـەر دوژمـن و بەدواداچـوونی باڵانسی هێزی دەوڵەتانی تر و بەستنی هاوپەیمانێتیی سیاسی و سەربازی.

٣. بەڕێوەبردنی کاروباری ئازادکردنی دیل و گۆڕینەوەیان، لێکۆڵینـەوە لە گوزەرانیان.

لە هەمان کاتدا رێسای پاراسـتنی نێـردراوی بیـانی جێبـەجێ دەکـرا. لـە سـەردەمی خولـەفای راشیدینیشـدا دەزگایـەکی دبلۆماسـی بونیـادنرا، بـۆ نووسـینەوەی ئـەو نامانـەی، کـە ئاڕاسـتەی پادشـا و سـەرکردەکان دەکـرا، هەروەها بۆ راپەڕاندنی ئەرکی نوێنەری دبلۆماسی، بە واژۆکردنی بەڵگەنامەی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٢٧٣٦-٢٧٧٠.

پەیوەندیی ئاڵوگۆڕکراو، ئەمە وێڕای دروستکردنی پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ لەسەردەمی فراوانبوونی فتوحاتدا، کە لەپێناو ئاڵوگۆڕکردنی بەرژەوەندییەکان، نامەگۆڕینەوەو شاندناردنی لەگەڵ خۆیدا هێنا[١]، ئەمە دواتر لە سەردەمی جێنشینەکان و ئومەوی و عەباسییەکاندا زیاتر پەرەیسەند[٢]، تەنانەت کاتێك کە (عوسمانی کوڕی عەففان) (خوا لێی رازی بێت) بوو بە جێنشین، بڕێك پارەی لە خەزێنە (بیت المال)ی موسڵمانان بۆ خەرجیی پێشوازییکردنی نێردە دبلۆماسییەکان و مانەوەیان تەرخانکرد،تەنانەت کاتێك کە (عوسمانی کوڕی عەففان) (خوا لێی رازی بێت) بوو بە جێنشین، بڕێك پارەی لە خەزێنەی موسڵمانان (بیت المال) بۆ خەرجیی پێشوازییکردنی نێردە دبلۆماسییەکان و مانەوەیان تەرخانکرد[٣]..

لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا، (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) گرنگی بە دبلۆماسی دا، دیوانی تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە و ئەرشیفکردن و پاراستنی نامە و نووسراو و بەڵگەنامەکان دروستکرد. ئومەوییەکان ڕێزی نێردەی بیانییان دەگرت، ئەویش لەسەر ئەو بنەمایەی کە ڕێزگرتن لە نێردە، ڕێزگرتنە لە نێرەرەکەی. بۆیە کاتێك بیزەنتییەکان نێردەیەکیان بە ناوی (یوحەننا)یان لەدوای گەمارۆدانی قوستەنتینە، بۆ دیمەشقی پایتەختی ئومەوییەکان نارد، کە پیاوێکی دانا و لێزان بوو، (موعاویە) بە ئامادەبوونی

---

(١) بڕوانە: د. عدنان السيد حسين، العلاقات الدولية في الإسلام، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ط٢، ٢٠١٠، ص٢٠٥.

(٢) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٢٩-٣٠.

(٣) بڕوانە: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٥٥-٥٨.

ژمارەیەك لە گەورەپیاوانی ماڵی ئومەوی پێشوازییەکی گەورەیان لێکرد، لە ئەنجامدا گەیشتنە رێککەوتنێك کە ماوەی (٣٠) سی ساڵی خایاند. جگە لەمە، ئومەوییەکان بە شێوازێکی تایبەت پێشوازییان لە نێردەی وڵاتانی تر دەکرد، کە بەڵگە بێت لەسەر گەورەیی و پێگەی مەزنی دەوڵەتەکەیان، لە هەمان کاتدا، نێردەکە رێنمایی شێوازی بینینی خەلیفە و شوێنی دانیشتنی و جیاوك و پارێزبەندییەکانی پێدەدرا، هەروەك چۆن چاودێریش دەکرا، نەبادا سیخوڕی، یاخود هاوکاریی دوژمنان بکات،تەنانەت کاتێك کە (عوسمانی کوڕی عەففان) (خوا لێی ڕازی بێت)، بوو بە جێنشین بڕێك پارەی لە خەزێنەی موسڵمانان (بیت المال) بۆ خەرجیی پێشوازییکردنی نێردە دبلۆماسییەکان و مانەوەیان تەرخانکرد[١].

لەبەرئەوەی کەسی دبلۆمات نوێنەری سەرۆکی دەوڵەتە، لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە لەو کەسانە هەڵدەبژێران، کە پلەو پۆستێکی باڵایان هەبێت، بۆ نموونە: لەنێو داوەر و زانا و گەورە بەرپرسانی حوکومەت دیاری دەکران، وەك وەزیرو ئەمیر و سەرۆك جەنگەکان و نووسەر و پزیشك و سەرۆکی دیوانی خەلیفە، یاخود لە بازرگان و شاعیرەکان دیاری دەکران. دەسەڵاتی ئیسلامی گرنگی بە پێدانی بەڵگەنامەی تەواو بە باڵوێزەکانیان بۆ ناساندنی ناوونیشانیان و سیفەت و سروشتی کارەکانیان داوە، ئەمەش وەك پاسپۆرت و بەڵگەنامەی دامەزراندن (ورقه اعتماد)ی ئەمڕۆ وایە، کە کاری هاتوچۆی باڵوێزەکان ئاساندەکات. هەروەها باڵوێز و دبلۆماتەکان مووچەیان لە حوکومەت وەردەگرت، تەنانەت پۆشاکی تایبەتیی ئەو کارەیان دەپۆشی.

---

(١) بڕوانە: م.ن،ص ص٥٩-٦٢.

جگە لەوە کاری نێردراو و باڵوێزەکان بە تەواوبوونی ئەرکەکەیان تەواو دەبوو، هەندێکجاریش ماوەی باڵوێزخانەکە درێژدەبووەوە بۆ ماوەی شەش مانگ، واتە نێردراوی هەمیشەیی و جێگیر نەبووە، بەڵکو کاتی بووە[(١)].

لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا پەیوەندییە دبلۆماسییەکان پەرەیان سەند، ئەویش بە بەستنی پەیوەندیی سیاسیی و دبلۆماسیی لەگەڵ دەوڵەتە هاوچەرخەکانی خۆیدا، ناردنی نێردە و نێراوی دبلۆماسی و دیاریکردنی مەرجەکانیان، پەرەدان بە دیوانی تایبەت بە نووسراو و نامە و بەڵگەنامەکان، پەرەسەندنی نووسین و دانراوی تایبەت بە پەیوەندیی نێودەوڵەتی و جەنگ و ئاشتی و دبلۆماسی، دیاترینیان: کتێبی (*تأريخ الأمم والملوك*)ی تەبەری، (*كتاب السَّير الكبير*)ی شەیبانی، (*المبسوط*)ی سەرخەسی، کە بەشی دەیەمی تایبەتە بە دبلۆماسی، ئەمانەش بەشێکیان بۆ زمانە بیانییەکان وەرگێران و وەك بنەمای دبلۆماسی و دواتر بنچینەی یاسای نێودەوڵەتیی سوودیان لێ وەرگیراوە، ئەمە وێڕای ڕۆڵی (بيت الحكمة) –کە پێنجەمین جێنشینی عەباسیی (هارون ئەلڕەشید) (١٤٩–١٩٣ك) دایمەزراند و (مەئمون) پەرەی پێدا– لە گەشەسەندن و پەرەپێدانی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە سیاسەتی دەرکی، هەموو ئەمانە سەرباری پەرەسەندنی پەیوەندییە بازرگانییەکان، ئاڵوگۆڕی نوێنەری دبلۆماسی، پەرەدان بە پۆستە، پۆلێنکردنی نێردەکان، جێبەجێکردنی بنەمای مامەڵە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٥٩-٦٢.

بە هاوشێوە، داڕشتن و پەرەدان بە ڕێساکانی مامەڵە لەگەڵ نێردەکاندا و پێدانی جیاوك و پارێزبەندی[١].

لە سەردەمی (هارون ئەلرەشید)دا، هاریکاری لەگەڵ (شارلمان)ی (٧٤٢–٨١٤) پادشای فەرەنسا بۆ رووبەڕووبوونەوەی بیزەنتەهەبووە، لە ساڵی (٧٩٠)دا پەیماننامەی ڕێککەوتن و ئاشتی لەنێوان ئەو دوو هێزەدا هەبووە، ئەمە وێڕای پەیوەندی لەگەڵ (قەیسەری رۆم) لە بوارە رۆشنبیری و زانستییەکان و ئاڵوگۆڕی باڵوێز، هەروەها بەهێزکردنی پەیوەندیی دۆستانە و ماف ئاینیی مەسیحییە ئەوروپییەکان لە دەوڵەتی عەباسیدا، هەروەها لە سەردەمی جێنشین (موقتەدیر) (٢٨٢–٣٢٠ك)دا باڵوێزخانە دروستکراوەو ڕێزی تایبەتیان لە نێردراوی بیانی گرتووەو کارئاسانییان بۆ کراوە، بۆئەوەی بتوانن ئەرکەکانیان بەباشی جێبەجێ بکەن[٢].

دبلۆماسیی جیهانی ئیسلامی، پانتاییەکی جیۆپۆلەتیکیی فراوانی گرتبووەوە، لە وڵاتی "چین" لە رۆژهەڵاتەوە بۆ "ئەندەلوس" لە رۆژئاوا، و کاریگەریی لەسەر ڕێنسانسی ئەورووپی دروستکردووە بەوەی، کە کار لەسەر ئەو ڕێسایە بکەن، کە ئاشتیی بنەڕەت و بنچینەیە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، ئەمەش کاریگەری لەسەر دەرکەوتنی دبلۆماسی کرد، بە چەمکە نوێیەکەی کە بە "دبلۆماسیی کلاسیکی" ناودەبرێت[٣].

---

(١) بڕوانە: م.ن،ص ص٦٢-٧٥.

(٢) بڕوانە:م.ن،ص ص٦٦-٦٧. و: د. عدنان السيد حسين، العلاقات الدولية في الإسلام، م.س.ذ، ص٢٠٥.

(٣) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٠٥-٢٠٦.

تەنانەت چەندین ڕێسا و تێبینی دبلۆماسیی گرنگ هەن، کە موسڵمانان لە دانوسـتانەکانیاندا پشـتیان پێبەسـتوون و بـوون بـە بەشـێك لـە نـەریتی دبلۆماسیی جیهانی. دانوستانەکانیش بۆ مەبەستی وەستاندنی جـەنگ، یـان بـەرپاکردنی ئاشـتی، یـان بـەهێزکردنی پەیوەنـدیی ئاشـتییانە، یـاخود بێلایەنکردنی چەنك لایەنێك، کە ئەگەری ئەوەیان هەیە، لەبەردەم بانگەوازی ئیسلام و موسڵماناندا ببنە ڕێگر، یاخود بۆ دیلگۆڕینەوە بوون[١].

کەواتە موسڵمانان بەگشتی گرنگییان بە دانوستان و نامەناردن و نـاردنی شـاندی نوێنـەر و پەیامهـەڵگر و پرەنسـیپی ڕێزگـرتن و پاراسـتنی نوێنـەری بیانی و بنەماکانی ڕاستگۆیی و بەستنەوەی ئاکاری بەرز و مرۆیـی بـە کـاری دبلۆماسییەوە داوە، سەرباری ئەو گرنگییە زۆری بـە توانـا جۆراوجۆرەکـانی کەسـی دبلۆمـات دراوە، لـە ڕەوانبێـژی و زیرەکـی و وریـایی و زەینڕوونـی و لێهاتوویی و کارامـەیی و شـارەزایی و پاکوخـاوێنی، واتـە جەختکردنـەوە لـە مەرجەکانی دبلۆمات لەرووی روخسار و ناوەڕۆکەوە لە یەك کاتدا.

دبلۆماسـییەتی ئیسـلامیی چـەند نیشـانە و جیاکەرەوەیـەکی هەیـە، کـە دەبنـە ئـەو هێڵـە گشـتییانەی، کـە پێویسـتە دبلۆماسـییەتی ئیسـلامی لـە چوارچێوەیاندا کاربکات، دیارترینیان بریتین لە[٢]:

ڕێزگـرتنی مـرۆڤ: بـە موسـڵمان و نـا موسـڵمانەوە، پاراسـتنی مافـە بنەڕەتییەکانی، ستەملێنەکردنی و ئازارنەدانی.

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٠٨-٢١٤.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عبدالمجید محمد الأقطش و یحیی سالم الأقطش، في السياسة الشرعية، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، عمان – الأردن، ٢٠١٠، ص ص٣٦٢-٣٦٤.

أ.	دانایی له گوتاردا: دانـایی لـه وشـه و وتـه و گفتوگـۆ و دانوسـتاندا، ئاڕاستەکردنی گوتار بۆ ئەقڵ و ویژدان پێکەوە ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ﴾ (النحل: ١٢٥).

ب.	هەوڵدان بۆ دروستکردنی دۆسـتایەتی و لێبـوردەیی و خۆشەویسـتی لـەنێوان گەلانـدا: سـووربوون لەسـەر نزیککردنـەوە و دۆسـتایەتیی نێـوان تاکـەکان و گـەلان و دەوڵـەتان و دوورخسـتنەوەی نـاکۆکی و ئـاژاوە و رقـو کینە.

ج.	چـاکەکردن لەگـەڵ چـاکەکاراندا و مامەڵـەی چـاکە بەهاوشـێوە و چاکتریش لەگەڵ چاکەکاراندا: ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾ (الـرَّحمن: ٦٠).

د.	پابەندبوون بە بەڵێن و ڕێککەوتننامە و پەیماننامەوە: واتە ڕێزگـرتن لـە ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییـە دووانـەیی و کۆمەڵییەکانـەوەو پابەنـدبوون پێیانەوە. ﴿..وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ ۖ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾ (الإسراء:٣٤)

له هەمان کاتـدا، دبلۆماسـییەتی ئیسـلامی گرنگییـەکی زۆری بـە کەسـی دبلۆمات و تایبەتمەندییەکانی داوە، بۆیە چەندین مـەرج و تایبەتمەنـدیی بـۆ بوون بە دبلۆمـات دانـاوە، لێـرەوە دەتوانرێـت دیـارترین تایبەتمەندییـەکانی دبلۆماسییەتی ئیسلامیی بەم شێوەیە دیاریی بکرێت[١]:

أ.	پێویستە کەسی دبلۆمـات خـاوەن کەسـایەتییەکی دیـار بێـت و خـاوەن ژیری و لێهاتووی و جورئەت بێت، له هەمان کاتدا هـێمن و لەسـەرخۆ و رۆشنبیر بێت، و توانای یەکلاکردنەوەی بڕیاری هەبێت.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٢٩-٣٤.

ب. گرنگییەكی تەواوی بە پاكوخاوێنی و جلوبەرگ و قـەدو بـاڵاو جەسـتەی كەسی دبلۆمات داوە.

ج. رێزگــرتن لــە نوێنــەری وڵاتــان یەكێكــە لــە پرنســیپە گرنگــەكانی دبلۆماسـییەتی ئیسـلامیی. ئیسـلام رێـزی تـەواوی لـە نێراوەكـان (دبلۆماتەكان) گرتووە، ئاساییشی بۆ رەخساندوون، تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دیاری پێ بەخشیون و ئـەركی حەوانـەوەو بەجێهێشـتنی خـاكی ئیسـلامییانی گرتووەتـە ئەسـتۆ، فەرمانیشـی بـە شوێنكەوتووانی كردووە، كە لەسەر رێبازەكەی بەردەوام بن.

د. پرەنسـیپی پاراسـتنی نوێنـەری دەوڵـەتان گرنگیـی تـەواوی پێـدراوە. هەروەها سیستمێكی تایبەت بۆ پێشـوازیكردن لـە بـاڵوێزی دەوڵـەتانی بیـانی دانـراوە، رێـوڕەسمی تایبـەتی هـەبووە بـۆ پێشـوازیكردنیان، بەشێوەیەك كە لەگەڵ پێگـەی ئـەو دەوڵەتـەدا گونجـاو بووبێـت. ئەمـە وێڕای ئەوەی كە باڵوێزو ستافەكەشی لە هەموو جۆرە باجێكی گومرگی بەخشراون و رێـز لـە مومارەسـەكردنی سـرووتە ئاینییـەكانیان گـیراوە، ملكەچ نەبوون بۆ دادگای تاوان(١).

ه. دیارترین ئەو خاڵانەی كـە دبلۆماسـیەتی ئیسـلامی پـێ جیادەكرێتـەوە بریتین لە پابەندبوونی بەو پرەنسیپە ئەخلاقی و مرۆییانەی، كـە ئـاینی ئیسـلام هێناویـەتی و جیاكردنـەوەی ئـەخلاق و سیاسـەت لـە مامەڵـەی نێودەوڵەتیدا رەتدەكاتەوە.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٥٦-٥٨.

و. جگه لەمانە، گرنگی دراوە بەو پرنسیپەی، کە بالۆیز نابێت دەست وەربداتە کاروباری ئەو دەوڵەتەی بۆی نێردراوە، جا ئەگەر بالۆێزەکە نێردراوی دەوڵەتی ئیسلامی بێت، یان لە دەوڵەتانی ترەوە بۆی نێرا بێت.

لێرەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە، کە ئیسلام گرنگی بە بواری دبلۆماسیی داوە و ئامرازە دبلۆماسییەکانی بڵاوکردنەوەی ئیسلامیش بریتیبوون لە: (نێراوەکان، نووسراوە دبلۆماسییەکان، دانوستان و دامەزراوەی دبلۆماسی)[(١)]. ئەوەتا لە سۆنگەی ئەو پەیوەندییە دبلۆماسییەی، کە موسڵمانان لەگەڵ نەتەوەو دەوڵەت و کیانەکانی تردا ئەنجامی داوە دەتوانرێت بوترێت، کە چەند داهێنانێکی دبلۆماسییان کردووە، لە چەند بوارێکی جیاوازدا، دیارترینیان: (بواری دانوستان، نامەئاڵوگۆڕکردن، ناردنی نێراو، پابەندبوون بە بەڵێن و پەیمانەوە، پەیوەندیی بازرگانی و کولتووری)[(٢)].

## دووەم: دبلۆماسییەتی بیزەنتی:

لاوازیی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، سەریکێشا بۆ ئەوەی لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا ببێت بە دوو بەشەوە: ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیی ڕۆژهەڵات)، کە قوستەنتینە پایتەختی بوو، ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیی ڕۆژئاوا کە ڕۆما پایتەخی بوو. بیزەنتییەکان

---

(١) بۆ زانیاریي زیاتر بڕوانە: د. سهیل حسین الفتلاوي، م.س.ذ، ص٩ ص٤٣-٥٤.

(٢) بڕوانە: د. عدنان السید حسین، العلاقات الدولیة في الإسلام، م.س.ذ، ص ص٢٠٥-٢٠٦.

بەهۆی ناتەبایی نێوخۆییەوە نەیاندەتوانی هێزێکی سەربازی وا بونیاد بنێن، کە ئاسایشیان بۆ فەراهەم بکات، لە مەترسیی دەرەکی بیانپارێزێت، لە هەمان کاتدا کەوتبوونە نێوان دەوڵەتی فرەنجە لە رۆژئاواوە (بە سەرکردایەتیی (شارلمان) بە ویستە فراوانخوازییەکانییەوە)و دەوڵەتی عەباسی لە رۆژهەڵاتەوە، کە لەوپەڕی بەهێزییدا بوو، ئەمە وێڕای بوونی هۆز و گەلانی سەربەخۆ لەنزیك سنوورەکانییەوە، کە بۆ سەرکردەکانی بیزنتە جێی مەترسی بوون. بۆیە بیزەنتییەکان دبلۆماسییان وەك ئامرازێك بۆ مانەوەیان وەك دەوڵەتێکی هەژموونکار بەکارهێناوە. لەبەرئەوە ئیمپڕاتۆرە بیزەنتییەکان چەندین شێوازی فرۆفێڵیان پەرەپێدا، لە بواری دبلۆماسییەتەکەیاندا، کە بەکاریان دەهێنا بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕییەی، کە چەك هەیەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسیی گەلە بەربەرییەکانی دەوروبەریان، کە بەردەوام مەترسیی داگیرکردنی خاکەکەیان لێ دەکرا. بۆیە هەوڵی دووبەرەکیی دوژمنەکانیان دەدا بە سێ رێگەی سەرەکی[1]:

١. لاوازکردنی بەربەرییەکان بە نانەوەی ئاژاوە و ناکۆکی لەنێوانیاندا.
٢. کڕینی دۆستایەتیی هۆز و گەلانی دراوسێیان بە دیاری و مەرایی و بەرتیل.
٣. بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی لەنێو بێباوەڕانیاندا.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٥٨-٥٩. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٧٩-٨٠.

بەم شێوازە (جۆستنیان) – کە لە ساڵانی (٥٢٧–٥٦٥ز) حوکمڕانی کرد– توانیی قەڵەمڕەوی خۆی بەسەر سودان و وڵاتانی عەرەب و حەبەشەی ئەوکاتەدا بسەپێنێت، هەروەها توانیی هۆزەکانی دەریای سوور و قەوقاز لە سنووری خۆیاندا رابگرێت[١].

بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە پێویستی بە کەسانی راهێنراو و شارەزا هەبوو لە بواری دانوستاندا، هەروەك چۆن پێویستی بە دەزگایەك هەبوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دەوروبەرو تەنانەت زانیاری لەسەر شێوازی پەیوەندییەکانیان و ئاراستەی بڕیاردانیان و نزیکبوونەوەیان و هاوپەیمانێتییان، بۆئەوەی، کە پێشوەخت کاری پێویست بۆ دژایەتیکردنی ئەنجامبدەن[٢]، بۆیە دەزگای کاروباری دەرەکییان پێکهێنا و لەگەڵ دوو ئەرکە سەرەکییەکەی دبلۆماسییدا (کە نمایندەییکردن و دانوستانە) ئەرکێکی سەرەکیتریان بۆ زیادکرد، کە بریتیبوو لە کۆکردنەوەی زانیاری.

ئیمپراتۆرە بیزەنتییەکان چەند باڵوێزێکیان بۆ ئەو مەبەستە دەناردە دەرەوە و لە پایتەختی دەوڵەتانی دوژمن ماوەیەك دەمانەوە، بەشێوەیەکی رێکوپێك راپۆرتی خۆیان دەنارد بۆ بەشێکی تایبەت بە کاروباری دەرەکی لە قوستەنتینەی پایتەختی بیزەنتییەکان. هەر لەوێ ڕاپۆرتەکان ووردبینییان بۆ دەکرا و لەسۆنگەیانەوە سیاسەت دادەڕێژرا، دواتر رێنمایی تایبەت دەنێرا بۆ باڵوێزەکان، کە ئیشی لەسەر بکەن لە مامەڵەکردنیاندا. بەم شێوازە "جۆستنیان" توانیی قەڵەمڕەوی ئیمپڕاتۆرییەتی بیزەنتە بگەیەنێتە سوودان

---

(١) د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص٨٤.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص٥٩.

و بەشێك لە دورگەی عەرەبی و حەبەشە، هەروەك چۆن توانی رێ لە هێرشی هۆزەکانی دەریای رەش و دەریای قەزوین بۆ سەر ئیمپراتۆرییەتەکەی بگرێت، هەروەها هەمان سیاسەتی گرتەبەر، کاتێك مەترسیی بولگار و مەجەر و رووسیا رووی تێکردن[١].

**دەتوانین دیارترین تایبەتمەندییەکانی دبلۆماسییەتی بیزەنتی لەم چەند خاڵەدا کورتبکەینەوە[٢]:**

١. شێوازگەلێکی نوێ زاڵبوو بەسەر کاری دبلۆماسیدا، کە پشتی بە درۆ و دەلەسە و لاڕێبردن بەستبوو، فروفێڵیش بووبوو بە رەگەزی سەرەکیی دبلۆماسییەتی بیزەنتی.

٢. ئەرکی سەرەکیی نێراوە دبلۆماسییەکان بریتی نەبوو لە هێنانەدیی ئاشتی، بەڵکو بریتیبوو لە بڵاوکردنەوەی ئاژاوە و چاندنی تۆوی رق و کینە لەنێوان هۆزەکانی لایەنەکانی تر.

٣. دبلۆماتەکان لەگەڵ کارەکەی خۆیاندا کاری بازرگانیشیان دەکرد، بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکی دارایی باڵوێزەکانیش بەڕێوەببەن.

٤. بیزەنتییەکان هەموو ئەو نێراوە دبلۆماسیيانەیان خستبووە ژێر چاودێرییەوە، کە لە دەوڵەتانی ترەوە بۆ لایان نێررابوون، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە ئەوان وەك سیخوڕ سەیری دبلۆماتە بیانییەکانیان دەکرد.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٥٩-٦٠. و: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٢٤-٢٦.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هەمان دوو سەرچاوەی پێشوو. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٨١-٨٢.

٥. گرنگیی زۆریان بە لایەنی سایکۆلۆجی دەدا، لەپێناو کارکردن لەسەر لایەنی دەروونیی باڵوێزی دەوڵەتان و ترساندنیان لە رێگەی نمایشکردنی عەرشێکی بزواو و نمایشی سەربازیی گەورەو ئیقناعکەرەوە، لە هەمان کاتدا.

٦. پەیوەندیی هاووڵاتیانی خۆیانیان بە باڵوێزە بیانییەکانەوە قەدەغەکردبوو.

٧. سەردەمی ئەوان بە سەرەتای سەردەمی باڵوێزی هەمیشەیی دادەنرێت، چونکە باڵوێزەکانیان بۆ ماوەیەکی زیاتر لەوەی، کە باوبوو لە لای دەوڵەتانی بیانی دەمانەوە.

٨. مەرجەکانی باڵوێز لای ئەوان بریتی نەبوو لە وتارزانی و رەوانبێژی و دەنگی بەرز و قسەزانین، وەك ئەوەی کە لای دبلۆماسییەتەکانی پێشوو هەبوو، بەڵکو مەرجەکانی دبلۆمات مەرجگەلێك بوون، کە لەگەڵ ئەو رۆڵە نوێیەدا بگونجێن کە بەو باڵوێزانە دەسپێرا، کە بریتیبوون لە توانای تێبینیکردنی ورد و دروست بۆ کاروبارەکان و لێکدانەوەی دروست بۆ رووداوەکان و ئامادەکردنی راپۆرتی ورد و بوونی کەسایەتییەکی خۆبەرەپێش و خۆخۆشەویستکەر.

٩. بە سەرەتای دەرکەوتنی دبلۆماتی پسپۆڕ دادەنرێت، دوای ئەوەی کە پێشتر ئەم کارە بە میراتگری، یان بەبێ پێشینە بوو.

بەو شێوەیە بیزەنتییەکان ئەزموونێکی نوێیان پێشکەش بواری پراکتیکیی دبلۆماسی کرد.

لێرەوە دبلۆماسی، بەپێی گۆڕانکارییەکان و گۆڕانی هێز و باڵانسی هێزەکان و جیهانبینییە جیاوازەکان، قۆناغێکی نوێی بڕی، دبلۆماسی

لەلایەکەوە بە ویست و ئامانجی زلهێزەکانی ئەو سەردەمە و بە میکانیزمی جیاواز و شێوازی جۆراوجۆر پراکتیزە دەکرا، لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی دبلۆماسییەتی ئیسلامی بە کۆمەڵە بنچینەو بناغەیەکی گرێدراو بە لایەنی ئەخلاقییەوە، موژدە بوو بە هاتنەکایەی جۆرێك لە دبلۆماسییەت، کە تێیدا دبلۆمات رێزی کەسی پارێزراوبێت و شێوازی کارەکەشی بە کۆمەڵێك پرنسیپ و بەها رێکبخرێت، کە هەم مافی دبلۆماتکاری تێدا پارێزراوبێت، هەم بتوانێت کارەکانیشی بەباشی بەرێوەببات.

لەبەرانبەردا، لە سایەی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتیدا، ئەم قۆناغە دبلۆماتی پرۆفیشناڵی پەروەردەکرد، کە تێیدا دبلۆمات لەسەر بنەمای سیخوڕی و فرووفێڵ و چاوبەستکردن، بە کارو چالاکی و راپۆرتەکانی و بە هەوڵی ئاژاوە و دووبەرەکینانەوە لەلای بەرانبەر، دبلۆماسییەتی بۆ قەرەبووکردنەوەی لاوازیی لایەنی سەربازی بەکاردەهێنا، ئەمەش لە دەرەنجامدا شوێنەواری نێگەتیڤی لەسەر کاری دبلۆماسیی و ناو و ناوبانگی دبلۆمات بەجێهێشت.

## باسی سێیەم: دبلۆماسیی نوێ

لە کۆتاییەکانی چاخەکانی ناوەڕاستدا نموونەگەلێکی نوێ لـە دبلۆماسـی دەرکەوتن، کە هەندێکیان بەجۆرێك لـە جۆرەکـان درێـژکراوەی قوتابخانـەی دبلۆماسیی بیزەنتینین، هەندێکی تریشـان ئاڕاسـتەیەکی جیاوازیـان هـەبوو. وێنـە بـۆ ئـەم دوو نموونەیـە بـە دبلۆماسـییەتی ئیتـاڵی و دبلۆماسـییەتی فەرەنسی دەهێنرێتەوە[١].

دبلۆماسیی نوێ –کە هەندێك لە پسپۆڕان بە دبلۆماسیی کلاسیکی نـاوی دەبـەن– لـە چـاخی ڕێنسانسـەوە دەسـت پێـدەکات و تـا جـەنگی یەکـەمی جیهانی بەردەوام بـووە، بـەوە جیادەکرێتـەوە، کـە هەمیشـەیی و جـێگیرە، هـــەروەها بـــەهۆی بـــەردەوامیی ئـــاڵوگۆڕکردنی بـــاڵوێز و نێـــراوە هەمیشەییەکانەوە دبلۆماسی بوو بە پیشەو بوارێك، کە پشت بە ڕێساگەلێکی جێگیر ببەستێت.

هەندێك لە مێژوونووسان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە دبلۆماسی بە چەمکە نوێیەکـەی لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی پـازدەوە سـەریهەڵداوە، کاتێـك کـە فەرمانڕەوای ئیمارەتی "میلانۆ" لە ساڵی (١٤٥٥) یەکـەم بـاڵوێزی نـارد بـۆ "جەنەوا"، بۆئەوەی بەشێوەی بەردەوام تێیدا بمێنێتەوە. ئەم مێژووەش بە سەرەتای دبلۆماسیی کلاسیکی دادەنرێت، کە تـا جـەنگی یەکـەمی جیهـانی بەردەوام بوو. بەڵام ناوەڕۆکی ئەم دبلۆماسـییە کلاسـیکییە لـە تێگەیشـتنی دەوڵەتـــە ئەورووپییـــەکان بـــۆ ڕۆڵـــی دەوڵـــەت و سروشـــتی پەیوەندییـــە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی دبلۆماسییەتی ئیتاڵی و فەڕەنسی، بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٦٠-٦٦.

نێودەوڵەتییەکان سەرچاوەی گرتبوو، کە دەوڵەت سروشتێکی دوژمنگەرانەو ویستی فراوانبوونی بەردەوامی هەیەو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش پەیوەندی هێزگەلێکی ململانێکارن، بۆ زیادکردنی هێز و قەڵەمڕەوی خۆیان هەموو توانا و ئامرازێکیان بەکاردەهێنن. بۆیە نمایشی هێزی سەربازی، سیخوڕی، پڕوپاگەندەو نهێنیگەری لە دیارترین ئەو ئامرازانە بوون، کە دبلۆماسیی کلاسیکی لەسەر وەستابوو. واتە باوەڕی بە سیاسەتی هێز هەبوو. ئەو سیاسەتەی، کە ڕێگەی خۆشکرد بۆ لەدایکبوونی سیستمی باڵانسی هێز، کە ئامرازێکی دیاری دبلۆماسیی کلاسیکی بوو[1].

ڕووەکانی دەرکەوتنی دبلۆماسیی هەمیشەیی دوای پەیماننامەی ویستڤالیا (١٦٤٨) بەڕوونی دەرکەوتن، ئەو پەیماننامەیەی کە کۆتایی بە جەنگێکی سی ساڵە هێنا، بنەمای باڵانسی هێزی بۆ یەکەمجار هێنایەکایەوە، ئەمەش سەریکێشا بۆ ئەوەی دەوڵەتە کێبڕکێکارەکان لەپێناو چاودێریکردنی یەکتری، باڵوێز و نێراوی هەمیشەیی و جێگیر دروستبکەن.

کاتێکیش بۆرجوازییەکان هاتنەسەر دەسەڵات، بەتایبەت دوای شۆڕشی فەڕەنسی، ئاڵوگۆڕکردنی دبلۆماسیی هەمیشەیی، بوو بە مافێکی دانپێدانراو بۆ هەموو دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری. تا وایلێهات هەنگاونرا بۆ بەیاساییکردنی ئەو بنەماو ڕێسایانەی کە پارێزبەندی و ئەرك و ماف نوێنەرە دبلۆماسییەکان دیاری دەکەن، ئەویش لەڕێگەی کۆنگرەی ڤیەننای ساڵی (١٨١٥) و ئیکس لاشاپیل لە ساڵی (١٨١٨) کە لەنێوان دەوڵەتە ئەورووپییە

---

(١) بڕوانە: د. عدنان السيد حسين، نظرية العلاقات الدولية، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ط٣، ٢٠١٠، ص ص١٣٠-١٣١.

گەورەکاندا مۆرکران، کە یەکەمیان تەواوکەری دووەمیان بوو[١]، تێیاندا باس لە ڕێساکانی ریزبەندی و پێشەندیی نێراوە دبلۆماسییەکان کرابوو، کە پێشتر دەبوونە جێی مشتومڕ و ناکۆکیی نێوان دەوڵەتان[٢]. تا کۆتاییەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمیش کار بەو ڕێسایانە کرا، کە کۆنگرەی ڤیەننا هێنابووی.

***ئەم سەردەمە دوو قۆناغی بڕیوە[٣]:***

**یەکەم/ قۆناغی ئامادەکردنی پیشەی کاری دبلۆماسی**: کە تا کۆنگرەی ڤیەننا بەردەوام بوو، چونکە تا ئەو کاتە دبلۆمات وابەستە بوو، بە کەسی حوکمڕانەوە زیاتر لەوەی پەیوەست بوو بە سەروەریی دەوڵەتەکەیەوە، ئەرکی سەرەکیی چاودێریکردن بووە لەپێناو پاراستنی بالآنسی هێز، واتە نەبووە بە پیشەیەکی سەربەخۆ و بەگومانەوە سەیری کراوە و زۆرجار لە چوارچێوەی ململانێکاندا مافی خوراوە و ڕێساکانی مەراسیمی موجامەلەو ریزبەندی دیاری نەکراوە.

**دووەم/ قۆناغی جێگیرکردنی ڕێساکانی کاری پیشەی دبلۆماسی:** کە لە پەیماننامەی ڤیەنناوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی بەردەوام بوو، ڕێساکان لەم قۆناغەدا بەرەو ئەوە هەنگاویان نا، کە ببن بە ڕێساگەلێکی فەرمانکەرو

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە هەردوو ڕێککەوتننامەکە و هۆکار و لێکەوتەکانیان، بڕوانە: د. ئەحمەد نەقیب زادە، مێژووی دیپلۆماسی و پێوەندییە نێونەتەوەییەکان (١٦٤٨-٢٠٠٤)، وەرگێڕانی: مستەفا مەعروفی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٧-٧٨.

(٢) بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص٩٣.

(٣) د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص١١٠.

پابەندکـەر، بەتایبـەت سـەبارەت بـە پـۆلێنکردن و ریزبەنـدکردنی نوێنـەرە دبلۆماسییەکان و هاتن و جێهێشتنی دبلۆماتەکان.

کەواتە دبلۆماسی لەم قۆناغەدا بـوو بـە پیشـەیەکی پسـپۆڕی، بەتایبـەت دوای گواســتنەوەی ســەروەری لــە فەرمانڕەواکانــەوە بــۆ دەوڵــەتان، نوێنەرایـەتیکردن لـە نوێنەرایـەتیکردنی فـەرمانڕەواوە بـۆ نوێنەرایـەتیی دەوڵەت، واتە دبلۆماتەکان بوون بە بەشێك لە فەرمانبەرانی دەوڵەت، جۆرێك لـە سـەربەخۆییان بـۆ دروسـتبوو، هـەروەها بـوون بـە خـاوەنی جیـاوك و پارێزبەندیی دبلۆماسی، بەتایبەت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە[١].

بەڵام ئەم قۆناغـە بـە قۆنـاغی دبلۆماسـیی نهـێنی ناسـراوە، چـونکە لـەو کاتەدا دەوڵەتان لەپێناو ململانێی داگیرکاری و سەپاندنی قەڵەمڕەوی خۆیان پیادەیان دەکرد.

**دەتوانین تایبەتمەندییەکانی دبلۆماسیی نوێ (کە هەندێك لە پسپۆڕان بە دبلۆماسیی کلاسیکی ناوی دەبەن) لەم چەند خاڵەدا کورتبکەینەوە[٢]:**

١. **سەبارەت بە نێراوە هەمیشەییەکان:** لە سەدەی پانزەوە دەوڵەتـە ئەورووپییەکان نێراوی هەمیشەییان بۆ یـەکتر دەنـارد، ئەمـەش فراوانبـوونی هەندێك لە رێساکانی مامەڵەو نوێنەرایەتی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

٢. **سـەبارەت بـە پارێزبەنـدی:** گرنگـی بـە دانـانی رێسـاگەلێك بـۆ پارێزبەندی و مافی دبلۆماسیی، بۆ کەسانی دبلۆمـات درا، لـەپێناو پاراسـتنی ژیان و پیشەکەیان. بۆ نموونە: (ملکەچنەبوون بـۆ دادگـای نـاوخۆیی، رێـزی

---

(١) م.ن، ص ص٤٥-٤٦.

(٢) م.ن، ص ص١١٦-١٢١.

باڵوێزخانە وشوێنەکەی، مافی پەنابەرێتی). جگە لەمە لەسەدەی هەژدە بە دواوە –کاتێك بڕیاردرا دبلۆمات خێزانەکەی لەگەڵ خۆی ببات– پارێزبەندی درێژبوویەوە بۆ خێزانی باڵوێز و ستافی باڵوێزخانەکە.

٣. **هەڵبژاردنی باڵوێزەکان:** پێشتر هەڵبژاردنی باڵوێز و نێراوە دبلۆماسییەکان، لەسەر بنەمای تیرە و خزمایەتی بوو، هەروەها پێویستبوو لەسەر ئەو کەسەی ئەو ئەرکەی پێدەسپێرا، کە چەند تایبەتمەندییەکی گرنگ و باشی تێدابێت، لە زیرەکی و رۆشنبیریی فراوان و هۆشمەندی و زمانپاراوی و لێزانی، بەڵام بەهۆی پەرەسەندنی دبلۆماسی و گواستنەوەی بۆ قۆناغی دبلۆماسیی هەمیشەیی و زیادبوونی تێچوو و خەرجیی نێراوە دبلۆماسییەکان لەلایەك و لاوازیی هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندن لە لایەکی تر، ئەندامانی خێزانە دەوڵەمەند و خانەدانەکان خۆیان لە ئەرکی لەئەستۆگرتنی باڵوێزخانەو نێراوەکان دەدۆزییەوە، بەتایبەت کە خەرجیی دارایی خۆی و ستافەکەشی لەئەستۆ دەبوو، بۆیە هەندێك دەوڵەت، لەوانە (بوندوقیە) هەندێك لە خانەدانەکانی بەزۆر ناچاردەکرد، کە ئەو ئەرکە بگرنەئەستۆ، هەرکەسێك رەتی بکردایەتەوە غرامەی دارایی بەسەردا دەسەپێنرا. بەڵام لە سەدەی شازدەوەو لەگەڵ پەرەسەندنی کاری دبلۆماسی و زیادبوونی ژمارەی باڵوێزخانە هەمیشەییەکان، وایلێهات باڵوێزەکان لەنێو نووسەرانی دەوڵەت و فەرمانبەرەکانیدا هەڵدەبژێران، وەك: (دانتی) و (میکیاڤیلی)، پاشان وایلێهات لەنێو دادوەر و پارێزەرەکاندا هەڵدەبژێران. بەڵام لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا جارێکی تر باڵوێزەکان لەنێو خانەدانەکاندا هەڵدەبژێران، بەڵام مافی هەڵبژاردنی پایەتەختە

گرنگەکانی وەکو پاریس و لەندەن و رۆما و مەدرید و ڤیەننایان پێدەدرا. بۆ ئەمەش هەولاتیبوون بە مەرج دانەدەنرا.

٤. **ئەرکی دارایی:** پاش ئەوەی ئەرکی دارایی باڵوێزخانە لەسەر شانی باڵوێز بوو، لە سەدەی پازدەوە ئەو ئەرکە بە نەریت گوێزرایەوە بۆ دەوڵەتی پێشوازیکەر (دەوڵەتی میواندار) بە ئەرکی دارایی باڵوێزەکانیشەوە، ئەمەش بۆ سووککردنی ئەرکەکەیان و هاندانیان بوو، بەلام زۆربوونی باڵوێزخانە هەمیشەییەکان وایکرد، لە سەدەی حەڤدەوە رێسایەکی نوێ پیادەبکرێت، کە بریتی بوو لەوەی تەنها خەرجیی باڵوێزانی سەروو ئاسایی (السفراء فوق العادة)[١] لە کاتی گەیشتنیانەوە تا پێشوازیکردنیان لەلایەن پاشاوە بگیرێتەئەستۆ، ئەم خەرجییەش باڵوێزە ئاساییەکانی نەدەگرتەوە.

٥. **دبلۆماسیی لووتکە:** لەم قۆناغەدا دبلۆماسییەتی لووتکە بڵاوبووەوە، کە لە شێوەی چاوپێکەوتن و کۆبوونەوەی پاشا و میرەکاندا ئەنجامدەدرا، بۆ تاوتوێکردنی بابەتە ئاڵۆزەکان. بەلام ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە بە جۆرێك لە ترس و دڵەڕاوکێوە ئەنجامدەدرا، هەرلایەك لەوە دەترسا گەر لە خاکی بەرانبەردا ئەنجامبدرێت دەستدرێژییان بکرێتە سەر،

---

(١) بەخشینی نازناوی سەرووئاسایی بە باڵوێز تەنها بۆ جیاکردنەوەی نێراوە کاتییەکان و نێراوی شەرەف و دەستە دانوستانکاری تایبەتەکان بووە، کە ئەو کەسانە لەبری نێراوە هەمیشەییەکان سەرۆکایەتییان کردووە، دواتر نەریتەکە وا هات, کە باڵوێز نازناوی (سەروو ئاسایی) لە نوێنەرایەتییە هەمیشەییەکانیشدا وەربگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە جیاوێکیشی لەسەر وەربگرێت، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ماددەی سێیەمی رێککەوتننامەی ڤیەننا هەر جۆرە پێشکەوتن و پێشبەندییەکی بۆ ئەوانە قەدەغە کرد, کە نازناوی (سەروو ئاسایی) وەردەگرن، کەواتە باڵوێزەکان پلەیان هاوتایە، جا هەر جۆرە نازناوێکی تایبەتیشیان هەبێت. د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، الدليل الدبلوماسي، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠١٥، ص٦٣.

بۆیە زۆرجار لەنێو بەلەمێکی گەورەدا، لە ناوەڕاستی رووبارێکدا ئەنجامدەدرا، کە لەنێوان دەوڵەتی هەردوولادا بێت.

٦. **مەراسیم و پێشبەندی:** رێساکانی مەراسیمی پۆلێنکردن و ریزبەندی و پێشخستنی باڵوێزەکان، دوای ئەوەی ئالۆزی و ناکۆکی لەسەر دروستدەبوو، لە کۆنگرەی ڤیەننا (١٨١٥)دا دیاریکران.

٧. **دبلۆماسیی دووانەیی نهێنی:** لەبەرئەوەی دبلۆماسی سیفەتێکی دووانەیی هەبوو، واتە لەنێو دوو دەوڵەتدا ئەنجامدەدرا، و پەرەسەندنەکان وایکرد کێبڕکێی نێوان دەوڵەتان گەرمتر بێت، بەتایبەت دوای پرۆسە کۆلۆنیالییەکان، ئەمەش وایکردبوو دبلۆماسییەت ببێت بە کارێکی نهێنی، بەتایبەت لە دانوستانەکان و رێککەوتننامەکاندا. ئەمەش وایکرد هەولێکی زۆر بدرێت بۆ دەستخستنی زانیاری بە بەرتیل و سیخوڕی، هەروەك چۆن دیاردەی درۆ و دووڕوویی لە کاری دبلۆماسییدا بڵاوبوویەوە، تا وایلێهات باڵوێزی بوو بە پیشەیەك، کە لەسەر رووپامایی و درۆ وەستابوو، هەروەك چۆن لەسەدەی حەڤدەدا (**هنری وتۆن** Henry Wotton)ی دبلۆمات، لە سەردەمی شاژنە ئیلیزابیس لەپێناسەی باڵوێزدا دەڵێت: **"باڵوێز پیاوێکی ئەمینە، نێراوە بۆ درۆکردن لە دەرەوەی دەوڵەتی خۆی لەپێناو بەژەوەندیی نیشتمانەکەیدا"**. هەر بۆیە (**ڤۆڵتێر**) لەسەدەی هەژدەدا دبلۆماسیی بە **"سیخوڕیی شەریف"** وەسفدەکرد، چونکە پەیوەندیی پێوەکردنیان قەدەغە بووە، تەنیا بۆ بەرپرسانی پەیوەندیدار نەبێت[١]. تەنانەت گەشتبووە ئاستێك (ئۆتۆ ڤۆك بسمارك) (١٨١٥–١٨٩٨) —کە سەرپەرشتی یەکگرتنەوەی ویلایەتە ئەڵمانییەکان و دامەزراندنی ئیمپڕاتۆرییەتی ئەڵمانی کردووە و لە ساڵی

---

(١) وەرگیراوەلە: د.علي حسين الشامي، م. س.ذ، ص١٢١.

(١٨٧١) بـووه بـه یەكـەم راوێـژكاری ئـەڵمانی، بالأنسـی هێـزی لـە ئـەورووپا بـەكارهێنا– لـە وتەیەكیـدا وتوویـەتی: "باشـترین رێگـە بـۆ خەڵەتانـدن و شاردنەوەی راستی، وتـنی راسـتییە". جگـە لـەوە، لـە (بـەریتانیا)ش لـە سـاڵی (١٦٥٣) یاسـایەك پەسـەندكرا، كـە تێیـدا هـاتووە: نابێـت هـیچ پەرلـەمانتارێك گفتوگـۆ، یـان پەیوەنـدی لەگـەڵ بـاڵوێزی دەوڵـەتێكی بیـانی ببەسـتێت، بـە پێچەوانەوە كورسییەكەی لە پەرلەمان لەدەست دەدات[١].

بەڵام دواتر خەڵكی بۆی روونبـووەوە، كـە لـە دوورمـەودادا دەسـتپاكی و ئـەمینی، نـەك فڕۆفێـل، كاریگـەرترە بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـەكان، جـا ئـەو دەستكەوتە كورتمەودایانەی، كـە دەكرێـت بـە دووڕوویـی و فڕوفێـڵ دەسـت دەكەون، هەرچیەندێك بـن. گـرنگترین دەسـتكەوتێكیش كـە لـە دبلۆماسـیی كلاسـیكیدا پێشكەشـكرا ئـەوەبوو، كـە دبلۆماسـییەت بـەهۆی پەیماننامـەی ڤیەنناوە بەشدارییەكی گرنگی كرد، لە هێنانەكایەی سەردەمێكی ئاشـتی لـە ئـەورووپا، كـە لـە شـێوەی زیادەڕۆییـدا پێـی دەوترێـت "سـەدەی ئاشـتی" لەنێوان سالانی (١٨١٥–١٩١٤) [٢].

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٢١.

(٢) بڕوانە: برایان وایت، م. س، ذ، ص ص٥٣١-٥٣٢.

## باسی چوارەم: دبلۆماسیی هاوچەرخ

جەنگی یەکەمی جیهانی و ئەو رووداوانەی لێی کەوتنەوە، سەردەمێکی نوێیان لە پەرەسەندنی دبلۆماسیی هێنایە کایەوە، بوون بە وێستگەیەك بۆ گواستنەوە لە رێساگەلێکی کلاسیکییەوە بۆ رێساگەلێکی نوێ لە بواری دبلۆماسییدا، واتە دبلۆماسیی لە پیشەیەکی کەسی و ئۆرستۆکراسی و نهێنییەوە هەنگاوی نا، بەرەو دبلۆماسییەکی ئاشکرا و پەرەیسەند، بەتایبەتی لەدوای دەرکەوتنی (رووسیا)ی سۆشیالیستی و رەتکردنەوەی رێککەوتننامە نهێنییەکانی سەردەمی قەیسەری و راگەیاندنی پایەندنەبوونی پێیانەوە، لە لایەك و بنەما چواردە خاڵەکییەی (ولسن)ی سەرۆکی ئەمەریکی لە لایەکی دی، کە رۆڵی گەورەیان بینی لە دەرکەوتنی ئەم قۆناغەدا.

لەبەر سێ هۆکاری سەرەکی هێرشکرایە سەر دبلۆماسیی کۆن و کلاسیکی – نهێنی، کە بریتین لەمانە[1]:

١. دبلۆماسیی کلاسیکی بە هۆکاری ئەو کاولکارییە سیاسییانە دانرا، کە دووچاری مرۆڤایەتی ببوونەوە.

٢. لەگەڵ پرنسیپەکانی دیموکراسیدا دژ دەوەستێتەوە.

٣. جەدوایەکی ئەوتۆی نییە و تەنیا کاتکوشتنەو دژی پرنسیپە ئەخلاقییەکانیشە.

بەگشتی نیشانەکانی دبلۆماسیی هاوچەرخ، لەڕووی رواڵەت و ناوەڕۆکەوە بەم شێوەیە پوختدەکرێتەوە[1]:

---

(١) د. السيد أمين شلبي، م. س.ذ، ص٨٩.

أ. **لەڕووی ڕواڵەتەوە:** بەهۆی کەمبوونەوەی دووریی نێوان وڵاتان، کاڵبوونەوەی سنووری نێوانیان لە سایەی پەرەسەندنی خێرا و گەورەی هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندن و میدیا، خێرایی پەیوەندی و کارلێکی یەکە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان زیاتر بوون. کە دەکرێت نیشانەکانی ئەم گۆڕانکارییە لەم چەند خاڵەدا باسبکەین:

١. **دەرکەوتنی دبلۆماسییەتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان:** واتە دەرکەوتنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بەشدار بوون، لە دەرکەوتن و پەرەسەندنی دبلۆماسیی هاوچەرخ، چونکە ئەم ڕێکخراوانە هەوڵە دبلۆماسییەکانیان کۆدەکردەوەو هەوڵی کەمکردنەوەی ناکۆکی و ململانێکانیان دەدا، لە جۆرێك دبلۆماسیی نوێدا، کە بە "دبلۆماسیی پەرلەمانیی Parliamentiary Diplomacy" ناوزەددەکرێت، کە تێیدا لەسەر شێوەی کاری پەرلەمان بڕیاربەدەستانی گەلانی دنیا کۆدەبنەوە، لە ڕێی دانوستان و کۆمەڵە ڕێسایەکی گشتییەوە بڕیار لەسەر بابەتەکان دەدەن، بۆ نموونە: (ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان) و (نەتەوەیەکگرتووەکان).

لەڕاستیدا کاریگەریی دەرکەوتنی دبلۆماسییەتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، لە دوو ڕووەوە دەرکەوت[٢]: یەکەمیان ئەوە بوو، کە ئەو ڕێکخراوانە بوون بە شوێنێکی گرنگ بۆ خستنەڕوو و گفتوگۆکردنی کێشە

(١) بۆ زانياريي زياتر بڕوانه: يونس طلعت الدباغ، الدبلوماسية المعاصرة في ظل العولمة: اتجاهات ونماذج، التفسير للنشر والإعلان، أربيل ودار الفتح للدراسات والنشر، الأردن، ٢٠١٥، ص ص١٠٠-١١٦.و: د. السيد أمين شلبي، م. س.ذ، ص ص٩١-٩٣.

(٢) بۆ زانياريى زياتر بڕوانه: د.غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص٣٤-٣٥.

جۆراوجـۆرە سیاسـی و ئـابووری و سـەربازی و هونەرییـەکانی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان، بەمـەش دبلۆماسـی شـوێنێکی فـراوان و فرەلایـەنی دۆزییـەوە، بۆئـەوەی چـالاکییەکانیی تێـدا بەرجەسـتەبکرێت. دووەمیـان بریتیبوو لە کاریگەریی ئەم رێکخراوانە لەسەر پەرەسەندنی رێساکانی یاسای نێودەوڵـەتیی تایبـەت بـە جیـاوك و پارێزبەندییـەکان و داننـان بـە مـافی مومارەسـەکردنی نوێنەرایـەتیی دبلۆماسـیی ئیجابییانـەی ئـەو رێکخراوانـە، تەنانـەت داننـان بـە جیـاوك و پارێزبەنـدیی نوێنـەرەکانیان و نوێنـەری هەمیشەیی دەوڵەتان تێیاندا و بارەگاکانیشیان.

٢. **زیادبوونی رێژەی کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی:** زیادبوونی یەکەکانی خێزانی نێودەوڵەتی بنکەی مامەڵەی دبلۆماسـیی فراوانترکـرد. لـە کاتی دروستبوونی سیستمی دەوڵەتی نـوێ لـە کـاتی بەسـتنی پەیماننامـەی ویستڤالیای ساڵی (١٦٤٨) ژمارەی ئەو وڵاتانەی، کە لە ئەورووپا پەیوەندیی دبلۆماسییان پێکەوە هەبوو، لە (١٢) وڵات تێنەدەپـەڕی، بـەڵام لـە ئێسـتادا (١٩٤) وڵات بە رەنگ و رەگەز و ئایین و ژیار و زمانی جیاوازەوە پەیوەنـدیی دبلۆماسییان هەیە، ئەمە وێڕای زیادبوونی بەرفراوانی یەکەکانی تری یاسـای گشتیی نێودەوڵەتی.

٣. **پەرەسەندنی تەکنۆلۆجی لە هۆکارەکـانی هاتوچـۆ و گەیانـدن و زانیارییەکان:** لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە شۆڕشێکی تـەکنۆلۆجیی بێوێنـە هـەموو کایـەکانی ژیـانی داگیرکـردووە، بەتایبـەتتر لـەدوای جـەنگی ساردەوە شۆڕشەکانی زانیاری و گەیاندن و کۆمپیوتەر، جیهانیان کردووە بە گوندێکی بچووك و پەیوەندی و کارلێکی کەسە یاساییە نێودەوڵەتییەکان بـە شـێوازێك ئاسـانکردووە، کـە دەتـوانن راسـتەوخۆ گفتوگـۆی کێشـەو بابەتـە

هەنووکەییـەکان بکـەن و چارەسـەری خێـرای بـۆ بدۆزنـەوە. لـە لایـەکی تریشـەوە، ئینتـەرنێت، کـە دایکـی هۆکارەکـانی زانیـاری و گەیاندنـە، سەردەمێکی دروستکردووە، کە هیچ بڕیار یان ڕێککەوتن یان ڕێوشوێنێك بەنهێنی نامێنێتەوە، واتە سیفەتی نهێنیی کاری دبلۆماسیی کرد، بە بەشـێك لـە مێـژوو (دیـاردەی ویکیلـیکس بەڵگەیـەکی گرنگـی ئـەو ڕاسـتییەیە، کـە توانیویەتی هەزاران نهێنیـی سـەرۆك و بەرپرسـانی دنیـا بخاتـە بـەر دیـدەی گەلەکانیان). هەروەها لـە لایـەکی تـرەوە، ئـەم شۆڕشـانە ڕۆڵـی کلاسـیکیی دبلۆماتیشـیان کـەم کردووەتـەوە، چـونکە زۆرکـات سیاسـەتی دەرەوە و سـەرۆکی وڵاتـان خۆیـان راسـتەخۆ بەشـداری لـە چارەسـەری کێشـەو ناکۆکییەکان دەکەن.

ب. **لەڕووی ناوەڕۆکەوە:** بڵاوبوونـەوەی دیموکراسـی و کەمبوونـەوەی سیسـتمی حـوکمڕانیی ڕەهـا و زیـادبوونی بەشـداریی گـەلان لـە هەڵبـژاردنی نوێنـەرانی خۆیـان لـە پەرلەمانەکانـدا، زیـادبوونی ڕۆڵـی ڕای گشـتی لـە تایبەتمەندییـەکانی دبلۆماسـیی هاوچـەرخ بـوون، لـەڕووی ناوەڕۆکـەوە. کـە دەکرێت لەم چەند خاڵەدا ئاماژە بۆ دیارترینیان بکەین:

١. **کاریگـەریی ڕای گشـتی:** لەسـەر ئاسـتی نـاوخۆ و نێودەوڵـەتییش زیادیکرد، لەسەر ئاستی نـاوخۆ ئـەو کاریگەرییـە لـە ئـەنجامی چـەند خاڵێـك زیادیکرد، کە بریتیبوون لە: بەرزبوونـەوەی ڕێـژەی ئاسـتی بـژێویی خـەڵك و بڵاوبوونەوەی میدیای بیستراو و بینـراو و خوێنـدراو، بەرزبوونـەوەی ئاسـتی هۆشـیاریی ڕۆشـنبیری و بڵاوبوونـەوەی بنـەمای دیموکراسـی لـە کایـەی سیاسیدا. هەرچی ڕای گشتیی جیهانییشـە لـە ئـەنجامی زیـادبوونی ژمـارەی دەوڵەتـە تازەسـەربەخۆکان و زیـادبوونی ڕۆڵ و کاریگـەریی ئەکتـەرە

نادەوڵەتییەکان لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، لە سایەی پێشکەوتنی گەورەی هۆکارەکانی پەیوەندی و راگەیاندندا رێژەی کاریگەریی بەرزبووەوە. بۆیە دەوڵەتان لە هەنگاوە دبلۆماسییەکانیاندا ناچار بوون، رای گشتیی ناوخۆی و جیهانی بەهەند وەربگرن، چونکە رای گشتی پێیوابوو، هۆکاری سەرەکیی ناکۆکی و ململانێ نێودەوڵەتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دبلۆماسیی نهێنی و دەرهاویشتەکانی لە رێککەوتننامە نهێنییەکان[1].

٢. **فراوانبوونی ئەرکی دبلۆمات:** بەربڵاویی فرەلایەنی و هەمەچەشنیی بەرژەوەندیی یەکە نێودەوڵەتییەکان وایکردووە، کە چوارچێوەی کاری دبلۆماسییش فراوان بێت، بە شێوەیەك کە چەند لایەن و بابەتێك لەخۆ بگرێت، کە پێشتر لە بازنەی گرنگیدانی ئەودا نەبوون، بۆیە پێویستە دبلۆمات تەنیا بەوەوە نەوەستێت، کە گرنگی بە رەهەندە سیاسییەکانی پەیوەندیی نێودەوڵەتیی وڵاتەکەی بدات، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی گشتگیر پەی بە رەهەندە جیاوازەکانی پەیوەندیی بازرگانی و ئابووری و سەربازی و پیشەسازی و میدیایی و...هتدی وڵاتەکەی بدات، بۆیە پێویستە کارەکەی گشتگیر بێت و گرنگی بە هەموو ئەو لایەنانە بدات، هەر بۆیە باڵوێزخانەکان بە دیاریکردنی پاشکۆ بۆ هەریەکێك لەم بوارانە کارە دبلۆماسییەکانی وڵاتەکانیان لە دەرەوە بەهێز و گشتگیر دەکەن.

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٢٨.

## هێڵکاریی ژماره (١)

## نیشانەکانی دبلۆماسیی هاوچەرخ



**گرنگترین تایبەتمەندییەکانی دبلۆماسیی هاوچەرخ لەم چەند خاڵەدا دەخەینەروو[1]:**

١. سەرهەڵدانی سەردەمی دبلۆماسیی کراوە و ئاشکرا لەگەڵ جەنگی یەکەمی جیهانیدا، وایکرد کە رای گشتی بتوانێت کاریگەری لەسەر رەوتی رووداوەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی جێبهێڵێت.

٢. کاری دبلۆماسیی تەنها لە ئەورووپادا کورت هەڵنەهات، بەڵکو فراوان بوو بۆ نێوەندێکی نێودەوڵەتی، کە چەندین سیستمی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت و چەندین رێکخراوی نێودەوڵەتیی تێدایە، ئەمەش سیاسەتی نێودەوڵەتی زیاتر ئاڵۆزکرد و پێویستیی بە رێساگەلێکی نوێ بۆ رێکخستنی کاری دبلۆماسیی لە بوارە جیاوازەکاندا هەبوو.

٣. پەرەسەندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئەرکەکانی دەوڵەت و پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن، هەموو لایەنەکانی ژیانیان بە نێودەوڵەتی کرد، بواری کاری دبلۆماسییشی فراوان کرد، بۆ بوارە ئابووری و تەکنۆلۆجییەکان و...هتد.

٤. بنەمای پشتبەستن بە یەکتری و بەرژەوەندیی هاوبەشەکانی گەلان، مەترسییە گشتییەکانی سەر مرۆڤایەتی و پێویستیی پێکەوەژیان و ئاشتی، وایان کردووە، کە هەموو یەکەیەك پێویستیی بەردەوامی بە کاری دبلۆماسی بە واتا فراوانەکەی هەبێت، چونکە لەم سەردەمەدا کە جیهان لە سایەی جیهانگیری و شۆڕشی گەیاندندا وەك گوندێکی بچووکی لێهاتووە، هیچ یەکەیەکی نێودەوڵەتی ناتوانێت لە گۆشەگیریدا بژی، ئەمەش وایکرد تەنیا

---

(١) د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص١٢٦-١٢٩.

نوێنەرایەتیی سیاسیی پرۆتۆکۆلی ئەرکی سەرەکیی دبلۆماسی نەبێت، بەڵکو ئەم ئەرکە چەندین بواری تری ژیانی گرتەوەو فراوانیی زۆری بەخۆوە بینی. بۆیە ئەرکی دبلۆماسییش پەرەیسەند و دبلۆمات فەرمانبەرێکی فەرمییە و چەندین پارێزبەندی و جیاوکی هەیە، هەروەها لە ڕێگەی ڕاهێنان و فێرکردن و شارەزاییەوە ئامادەدەکرێن و پێویستە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی شارەزاییان هەبێت.

٥. ئەم پەرەسەندنە سەریکێشاوە بۆ ئەوەی لەپاڵ دبلۆماسیی هەمیشەییدا بۆ دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، نێراوی کاتی و تایبەت هەبن، بۆ کاری تایبەت. جگە لەمە دبلۆماسی لەپاڵ دبلۆماسییەتی دووانەییدا دبلۆماسی فرەیی بەخۆوە بینی، ڕێکخراوە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکانیشی گرتەوە، تەنانەت ڕێکخراوە سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکان و هاوپەیمانێتییە سەربازییەکانیشی گرتەوە، ئەمە وێڕای بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکان و ئەکتەرە ئەکتیڤەکانی سەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی.

بەو شێوەیە دبلۆماسی لەرووی تیۆری و پراکتیکییەوە پەرەیسەندووە تا گەیشتووەتە ئاستێك، کە یاسای دبلۆماسی هەموو وردەکارییەکانی یەکلایی کردووەتەوە، پێویستە یەکە نێودەوڵەتییەکان پێوەی پابەند بن، ئەگەر نا تووشی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی دەبن.

ئەم سەردەمە قۆناغی **"قۆناغی پێشکەوتنی ڕێساکانی دبلۆماسی"** بەخۆوە بینی، کە تێیدا کاری دبلۆماسی هەنگاوی یاسایی گەورەی نا، ئەویش نووسینەوەی تەواوەتی و گشتگیری دبلۆماسیی بوو، لەلایەن

ولآتانـــەوە. ئـــەویش بـــە واژوکردنـــی هەرســـێ ڕێککەوتننامـــە گـــرنگ و بنچینەییەکەی بواری دبلۆماسی، کە بریتیبوون لە:

١. ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، (٢)ی ئـازار بـۆ (١٤)ی نیسـانی سـاڵی (١٩٦١)، بـە بەشـداریی نوێنـەری (٨١) دەوڵـەت چـاودێری و چـەندین ڕێکخـراو و ئـاژانس و لیژنـەی نێودەوڵـەتی، لـە نەمسـا بەسترا، ئەم ڕێککەوتننامەیە (٥٣) مادده لەخۆ دەگرێت، تایبەتە بە نێـراوە دبلۆماسییە هەمیشەییەکان(١).

٢. ڕێککەوتننامـــەی ڤیـــەننا بـــۆ پەیوەندییەکونســـوڵییەکان، ســـاڵی (١٩٦٣) بەستراو (٧٩) مادده لەخۆدەگرێت.

٣. ڕێککەوتننامەی نێردراوە تایبەتەکان، ساڵی (١٩٦٩) بەسـتراو (٩٢) مادده لە خۆدەگرێت.

بەڵام هەر لەم قۆناغەدا و لە رووخانی (یەکێتیی سـۆڤێت) و کۆتاییهـاتنی جەنگی ساردەوە، پەیکەری سیستمی نێودەوڵەتی لە دووجەمسەرییەوە گۆڕا بـۆ تاکجەمســەری، (وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا) کاریگــەری لەســەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیی زیادیکرد و ڕۆڵـی سـەرەکی لـە داڕشـتنی ئەجێنـدای

---

(١) بە دوای ئەمڕێککەوتننامەیەدا دوو پڕۆتۆکۆلی خۆویستانە نووسرانەوە، یەکەمیان تایبەت بوو بە چۆنێتیی دەستخستنی ڕەگەزنامە و لە ماددەی دووەمیدا ئاماژەی بەوە کردووە, کە "دروست نییە ئەندامانی ئەو نێراوە دبلۆماسییەی, کە ڕەگەزنامەی ئەو دەوڵەتەیان نییە کە تێیدا دامەزرێنراون بۆ کاری دبلۆماسی (دەوڵەتی پێشوازیکەر), کە خۆیان و ئەندامانی خێزانیان تەنیا بە یاسای نێوخۆیی ئەو وڵاتە ڕەگەزنامەی ئەو دەوڵەتە بەدەست بهێنن". هەرچی پڕۆتۆکۆلی خۆویستانەی دووەمیش بوو تایبەت بوو, بە چارەسەرکردنی پابەندکەرانەی ناکۆکییەکان و ڕاڤەکردنی ڕێککەوتننامەکە لای دادگای دادی نێودەوڵەتی, بەپێی داوایەك کە هەرلایەنێکی ناکۆکی پێشکەشی دەکات, لەو دەوڵەتانەی کە ئەو پڕۆتۆکۆڵەی قبوولکردووە.

کارە جیهانییەکاندا دەگێڕا[١]، بە جۆرێك کە هەندێك لە نووسەر و پسپۆڕان بە **"دبلۆماسیی هەژموونی تاکجەمسەری"** ناوزەدی دەکەن، چونکە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە (ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) بە جۆرێك لە جۆرەکان دەستی بەسەر سیاسەتی جیهاندا گرتووە، کاری دبلۆماسی تا رادەیەکی زۆر کۆنترۆڵ کردووە و شێوازێکی نوێی هێناوەتە پێشەوە، ئەویش دبلۆماسیی زۆرەملێ و هەڕەشەیە بەهۆی ئەو دەسەلات و توانا و هێزە گەورەیەوە کە هەیەتی، کە لە رێگەیەوە هەوڵدەدات، بە چەند میکانیزمێکی جیاواز، کولتوور و بەرژەوەندییەکانی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنێت، کە دیارترینیان ئەمانەن[٢]:

أ. بەستنەوەی ئابووریی دەوڵەتان بە ئابووریی (ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا)وە و بەکارهێنانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، وەك ئامرازێك بۆ وروژاندنی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان و دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتان.

ب. پەنابردنی (ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا)، لە چەندین حاڵەتدا، بۆ رەتکردنەوەی دبلۆماسیی وەك رێگەچارەی کێشەکان، پشتبەستنی بەهێزی سەربازی بۆ سەپاندنی هەژموونی خۆی، لە ململانێکانی و یەکلاییکردنەوەی کێشەکان، لەو میانەیەشدا دبلۆماسی وەك ئامرازێکی هەڕەشە بەکارهێناوە.

---

(١) بڕوانە: د. السيد أمين شلبي، م.س.ذ، ص٨٥.

(٢) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٨٥-٨٦.

ج. بەکارهێنانی دەوڵەتە ئەوروپییەکان لەلایەن (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا)وە بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی، بۆ نموونە: (پەیماننامەی ناتۆ) و شێوازی بەکارهێنانی.

د. کەمبوونەوەی رۆڵی نەتەوەیەکگرتووەکان لە چارەسەرکردنی کێشەو ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان، مەگەر بە ئاراستەی بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ئەمەریکییەکان، واتە پێدانی رەوایەتی بە پرۆژە ئەمەریکییەکان لە رێگەی بڕیارە نێودەوڵەتییەکانەوە (وەك داگیرکردنی ئەفغانستان لە ٢٠٠١)، ئەگەر نەشتوانرا لە رێگەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە رەوایەتیی پێبدرێت، ئەوا تێیدەپەرێنێت و سیاسەتی خۆی لە دەرەوەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسەپێنێت (داگیرکردنی عێراق لە ٢٠٠٣ وەك نموونە).

ه. بەکارهێنانی دامەزراوەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ مەبەستی سیخوڕی، بەتایبەت لیژنەکانی گەڕان بەشوێن چەکی کۆکوژ (نموونە: عێراق ١٩٩٨).

و. کەمبوونەوەو سستبوونی دبلۆماسیی زۆرێك لە دەوڵەتان بەتایبەت عەرەبییەکان، مەگەر بە رەزامەندیی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) بێت، ئەویش لە چوارچێوەی ململانێ نێودەوڵەتییەکاندا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، دەبینین دبلۆماسیی بەجیهانی بووەو چەمکی دبلۆماسیی بەجیهانیکراو (الدبلوماسية المعولمة) هاتووەتە کایەوە، ئەویش بە دوو رێگە جیادەکرێتەوە[١]:

---

(١) بڕوانە: برایان وایت، م.س. ذ، ص٥٣٩.

یەکـــەم: ئێســـتا دبلۆماســـی چوارچـــێوەیەکی جیهـــانیی راســـتەقینەی وەرگرتووە، سەردەمی دابەشکاریی ئایدیۆلۆجی بەسەرچووە، کـە لـەماوەی جەنگی ساردا زۆرێك لە دەوڵەتانی لە بازنەی کـارلێکی دبلۆماسـیی ئاسـایی دوورخستبووەوە.

دووەم: بــەوە جیــا دەکرێتــەوە، کــە هەمەچەشــن و ئــاڵۆزە، کــە هــەم ئەجێندای دبلۆماسی و دبلۆماتیش فراوانترە لە پێشوو، هـەم ئـەو لایەنانـەی تێیدا بەشدارن جگە لە دەوڵەت، ئەکتەری نادەوڵەتییان تێدایە، کە پێویستە لەسەر بنەماکانی پشتبەیەکتربەستن و هاریکاریی یەکتری کـار بـۆ پاراسـتنی ئاساییشی مرۆیی و مافەکانی مرۆڤ بکەن. جگـە لـەوە ئەجێنـدای دبلۆماسـی فراوانتر بووە لە جاران، ئەویش بەوەی کە چەندین بابەت و پرسی جۆراوجۆر و هەمەچەشن لەخۆ گرتووە، کە پێشـتر تـەنیا لـە بەرنامـەی کـاری نـاوخۆدا باسدەکران. ئەمەش بەشێکی دەگەرێتەوە بۆئەوەی هەڕەشەو بەرژەوەندییە هاوبەشەکان لە یەك کاتدا زیادیان کردووە، یەکە نێودەوڵەتییـەکان ناچـارن، بـــۆ رووبەڕووبوونـــەوەی هەڕەشـــە و مەترســـییەکان و بـــەدیهێنانیانی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان، هاوکاریی یەکتر بکەن. نموونـەش زۆرە، لەوانـە: تـــیرۆر و کۆچـــی نایاســـایی و مەترســـییەکانی ســـەر ژینگـــە لـــە لایـــەك و بەرژەوەندییە ئابووری و بازرگانییەکان لەم سەردەمی پشتبەیەکتربەسـتنەدا لە لایەکی ترەوە.

لێرەدا، بۆ تێگەیشتنی زیاتر بە خشتەیەك بەراورد نێوان دبلۆماسیی نوێ (کلاسیکی) و دبلۆماسیی هاوچەرخ دەکەین:

**خشتەی ژمارە (١)**

**بەراوردی نێوان دبلۆماسیی نوێ (کلاسیکی) و دبلۆماسیی هاوچەرخ[(١)]**

| ڕ | جیاکەرەوەکان | دبلۆماسیی نوێ (کلاسیکی) Traditional Diplomacy | دبلۆماسیی نوێ Contemporary Diplomacy |
|---|---|---|---|
| ١ | ماوەکەی: | لە چاخی ڕێنسانسەوە دەستپێدەکات تا جەنگی یەکەمی جیهانی. | لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەستپێکردووەو تا ئێستا بەردەوامە. |
| ٢ | چوارچێوەی جوگرافی: | سنووردار بووە، کاری دبلۆماسی زیاتر لە کیشوەری ئەورووپادا چڕ بووەتەوە. | بەهۆی زیادبوونی ئەندامانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە لەرووی چەندێتی و چۆنێتییەوە، هەموو جیهانی گرتووەتەوە. |
| ٣ | شێوازی بەڕێوەچوون و تایبەتمەندیی دیاری: | نهێنی. | ئاشکرایی. |

(١) بڕوانە: یونس طلعت الدباغ، م.س.ذ، ص ص١٢٨-١٢٩.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤ | لایەنەکانی: | دوولایەنە، یاخود سنووردارییی لایەنەکانی. | فرەلایەنە. |
| ٥ | ئەو بنچینەیەی لەسەر بونیادنراوە: | بەرژەوەندیی رەهای دەوڵەتان (زیاتر ئامرازێك بووە بۆ جەنگ و ململانێ). | بەرژەوەندیی هاوبەش و فرەلایەن لەنێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتییدا (زیاتر ئامرازێکە بۆ ئاشتی). |
| ٦ | رۆڵی رێسا یاساییەکان: | رێسای یاسایی رێکخەری نەبووە. | پێویستە بەپێی رێسا یاساییە نێودەوڵەتییەکان بێت (نم: رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان). |
| ٧ | رۆڵی رای گشتی: | رای گشتی کاریگەریی نەبووە، دبلۆماسیی پەیوەندیی بە کەسی حوکمڕانەوە هەبووە و سیستمی حوکمڕانی رەها بووە. | رۆڵی لە چاودێریکردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتاندا هەیە و کاریگەری لەسەر دبلۆماسیی بەجێدەیڵێت. |
| ٨ | پێگەی دەوڵەت: | دەوڵەت تاکە ئەکتەر بووە، لە پەیوەندییە | دەوڵەت و ئەکتەری تری نادەوڵەتیش کاری |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | دبلۆماسییەکاندا. | دبلۆماسیی ئەنجامدەدەن. |
| ٩ | رۆڵی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان: | رێکخراوی نێودەوڵەتی، یاخود کۆمکارێکی هاوبەش بوونی نەبووە. | رۆڵی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان فراوان بووە. |
| ١٠ | هەڵسەنگاندن: | زیاتر رووکەشی و رواڵەتی بووە. | زیندوو و جیددی و هەمەلایەنە و گشتگیرە. |

بەگشتی دەتوانین بڵێین: دبلۆماسیی لە سەردەمی هاوچەرخدا لەرووی ستوونی و ئاسۆییەوە پەرەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینیوە، چەندین جۆر و ئاست و شێوازی نوێ لەو بوارەدا هاتوونەتە کایەوە، کە پەرەسەندنی پراکتیکیی دبلۆماسیی پیشان دەدەن، ئەمە وێڕای ئەو گرنگییە زۆرەی، کە لە بواری لێکۆڵینەوەو تیۆریدا لە زانکۆ و پەیمانگا و ناوەندە نێودەوڵەتییەکاندا بەم بوارە دراوە.

## بەشی سێیەم: جۆرەکانی دبلۆماسی

➢ ئامانجەکانی بابەتەکە:

١. ئاشنابوون بە جۆرەکانی دبلۆماسی و فراوانبوونی ئەو بوارە لەرووی ستوونی و ئاسۆییەوە.

٢. ئاشنابوون بە پۆلێنە جیاوازەکانی دبلۆماسی، کە چەندین جۆر و شێواز لە کاتی جەنگ و ئاشتیشدا و لە هەموو بوارەکانی پەیوەندیی نێودەوڵەتییەکاندا پەیڕەودەکرێن.

٣. جیاکردنەوەی جۆرە نوێیەکانی دبلۆماسی و ناسینی تایبەتمەندییەکانیان.

➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە:

**دەستپێک..**

دبلۆماسیی بە شێوە کلاسیکییەکەی بە پلەی یەکەم گرنگی بە گواستنەوەی باری جەنگ بۆ ئاشتی دەدات و پێچەوانەی ئەمەش راستە. واتە دبلۆماسی لە دروستکردنی ئاشتی و بەڕێوەبردنی ململانێکانیشدا ئەرکی گەیاندنی لە ئەستۆ بووە. لەگەڵ ئەوەی ئەو ئەرکە لایەنی سەرەکیی چالاکییە دبلۆماسییەکانی لە رابردوو و ئێستاشدا پێکهێناوە و تا هەنووکە گرنگترین ئەرکیشە، دەبێت ئەوە بزانین، کە لەمڕۆدا چوارچێوەی دبلۆماسی لەو سیاسەتە دبلۆماسییانە فراوانترە کە دەوڵەتان پیادەی دەکەن. بە واتایەکی تر، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو شێوە دبلۆماسییە فەرمییە یاساییەی، کە لەسەر (کۆنگرەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١)

بونیادنراوە، تەنیا دان بە پەیوەندیی دبلۆماسی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا دەنێت، ئاسان نییە ئەو سیاسەتە دبلۆماسییانە، کە لە بازنەی سیستمی هاووڵاتییانی نێودەوڵەتیدا مومارەسەدەکرێن، فەرامۆش بکەین، بۆ نموونە: چالاکییەکانی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و ڕێکخراوە حوکومییە نێودەوڵەتییە ئابوورییەکان، بەتایبەت ڕێکخراوی ئابووریی جیهانی (WTO)، کە چەندین تۆڕی پەیوەندیی دبلۆماسییان هەیە، کە لەنێو سیستەمە دبلۆماسییە کلاسیکییەکەو دەرەوەیشیدا چالاکیی خۆیان دەکەن. هەمان شت بە شێوەیەکی فراوان بەسەر چالاکییەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا جێبەجێ دەبێت. ئەمە وێڕای پەیوەندیی نێوان حوکومەتەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحوکومییەکان لەلایەك و پەیوەندیی نێوان ڕێکخراوە ناحوکومییەکان و ڕێکخراوە حوکومییە نێودەوڵەتییەکان لەلایەکی ترەوە، سەرباری پەیوەندیی نێوان ڕێکخراوە ناحوکومییەکان لەنێوخۆیاندا[١].

کەواتە دبلۆماسی جۆری زۆرە، پۆلێنی جۆراوجۆریشی بۆ کراوە، ئێمە لێرەدا تەنها چەند جۆرێکی گرنگیان باس دەکەین[٢]:

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جوزیف إم سیراکوسا، الدبلوماسیة: مقدمة قصیرة جدا، ترجمة: کوثر محمود محمد، مؤسسة هنداوي للتعلیم والثقافة، القاهرة، ٢٠١٥، ص ص١١٣-١٣٠.

(٢) بڕوانە: د. سهیل حسین الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٩٥-١٠٠.

## یەکەم: دبلۆماسیی نهێنی و دبلۆماسیی ئاشکرا

لەسەرەتادا و لە سەردەمە کۆنەکاندا، لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی گشتی پاشا و فەمانڕەواکان کاروباری وڵاتیان بەڕێوەدەبرد و هاووڵاتیان ئاگاداری زۆربەی کارەکان نەبوون، دبلۆماسی شێوەیەکی نهێنی وەرگرتبوو، کە بووبووە جێگای گومان و دڵەڕاوکێی زۆربەی لایەنەکان و گومانکردن لەیەکتر، ئەمەش هەڕەشەی بۆ "بنەمای نییەتباشی لە پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکاندا" دروستکرد، بەڵام لە سەردەمانی دواتر و بەهۆی پێشکەوتن لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا، بەتایبەتی لایەنی ئامرازەکانی گەیاندن و راگەیاندن و گرنگیدانی زیاتر بە مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی، دبلۆماسی لە نهێنییەوە گۆڕا بۆ ئاشکرا.

بۆیە کارنامەی کۆمەڵەی گەلان تۆمارکردنی پەیماننامەکانی لە سکرتاریەتی کۆمەڵەدا، کردبوو بە مەرجی دروستیی پەیماننامەکە، دواتر نەتەوەیەکگرتووەکانیش تۆمارکردنی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانی، لە سکرتارییەتدا کرد بە کارێکی پێویست و لە نزیکترین کاتیشدا بڵاوبکرێتەوە، ئەگەر نا، ئەوا هیچ لایەنێکی پەیماننامەکە ناتوانن لەبەردەم هیچ یەکێك لە دەزگا و لقەکانی نەتەوەیەکگرتووەکاندا دەقی ئەو پەیماننامەیە لە ناکۆکییەکانیاندا وەکو بەڵگە بەکاربهێنن.

## دووەم: دبلۆماسیی دوو لایەنە و دبلۆماسیی گشتی (کۆمەڵی)

سەردەمانێکی زۆر ولأتان دوولایەنە و بەیەکەوە و ڕاستەوخۆ کاری گفتوگۆو دبلۆماسییان ئەنجامدەدا و بڕیاری پەیوەندییان دەدا، بەلأم بەهۆی زیادبوونی بەرژەوەندییەکان و ئالۆزبوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە دبلۆماسیی گشتی هاتەکایەوە، کە لە دوو ولأت زیاتر بەشداری تێدادەکەن، هەر بڕیارێکی تێدا دەربکرێت هەموولایەك دەگرێتەوە، پێشی دەوترێت **دبلۆماسیی پەرلەمانی**. بۆ نموونە: ئەو ڕێکخراوانەی کە بۆ شوێنێك، یان کێشەیەك، یان هاوپەیمانێتییەکی سەربازی، یاخود ڕێککەوتنێکی سیاسی، یان ئابووری، یان تەکنۆلۆجی، یاخود هونەری دروستدەکرێن، وەك: **ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە گشتییەکان** (نەتەوە یەکگرتووەکان)، **ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە تایبەتمەندەکان** (ڕێکخراو ڕێکخراوی مافی مرۆڤ، لیژنەی خاچ، یان مانگی سووری نێودەوڵەتی)، **ڕێکخراوە کیشوەرییەکان** (ڕێکخراوی دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتینی، یەکێتیی ئەورووپا).

## سێیەم: دبلۆماسیی فەرمی و دبلۆماسیی جەماوەری

مەبەست لە دبلۆماسیی فەرمی ئەو جۆرە کارە دبلۆماسییەیە کە ولأتان لەڕێگای دامودەزگای فەرمییانەوە، لەگەڵ یەکتری ئەنجامی دەدەن، بەلأم دبلۆماسییی جەماوەری ئەو جۆرەیە، کە ڕێکخراوە ناحوکومییەکان و هەندێك لە کۆمپانیا گەورەکان ئەنجامی دەدەن و لەپاڵ دەوڵەتاندا بەم کارەیان هەڵدەستن و ڕۆژ بە ڕۆژ لەرووی ڕێژەو کاریگەری و ڕۆڵەوە لە گەشەکردندان، تەنانەت بەشداری لە زۆرێك لە کۆنگرە نێودەوڵەتییە فەرمییەکانیشدا دەکەن، (دواتر زیاتر لەسەر دبلۆماسیی جەماوەریی دەدوێین). نموونەیان زۆرە، دیارترینیان:

أ. ئەو ڕێکخراوە ناحوکومییانەی، کە سروشتێکی **هونەری** و تایبەتییان **هەیە**، کە ئەرکی پاراستنی بەرژەوەندیی چەند تاکێك دەگرنە ئەستۆ لەو وڵاتانەی، کە دەکەونە سنووری کارو چالاکییانەوە (وەك: یەکێتیی پارێزەرانی عەرەب، ڕێخکراوی پزیشکانی بێسنوور، ڕێکخراوی ڕۆژنامەنووسانی بێسنوور).

ب. ئەو ڕێکخراوە ناحوکومییانەی، کە گشتین و بەرژەوەندیی گشتییان **هەیە** (وەك: گرووپە سەوزەکانی پاراستنی ژینگە، ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی).

## چوارەم: دبلۆماسیی نوێنەرایەتیی دەوڵەتان و دبلۆماسیی کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان

مەبەست لە **دبلۆماسیی نوێنەرایەتیی دەوڵەتان** ئەوەیە، کە نوێنەرەکان کاری گرنگیان ئەوەیە، کە بەرژەوەندیی وڵاتەکانیان بەپێی سیاسەتی دەرەکیی وڵاتەکەیان بپارێزن، بەڵام **دبلۆماسیی کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان** بریتییە لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو کۆنگرانەی لەنێوان وڵاتاندا دەبەسترێت، بۆ تاووتوێکردنی ئەو مەسەلە گشتییانەی کە پەیوەندی بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە **هەیە**، جا سیاسی بن، یان ئابووری و سەربازی، یاخود کۆمەڵایەتی و کولتووری و زانستی. سەبارەت بە بەڕێوەچوونی کارەکانی ئەم جۆرە کۆنگرانە ڕێساگەلێکی ورد جێگیر بوون و لە بەڕێوەبردنیاندا پیادەدەکرێن، دەوڵەتی ڕێکخەری کۆنگرەکەش پێویستە پێداویستیی تەواوی کۆنگرەکەو ئاساییش بۆ نوێنەری دەوڵەتان فەراهەم بکات.

## پێنجەم: دبلۆماسیی کۆنگرەی لووتکە

مەبەست پێی ئەو جۆرە کۆنگرانەیە کە تەنها سەرۆك، یان کەسی یەکەمی وڵاتەکان بەشداری تێدادەکەن. چەند جۆرێکی هەیە لەوانە: ئەو کۆنگرانەی کە بەرپرسی یەکەمی هەموو وڵاتانی جیهان بەشداردەبن، یاخود تەنیا کیشوەرێك یا هەرێمێك، یاخود ڕایەڵ و تایبەتمەندییەك بەیەکیانەوە ببەستێت، وەك هەشت وڵاتە پیشەسازییەکە، یان ئۆپیك، یان ناتۆ، یان کۆمکاری عەرەبی، یان یەکێتیی ئەورووپا[1].

لەگەڵ ئەوەی دبلۆماسیی لووتکە نوێ نییە، بەڵام دوای دەرکەوتن و فراوانبوونی کێشەو ناکۆکی و ململانێ نێودەوڵەتییەکان بەتەواوی پەرەی سەندووە. ڕەنگە "لووتکەی هەزارە/ قمة الألفية" کە لە ساڵی (٢٠٠٠)دا بەسترا، نموونەیەکی دیار بێت بۆ ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە، کە تێیدا (١٥٠) سەرۆك دەوڵەت و حوکومەت لە وڵاتانی ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکان کۆبوونەوە، بۆ تاووتوێکردنی ئەو ئاڵینگارییە (تحديات)ە جیهانییانەی، کە لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی زاینییەوە ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە، وەك: ناکۆکییە چەکدارییەکان و شێوازی چارەسەرکردنیان، قووڵبوونەوەی بۆشایی نێوان دەوڵەمەند و هەژار، داڕمانی ژینگەی سروشتی، کۆچی نایاسایی،...هتد[2].

---

(١) بڕوانە: برایان وایت، م.س.ذ، ص٥٣٨.

(٢) د. عدنان السيد حسين، نظرية العلاقات الدولية، م.س.ذ، ص١٣٣.بۆ نموونە: تەنها لە ساڵی (٢٠١٥)دا ڕێژەیکۆچکەرانی نێودەوڵەتی و پەناهەندەکان گەیشتووەتە (٢٢٤) ملیۆن کەس، بەمەش ڕێژەکەی، لەچاو ساڵی (٢٠٠٠)دا، (٧١) ملیۆن زیادیکردووە، واتە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (٢٠٠٠)دا، بە ڕێژەی (٤١٪) زیادیکردووە. ڕێژەی کۆچکەرە نێودەوڵەتییەکان لە ساڵی (٢٠٠٠)دا تەنها (٢,٨)ی

لەم جۆرە دبلۆماسییەدا سەرۆکی وڵاتان ئازادییەکی زیاتریان دەبێت بۆ بڕیاردان، ئەمە وێڕای ئەوەی کە کۆمەڵێك کاری رۆتینی کەمدەکاتەوە، پرۆسەی دانوستانەکان خێراتردەکات، سەنگ و قورساییەکی زیاتری لەرووی دبلۆماسییەوە هەیە و راگەیاندنەکانیش گرنگی زیاتری پێدەدەن و خێراییەکی زیاتر بەخۆیەوە لە گەیشتن بە ئاکام دەبینێت، کاریگەریی زیاتری لەسەر دروستبوونی زمانی تێگەیشتن و گیانی تەبایی و هاوڕێیەتی لەنێوان سەرۆکی وڵاتاندا هەیە. لە هەمان کاتدا سەرۆکی وڵاتان دەبنەهۆی

---

دانیشتووانی جیهانیان پێك دەهێنا، بەڵام لە ساڵی (٢٠١٥)دا ئەو رێژەیە بۆ (٣,٣) بەرزبووەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە کرێکارە کۆچکارەکان، کە لە ساڵی (٢٠١٥) رێژەیان (١٥٠) ملیۆن کەس بووە، زۆرینەی کۆچکەرە نێودەوڵەتییەکان پێکدەهێنن. ئافرەتانیش نزیکەی نیوەی کۆچکارە نێودەوڵەتییەکان پێکدەهێنن. ئەو گەنجانەش, کە تەمەنیان لەنێوان (١٥-٣٥)ساڵدایە نزیکەی سێیەکی ئەو رێژەیە پێکدەهێنن. لە لایەکی ترەوە ژمارەی پەناهەندەکان لە ساڵی (٢٠١٤)دا گەیشتووەتە (١٤,٤) ملیۆن پەناهەندە، کە (٧٥٪)ی ئەو رێژەیە تەنها سەر بە (١١) دەوڵەتن و تەنها (٧) دەوڵەت نزیکەی نیوەی پەناهەندەکانی جیهانیان لەخۆ گرتووە، ئەمە لە کاتێکدا کە نیوەی کۆی گشتیی ئەو رێژەیە منداڵن و تەمەنیان لە (١٨) ساڵ کەمترە. ئەمە لە کاتێکدا کە ژمارەی دەوڵەتانی ئەندامی (رێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ کۆچکردن) تا ساڵی (٢٠١٥) گەیشتووەتە (١٦٢) دەوڵەت و چالاکییەکانیشی لە (١٥٠) دەوڵەتدا ئەنجامدەدات, زیاتر لە (٨٠٠٠) فەرمانبەری مەیدانی کاردەکەن. لە هەمان کاتدا کۆمسیۆنی باڵای پەنابەران بەردەوام کار بۆ مافەکانی پەنابەران دەکات، بەڵام زۆرێك لەو رێژانەی کە باسکران لەژێر هەڕەشەی سووکایەتی و مافخوران و تەنانەت بازرگانیپێکردنەوەن، بۆیە زۆرجار کۆنگرەی لووتکە بۆ چارەسەری ئەو گرفتە نێودەوڵەتییانە دەبەسترێت بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەی گونجاو. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الأمم المتحدة، الجمعية العامة، تقرير الأمين العام، الدورة السبعون، البندان 15و 116 منجدولالأعمال، متابعة نتائج قمة الألفية، Distr.: General، 21 April 2016، AL70/59

دەقی راپۆرتەکە لەم لینکەدایە: (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/٨)

http://www.un.org/pga/70/wp-content/uploads/sites/10/2015/08/21-Apr_Refugees-and-Migrants-21-April-2016.pdf

جێبایەخی زیاترو رەنگە بتوانن لەو رێگەیەوە پێگەی خۆیـان بـەهێز بکـەن، هەروەها یەکتربینینیان بە راستەوخۆ دڵنیاییەك، یان جۆرێـك لـە گەشـبینی دەبەخشێت بە رای گشتی[1].

## شەشەم: دبلۆماسیی هەژموون

لەگـەڵ ئـەوەی یـەکێك لـە بنـەما سـەرەکییەکانی دبلۆماسـی بریتییـە لـە یەکسانی لەنێوان دەوڵەتانـدا، بـەبێ سـەیرکردنی گـەورەیی و بچـووکیی توانـای دەوڵەتەکان، چونکە هەموو دەوڵەتان سەروەریی خۆیان هەیەو پێویستە بتـوانن موماره‌سەی پەیوەندییەکی هاوسەنگ لەگەڵ لایەنـەکانی تـردا بکـەن، هـەروەها لەگـەڵ ئـەوەی کـە بەگشـتی دەوڵـەتان لـە دەنگدان و رادەربـڕین لـە رێکخـراوە نێودەوڵەتییەکانـدا یەکسـانن (جگـە لـە چـەند ریزپـەڕێکی وەك ڤیتـۆی پێـنج ئەندامـە هەمیشـەییەکەی ئەنجوومـەنی ئاسـاییش، یـان شـێوازی دەنگـدان لـە صندوقی دراوی نێودەوڵـەتی)، هـەروەها هـیچ دەوڵـەتێکیش بـۆی نییـە ویسـتی خۆی بە بیـانووی بەهێزییەکەیـەوە بەسـەر دەوڵـەتانی تـردا بسـەپێنێت، بـەڵکو پێویسـتە هـەموویان پابەنـدی یاسـای دبلۆماسـی بـن، بـەڵام بـەهۆی تـاکڕەویی وڵاتەیــەکگرتووەکانی ئەمــەریکاوە، بــەهۆی هێــزە ســەربازی و ئــابووری و تەکنۆلۆجییەکەیـەوە، ئـەم بـارە گـۆڕاوەو ئـەم وڵاتـە زۆرجـار کـاری تاکلایەنـە دەکات و بڕیاری نادادپەروەرانە بـە نەتەوەیـەکگرتووەکان دەردەکـات، بەمـەش هەژموونی خۆی سەپاندووە.

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص١٢٠-١٢٣.

**حەوتەم: دبلۆماسیی هاوولاتی** (Citizen Diplomacy) **و دبلۆماسیی جەماوەری، یان دبلۆماسیی گشتی (الدبلوماسیة الشعبیة أو الدبلوماسیة العامة** Public Diplomacy)**:**

پاش ئەوەی رۆڵی هاوولاتیان لە دروستکردنی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان زیادیکرد، چەمکی دبلۆماسیی هاوولاتی، یان دبلۆماسیی رەوتی دووەم (دبلوماسیة المسار الثانيSecond Track Diplomacy) دەرکەوت، کە پیشەییەکان و سەرکردەکانی را و کەسە کاریگەرەکانی کۆکردەوە، بۆ کارکردن بۆ چارەسەری کێشەو ململانێکان و بەدیهێنانی هاریکاری لە دروستکردنی ئاشتی و گەشەپێدانی هاوبەش. ئەمە وێڕای هەوڵەکان بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دوورمەودا لەنێوان دەوڵەتان و گەلان و کولتوورە جیاوازەکاندا و بڵاوکردنەوەی کولتوور و بەهای تایبەت و دروستکردنی نەرمەهێز و کاریگەریی لەسەر ئاراستەکانی رای گشتی. بۆیە چەمکی دبلۆماسیی جەماوەریی دروستبوو، کە واتای پەیوەندیی نێوان گەلانی دنیا دەگەیەنێت، ئەمەش بواری بەشداریی فراوانی هاوولاتییانی خاوەن پسپۆڕی و لێهاتوویی جیاواز دەڕەخسێنێت، بۆئەوەی بتوانن بە چەندین کارو ئەرکی جیاواز هەستن، کە سنووری دبلۆماسیی کلاسیکی-فەرمیی- هەمیشەیی تێبپەڕێنێت. بەوە دبلۆماسیی جەماوەریی دەبێتە بنچینەیەك بۆ دبلۆماسییەکی فرەڕەهەند، چونکە نابێتە ئەلتەرناتیڤی دبلۆماسیی کلاسیکیی فەرمی، بەڵکو رۆڵەکەی تەواودەکات، کار بۆ دروستکردنی

پەیوەندیی دوورمەودا لەگەڵ گەلانی تردا دەکات، ئەمەش کەسانی پسپۆڕ و شارەزا و لێهاتووی دەوێت[1].

دبلۆماسی گشتیی بە یەکێك لە ئامرازە سەرەکییەکانی نەرمەهێز ( Soft Power) دادەنرێت[2].

واتە دبلۆماسیی جەماوەریی، کە زۆرجار بە دبلۆماسیی گشتی[3] ناودەبرێت، دەبێتە پاڵپشتێکی باش بۆ سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان بۆ ئامادەکردنی رای گشتیی و جەماوەری لە دەرەوەی سنووری خۆیان بۆ ئەو کارو چالاکییانەی کە ئەنجامی دەدەن، ئەمەش بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە دوو رێگەوە ئەنجامدەدرێت، یەکەمیان: دەرخستنی کولتوور و بەها نیشتمانییەکان. دووەمیان: بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری، کە زۆرجار رێگەی یەکەمیان لە ئەورووپا بە دبلۆماسیی کولتووری دادەنرێت و دەوڵەتان دەزگای فەرمی و نیمچەفەرمی بۆ دروستدەکەن. زۆرجاریش ئەکادیمی و رۆشنبیر و مامۆستایان و دەستەبژێری سیاسی و کۆمەڵایەتی و هونەرمەندان

---

(١) بڕوانە: د. سليمان صالح، استخدام وسائل التواصل الاجتماعي في الدبلوماسية العامة، ص ص٣-٥. دراسة متوفرة على الرابط التالي بتأريخ (٢٠١٧/١/٢١):

https://units.imamu.edu.sa/Conferences/smumc/Documents/د.٢٠٪سليمان٪٢٠صالح.pdf

(2) Jan Melissen, The New Public Diplomacy: Soft Power in International Relations, PALGRAVE MACMILLAN, New York, 2005, p.4.

(٣) لە بنەڕەتدا "دبلۆماسیی گشتی" بە "پڕوپاگەندە"ی یەکلایەنە پێناسەکراوە، کە بۆ دروستکردنی کاریگەری و وەرگرتنی پشتیوانی لە دەرەوەی وڵات لەلایەن رای گشتییەوە بەکارهاتووە، بۆ نموونە: بەکارهێنانی چاوپێکەوتن لەلایەن بەرپرسی وڵاتێکەوەبۆ پڕوپاگەندە و دروستکردنی کاریگەری لەسەر رای گشتی لە وڵاتی بەرامبەر، بەڵام لە بەرامبەردا دبلۆماسیەتی میدیا بریتییە لە زنجیرە کارێك, کە هەندێك جار لەلایەن نەیارەکانەوە بەهاوبەشی ئەنجامدەدرێت, بە مەبەستی چارەسەرکردنی ململانێ و ناکۆکییەکان راستەوخۆ لەلایەن دامەزراوە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی لایەنەکانی ململانێوە. ( Eytan Gilboa, Op. Cit,p. 303.) بەڵام لە ئێستادا چەمکی دبلۆماسی گشتی فراوانتر بووە و بۆ زۆر مەبەست بەکاردێت.

و نووسەر و ڕۆژنامەنووسان، یان خوێندکاران دەکرێنە ئامانج، بۆئەوەی وێنای جوانی ئەو وڵاتانەیان لا دروستبکرێت، بۆئەوەی کاتێك کە لە وڵاتی خۆیاندا بوون بە بەرپرس و خاوەن پێگەو کاریگەری، ئەمان بتوانن بەرهەمەکەی بچننەوە. کەواتە ئەم دبلۆماسییەتە دوورمەودایە و چنینەوەی بەرهەمەکەی کاتی پێویستە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەشویش و پڕوپاگەندە[١].

بۆ کاراکردنی ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە دەوڵەت و گەلان دەتوانن، بۆ دروستکردنی کاریگەری لە دەرەوەی سنووری وڵاتی خۆیان سوود لە توانای مرۆیی خۆیان وەربگرن، ئەویش لەمڕۆدا زیاتر لە ڕێگەی ئینتەرنێت و کەناڵە ئاسمانییەکانەوە ئەنجامدەدرێت.

**دیارترین ئامرازەکانی دبلۆماسیی جەماوەریی بریتیین لە[٢]:**

- **ئامرازە کولتوورییەکان:** (بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و ناوەندە کولتوورییەکان وەك نموونە).
- **ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندی:** (کەناڵی تەلەفزیۆنی و جۆرەکانی تری میدیا و ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان).
- **بەرنامەی ئاڵوگۆڕی شاندە و پڕۆژەی هاوبەش:** (کاری ڕێکخراوەکانی گەنجان وەك نموونە).

---

(١) بڕوانە: فيليب م. تايلور، الدبلوماسية العامة ومكانتها في السياسة الخارجية، مجلة الدبلوماسي، يصدرها معهد الدراسات الدبلوماسية بوزارة الخارجية السعودية، الرياض، العدد ٥٢، أكتوبر ٢٠١٠،ص ص٣٨-٤٠.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بودردابن منيرة، دور الدبلوماسية غير الرسمية في تنفيذ السياسة الخارجية، رسالة ماجستير، جامعة قسنطينة، كلية الحقوق والعلوم السياسية، ٢٠٠٩، ص ص٦١-٦٣.

- **گەشتوگوزار:** (بەتایبەت گەشتوگوزاری ئایینی و پەیوەندیی بە شوێنەوار و بە کولتوورەوە).
- **رۆڵی ئافرەتان و ژنان:** (رێکخراوەکانی ئافرەتان و بەشداریی ژنان لە کۆڕ و کۆبوونەوەو شاندەکاندا).
- **دامەزراوە ئەکادیمییەکان:** (ئاڵوگۆڕی بەرنامەی ئەکادیمی و زانستی و کولتووری لەگەڵ سەردانکەرانی بیانی، ئاڵوگۆڕی پرۆگرام و راهێنان و شێوازی خوێندن، ئەمەش دبلۆماسیی جەماوەریی پشتی پێدەبەستێت).
- **کەرتی تایبەت:** یەکێکە لەو ئامرازە گرنگانەی، کە دبلۆماسیی جەماوەریی پشتی پێدەبەستێت، لەپێناو بەهێزکردنی چاکسازییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا.
- **پەرەسەندنی تەکنۆلۆجی:** لە رێگەی بەکارهێنانی تۆڕەکانی ئینتەرنێت، وەك ئامرازی بڵاوکرنەوەی زانیاری و هەواڵی تایبەت بە حوکومەت و دروستکردنی پەیوەندیی لەنێوان حوکومەت و کۆمەڵگەدا، لە رێگەی تەرخانکردنی کۆمەڵە پێگەو ماڵپەڕ و هەژماری تایبەت لەسەر ئینتەرنێت بە زمان و شێوەزارە جیاوازەکان بۆ تێگەیاندنی واقیعی سیاسیی دەوڵەتان. لەم بوارەدا گرنگیی زیاتر بەم جۆرەی دبلۆمات و داهێنانەکانی دەدرێت، چونکە دبلۆماسیی دیجیتاڵیی ئەلیکترۆنی پێویستی بە ئەقڵیەتی داهێنەرانە هەیە، بۆیە لەم ساڵانەی دواییدا چەمکی داهێنەرە دبلۆماسییەکان (The Leading Innovators in diplomacy) دەرکەوت. هەر لەو چوارچێوەیەدا لە (١٩–٢٠ی نۆڤەمبەری ٢٠١٢) لە کۆنگرەیەك لە (ماڵتا) لەسەر داهێنان لە دبلۆماسییدا بەسترا، کە تێیدا جەخت لەوە کرایەوە، کە داهێنان لە بواری دبلۆماسییدا پێویستی بە دیدگای کولتووریی جیاواز و

تێگەیشتنی گۆڕاوە نێودەوڵەتییەکان و شێوازی بەکارهێنانی دەرفەتەکان هەیە، بەشێوەیەك بتوانێت لەگەڵ گۆڕانکارییە جیهانییە خێراکاندا هەنگاوبنێت[1]. هەروەها پێویستە ڕێگەو کەناڵە جیاوازەکان بدۆزرێتەوە بۆ گەیشتن بەو کەسانەی کە دبلۆماسیی کلاسیکی فەرمی ناتوانێت بیانگاتێ.

– **ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان**: کە دبلۆماسیی جەماوەری پشتی پێ دەبەستێت لە دەستخستنی شارەزایی و کارامەیی لەلایەن ئەندامانی ئەو پارتانەوە، هەروەها هەوڵدەدات ئەو پارتانە ڕێکبخات و تەواوکاری لەنێوانیاندا لەسەر ئاستی ناوخۆیی پاشان نێودەوڵەتی دروستبکات.

کەواتە دبلۆماسیی جەماوەری بەردەوام هەوڵی بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە و سوودوەرگرتن لەو بەرپرسیارێتییانە بە هەموو جۆرە جەماوەرییەکانییەوە دەدات، لەپێناو بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگە جیاوازەکان لە جیهاندا بەشێوەیەك ئاییندەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان گرەنتی بکات، بۆیە دبلۆماسیی جەماوەریی پشت بە توانا جەماوەرییەکان دەبەخشێت بۆ ئەوەی هەموو لایەکمان، لە ڕێگەی کارلێکی ڕاستەوخۆوە، لە یەکتری تێبگەین، ئەویش بە فراوانکرنی کەناڵ و پردەکانی بەستنەوەی گەلانی جیهان بەیەکتری لەمیانەی سیاسەتی دەرەکی و مامەڵە نێودەوڵەتییەکان، دێتەدی.

پێویستە گەلان خاوەنی سەروەری بن، بەشداریی پرۆسەی دروستکردنی بڕیار بکەن، لەم سۆنگەیەوە پێویستە چینی فەرمانڕەوا لە پرۆسەی دبلۆماسییدا رای گشتی نادیدەنەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەوەمان لەیاد

---

(١) بڕوانە: د. سليمان صالح، م.س.ذ، ص ص١٢-١٣.

بچـێت، کـە دەوڵــەتان هەمیشــە هەوڵــدەدەن دبلۆماســیی جــەماوەریی بــە ئاراســتەی بــەدیهێنان و بەرجەســتەکردنی سیاســەتی بــاڵای وڵاتەکــەیان و بەرژەوەندییە باڵاکانیان بەکاربهێنن.

لە دبلۆماسیی هاووڵاتیدا، هاووڵاتی رۆڵی بەرگریکار، یـاخود بانگەشـەکار بۆ پرسگەلێك دەبینێت، کـە پەیوەسـتن بـە مـافی مـرۆڤ و پاراسـتنی ژینگـەو هاوشێوەکانییانەوە. ئەم جۆرە دبلۆماسییە خودی هاووڵاتیی ئەستێرە رۆڵی تێدا دەبینێت، کە بە بیرۆکەو بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەو رۆڵە دەبینێت. بۆ نموونە: کەسە ناودارەکان، یان دەوڵەمەندەکان، یان ئەستێرەکانی سینەما، یان وەرزش، کە هەنـدێکجار رێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکانیش وەك: (بـاڵۆێزی نیازپــاکی) دیارییــان دەکــەن، کــە بــەو پێییــە بــە ئــەرکێکی دبلۆماســی هەڵدەستن، کە رەهەندێکی مرۆڤدۆستانەی هەیـە، (وەك: بیـلٚ گـەیتس Bill Gates، کە لە سـاڵی ١٩٧٥ کۆمپانیـای مایکرۆسـۆفتی دامەزرانـدووەو بـە یەکەم دەوڵەمەندی دنیا هەژماردەکرێت) ئەو کەسانە چارەسـەر بـۆ هەنـدێك پرسی وەك: (مافی مرۆڤ) دەدۆزنەوە، یـاخود پشـتیوانیی دارای و مەعنـەویی دەکــەن. ئــەم جــۆرە دبلۆماســییە بووەتــە نــەریتێك و زۆرێــك لــە وڵاتــان و رێکخراوە حوکومی و ناحوکومییەکان پێڕەوی دەکەن[١].

دبلۆماسیی لە شێوە جەماوەرییەکەیدا، لە رێگـەی ئـامرازە جیاوازەکـانی بەردەسـتەوە، گوتـاری خـۆی ئاڕاسـتەی گـەل دەکـات. واتـە دبلۆماسـیی جەماوەریی تـەنها لـە ئامانجەکانیـدا جـەماوەری نییـە، بـەڵکو پێویسـتە لـە ئامرازەکانی گەیاندنیشیدا جەماوەری بێت، ئەویش لەپێناو گەیاندنی گوتاری

(١) یونس طلعت الدباغ، م.س.ذ، ص ص١٦٢-١٦٣.

دبلۆماسیی فەرمیی بە جەماوەر و قەناعەتهێنانیان بەو دبلۆماسییەتەی، کە دەوڵەت هەیەتی. کەواتە ئەم جۆرە لە دبلۆماسیی پێویستی بە دبلۆماسیی جەماوەریی هەیە، کە لە هەناوی خەڵکییەوە هاتبێت کە لە زمانیان تێبگات و ئامرازی گونجاوی بۆ گەیاندنی پەیامە دبلۆماسییەکانی بە باشترین شێوە هەبێت. ئەم دبلۆماسییەتە لە سنووری دەوڵەتدا کورت هەڵنایەت، بەڵکو دەگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی سنوور بۆ دروستکردنی کاریگەریی لەسەر رای گشتیی جیهانی(١).

کەواتە دبلۆماسیی جەماوەریی "بریتییە لەو چالاکییەی کە وڵاتێك، یان دەوڵەتێك بە نوێنەرایەتیی گەلەکەی بە مەبەستی راکێشانی رای گشتیی دەرەکی ئەنجامیدەدات، دوور لە چالاکیی باڵوێزخانەو نێراوە فەرمییەکان و راگەیاندنی کلاسیکیی دبلۆماسیی فەرمی. لە دیارترین ئامرازەکانیشی: سەندیکا جیهانی و پیشەییەکان و یەکێتییە خوێندکارییەکان و رێکخراوەکانی گەنجان و خانمان و پەرلەمانەکان و پارتە جەماوەرییەکان و ئەو رێکخراوە ئەهلییە نا حوکومییانەی کە پەیوەندیی دۆستانەیان بە رێکخراوە هاوشێوەکانیانەوە لە شوێنە جیاوەزەکانی جیهاندا هەیە"(٢).

لە جیهانێکدا، کە تەکنۆلۆجیای گواستنەوەو گەیاندن و زانیارییەکان هەموو جیهانی بەیەکەوە وابەستەکردووە، گرنگیی بەکارهێنانی دبلۆماسیی گشتی وەك تەکنیکێکی دبلۆماسیی بەردەوام لە زیادبووندایە. دبلۆماسیی

---

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص٩١.

(٢) عمر سليمان ملكاوي، دور الإعلام في تحقيق مفهوم الدبلوماسية الشعبية، ص٣. تأريخ الزيارة (٢٠١٦/١/٢١): متوفر على موقع شبكة ضياء للمؤتمرات والدراسات على الرابط التالي: http://diae.net/29170

گشـتی ناوەنـدە گشـتییەکان و دەسـتەبژێرە بیانییـەکان دەکاتـە ئامـانج، لەپێناو کێشانی وێنەیەکی گشتی، کە توانای دەوڵەت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دبلۆماسـییەکانی بـەهێزدەکات. بـۆ نموونـە: جەختکردنـەوەی سـەرۆك و وەزیری دەرەوەی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) لـە سـەردەمی ئۆبامـادا (٢٠٠٩–٢٠١٦) لە بەکارهێنانی "نەرمەهێز – Soft Power" و برەودان بە بڵاوکردنـەوەی بـەها دیموکراسـییەکان و پاراسـتنی مافـەکانی مـرۆڤ و رۆڵـی ئافرەتان. بەگشتی رۆڵی دبلۆماسیی گشتی لە سەرەتای هەزارەی سێیەمەوە وەك ئامرازێکی دبلۆماسیی بەسوود زیادیکردووە.

ئـەوەتا بەرپرسـانی (وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا) لـە "جـەنگی دژەتیرۆر"دا، تەنها بە بەکارهێنانی کەناڵە ئاسمانییە هەواڵییەکان و گۆڤار و رۆژنامە و سایتەکانەوە ناوەستن، بـەڵکو دەوڵـەتانی دۆسـت و دوژمنیـان لـە دانوستانی راستەوخۆدا کۆدەکەنەوەو لە رێگەی کەناڵەکانەوە پیشانی دنیای دەدەن. لـە هـەمان کاتـدا وەزارەتـی دەرەوەی ئەمـەریکا تـۆڕی رادیـۆی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دامەزراندووە، کە هـەردوو رادیـۆی سـەوا (SAWA)و حورە(حرة) لەخۆدەگرێت، کە گرنگی بە مۆسیقا و گۆرانیی میللی ناوچەکەو کورتە هەواڵـە بەپەلـەکان دەدەن. ئەمـە وێـڕای کـەناڵی ئاسمـانیی هـەواڵیی ئـەلحورە (الحـرة) و (الحـرة عـراق)، کـە دیـدگای ئەمـەریکی بـۆ سیاسـەتی دەرەوە لە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت و (عێـراق) پێشکەشـدەکەن، بـەڵام مـەرج نییە ئەم جۆرە لـە دبلۆماسـی هەمیشـە بتوانێـت دڵ و هۆشـی خـەڵك بـەلای خۆیـدا رابکێشـێت، بەتایبـەت کاتێـك کـە سیاسـەتی کردەیـی پێچـەوانەی درووشمەکانی بێت، بۆیە دەبینین کەناڵی ئەلحورە توانیویەتی تـەنها (١٪)ی

بینەران بەلای خۆیدا رابکێشێت، لەکاتێکدا کە بودجەکەی تەنها بۆ ساڵی (٢٠١٠) بریتیبووە لە (١١٣) ملیۆن دۆلار[١].

لە لایەکی ترەوە "ئاژانسی زانیاریی ولاتەیەکگرتووەکان- United States Information Agency" نموونەیەکی دیاری دبلۆماسیی جەماوەریی بوو، لەنێوان ساڵانی (١٩٥٣-١٩٩٩) وەك دەستەیەکی سەربەخۆیە راڤەکردنی سیاسەتی دەرەکیی ئەمەریکی و پاڵپشتیکردنی بەرژەوەندییە ئەمەریکییەکانی لە رێگەی کۆمەڵە بەرنامەیەکی فێرکردن و رۆشنبیری و راگەیاندنەوە لەئەستۆگرتبوو. وەك: دەنگی ئەمەریکا و چەند رادیۆ و تەلەفزیۆنێکی تر و بەرنامەی وەك بەرنامەی ئۆفەرەکانی فۆلبرایت[٢]. دواتر ئەم ئاژانسە گۆڕا بۆ "بریکاری وەزارەتی دەرەکی بۆ دبلۆماسیی گشتی و کاروباری گشتی- Under Secretary of State for Public Diplomacy and Public Affairs"[٣].

---

(١) بڕوانە: کارين أ. منغست و إيفان م. أريغوين، مبادىء العلاقات الدولية، ترجمة: حسام الدين خضور، دار الفرقد، دمشق، ٢٠١٣، ص ص١٩٨-١٩٩.

(٢) بەرنامەی ئۆفەرەکانی فۆلبرایت: بەرنامەیەکی ئەمەریکییە، هەلی تەواوکردنی خوێندنی باڵا و پڕۆژەی توێژینەوە لە بوارە جیاوازەکاندا دەبەخشێت بە خوێندکارانی دەرەوە، لە نزیکەی (١٠٠) زانکۆ و دامەزراوەی ئەکادیمی ئەمەریکی، تا ساڵ (٢٠١٥) نزیکەی (٣٠٠٠٠٠) خوێندکار لێی سوودمەندبوون، ساڵانە نزیکەی (١٧٠٠) ئۆفەر پێشکەشدەکرێت، ئەمە وێڕای ئۆفەری فێرکردنی زمان. داواکارییەکانی پێشکەشکراو بۆ وەرگرتنی ئەو ئۆفەرانە لەلایەن دەزگاکانی فۆلبرایت و باڵوێزخانە ئەمەریکییەکانەوە وردبینی دەکرێت. بەرنامەکە ئەرکی دارایی ڕەسمی خوێندن و گەشت و مانەوە و دڵنیایی تەندروستی و بژێویی خوێندکارەکان لەئەستۆ دەگرێت.
بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە (مێژووی سەردان ٢٠١٧/٣/٨):
http://www.hotcourses.ae/study-abroad-info/applying-to-university/fulbright-scholarship/

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەو ئاژانسە بڕوانە هەردوو سایتی تایبەت بە کارەکانی: (رێککەوتی سەردان: ٢٠١٦/١/٢١)

## هەشتەم: دبلۆماسیی کولتووری:

لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی زانیاری و تەکنۆلۆجی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە، هەروەها لەگەڵ ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکان و هەمەچەشنبوونیان لەنێوان دەوڵەتاندا، دبلۆماسیی چووە چەندین بواری رۆشنبیری و مرۆیی و ژینگەیی جۆراوجۆرەوە، چونکە هەست بە پێویستییەکی زۆر بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییە کولتوورییەکانی نێوان وڵاتان کرا، هەوڵی نەهێشتنی دۆخی رق و تۆڵە دەستدرێژی درا، بۆیە، بۆ بەهێزکردنی هاریکاریی نێوان دەوڵەتان، دبلۆماسیی کولتووری دەرکەوت، بەتایبەت لە بوارە زانستی و رۆشنبیری و پەروەردەیی و تەکنۆلۆجییەکاندا، لەپێناو دەرخستنی بەها ژیارییە جیاوازەکان، دوور لە سڕینەوەو پەراوێزخستن، و بۆ زیادکردنی هاریکاریی هونەریی لەنێوان دەوڵەتاندا، کە دواجار دەچنە چوارچێوەی خزمەتکردنی ئامانجە باڵاکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی جێگیرکردنی ئاشتی و ئارامیی نێودەوڵەتی(١).

-https://www.archives.gov/research/guide-fed-records/groups/306.html

-http://dosfan.lib.uic.edu/usia/

(١) بڕوانە: د. عدنان السید حسین، نظریة العلاقات الدولیة، م.س.ذ، ص ص١٣٣-١٣٤.

## نۆیەم: پارادبلۆماسی و پرۆتۆدبلۆماسی
(Paradiplomacy & Protodiplomacy)

پارادبلۆماسی[١] واتە دبلۆماسیی خوار دبلۆماسیی فەرمی، ئەم دیاردەیە هاوتەریبە لەگەڵ لامەرکەزیبوونی زۆرینەی وڵاتان بە شێوازی جیاواز. کاڵبوونەوەی ناوەندگەراییش دەرهاویشتەی چەندین فاکتەرە، لەوانە: قەیرانی دەوڵەت نەتەوە، جیهانگیری، هەوڵ بۆ سوودمەندبوون لە ئابووریی جیهانی و شوناس. لە هەمان کاتدا شارە گەورەکان هەنگاو بۆ ئەوە دەنێن، کە ببنە ئەکتەری دبلۆماسی. بەڵام پڕۆتۆدبلۆماسی: ئەو دبلۆماسییەیە کە شارێك، یان هەرێمێك ئەنجامیدەدات، بەمەستی جیابوونەوە لە وڵاتەکەی. پارادبلۆماسی لە جیهاندا بە سێ ئاست ئیشدەکات[٢]:

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە چەمکی پارادبلۆماسی بڕوانە:

- Dr. Dana Ali Salih and Bakhan Ako Najmalddin, Paradiplomacy of the Kurdistan Region after 2003; present and future,Journal of Law for legal and Political Science, College of Law, University of Kirkuk, Iraq, Vol: 5, part: 2, Num: 18, 2016, pp. 481-486.
- Andr´e Lecours, Paradiplomacy: Reflections on the Foreign Policy and International Relations of Regions, International Negotiation, 7, 2002, Kluwer Academic Publishers, Netherlands, pp. 91–114.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

- د. سەردار عەزیز، دیپلۆماسیی پەرلەمانی: چالاککردنی پەرلەمانی کوردستان لەڕووی دبلۆماسییەوە، ژووری توێژینەوەی سیاسیی بزوتنەوەی گۆڕان، سلێمانی، ٢٠١٦، ل ل٢٢-٢٣. و:

-David Criekemans, Are the boundaries between paradiplomacy and diplomacy watering down? Preliminary findings and hypotheses from a comparative study of some regions with legislative power and small states, 2nd Global International Studies Conference: "What Keeps Us Apart, What Keeps Us Together? International Order, Justice and Value", Ljubljana, Faculty of Social Sciences, University of Ljubljana, Slovenia, 23-26 July, 2008, pp3-35.

أ. ئاستی سیاسی (وەك: هەرێمی کەتەلۆنیا لە ئیسپانیا، کیوبك لە کەنەدا).

ب. ئاستی ئابووری (وەك: ویلایەتەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەگشتی).

ت. ئاستی تەکنۆلۆجی و کولتووری و زانست و خوێندن، کە بەگشتی ئاستێکی فرەڕەهەندە (وەك: ویلایەتەکانی ئەڵمانیا بەگشتی).

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین، کە (هەرێمی کوردستان) هەوڵی داوە لە ئاستە جیاوازەکاندا وەك ئەکتەرێکی نێودەوڵەتی دەربکەوێت و کارو چالاکیی خۆی بکات، هەرچەندە ئاستەنگ و تەنگوچەڵەمە زۆرن لە بەردەمیدا، بەڵام هەنگاوەکانی دەستپێکردووەو توانیویەتی قۆناغێکی باش ببڕێت، لەوەی کە بتوانێت هەرچەندە تا ئێستا لە چوارچێوەی (عێراق)دا ماوەتەوە، وەك ئەکتەرێکی دیار لەو و جیا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەربکەوێت و مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لەبەر ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی بواری دبلۆماسیی و پراکتیزەکردنی بەخۆیەوە بینیوە، (د. عەتا موحەممەد ساڵح زوهرە)، بەپێی چەند پێوەرێك، پۆلێنیکی فراوانتری بۆ جۆرەکانی دبلۆماسی کردووە، بەم شێوەیە[1]:

**١. دبلۆماسی بەپێی ژمارەی لایەنە بەشداربووەکانی:**

أ. دبلۆماسیی دوولایەنە. ب. دبلۆماسیی فرەلایەنە.

**٢. دبلۆماسی لەڕووی ئەو لایەنانەی کە مومارەسەی دەکەن:**

أ. دبلۆماسیی نێراوە دبلۆماسییەکان.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٩١-١٣١.

ب. دبلۆماسیی لووتکە.

ت. دبلۆماسیی جەماوەریی.

**٣. دبلۆماسی لەڕووی بابەتەکانییەوە:**

أ. دبلۆماسیی هاوپەیمانییەتەکان – دبلوماسیة المحالفات (Alliance Deplomacy): کە مەبەست تێیدا بەستنی پەیماننامەو هاوپەیمانێتییە و زۆرجار ماوەیەی چەند مانگێک یان چەند ساڵێك دەخایەنێت. وەك: هاوپەیمانێتییە سەربازییەکان بۆ بەرگریی هاوبەش، کە هەر لە دێرزەمانەوە بۆ باڵانسی هێز یان ململانێ و هەژموونکردن... بەکارهاتوون،لە ئێستادا (رێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی "ناتۆ") دیارترین نموونەیە.

ب. دبلۆماسیی ئابووری (Economic Deplomacy): مەبەست لێی ئەو چالاکییە ئابوورییانەیە، کە فاکتەری ئابووری تێیاندا بۆ مامەڵەی سیاسی بەکاردێت. کە بۆ سزادان، یان پاداشتکردن، یاخود هاوسەنگیڕاگرتن... بەکاردێت، وەك: دبلۆماسییەتی دۆلار، یان دبلۆماسییەتی کۆمەکی ئابووری، کە زۆرجار بۆ رێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی بیر یان ئایدیۆلۆجییەتێکی دیاریکراو (بۆ نموونە: شیوعییەت) بەکارهاتووە، یان بۆ بڵاوکردنەوەی سیستمێکی ئابووریی دیاریکراوی (وەك: ئابووریی بازاڕ) و بڵاوکردنەوەی کولتوور و هەژموون بەکارهێنراون.

ج. دبلۆماسیی خۆپارێزی – الدبلوماسیة الوقائیة ( Preventive Deplomacy): مەبەست لەو چالاکییانەی یەکە نێودەوڵەتییەکانە، بەتایبەت نەتەوەیەکگرتووەکان، کە ئامانج تێیاندا رێگریکردنە لە تەقینەوەی ململانێکان و سنووربۆدانان و چارەسەرکردنییەتی لە حاڵەتی رووداناندا.

واتە دبلۆماسیی خۆپارێزی بریتییە لە گرتنەبەری ڕێگەچارەی ئاشتییانە لە ڕێگەی دانوستانەوە، لە پێناو ڕێگرتن لە سەرهەڵدان یان تەقینەوەی ناکۆکی لە نێوان یەکەنێودەوڵەتییەکاندا و ڕێگریکردن لە بەرزبوونەوەو توندبوون یان زیادبوونی ئەو ناکۆکییانەی کە هەن و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان لە ڕێگەی دانوستان و لێکۆڵینەوە و نیوەندگیری و یەکخستن و تەحکیم و چارەسەری دادوەرییانەوە[1].

د. دبلۆماسیی قەیرانەکان – دبلوماسیة الأزمات ( Crisis Deplomacy): مەبەست لەو هەوڵە دبلۆماسییانەی زلهێزەکانە، کە بۆ بەڕێوەبردنی قەیرانەکان پێی هەڵدەستن، کە بەپێی سروشتی پەیوەندیی نێوان لایەنەکانی قەیرانەکان و جۆر و ئاستی ئامانجەکانیان دەگۆڕێت. زۆرجار هەڕەشەو پڕوپاگەندە و سیخوڕی و لایەنی سێیەم و...هتدی تێدا بەکاردێت.

ه. دبلۆماسیی کولتووری – الدبلوماسیة الثقافیة ( Cultural Deplomacy): بریتییە لەو هەوڵە دبلۆماسییانەی، کە ئامانج تێیاندا دروستکردنی گۆڕانکارییە لە دیدی دەوڵەتانی تر، بەرانبەر بەو دەوڵەتەی کە پێیان هەڵدەستێت، بەشێوەیەك کە کاریگەریی لەسەر جۆری ڕەفتاریان بکات، لە هەمان کاتدا پشتگیریی جەماوەریی بۆ کولتوورێکی دیاریکراو بەدەستبهێنێت، بە شێوەیەك، کە وابکات قبوولکردنێکی باش هەبێت بۆ سیاسەتەکانی لە دەرەوەی سنووری خۆی، واتە پشتیوانیی جەماوەریی دەرەوە بۆ سیاسەتەکانی مسۆگەربکات، بە جۆرێك بتوانێت پەیوەندیی

---

(١) بڕوانە: د.عدنان خزعل عباس الجبوري، الدبلوماسیة الوقائیة وأثرها في معالجة الخلافات: دراسة مقارنة بین الشریعة الإسلامیة والقانون الدولي، مجلة مداد الآداب، الجامعة العراقیة، کلیة الآداب، المجلد: ١، العدد: ١١، ٢٠١٥، ص٥٢٧.

جێگیر و رایەڵەی دۆستانە لەنێوان گەلاندا دروستبکات. لە ئێستادا رۆڵی کولتوور و بەهاکان لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا زیادیکردووە، بۆیە لە بواری دبلۆماسییشدا ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە گەشەی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە، چونکە هۆکارەکانی گەیاندنی گەلان بە یەکتری و دید و تێڕوانینی هاوبەش بۆ کێشە و گرفت و خواست و داواکارییەکانی گەلان بەردەوام لە زیادبووندان.

**دبلۆماسی لەڕووی ئەو شێوازەوەی کە وەریدەگرێت:**

أ. دبلۆماسیی کلاسیکی: لە تایبەتمەندییەکانی: دێرینە، نهێنییە، لایەنەکانی سنووردارن.

ب. دبلۆماسیی پەرلەمانی: لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی: ئاشکرایی، دیموکراسی، کۆمەڵێبوون، فرەیی بوارەکانی چالاکیی دبلۆماسی.

**٤. جۆرەکانی دبلۆماسی لەڕووی خێراییەوە:**

أ. دبلۆماسیی لەسەرخۆ (الدبلوماسية الهادئة): ئەو چالاکییە دبلۆماسییانەیە، کە ماوەیەکی زۆری دەوێت، رەنگە چەند ساڵێك بخایەنێت، بۆیە پێویستی بە ئارامی ولەسەرخۆیی هەیە، چونکە ئامانجی گەیشتنە بە دەرەنجامگەلێکی جێگیر. ئەم دبلۆماسییەتە بە چەند شتێکەوە بەستراوەتەوە:

- سیاسەتێکی دەرەکیی دوورمەودا.
- بابەتگەلێکی ستراتیجی و دوورمەوداکانی وەك: چەکداماڵین و رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی.
- بابەتگەلێکی ئابووریی گرنگی وەك: گەشەپێدان و بازرگانیی دەرەکی.

دیاترین نموونه دبلۆماسییەتی بەریتانیی بووە لـە هەوڵـەکانی بـۆ مـاوەی دوو سەدە، بۆ هێشتنەوەی هەژموونی خۆی بەسەر ئـەورووپادا، ئـەویش لـە ڕێگەی باڵانسی هێزەوە، چونکە دەیزانی دروستبوونی هێزێکـی هـەژموونکار بەسەر ئەورووپادا، مەترسی بۆ ئاسایيشی ئەو دروستدەکات.

ب. دبلۆماسیی مەکۆ (دبلوماسية المكوك – Shuttle Deplomacy): مەبەسـت لـەو چـالاکییە دبلۆماسـییانەیە وەزیرانـی دەرەوە، یـان سـەرۆکی دەوڵـەتان لـە ماوەیـەکی کورتـدا بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەیەکی نێودەوڵـەتی ئەنجامیـدەدەن. وەك: هەوڵـەکانی (هنـری کیسـەنجەر) لـەنێوان (قـاهیرە و دیمەشق و تەلئەبیب)، لە کاتی جـەنگی ئۆکتۆبـەری (١٩٧٣) لـەنێوان عـەرەب و ئیسرائیلدا. دبلۆماسیی مەکۆ پشت بە چەند ڕەگەزێك دەبەستێت:

– شارەزایی تەواوی دبلۆمات.

– بەشبەشـکردنی کێشـەکان و وەرگـرتنی بەشـێکی کێشـەکان و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان، بۆیەهەندێك لە پسپۆڕان بە دبلۆماسیی هـەنگاو بە هەنگاو (Step by Step Diplomacy –) ناوی دەبەن.

– خێرایی لە چالاکی و جموجووڵدا.

ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە مەترسی و کەموکوڕیی خۆی هەیە، لەوانە:

– زۆرجار وادەکات، کە وابزانین چارەسـەرێکی زۆربـاش دەهێنێـت بـۆ کێشـەکان، بـەبێ ئـەوەی ئـەم گەشـبینییە بەهانەیـەکی لـۆژیکی و واقیعیـی هەبێت، یان وا دەکات سەرۆکی وڵاتـان بگەنـە ڕێککـەوتنێکی ناپێگەیشـتوو، بەتایبەت ئەگەر لەماوەیەکی کورتدا تەواو کرابێت.

– زۆرجـار تێیـدا ڕێککـەوتن لەسـەر شـتێك دەکرێـت، کـە گەوهـەری کێشەکان نییە.

- زۆرجار سیاسییەکان، نەك دبلۆماتکارە پرۆفیشناڵەکان ئەم جۆرە دبلۆماسییەتە ئەنجامدەدەن، ئەمەش، لای هەندێك لە پسپۆڕان، جێی مەترسییە، چونکە مەرج نییە هەموو سەرۆکێك یان سیاسییەك دبلۆماتکارێکی سەرکەوتوو بێت.

لە ئێستادا زۆریی کێشە و ناکۆکی و قەیرانە نێودەوڵەتییەکان لەلایەك و ئاسانیی پەیوەندیکردن و هاتوچۆکردنی نێوان دەوڵەتان لەلایەکی ترەوە، وایان کردووە دبلۆماسیی مەکۆ فراوان و بەربڵاو بێت.

چەند پۆلێنێکی تر کراون بۆ دبلۆماسی، کە جەخت لەسەر فرەیی جۆر و ئاست و میکانیزم و شێوازەکانی مومارەسەکردنی دبلۆماسیی و تەواوکاریی نێوانیان دەکەنەوە.

لە دیارترین ئەو پۆلێنانە ئەو پۆلێنەیە، کە دبلۆماسیی بۆ پێنج ڕێگە دابەشکردووە، کە بە ڕێگەکانی دبلۆماسی (Tracks Diplomacy) ناسراون، لەو پۆلێنەدا گرنگی بەو چالاکییانە داوە، کە هەریەکێك لە ڕێگەکانی دبلۆماسی پێی هەڵدەستن، بەم شێوازەی خوارەوە[1]:

١. دبلۆماسی ڕێگەی یەکەم (فەرمی): ئەو دبلۆماسییە فەرمییەیە، کە دەوڵەتان لە ڕێگەی نێراوە دبلۆماسییە کاتی و هەمیشەییەکانیانەوە، یاخود لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی نامەوە ئەنجامیدەدەن.

٢. دبلۆماسیی ڕێگەی دووەم: ئەو هەوڵانەیە کە کەسانی نافەرمی پێی هەڵدەستن، لەوانەی کە تا ڕاددەیەکی باش شارەزان لە پاراستنی ئاشتی و

(1) John W. MckDonald , Multi-Track Diplomacy: Conflict Resolution for the New Century,University of British Columbia, Faculty of Law, http://www.politics.ubc.ca/index.php?id=9976,12/09/2008

دیالۆگ و پێکـەوەژیان و هەوڵـدەدەن، لـۆجیکی بـەکارهێنانی هێـز وەلابنرێـت و هانی پەیوەندی و هاریکاریی لەنێوان کۆمەڵگە دابەشبووەکاندا دەدەن، بەمـەش هــەوڵی دروســتکردنی تێگەیشــتنی هاوبــەش لــەنێوان کۆمەڵگــە جیاوازەکانــدا دەدەن، کۆشـش بـۆ دروسـتکردنی جیهانێـك دەکـەن، کـە تێیـدا هاریکـاری و پشتیوانیی هاوبەش بەسەر سیاسەتی بـەکارهێنانی هێـزدا زاڵ بێـت، لـە هـەمان کاتدا پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان لەسـەر بنـەمای پەیوەنـدیی نێـوان گـەلان، نەك لەسەر بنەمای پەیوەندیی نێوان سیستمەکان، بوەستێت.

٣. دبلۆماسیی ڕێگەی سێیەم: ئەم جۆرەیـان بـە دبلۆماسـیی هـاوولاتی ناسراوە، کە بریتییە لە دیدارە نافەرمییەکانی نێوان دەوڵەتان، بە مەبەستی نزیککردنـــەوەی دیـــد و بۆچـــوونەکان و پشـــتیوانیکردنیان لـــە ڕێگـــەی ناوەندەکانی توێژینەوە، بە ئامانجی بـەدیهێنانی ئاشـتی و دیـالۆگ لـەنێوان گەلانــدا، لــەپێناو بــەدیهێنانی ئامانجــەکانی سیاســەتی دەرەوە. لێــرەدا مەبەست لەو کۆنگرە نێودەوڵەتییانەیە، کە پشت بەو بەشدارانە دەبەسـتێت کـە نادەوڵـەتین، بـە ئامـانجی دۆزینـەوەی ڕێگەچـارە ئەلتەرناتیڤـەکان بـۆ چارەسەری دۆزەکانی سیاسەتی دەرەوە. هەروەها ئـەم جـۆرە دبلۆماسـییە ئاماژەیــە بــۆ بــواری بازرگــانی و ئــابووری و کــەرتی تایبــەت و کۆمپانیــا فرەڕەگەزەکان و ئەو کارلێکانەی، کـە لەنێوانیانـدا ڕوودەدەن، بـە ئامـانجی بەهێزکردنی هەلی کار و پشتیوانیکردنی دامەزراوە ئابوورییەکان.

٤. دبلۆماسـیی ڕێگـەی چـوارەم: بـە دبلۆماسـیی گـەل بـۆ گـەل، یـان دبلۆماســیی هــاوولاتی ناســراوە، کــە بنکەیــەکی فــراوان دەڕەخســێنێت، کــە ئاسانکاری بۆ گـەل دەکـات، کـە چوارچێوەی مومارەسـەی دبلۆماسـی فـراوان بکــات و هاوســۆزی زیــاتر دروســتبێت، لــە ڕێگــەی ئــاڵوگۆڕکردنی شــارەزایی

لەنێوخۆیانــدا، ئــەم جــۆرە ئــاڵوگۆڕەش سەردەکێشــێت بــۆ دروســتکردنی پەیوەندییــەکی بــاش لەگــەڵ خەڵکــدا و ســەرکەوتنی پرۆژەکــان و بــەدیهێنانی ئامانجــەکانی سیاســەتی دەرەوە. ئــەم جــۆرە دبلۆماســییە تایبەتــە بــە بــوارە زانســتی و ئــەکادیمی و کولتــووری و فێرخــوازی و خوێنــدکاری و هونــەری و وەرزشییەکانەوە.

٥. دبلۆماســیی ڕێگــەی پێنجــەم: لــەم جــۆرە دبلۆماســییەتەدا ڕۆڵــی ئامرازەکــانی ڕاگەیانــدن و پەیوەنــدی و ڕای گشــتی لــە بــواری پەیوەندییــە نێودەوڵەتییــەکان و سیاســەتی دەرەکیــدا دەردەکــەوێت، لــەپێناو بــەدیهێنانی ئاشتی و هاریکاری لەنێوان گەلاندا، بۆیە هەوڵی هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگــەکان دەدەن، لە ڕێگەی بەردەستخســتنی زانیــاری و بیرۆکــەکان و تیشکخســتنە ســەر کولتــوور و پێداویســتییە نیشــتمانییەکانی تــر، پاشــان بەرزکردنــەوەی ئاســتی هۆشیاریی خەڵکی لەسەر پرسەکانی ئاشتی و سیاسەتی دەرەکی و گۆڕاوەکــانی سیاســەتی نێودەوڵــەتی. ئــەم جــۆرە دبلۆماســییە هاوکــارێکی باشــی ئاســتی سێیەمی دبلۆماسییە، بەتایبەت ناوەندەکانی توێژینەوە، لە ڕێگەی بــرەودان بــە چــەمکەکانی ئاشــتی و هاریکــاریکرنی لــە شــرۆڤەکردنی ناکۆکییــەکان و پێشبینیکردن بۆیان. جگــە لــەوە ئــەم ڕێگــە دبلۆماســییە کــار بــۆ دروســتکردنی ئاشتی دەکات، هاوکار دەبێت بۆ ئەو کەسانەی لە سلکی دبلۆماسیی فــەرمی و نافەرمیدا کاردەکەن.

بەهۆی فراوانبوونی بوارەکانی مومارەسەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و کاری دبلۆماسی، چەند ڕێگەیەکی دبلۆماسیی تر دەرکەوتوون، لەسەر ئــەو بنەمایە داڕێژەرانی ئەم پۆلێنە ئەو ڕێگە دبلۆماسییانەیان فــراوانتر کــردووە، لەژێر ناوی "دبلۆماسیی فرەڕێگە"، و لە پۆلێنێکی نوێدا وایان لێکردووە، کە

نۆ ڕێگەی جیاواز و تەواوکەری یەکتری لەخۆ بگرێت، واتە چوار ڕێگەی تریان بۆ زیادکردووە، کە بریتین لە:

- ئایین.
- گرووپەکانی ئاشتی بۆ نەهێشتنی جەنگ، کە لە بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکاندا خۆی دەبینێتەوە.
- توێژینەوەو ڕاهێنان و فێرکردن.
- کاری خێرو چاکە و هاوکاریی (کۆمەڵەکانی هاوکاری و پارەکۆکردنەوە).

شیاوی باسە هەموو ئەم ڕێگە دبلۆماسییانە تەواوکەری یەکترین و پەیوەستن بەیەکەوە و هەریەکێکیان گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە بە هاوکاریی نێوانیان دەتوانرێت ئامانجە باڵاکانی دبلۆماسیی بەدیبهێنرێت. داڕێژەرانی ئەم پۆلێنە لە شێوەیەکدا ئەم پۆلێنەیان زیاتر ڕوونکردووەتەوە. (بڕوانە هێڵکاریی ژمارە(٢) )

دیارە بەم جۆرە پۆلێنە، توانیویانە دیوە جیاوازەکانی مومارەسەکردنی دبلۆماسیی بخەنەڕوو، پەیوەندیی نێوانیان لێکبدەنەوە، کە هەریەکەیان میکانیزمی تایبەت بەخۆی هەیە و لە هەندێك باردا دژ بەیەك و لە هەندێك باری تردا تەبا کاردەکەن، بۆ نموونە: دبلۆماسیی هاوولاتی مەرج نییە هەمیشە بە ئاڕاستەی دبلۆماسیی فەرمی کاربکات، بەڵام زۆربەی کات دەوڵەتان هەوڵدەدەن جۆرە نافەرمییەکانی دبلۆماسیی لە خزمەتی دبلۆماسیی فەرمیی خۆیان و سیاسەتی باڵا و ستراتیجییەتی نیشتمانیی خۆیان بەکاربهێنن.

## هێڵكاری ژماره (٢)

## پۆلێنی ڕێگەكانی دبلۆماسیی (دبلۆماسیی فرەڕێگە)[١]




---

(1) Ibid.

## بەشی چوارەم: دبلۆمات

- ئامانج لەم بابەتە:

١. ناساندن و پۆلێنکردنی کەسانی دبلۆمات و مەرجەکانی دیاریکردنیان.
٢. روونکردنەوەی کاریگەریی کەسی دبلۆمات لەسەر کاری دبلۆماسیی. هەرچەندە کاری دبلۆماسی بە یاساو ڕێسای تایبەت ڕێکخرابێت، دەبینین جۆرو شێوازی مامەڵەو زانستی کەسی دبلۆمات کاریگەریی خۆی لەسەر پڕۆسەی دبلۆماسی بەگشتی جێدەهێڵێت.
٣. ئاشنابوون بە خووڕەوشت و هەڵسوکەوتی کەسی دبلۆمات، بۆئەوەی جوانترو باشتر لە کارەکانی تێبگەین.
٤. دیاریکردن و زانینی ناوونیشان و ڕێژەو سنووری دەسەڵات و جۆرەکانی دبلۆماتکاران.
٥. تێگەیشتن لە گرنگترین ئەو کارە هاوبەشانەی، کەلەنێوان دبلۆماتکاراندا هەیە.

- ناوەڕۆکی بابەتەکە:

**دەستپێك..**

هەردەوڵەتێك پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لە ڕێگەی دەزگاگەلێکی پسپۆڕەوە بەڕێوەدەبات، کە پێویستە کەسانێك کاری تێدابکەن خاوەنی چەند سیفەتێك بن، کە وایان لێبکات بتوانن بەتەواوی بەکاری خۆیان هەستن، بەو کەسانە دەوترێت دبلۆمات.

## باسی یەکەم: چەمکی دبلۆمات و جۆرەکانی

زاراوەی دبلۆمـات زاراوەیـەکی فراوانـە، سـەرۆکی دەوڵـەت و وەزیرەکـان و ئەندامانی نێراوە دبلۆماسییە هەمیشـەیی و کاتییـەکانیش دەگرێتـەوە. هەریـەك لەمانەش بەپێی پلە و پۆست و کارەکانیان پارێزبەندی و جیاوکیان هەیە.

با بزانین زاراوە و چەمکی دبلۆمـات چـییە و ئـەو کەسـانە کـێن، کـە ئـەو سیفەتە هەڵدەگرن و ئەو مەرجانە چین، کـە پێویسـتە لـە کەسـی دبلۆماتـدا بوونیان هەبێت و پلەی دبلۆماتەکان چەندن و چین..

**یەکەم: چەمکی دبلۆمات:**

ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتیی دەوڵەتەکانیان لـە دەرەوە دەگرنەئەسـتۆ زۆر ناویـان لێنـراوە. وشـەی (Diplomat) هـەرجارەی بـە شـێوەیەك راڤەکراوە، دیارترینیان ئەمانـەن: (نوێنـەری دبلۆماسـی، دەزگـای ناوەنـدیی کاروباری دەرەکی، نێراوە دبلۆماسییەکان، دەستە دەرەکییەکان، خزمـەتی دەرەکی، وەکیلە دبلۆماسییەکان، نوێنەرە سیاسییەکان)[١].

**رێککەوتننامەی ڤیـەننا بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکانی سـاڵی (١٩٦١)** وشـەی (Diplomatic Envoys)ی بـۆ ئـەو کەسـانە بـەکارهێناوە، کـە نوێنەرایەتیی وڵاتەکانیان لە دەرەوە لەئەستۆدەگرن، ئـەم وشـەیەش لـە زمـانی عەرەبیـدا بـۆ وشـەی (المبعوثـون الدبلوماسـیون-نێـراوە دبلۆماسـییەکان) وەرگێڕاوە. لە زمانی کوردیشدا وشەی "دبلۆمـات"، یـان "دبلۆماتکـار" بـۆ ئـەو چەمکە بەکارهاتووەتەوە.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهیل حسین الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٠٢.

**ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکانی ساڵی (١٩٦٣)**ش وشەی کونسوڵ (Consul)ی بۆ ئەو کەسانە بەکارهێناوە، کە چاودێریی بەرژەوەندیی هاوڵاتییەکانیان دەکەن لە دەرەوە، لە زمانی کوردی و عەرەبیشدا وشەکە بە "کونسوڵ" و "القنصل" ماوەتەوە بەبێ وەرگێڕان.

بەڵام **ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩)** ناوی لێناون "نوێنەرانی دەوڵەت".

بەهەرحاڵ دبلۆمات ئەو کەسانەن، کە نوێنەرایەتییکردنی دەوڵەتەکانیان لە دەرەوە لەئەستۆدەگرن.

**دووەم: سەلماندنی سیفەتی دبلۆماسی:**

لە زۆربەی دەوڵەتاندا وەزارەتی دەرەکی هەڵدەستێت بە دانانی لیستێك بۆ ناوی ئەو کەسانەی، کە نێراوی دبلۆماسیی دانپێدانراون لەلای خۆی لەوانەی، کە سیفەتی دبلۆماسییان هەیە. لەسەر داوای ئەو دەستە نێراوە دبلۆماسییەی کە کەسە دبلۆماتەکە کاری تێدادەکات، پێناسێکی تایبەتیان پێدەدرێت، کە سیفەتی دبلۆماسییان بسەلمێنێت(١).

کەواتە **پاسپۆرتی دبلۆماسیی** بریتییە لەو دۆکیومێنتی گەشتکردنەی، کە سیفەتی فەرمی و نماییندەکاریی هەڵگرەکەی دیاریدەکات، بۆ ئاگاداربوونی دەزگاکانی ئاساییش و سنوورەکان و گومرگ و...هتد، لەو وڵاتەنانەی کە

---

(١) م.ن، ص ص١٠٣.

گەشتیان بۆ دەكات، بەتايبەت لای ولآتی خانەخوێ، هەروەها ئەو بەڵگەنامە ئاسانكارييە ياساييە نێوخۆييەكانی ئەو ولآتانەيان بۆ دەستەبەردەكات(١).

پاسپۆرتی دبلۆماسی بە ئەندامانی خزمەتی دبلۆماسی و خێزانەكانيان و ئەندامانی باڵای حكومەت و دبلۆماتكاران بە گشتی دەدرێت. لە كاتی پێويستيشدا بە كەسايەتييەكانی وەك خانەوادەی پادشايی، دەدرێت، هەندێكجار رێگە بە دبلۆماتكارەخانەنشينەكانيش دەدرێت كە پارێزگاريی لێ بكەن و پێيان بمێنێت. باشتر وايە پارسپۆرتە دبلۆماسييەكان بۆ چەند جۆرێك پۆلێن بكرێن، چونكە هەندێكجار ئەو پاسپۆرتە بۆ ئاسانكاريی بە كەسانێك دەبەخشرێت بۆ سەردانی نەخۆشی يان كاری پێويست سوودی لێوەردەگرن(٢) (٣).

كەوتە پێويستە تێبينيی ئەوە بكرێت، كە مەرج نييە هەركەسێك پاسپۆرتی دبلۆماسيی پێبێت، بە دبلۆمات هەژماربكرێت، چونكە دەوڵەتان پاسپۆرتی دبلۆماسيی دەبەخشنە هەموو ئەندامانی دەستە نێراوەكە و زۆرێك لەو فەرمانبەرانەی، كە سەردانی دەرەوە دەكەن، جا مومارەسەی كاری دبلۆماسيی بكەن، يان نا، ئەويش لەپێناو كارئاسانيی بۆيان. بە مانايەكی تر پاسپۆرتی دبلۆماسيی هەميشەيی، كە دەدرێت بە دبلۆماتكاران جياوازە لەو دۆكيۆمينتە، يان ڤيزە دبلۆماسييەی كە بۆ يەكجار، يان چەند گەشتێك دەوڵەت بۆ ئاسانكاريی دەيبەخشێت بە هەندێك لە هاووڵاتيانی، بۆيە پێويستە بۆ زانينی دبلۆمات بوون، يان نەبوونی هەركەسێك بگەڕێينەوە بۆ ليستی ئامادەكراوی

---

(١) د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٤٨.

(2) See: A Dictionary of Diplomacy, G. R. Berridge and Alan James, PALGRAVE MACMILLAN, New York, 2003,p.77.

وەزارەتــی دەرەوە بــۆ نــاوی دبلۆماتــەکان. ئــەو لیســتە زانیــاریی نهــێنی لەخۆناگرێت، لە هەندێك دەوڵەتدا دەتوانرێتبەئاشکرا بشفرۆشرێت[١].

نــەریتی نێودەوڵــەتی وایــە، کــە وەزارەتــی دەرەوە خــۆی لایەنــە پەیوەندیــدارەکان ئاگاداربکاتــەوە، لــە نــاوی ئــەو کەســە دبلۆماتانــەی لــە دەوڵەتەکەیدا کاردەکەن، نەك پشت بە پاسپۆرت، یـان پێناسـی دبلۆماسـیی ببەسترێت[٢].

پێویستە فەرمانگەکانی هەردەوڵەتێك لـە ناوونیشـانی کەسـە دبلۆماتـەکان و پارێزبەندی و جیاوکەکانیان ئاگاداربن، ئەگەر نا، ئەوا بەپێچـەوانەوە کاردەکـەن —بۆ نموونە: باجێك لە دبلۆمـات دەسـێنن کـە نایگرێتـەوە—، ئەمـەش زیـان بـەو دەوڵەتەو پەیوەندییەکانی دەگەیـەنێت. پێویسـتە ئـەوەش بـزانین دوای ئـەوەی وەزارەتی دەرەوە فەرمانگە پەیوەندیدارەکانی، وەك دادگاکـان و گومرگـەکانی، لە لیستی کەسە دبلۆماتەکان و پارێزبەنـدی و مافـەکانیان ئاگـادارکردەوە، ئـەوا جێبەجێکردنی ئەو پارێزبەندی و مافانە دەبێتـە تایبەتمەنـدیی ئـەو فەرمانگانـە، هەروەها وەزارەتی دەرەوە ماف چاودێریکردنی بڕیارەکانیانی نابێت. کـاتێکیش وەزارەتــی دەرەوە جــەختی لــەوە کــردەوە، کــە کەســێك ســیفەتی دبلۆماســیی هەیە، ئەوا بڕیارەکەی بڕیاری کۆتاییــەو دروســتنییە لەبــەردەم هــیچ دادگایەکـدا تانەی لێبدرێت سەبارەت بە دبلۆماتەکان[٣].

---

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٦٩،٨٢.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٠٣.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص١٠٣-١٠٤.

سەبارەت بە دیاریکردنی ژمارەی ئەو دبلۆماتانەش، کە لە باڵوێزخانەی دەوڵەتێکدا لە دەوڵەتێکی دی بوونیان دەبێت، ئەوا ئەو دەوڵەتە ئازادە لە دیاریکردنیدا، بەڵام بەمەرجێك زیادەڕۆیی تێدا نەکرێت و لە سنووری مەعقولدا بێت، ئەمە وێڕای رەچاوکردنی ئەو بارودۆخ و بنچینانەی، کە لە دەوڵەتی میوانداردا باوە، هەروەها بە خوێندنەوەی پێداویستییەکانی باڵوێزخانەکە. ئەو دەوڵەتەشی باڵوێزخانەکەی لێیە بۆی هەیە زیادەی ژمارەی دبلۆماتەکانرەتبکاتەوە[١].

## سێیەم: سیفەتەکانی دبلۆمات:

دبلۆماسی زانست وهونەرە، سەبارەت بەوەی کە زانستە پێویستە مومارەسەکردنی لەلایەن کەسانێکەوە بێت، کە زانیاریی تەواویان لەسەر رێساکانی ئەو زانستە هەبێت لە رێگەی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و مومارەسەی بەردەوام و گەڕان بەشوێن سەرچاوە زانستییەکانی ئەو بوارەو شارەزابوون لێیان. سەبارەت بەوەش، کە هونەرە ئەوا پێویستە کەسی دبلۆمات بەهرەگەلێکی هەبێت، کە شیاوی بکات بۆئەوەی بتوانێت بەو کارە هەستێت. بەهرەی گوزارشتکردن لەو هونەرە بەباشی و بوونی کەسایەتییەکی بەهێز و هۆشمەندی و وریایی لە مەرجە سەرەکییەکانی ئەم کارەن.

پێش ئەوەی بەوردی باس لە مەرج و تایبەتمەندییەکانی دبلۆمات بکەین، پێویستە تێبینییەکی گرنگ بخەینەڕوو: کاتێك ئێمە باس لەو مەرج و

---

(١) م. ن. ص١٠٤.

تایبەتمەندییانە دەکەین، کە پێویستە لە کەسی دبلۆماتدا هەبن، وێنەی باشترین نموونە و ئاستی دبلۆمات دەکەین، کە وێنەیەکی باڵایە، بۆیە بەدیهاتنی ئەو مەرج و تایبەتمەندییانە لە کەسی دبلۆماتدا ڕێژەییە، چونکە لەلایەکەوە ئاستی مرۆڤەکان سنووردارە و ڕەنگە کەسێك نەتوانێت لەیەك کاتدا هەموو ئەو تایبەتمەندییانە لە خۆیدا بەرجەستەبکات، لەلایەکی ترەوە ئاست و توانای دەوڵەتان و یەکە نێودەوڵەتییەکانی تریش، لەرووی مرۆیی و ئیداری و زانستییشەوە جیاوازن و ئاسان نییە، هەموو یەکەیەکی نێودەوڵەتی بتوانێت دبلۆماتەکانی هێندەی دبلۆماتی بەو مەرج و تایبەتمەندییانەوە هەبێت، کە پێداویستییەکانی دەیخوازێت، بۆیە دەوڵەتان هەوڵدەدەن باشترین دبلۆماتکاریان بۆ ئەرکە قورس و گرنگەکان راسپێرن، لە هەمان کاتدا هەوڵدەدەن، لە ڕێگەی دەزگا و دامەزراوەی ئەکادیمیی تایبەتەوە، دبلۆماتکارانی خۆیان پێبگەیەنن و پەرە بەتواناکانیان بدەن، بۆئەوەی زۆرترین ڕێژەی ئەو مەرجانەیان تێدا بێتەدی، خۆ ئەگەر بژاردەکە لەنێوان کەسانێکدا بوو، کە مەرجە رووکەشییەکانیان تێدابێت، بەرامبەر کەسانێك کە مەرجەکانی گەوهەری دبلۆماتیان تێدابێت، ئەوا باشتروایە جۆری دووەمیان دیاری بکرێت و کاری دبلۆماسیی پێ بسپێرێت.

با بزانین دیارترین ئەو سیفەتانە چین، کە پێویستە لە کەسی دبلۆماتدا هەبن (مەرجەکانی کەسی دبلۆمات):

### ١. سەبارەت بە شێوەو ڕوخساری دەرەوەی دبلۆمات[١]:

أ. **ناوبانگ و ناوونیشان:** زۆر لە دەوڵەتان هەوڵدەدەن دبلۆماتەکانیان لەو کەسانە هەڵبژێرن، کە ناوبانگ و ناوونیشانێکی باش و بەرزیان هەیەو خزمەتیان بە مرۆڤایەتی کردووەو لەنێو خەڵکدا خۆشەیستن، زۆرجار نازناوی دبلۆمات دەبێتەهۆی ئەوەی ئەو کۆمەڵگەیەی کاری تێدادەکات دۆستایەتی لەگەڵدا بکەن. بەپێچەوانەوە ئەگەر دبلۆمات ناوبانگێکی خراپ و مێژوویەکی خراپی هەبێت، ئەوا کاریگەریی نێگەتیڤ دروستدەکات، لەسەر کارە دبلۆماسییەکەی.

ب. **جوانیی شێوە:** واتە دبلۆمات قۆز و جوان و جەستەرێك بێت و خاوەن پێداویستیی تایبەت نەبێت. دەوڵەتان هەوڵدەدەن کەسێکی ڕووخۆشی دەم بە زەردەخەنە بکەن، بە دبلۆمات بۆ بەدیهێنانی بەرهەم و دەستکەوتی باش، لە ڕێگەی کارە دبلۆماسییەکەیەوە، چونکە مرۆڤ بەبێ ویستی خۆی کەسانێکی ئێسکقورس و چارەتاڵیان خۆش ناوێت، ئەمە وێڕای ئەوەی، کە دبلۆمات دەنێرێت بۆ لای سەرۆك و گەورەبەرپرسانی دەوڵەتانی بیانی، بۆیە پێویستە کەسانێکی شێوەجوان بن. بەڵام نابێت ئەوەمان لەیادبچێت، کە پێویستە لە هەمان کاتدا دبلۆمات خاوەنی کەسایەتییەکی هاوسەنگ و سەنگین بێت و هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی خۆی بەپێی هەڵوێست و گۆڕانکارییەکان بگونجێنێت.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص١٠٥-١١٩. و د. هاني الرضا، م.س. ذ، ص ص٢٨١-٢٨٥. و د.ضرغام عبدالله الدباغ، قوة العمل الدبلوماسي في السياسة، دار آفاق عربية للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ص ص٨٩-٩٥.

ج. **<u>پاكوخـاوێنی و هارمۆنییـەتی جلوبـەرگ:</u>** پاكوخـاوێنیی جەسـتەو جلوبەرگ و شیكپۆشیی دبلۆمات یەكێكی ترە لەو مەرجانـەی، كـە پێویسـتە گرنگیـی تـەواوی پێبـدرێت، تەنانـەت پێویسـتە هارمۆنییـەت و رێكخسـتنێك هەبێت لە جلوبەرگی دبلۆماتدا، كە سەرنجی بەرانبەرەكانی رابكێشێت، بەڵام نابێت دبلۆمات لەرادەبەدەر گرنگی بە جلوبەرگ بدات، بە شێوەیەك لایەنـە مەعریفی و زانستییەكەی و لایەنی كولتووریی ئەو شوێنەی كاری تێدادەكات لەبیربكات، بەڵكو پێویستە لەگەڵ رێكوپێكی و پاكوخاوێنیی جلوبەرگەكەیدا گرنگی بەوە بدات، كە جۆرێك لـە سـادەیی پێـوە دیاربێـت، ئەمـەش بـەپێی وەرزەكان و كەشو هەواو كولتووری ئەو شوێنەی دبلۆماتی لێیە دەگۆڕێت.

## ٢. گەوهەری كەسێتیی دبلۆمات:

دبلۆمات تەنها پێویستی بە مەرجە ڕووكەشییەكان نییە، بەڵكو بۆئـەوەی وێنەكە تەواوبێت، پێویستە گرنگیی تەواو بە نـاوەڕۆكی كەسـێتیی دبلۆمـات بدرێت. دیارتینیشیان بریتین لە:

أ. زانیـاریی تایبـەت: پێویسـتە دبلۆمـات زانیـاریی وردی هـەبێت لەسـەر مێژوو و جوگرافیـا و كولتـوور و پێكهاتـەی سیاسـی و كۆمەڵایـەتی و ئـابووری و دامـــەزراوەیی و دانیشـــتووان و ســـامانی ئـــابووری و مرۆیـــی و كشـــتوكاڵی و پیشەسازیی وڵاتەكەی هەبێت، واتـە زانیـاریی سـەبارەت بـە هـەموو ئـەو شـتانە هـــەبێت، كـــە بـــۆ سیاســـەتی دەرەكیـــی و ژیـــانی دبلۆماســـیی و پەیوەندییـــە نێودەوڵەتییـەكان گـرنگ و پێویسـتن. هـەروەها پێویسـتە زانیـاریی لەسـەر ئـەو وڵاتـە، یـان ئـەو رێكخـراوە هـەبێت، كـە كـاری تێـدادەكات، یـان پەیوەنـدیی پێوەدەكات، یان دانوستانی لەگەڵدا دەكات، ئەمە وێـڕای ئـەوەی كـە پێویسـتە زانیاری لەسەر وڵاتانی زلهێـز و رێكخراوەكـان و ئاسـتی كاریگـەرێتییان هـەبێت.

هـەروەها پێویسـتە پرنسـیپە سـەرەکییەکانی شـێوازی بەڕێوەچـوونی کـاری دبلۆماسیی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و کـاری تـۆڕی فراوانـی باڵوێزخانـەو کونسوڵخانەکان بزانێت، ئاشنا بێت بە تۆڕی بازرگانیی نێودەوڵەتی و دامـەزراوە داراییەکان و شێوازی کاریان و ئاشنایەتیی هەبێت، بە پێکهاتـەو ڕۆڵ و شـێوازی کـاری نەتەوەیـەکگرتووەکان و پرنسـیپە گشـتی و بنەڕەتییـەکانی یاسـای نێودەوڵەتی، ئەمە وێڕای پەیبردنی بە ڕۆڵ و کاریگەریی شۆڕشـی تـەکنۆلۆجیا و زانیارییەکان لە دنیای کاری سیاسی و دبلۆماسیی و بوارەکانی تری ژیان[١].

ب. **زمانپاراویی دبلۆمات:**

پێویستە کەسی دبلۆمـات زمـانێکی پـاراوی هـەبێت، کەسـێکی قسـەزان بێت، بەشێوەیەك کە ئـەوەی لـە دڵیدایـە بتوانێـت بـە جـوانترین و باشـترین شـێوە بیگەیـەنێت بـە بەرانبەرەکـەی، تـا بتوانێـت سـەرنجی ڕابکێشـێت و قەناعـەتیپێبکات، هـەروەها پێویسـتە بـەپێی ئاسـتی تێگەیشـتنی قسەبۆکراوەکە وتەکانی ئاڕاستەبکات.

چـەکی دبلۆمـات زمانـە پاراوەکەیـەتی، ئەگـەر تـوانیی بەباشـی بـەکاری بهێنێـت، ئـەوا لـە وەرگـرتنی هەڵوێسـتەکان و بەرئەنجامەکانیشـیاندا سەرکەوتوودەبێت، پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە.

دەوڵەتان گرنگیی تەواو بە زمـانزانیی دبلۆماتـەکانیان دەدەن، بۆئـەوەی بەئاسانی پەیامی خۆیان بگەیەنن و ئامانجەکانیان بپێکن.

---

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٤٢-٤٣. و: د.عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٦٥-٦٧.

له دیارترین ئەو مەرجانەی کە پێویستە دبلۆمات لەکاتی قسەکردندا ڕەچاویان بکات بریتین له:

- خێرایی وەڵامدانەوەو تێگەیشتنی تەواو لە بەرانبەروەرگرتنی هەڵوێستی پێویست له بەرانبەرەکەی، جا بە بزاوتێك بێت بە سەر، یان برۆ، یان شانهەڵتەکاندن، یاخود به زمان بێت، یان به هەڵبژاردنی بێدەنگیی مەبەستدار.
- وردەکاری و ڕوونکردنەوەی تەواو له وتەکانیدا، واتە وتەو بابەتەکان تێکەڵ نەکات، بەڵکو هەربابەتێك و مافی خۆی بداتیٚ.
- قسەکردن به هێمنی و لەسەرخۆیی، تا گوێگر بتوانێت بەئاسانی لێی تێبگات.
- وتەکانی پچڕپچڕ و شێواو نەبن و له مەبەستی سەرەکی لانەدەن.
- جارجار بێدەنگییەکی کورت لەنێوان وتەکانیدا دروستبکات، کە بۆ تێڕامان و بیرکردنەوەی زیاتری قسەکەر و گوێگریش سوودبەخشە.
- دووبارەکردنەوەی زیاتر له جارێکی ئەو وشەو ڕستانەی، کە گرنگن و ئامانجی سەرەکیی بابەتەکەن، بۆئەوەی گوێگر بەتەواوی لێیان تێبگات و لەبەریان بکات.

بەپێی ڕێسا دروستەکانی ڕەفتاری دبلۆماسیی باشتروایە، دبلۆمات یەکەمجار دەست نەکات بە قسەکردن،بۆئەوەی بەتەواوی گویٚ لە بەرانبەرەکەی بگرێت تا بزانێت ڕاو بۆچوون و ئاستی داخوازی و هیواکانی ئەو چەندە، بەمەش بەرچاوی ڕۆشن دەبێت بۆ وەرگرتنی هەڵوێستی پێویست.

له لایەکی ترەوە، پێویستە دبلۆمات زمانی فەرمیی دەوڵەتەکەی خۆی بەتەواوی بزانێت، هەروەها گرنگیی دبلۆمات لەوەدا دەردەکەوێت، کە زمانی فەرمیی ئەو دەوڵەتەش بزانێت، کە کاری تێدا دەکات، چونکە گەر بە وەرگێڕان کارەکانی بەڕێ بکات ئەوا زۆرجار بەربەستێکی دەروونی لەنێوان گفتوگۆکارەکاندا دروستدەبێت، ئەمە وێڕای ئەوەی، کە هەندێکجار وەرگێڕەکە ئەرکەکەی خۆی بەباشی ئەنجامنادات، یاخود لە وەرگێڕانەکەدا هەڵەدەکات، یان لەبەر خێرایی قسەکەرەکان ناتوانێت لەگەڵیاندا وەرگێڕانێکی دروست ئەنجامبدات، ئەمەش سەردەکێشێت بۆئەوەی کە هەندێکجار بابەتگەلێکی گرنگ بەسەریدا تێپەڕێت. ئەمە جگە لەوەی کە هەندێکجار وەرگێڕەکان نهێنێتیی گفتوگۆکان ناپارێزێن، چونکە دەگونجێت وەرگێڕەکە سیخوڕی لایەکی تر بێت. بۆ لابردنی ئەم هەموو مەترسییە دەوڵەتان هەوڵدەدەن، دبلۆماتەکانیان فێری زمانی فەرمیی ئەو دەوڵەتانە بکەن، کە بۆیانی دەنێرن.

کەواتە لەگەڵ ئەوەی کە پەرەسەندنی تەکنۆلۆجیی بواری گەیاندن وەرگێڕانی ڕاستەوخۆی بەرهەمهێناوە، دەبینین تا ئێستاش باشترین ئامراز بۆ دانوستان، زانینی زمانی ئەو دەوڵەتەیە، کە دبلۆماتی بۆ دەنێرێت، چونکە دبلۆمات دەتوانێت راستەوخۆ ئەوەی دەیەوێت بیگەیەنێت و نهێنیی گفتوگۆکانیش بپارێزێت. تەنانەت دبلۆماتی سەرکەوتوو ئەوەیە کە زارە جیاوازەکانی ئەو زمانە بزانێت، چونکە یارمەتیی دەدات لە باش بەڕێوەبردنی کارەکەیدا.

### ت. زمانی دبلۆماسی[١]:

ئەگەر دبلۆمات زمانی ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراوە بەباشی نەزانی، ئەوا پێویستە زمانی دبلۆماسی بزانێت، کە بریتییە لەو زمانەی کە پێویستە کەسی دبلۆمات لەکاتی چاوپێکەوتن و کۆڕوکۆبونەوەکاندا لە قسەکانیدا و لە نامەکانیدا بەکاری بهێنێت.

زمانی دبلۆماسیی زمانێکی ڕەونەقدار و ڕێزدارانەو هاوسەنگە، زمانی دروستکردنی دۆستایەتییە، پێویستە خاوەنەکەی هیچ دیاردەو ڕووکەشێکی دوژمنکارانەو پێکدادانی پێوە دیارنەبێت، چونکە کاری سەرەکیی دبلۆمات دروستکردنی هاوڕێیەتی و دۆستایەتییە لەپێناو بەرژەوەندیی هاوبەش، بۆیە پێویستە تەنانەت لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگیش لەنێوان دەوڵەتەکەی و دەوڵەتانی تر وشەکانی بە هاوسەنگی و وریاییەوە بکات، گوزارشتگەلێك بەکاربهێنێت کە لایەنەکانی تر نەورووژێنێت، و هەوڵبدات بەهانە بۆ هەڵوێستەکانی دەوڵەتەکەی بهێنێتەوە، دووربکەوێتەوە لە هەڵەشەیی و تووڕەبوون.

هەروەها پێویستە دبلۆمات زاراوە دبلۆماسییە باوەکان بەباشی بزانێت، بەتایبەت ئەوانەی کە لەکاتی سەردانی بەرپرسان و وتەکانی بەخێرهاتندا بەکاردێن، چونکە هەڵەبەکارهێنانی ئەو زاراوانە ڕەنگە دەوڵەتەکەی دووچاری کێشە بکات. جگە لەمە پێویستە هەموو ئەو پارێزبەندی و جیاوکانە بزانێت، کە دبلۆمات هەیەتی.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە زمانی دبلۆماسی بڕوانە: د. فاضل زكي محمد، م.س. ذ، ص ص٤٣٣-٤٣٥. و: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١١٠-١١١.

بەڵام پێویستە دبلۆمات لە زمانی دبلۆماسیدا جۆر و ئاستی پەیوەندیی دەوڵەتەکەی لەگەڵ ئەو دەوڵەتەو پلە وپۆستی ئەو کەسەی کە چاوی پێی دەکەوێت، سەنگی دەوڵەتەکە و کات و شوێنی سەردان و چاوپێکەوتنەکە، بەهەند وەربگرێت، وتەی گونجاو بۆ شوێنی خۆی هەڵبژێرێت، نەك بۆ هەموو کاتێك کلێشەیەکی دیاریکراوی هەبێت و لە هەموو شوێن و کاتێکدا، بەرانبەر هەموو کەسێك دووبارەی بکاتەوە، چونکە ئەگەر وابێت وتەکانی دەبنە شتێکی ڕۆتینیی ئاسایی و کاریگەری دروستناکەن، لەگەڵ هەڵوێست و بارودۆخە جیاوازەکاندا نەگونجاو دەبن.

دەتوانین بڵێین، زمانی دبلۆماسی بۆ دەلالەتکردن لە سێ شت بەکاردێت[١]:

- ئەو زمانەی کە دبلۆماتکاران لە گفتوگۆ و نامەکانیانیاندا بەکاری دەهێنن.
- ئەو گوزارشت و ڕستە وێژەییانەی، کە بە تێپەڕبوونی کات بە درێژایی مێژوو بوون بە بەشێك لە زمانی دبلۆماسیی ئاسایی و لە کۆڕو کۆبونەوە فەرمییەکاندا بەکاردەهێنرێن.
- ئەو گوزارشتە نەرمانەی، کە چەند واتایەك لەخۆ دەگرن و یارمەتیی دبلۆمات دەدەن، کە بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ هەستی بەرانبەرەکەی بریندار بکات، ئەوەی دەیەوێت دەریببڕێت. بە واتایەکی دی، ئەو تەورییانەی کە بە لێزانانە و وریاییەوە بەکاردەهێنرێن، کە لە ڕێگەیانەوە دبلۆمات دەتوانێت وشەو ڕستەی زۆر بەهێز و پڕمانا ئاڕاستەبکات، بەبێ

---

(١) بەراورد بکە لەنێوان: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٦٧. و: ياسين ميسر عزيز العباسي، الحق في تبادل وانتهاء التمثيل الدبلوماسي: مع إشارة للتمثيل الدبلوماسي الإسلامي، أطروحة دكتوراه غير منشورة، معهد البحوث والدراسات العربية، قسم الدراسات القانونية، القاهرة، ٢٠١٢ ص١٨٤.

ئەوەی لایەنی بەرانبەر بورووژێنێت، یاخود سنووری رێز و موجامەلەی دبلۆماسیی ببەزێنێت. ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو وشەو رستانە دەبێت، کە لە رووکەشدا نەرمی و رێز و موجامەلەیە، بەلاّم لە ناوەڕۆکدا هەڕەشەو ترساندن، یان ناڕەزاییدەربڕینە.

لێرەدا بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتر، دیارترین زاراوەکانی زمانی دبلۆماسی و واتا راستەوخۆ و شاراوەکەیان، لە خشتەی ژمارە (٢)دا، خراونەتەروو.

## خشتەی ژمارە (٢) [1]

## زاراوەکانی زمانی دبلۆماسی و واتا راستەوخۆ و شاراوەکەیان

| پەیام | واتای راستەوخۆ | واتای شاراوە |
|---|---|---|
| دەستێوەردان | حوکومەتی ولاّتەکەم دەستەوسان بوەستێت بەرانبەر.... | حوکومەتی ولاّتەکەم بەشێوەیەکی کردەیی دەستێوەردان دەکات لە....... |
| گوزارشتکردن لە هەڵوێستی دەوڵەت سەبارەت بە پرسێك بە شێوازێکی توند | بەڕاستی حوکومەتی ولاّتەکەم بە دڵەڕاوکێیەکی توندەوە دەڕوانێتە.... | ئەو بابەتە لەو پرسانەیە، کە دەوڵەتەکە دەیەوێت هەڵوێستێکی توندی لە بەرانبەردا بگرێتەبەر. |
| تێکچوونی پەیوەندیی | حوکومەتی ولاّتەکەم | پەیوەندییەکان بە |

(١) بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٦٩. و: یاسین میسر عزیز العباسي، م.س.ذ، ١٨٥.

| | | |
|---|---|---|
| سیاسی | ڕێگه نادات به..... | کردەیی تێکچوون، ئەگەر بارەکە بەم شێوەیە بەردەوام بێت ئەوا سەردەکێشێت بۆ پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان |
| هەڕەشەی سەربازی و ئاگادارکردنەوەی کۆتایی بە زمانێکی نەرم | حوکومەتی وڵاتەکەم ئەو کارە بە کاری نادۆستانە دادەنێت، حوکومەتەکەم داوای وەڵامێك دەکات لەپێش کاژێر دەی سەرلە ئێوارەی../../.... | هەڕەشەکردن بە هێرشکردن، گوزارشتکرن لە ئاگادارکردنەوەی کۆتایی سەبارەت بە ناکۆکییەکی ئەوتۆ |

### ج. هۆشمەندی و وریایی دبلۆمات و ئاکار و ڕەفتارەکانی(١):

هۆشمەنــدیی و وریــایی و خۆشەویســتی و دەســتپاکی و خــاکیبوون و دامەزراوی و ڕاستگۆیی و بێوەیی و نەفسبەرزی و ئارامگری و ررقخواردنەوەو بەخشـندەیی، لـە سـیفاتە بـەرزەکانی دبلۆمـاتی سـەرکەوتوون، بۆئـەوەی بتوانێت لە خەڵك نزیك بێتەوەو ئەرکەکەی بەجوانی جێبەجێ بکات.

---

(١) بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: د. ضرغام عبدالله الدباغ، م.س.ذ، ص ص٨٩-٩٥. و د. سهيل حسين الفتلاوي، ص ص١٠٥-١١٩. و: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٢٥٩-٢٦٥. و: د. السيد أمين شلبي، م. س.ذ، ص ص١٨٩-٢٠٣.

ئەگەر دبلۆماتی سەرکەوتوو، لەسەردەمی دبلۆماسیی کلاسیکیدا، مەرج بوو کە بتوانێت لەسەر هەموو هەڵوێست و رووداوێکی وڵاتی پێشوازیکەر وەڵامی سێ پرسیاری سەرەکیی پێبێت: کێ؟ لەکوێ؟ بۆچی؟ واتە دبلۆمات لەسەر هەر بزاوتێکی سیاسی بتوانێت حوکومەتی وڵاتەکەی لەوە ئاگاداربکاتەوە، کە کێ بڕیادەربووە تێیدا، لە چ رێککەوت و شوێنێکدا، هەروەها ئایا بڕیارەکە دروستە، یان هەڵەیە[1]، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا پێویستە دبلۆمات شیکردنەوەی تەواوی هەبێت بۆ هەڵوێست و ڕووداوەکان و سەرچاوەی زانیارییەکان و ئاستی متمانەو بەهێزیی ئەو زانیارییانەش بخاتەڕوو، ئەمە وێڕای لێکدانەوەو پێشنیاری خۆی بۆ بڕیاربەدەستانی وڵاتەکەی.

کۆبوونەوەی هەموو ئاکارە بەرزەکان لە کەسی دبلۆماتدا کارێکی ئاسان نییە، بۆیە دەوڵەتان هەوڵدەدەن دبلۆماتەکانیان رابهێنن، کە لانیکەم لەبەرچاوی خەڵك و کامێرادا بتوانن ئەو ئاکارانە لە خۆیاندا پیشانی خەڵك بدەن، با لە واقیعیشدا وانە بن.

بەڕاشکاوی دەتوانین بڵێین: لە واقیعی ئەمڕۆدا زۆر لە دەوڵەتان بەو کەسە دەڵێن دبلۆماتی سەرکەوتوو، کە کەسایەتییەکی دوولایەنەی هەبێت، واتە بەپێی بەرژەوەندیی دەوڵەتەکەی هەڵوێست بنوێنێت، لە کاتی ئاشتیدا هەڵوێستەکانی بە ئاڕاستەی خێرو خۆشی و هاوکاریدا بن، لەکاتی جەنگ، یان ململانێیشدا هەڵویستەکانی بە ئاڕاستەی خزمەتکردنی بەرژەوەندیی دەوڵەتەکەی بن، لە چوارچێوەی ئەو ململانێیەدا، واتە بتوانێت بەپێی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. السيد أمين شلبي، م. س.ذ، ص١٧١.

بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی، لە خێر و شەڕدا، لە ئاشتی و ململانێدا، ڕۆڵی خۆی بەرجەستەبکات.

هەروەها پێویستە کەسی دبلۆمات چەند ڕەفتارێکی گشتی تێدا بێت، دیارترینیان: (ڕێزگرتنی بەرانبەر، هێمنی و بەزەییبوون، زانینی ئەتەکێتی کۆنگرەو چاوپێکەوتن و دانوستانەکان)، کە بریتییە لە زانینی ئەو ڕێسایانەی، کە لەو جۆرە دانیشتن و کۆنگرەو دانوستانانەدا پیادەدەکرێت، کە لەنێوان دەوڵەتاندا ئەنجامدەدرێن، بۆ نموونە: ڕێکخستن و ریزبەندی و پێشبەندی و پۆلێنکردنی شێوازی دانیشتن و کاتی قسەکردن، دەرنەچوون لە بابەتی باسەکان و پابەندبوون بە وادەکانەوە. هەروەها پێویستە کاتی قسەکردنی و گوێگرتن و وەڵامدانەوەی بەپێی ئەو ئاستە بێت، کە ئەو نمایندەیی تێدادەکات بۆ دەوڵەتەکەی، هەروەها بەپێی پێگە و سیفەتی دەوڵەتەکەی بێت لەو دانیشتنەدا، ئایا سەرۆکی دانیشتنەکەیە، یان ئەندامە، یاخود چاودێر و میوان.

نەریت وایە، کە دبلۆمات پێشتر ئاگاداردەکرێتەوە لە شوێنی دانیشتنەکەی، بۆ پێشبەندی و ریزبەندیی دانیشتنیش ڕێوشوێنێك دەگیرێتەبەر، کە هیچ لایەك هەست بە جیاکاری نەکات، تەنانەت هەندێکجار ناوی دبلۆماتەکان لەسەر کورسییەکانیان دەنووسرێت بۆئەوەی هەڵە روونەدات، هەروەها کاتی هاتن و ڕۆیشتنی دبلۆمات دیاریدەکرێت، بۆیە زۆرجار ڕێبەرێك دەدرێتە دبلۆمات بۆ زانینی شوێن وکاتی هاتن و ڕۆیشتنی بۆ ئەو کۆنگرە، یان دانیشتنە.

پێویستە دبلۆمات لە نیوەی دانیشتنەکاندا جێی خۆی بەجێ نەهێڵێت، بەڵکو تا کۆتایی بمێنێتەوە، ئەگەر نا ئەوا بە هەڵوێستێکی سیاسی لەقەڵەم

دەدرێت، بەتایبەت ئەگەر جێهێشتنەکە لەکاتی قسەکردنی سەرۆك، یان نوێنەری دەوڵەتێکی دیاریکراو بێت. ئەگەر ناچاربوو ئەو کارە بکات ئەوا پێویستە پێش دانیشتنەکە لایەنە پەیوەندیدارەکان ئاگاداربکاتەوە، ئەگەر شتێکی کتوپڕیش ئەوەی خواست، کە دانیشتنەکە جێبهێڵێت، ئەوا پێویستە داوای لێبوردن لە ئامادەبووان بکات، رایبگەیەنێت کە کارێکی پێویست و کتوپڕ هاتووەتە پێشەوە، بۆیە پێویستە بڕوات.

بەڵام ئەگەر دبلۆماتەکە خۆی مەبەستی بوو بۆ پچڕاندنی وتەی قسەکەر دانیشتنەکە جێبهێڵێت، یاخود بە چوونەدەرەوەی ناڕازیبوونی خۆی لەو وتانە دەرببڕێت کە وتراوە، یان هەڵوێست و رەفتارێك کە نوێنراوە کە ئەو پێی رازی نییە، ئەوا پێویستە بەبێ سڵاو و خوداحافیزی دانیشتنەکە جێ بهێڵێت. بۆ نموونە: وەفدی سووریا لە کاتی وتەی (موحەممەد مورسی)ی سەرۆکی میسر لە دانیشتنی کۆنگرەی (١٦)ی رێکخراوی وڵاتانی بێلایەن (لە تاران لەسەرەتای ئەیلوولی ٢٠١٢)، لە هۆڵەکە هاتنە دەرەوەو لەدوای وتەکەی ئەو چوونەوە ژوورەوە، ئەمەش بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لە وتەکانی، چونکە باسی لە نەمانی رەوایەتیی رژێمی بەشارئەسەد کرد، پشتیوانیی خۆی بۆ شۆڕشی گەلانی سووریا دەربڕی.

یەکێکی تر لە رەفتارەکانی دبلۆمات، کە دەیکاتە هۆکاری لێکنزیکبوونەوە و لێکتێگەیشتن، بریتییە لە وەرگرتنی دیاری و ئامادەبوون لە وەلیمەو بۆنەکانی گەورەبەرپرسانی ئەو دەوڵەتەی کە بۆی نێراوە، هەندێکجاریش ئەمە لەنێوان بەرپرسە باڵاکانی دەوڵەتاندا ئەنجام دەدرێت.

زۆرجار دبلۆمات بانگهێشت دەکرێت بۆ خوانێکی تایبەت پێویستە ئامادەی بێت، چونکە زۆرجار ئەو بۆنانە بەکاردێن بۆ گفتوگۆکردنی

بابەتگەلێکی گرنگ و زیندوو، جا سیاسی بن، یان ئابووری، یان سەربازی، ئەگەر دبلۆماتەکە بۆی نەکرا ئامادەبێت، ئەوا پێویستە داوای لێبوردن بکات، ئەگەر نا، ئەوا بە هەڵوێستێکی سیاسی لەقەڵەم دەدرێت.

لەڕاستیدا پێویستە هەموو دەوڵەتێك بەرنامەی تایبەتی هەبێت بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردن و پەرەدان بە توانـاو لێهاتوویی دبلۆماتەکانی، بۆ ئەو کارەش پێویستە دەزگا و دامەزراوەی تایبەتی هەبێت، کە سەر بە وەزارەتی دەرەکی بێت و خولی ڕاهێنان بە دبلۆماتکاران بکاتەوە، گرنگی بەلایەنی تیۆری و پراکتیکی بدات، واتە دبلۆماتکاران بە زانست و زانیارییە پێویستەکانی زانست و یاسا رێساکانی دبلؤماسيي و دانوستان و زانستی رامیاری و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و...هتد، پڕچەك بکات و لە هەمان کاتدا گرنگی بە لایەنی شارەزایی و لێهاتوویی دبلۆمات بدات، لە بوارە پراکتیکییەکەیدا[١]، بەتایبەت سەبارەت بە گرنگیدان بە زمانی جەستەو تێگەیشتن لە پەیوەندییە نازارەکییەکان بەگشتی و زانینی شێوازی بەکارهێنانیان بە شێوازێکی تەندروست.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص١٢٩-١٥٨.

## باسی دووەم: پۆلێنی دبلۆماتکاران

### دەزگا دبلۆماسییە تایبەتەکانی دەوڵەت:

لەبەرئەوەی دبلۆمات ئەو کەسەیە، کە کاروباری دەرەوەی وڵاتەکەی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی تر جێبەجێ دەکات، لەبەرئەوە هەرکەسێك ئەم کارە بکات بە دبلۆمات هەژماردەکرێت. هەریەك لە سەرۆکی دەوڵەت و ئەندامانی حوکومەت و ئەو کەسانەی کە دەوڵەت وەك نێراوی هەمیشەیی، یان تایبەت دەیاننێرێتە دەرەوە بەم ئەرکە هەڵدەستن.

بۆیە دەتوانین جۆرەکانی دبلۆمات بەم شێوەیە پۆلێن بکەین[١]:

**یەکەم: سەرۆکی دەوڵەت**

سەرۆکی دەوڵەتان بەپێی دەستووری وڵاتەکانیان و بەدرێژایی ماوەی سەرۆکایەتییان دەتوانن لە هەموو شوێن و کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیدا بەبێ وتار، یان نووسراوی ناردن و پەسەندکردن و دامەزراندن (خطاب الاعتماد) نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی خۆیان بکەن، جا هەرنازناوێکیان هەبێت (پادشا، ئیمپراتۆر، قەیسەر، یاخود سەبارەت بە سیستمە پادشاییەکان: شێخ، میر، شا، هەروەها سەرۆککۆمار، سەرۆکی فیدڕاڵ، فەهرەر، سەرۆکی ئەنجوومەنی دەوڵەت)، هەریەکێك لەم نازناوانەی هەبێت، لە یاسای دبلۆماسییدا، بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت[٢]. ئەوەتا لە ماددەی (٢١)ی ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩)دا هاتووە: "سەرۆکی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٢٠-١٣٥.

(٢) بڕوانە: د. عبدالعزيز بن ناصر بن عبدالرحمن العبيكان، م.س.ذ، ص ص١٣٢-١٤١.

دەوڵەتی نێرەر بۆ دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان بۆ دەوڵەتی سێیەم مافی هەموو ئاسانکاری و جیاوك و پارێزبەندییەکی هەیە، کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا دانیپێدانراوە بۆ سەرۆکی دەوڵەتان لەکاتی سەردانە فەرمییەکانیاندا".

هەروەها سەرۆکی دەوڵەت ئەو کەسانە دیاریدەکات، کە لە دەرەوە نوێنەرایەتی دەکەن بەپێی نووسراوێکی پەسەندکردن و دامەزراندن، کە تێیدا دەسەڵاتەکانی دیاریدەکات. هەر ئەویش (سەرۆك) خیتابی ئیعتیمادی نوێنەرانی دەوڵەتە بیانییەکان لە دەوڵەتەکەیدا قبووڵ دەکات، پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان ئیمزادەکات، یان کەسێکی بۆ سەرپشك دەکات.

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پێویستە لەنێوان سەرۆکی دەوڵەتاندا پرەنسیپی یەکسانی پێڕەو بکرێت، بەبێ سەیرکردنی گەورەیی و بچووکی رووبەر و ژمارەی دانیشتووان و هێزی سەربازی و ئابووریی دەوڵەتەکەی، هەروەها بەبێ سەیرکردنی نازناوی هەریەکەیان کە ئایا ئیمپراتۆرە، شا، یاخود میر، یان سەرۆککۆمار، چونکە ئەم ناوانە لە دیدی یاسای گشتیی نێودەوڵەتیدا یەکسانن، هەریەکەشیان لەو یاسایەدا بە سەرۆکی دەوڵەت ناوزەددەکرێن و دەبنە نوێنەری دەرەکیی دەوڵەتەکانیان.

لەگەڵ ئەوەی لە ئێستادا پرەنسیپی یەکسانی لەنێوان سەرۆکی دەوڵەتاندا پەیڕەودەکرێت، سەرۆکیهەردەوڵەتێك، بەپێی جۆری سیستەمە سیاسییەکەی، نازناوێکی دیاریکراوی بۆ رێزلێنان لەگەڵ ناوەکەیدا بەکاردێت و پێویستە لە مامەڵەی دبلۆماسییدا فەرامۆش نەکرێت، بۆ نموونە: ئیمپراتۆر و قەیسەر و پاشا بە خاوەن شکۆ (صاحب الجلالة) بانگدەکرێن، سوڵتان بە خاوەن مەزنی (صاحب العظمة)، میر بە خاوەن پایە و بەرزی (صاحب السمو) و سەرۆککۆمار بە خاوەن گەورەیی (صاحب الفخامة)، پاپا بە خاوەن

پـیرۆزی (صـاحب القداسـة) بانگـدەکرێن، بـەڵام ئەمـە کاتێـك دەوڵـەتان لـە بەرانبەریاندا بەکاری دەهێنن، کە دانیان بەو سەرۆکانەو بە نازناوەکانیشـاندا نابێت[١].

**سەبارەت بە پارێزیەندی وجیاوکی سەرۆکی دەوڵەت:**

سـەرەتا پێویسـتە ئامـاژە بـەو ئاراسـتانە بکـەین، کـە بنچـینەی یاسـایی تایبـەت بـە بەخشـینی جیـاوك و پارێزیەنـدی بـە سـەرۆکی دەوڵـەت دیـاریی دەکەن، کە بریتین لە[٢]:

- شکۆ و نرخدانان بۆ پێگەو وەزیفەی سەرۆك: کە لـە رێککەوتننامـەکانی ساڵانی (١٩٦١، ١٩٦٣، ١٩٦٩)دا ئاماژە بۆ ئـەوە کـراوە، کـە پێویسـتە رێز و شکۆیان پارێزراو بێت، ئـەویش بـەهۆی ئـەو پلـە و پۆسـتەی، کـە هەیەتی نەك بەهۆی کەسێتیی خودی سەرۆکەوە.
- تیۆری درێژبوونەوەی هەرێمی: واتە سەرۆکی دەوڵەت گەشتی کردبێـت، لە دەرەوەی وڵاتی خۆشی بێت هەر وا هەژماردەکرێت، کە لـە سـنووری هەرێمی وڵاتەکـەی خۆیدایـە و ملکەچـی سیسـتمی نـاوخۆیی ئـەو وڵاتـە نابێت، کە تێیدایە. ئەم تیۆرە دووچاری رەخنەی ناواقیعیبوون و گرفتی یاسایی و پەیوەست بە سەروەریی وڵاتان بووەتەوە.

---

(١) د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص٢٢٦.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شادية إبراهيم أحمد حامد محمد عميرة، الحماية القانونية الدولية لرؤساء الدول، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠٧، ص ص٥١-٥٨. و: د. عطا محمد صالح زهرة، م.س.ذ، ص ص٢٣٨-٢٣٩.

- بنەمای موجامەلەی نێودەوڵەتی: کە پێویستی دەکات سەرۆکی وڵاتێکی بیـانی، کـە نمایینـدەی سـەروەریی وڵاتەکەیـەتی و پێویسـتە ڕێـزی لێبگیرێت و مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵدا بکرێت.

بە بڕوای ئێمە ئەم بنەمایـەش ئاسـتەکانی موجامەلـەو ڕێساکانی یاسـای نێودەوڵـەتیی تێکـەڵکردووە، چـونکە لـە زۆرێـك لـە پـرس و بابەتەکانـدا، پێویسـتە سـەرۆکی دەوڵـەت بـە شـێوازێکی پابەندکەرانـە ڕێـزی تایبـەتی لێبگیرێت و لادان لەم ڕێسایە لادانە لە یاسای نێودەوڵەتی و بەرپرسـیارێتیی لێدەکەوێتەوە، لە هەمان کاتدا، هەندێك کاری ڕێزلێنـان و تەشـریفات هەیـە، کـە دەوڵـەت دەتوانێـت بەرانبـەر سـەرۆکی وڵاتێـك پیـادەی نـەکات، هـیچ بەرپرسیارێتییەکی نێودەوڵەتیشی نەکەوێتە ئەستۆ، هێندە نەبێت کە ڕەنگە ئەو دەوڵەتەش بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە بگرێتەبەر.

سەرۆکی دەوڵـەت لەکاتێکـدا لـە دەرەوەی وڵاتەکـەی دەبێـت، پێویسـتە مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵـدا بکرێـت، بـە شـێوازێك کـە ڕێـزو پێگەکـەی بـە شیاوی بپارێزێت، بۆ ئەمەش پێویستە ڕەچاوی ئەم جیاوك و پارێزبەندییانـە بکرێت[(١)]:

١. پێویستە لە مەراسیمێکی تایبەتدا پێشوازیی لێبکرێت.

٢. پێویستە لە یاسا نێوخۆییەکان ببەخشرێت.

٣. پێویستە پارێزبەندیی دادوەری هەبێت، واتە پێویستە:

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص٥٣-٥٨. و: ياسين ميسر عزيز العباسي، ص ص٦٧-٧٢. و: شادية إبراهيم أحمد حامد محمد عميرة، م.س.ذ، ص ص٥٨-٦٧. هەروەها: د. فؤاد شباط، م.س. ذ، ص ص٣٨-٤٢. و: هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٥٨-١٦٠.

أ. ملکەچی دادگای سزایی نەکرێت. (خـۆی و ئەنـدامانی خێزانـی و ئەوانـەی لەگەڵیدان).

ب. ملکەچی دادگای شارستانی نەکرێت، جگە:

- داوا عەینییـەکان، لەنێویانـدا داوای حیـازە، جـا پەیوەسـت بێـت بـە خانووبەرە(عقار)، یان گواستراوە (منقول)ێکەوە[١].
- ئەو داوایانەی کە پەیوەستن بە جێماو (التركة)ێکەوە، کە سەرۆك تێیدا یەکێك بێت لە میراتگرەکان، یان وەسیەتبۆکراوەکان.
- ئەو داوایانەی کە پەیوەستن بە بازرگانی، یان پیشەسـازییەکەوە، کـە سەرۆکە بیانییەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆی ئەنجامی دابێت.

ت. ئـەو داوایانــەی کـە پەیوەسـتن بـە داواکردنــی قـەرەبوو لـە کردارێکـی زیانبەخش، کە بەسەر هەرێمی ئەو دەوڵەتـدا هـاتووە کـە داواکـە بـۆ لای یەکێك لە دادگاکانی بەرزدەکرێتەوە، بەڵام ئەو داوایانـە وەرنـاگیرێن، کـە داوای قەرەبووی زیانێك دەکەن، کە دەرەنجامی کارێك بووە لە کارەکانی سەرووەری.

ث. لە حاڵەتی سازشی سەرۆکی دەوڵەتە بیانییەکە لە پارێزبەندییەکەی، واتە لە حاڵەتی ئەو داوایانەی، کە سەرۆك تێیاندا دان بە دەسەڵات و پسپۆڕیی (اختصاص) دادگا نیشتمانییەکانی ئەو دەوڵەتەدا دەنێت، کە تێیدایە.

---

(١) خانووبەرە (عقار): بریتییە لە هەرشتێك، کە لە شوێنی خۆیدا مابێتەوە، تێیدا جێگیربێت، نەتوانرێت بەبێ ئەوەی تێکبچێت (تەلەف ببێت) بگوێزرێتەوە (وەك: زەوی و خانوو)، لە غەیری ئەوە هەموو شتەکانی تر بە گواستراوە دادەنرێن. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عبدالرزاق أحمد السنهوري، الوسيط في شرح القانون المني، الجزء الثامن عشر؛ حق الملكية: مع شرح مفصل للأشياء والأموال، دار إحياء التراث العربي، بيروت، بلا سنة الطبع، ص ص١٢-١٥.

٤. پارێزبەندیی کەسیی سەرۆکی دەوڵەت، واتە پێویستە دەوڵەتی خانەخوێ سەرۆکی میوان بە درێژایی مانەوەی بپارێزێت، ئەم پاراستنەش دوو لایەنی هەیە: یەکەم رەچاوکردنی رێزی سەرۆك و پاسەوانیکردنی. دووەم رەچاوکردنی رێزی شوێنی مانەوەی.

٥. سەرۆکی دەوڵەتی میوان و خێزانەکەی و هاورێکانی هەندێك لە جیاوکە داراییەکان و بەخشینەکانی باج و گومرگ و تێچووی هەندێك خزمەتگوزاری دەیانگرێتەوە،کە دەوڵەتان لە شێوەی موجامەلە نێودەوڵەتییەوە دەیبەخشن، واتە لە باجە ڕاستەخۆ و ناراستەوخۆکان دەبەخشرێن، هەروەها لە رەسمی گومرگیی ئەو شمەك و جانتا و دیارییانەی، کە پێیانە دەبەخشرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەریت وایە، کە سامانە تایبەتییەکانی سەرۆك لە گومرگی دارایی نابەخشرێن، واتە لەو باجانەی کە لەسەر خانووبەرەی نەگواستراوەی سەرۆکن لە دەرەوە، هەروەك چۆن لە باجی سەر میرات نابەخشرێن.

سەبارەت بەو ماوەیەی، کە سەرۆکی دەوڵەت جیاوك و پارێزبەندییەکانی دەمێنێت:

هەر لە ساتی وەرگرتنی پۆستەکەیەوە ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی هەیە و بە نەمانی سیفەتی سەرۆکایەتییەکەشی نامێنن، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی بەهۆی سیفەتەکەیەوە وەك سەرۆك وەریگرتووە، نەك وەك خودی کەسیی خۆی، بەڵام هەندێك دەوڵەت، وەك موجامەلە، ئەو جیاوك و پارێزبەندیانە بە سەرۆکی پێشووش دەبەخشێت.

لەبەرئەوەی کە سەرۆکی دەوڵەت سیفەتی باڵاترین دبلۆمات هەڵدەگرێت لە بەردەم دەوڵەتانی تردا، بەبێ رەچاوکردنی سروشتی ئەو سیستمە

سیاسییەی، کە لە دەوڵەتەکەیدا پیادەدەکرێت، زیاتر لە هەردبلۆکاتێکی دی، مافی ڕێزگرتنی تایبەتی هەیە.

هەر بۆیە ملکەچی دادگای دەوڵەتی پێشوازیکەر نابێت، ملکەچی دادگای شارستانی و سزادانیش نابێت و هیچ ڕێکارێکی لەبەرانبەردا ناگیرێتەبەر. بەڵام ئەو پارێزبەندی و مافانەی، کە دراونەتە سەرۆکی دەوڵەتان، تەنها تایبەت کراون بەو سەردانانەوەی کە فەرمین، واتە لە سەردانە نافەرمییەکاندا ئەو مافانەیان نییە و بەجێهێڵراون بۆ ڕێساکانی نەریتی نێودەوڵەتی، ئەمەش بەپێچەوانەی جێبەجێکردنە کردارەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە لە سەردانە فەرمی و نافەرمییەکاندا سیفەتی دبلۆماسیی بە سەرۆکی دەوڵەت دەبەخشن، هەروەها لەو حاڵەتانەی کە سەرۆکی دەوڵەتێك بەدزییەوە، یاخود بە ناوێکی خوازراوەوە –بە ئاگاداریی دەوڵەتی بەرانبەر– دێتە خاکی ئەو دەوڵەتەوە، کاتێکیش ئەو دەوڵەتە بۆ دەردەکەوێت کە ئەو کەسە سەرۆکی وڵاتێکی ترە، ئەوا پارێزبەنی و جیاوکەکانی دەپارێزێت. بۆ نموونە: لە ساڵی (١٨٧٣) پادشای (هۆڵەندا) لە ناوێکی خوازراوەوە سەردانی (سویسرا)ی کردبوو، سەرپێچییەکی ئەنجام دابوو، لە ئەنجامدا دادگا بڕیاری دا غرامەی بکات، بەڵام کاتێك کەسایەتییەکەی ناسی، ڕاستەوخۆ غرامەکەی لەسەر لابرد[١].

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: شادية إبراهيم أحمد حامد محمد عميرة، م.س.ذ، ص ص٧٤-٧٩. هەروەها: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س. ذ، ص١٢١.

هــەر ســەرۆك دەوڵــەتێك بــەپێی دەســتوری وڵاتەکــەی لــە مــاوەی ســەرۆکایەتییەکەیدا پارێزبەنــدیی لــە بەرانبــەر دەســەڵاتی دادوەریــی دەوڵەتەکەی هەیە.

سەرۆکی دەوڵەت سیفەتی دبلۆماتی هەیە لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا، تەنانەت ئەگەر دوای ئەوە لە سەرۆکایەتییەکەشیدا نەما، ئەوا ئـەو ماوەیـەی سـەرۆك بـووە بـە سـیفەتی دبلۆماسـیی بـۆ هـەژماردەکرێت، پارێزبەنـدی و مافــەکانی بــەردەوام دەبــن بــۆ ئــەو ماوەیــە، واتــە: دروســت نییــە دوای تەواوبوونی راژەکەی لێپێچینەوەی لەو کارانە لێبکرێت، کە لـەکاتی سـیفەتە دبلۆماتییەکەیـدا ئـەنجامی داون، مەگـەر تـاوانی جـەنگ، یـان تـاوانی دژی مرۆڤایــەتی و جینۆســایدی ئەنجامــدابێت، لــە رێگــەی دادگایــەکی نێودەوڵەتییەوە دادگایی بکرێت.

کەواتە پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێت، کە مافە نێودەوڵەتییە نوێیەکان سـنوور بـۆ پارێزبەندییـەکانی سـەرۆکی دەوڵـەت دادەنـێن، بـۆ نموونـە: لـە پەیماننامەی ڤێرسای کە جەنگی یەکەمی جیهانی پێ کۆتاهێنرا، هاوپەیمانان تێیـدا مـاف دادگـاییکردنی ئیمپراتـۆری ئـەڵمانیا (غلیـۆمی دووەم)یـان دا بـە خۆیان، چونکە تاوانی جەنگی ئەنجامدابوو (ماددەی ٢٢٧)، هەرچەندە ئـەم دەقە تەنیا وەکو مرەکـەبی سـەر کاغـەز مایـەوە، چـونکە ئـەو وڵاتـەی ئـەو پـەنای بـۆ بردبـوو (هۆڵەنـدا) ئـەوی رادەسـت نـەکرد، بـە بەهانـەی ئـەوەی سەرۆکی دەوڵەت بەرپرسیار نابێت و ئەو تاوانەی، کە ئەوان داویانەتـە پـاڵی ناچێتە ریزی ئەو تاوانانەی کە پێویستی دەکەن تاوانبـار ررادەسـت بکرێـت. بە هەمان شێوە لـەدوای جـەنگی دووەمـی جیهـان، بـەپێی رێککەوتننامـەی لەنـدەن (سـاڵی ١٩٤٥)، (دادگـای نـورمبێرگ) بـۆ دادگـاییکرنی تاوانبـارانی

جـەنگ دروسـتكرا، لەسـەر زاری دادوەرەكانیشـی ئـەوە وتـرا كـە: "ناكرێـت نوێنـەری دەوڵـەتان پارێزگـاریی یاسـای نێودەوڵـەتی خـراپ بـەكاربهێنن بـۆ ئەوەی هەستن بە كاری تاوانكاری و لە دەست بنەماكانی دادگاكاریی ئاسایی رابكەن و لە سزا پارێزراو بن" [(١)].

لێرەدا پرسیارێكی تر دێتـەئاراوە: ئایـا سـەرۆكی دەوڵـەت دەتوانێـت لـە دەرەوەی وڵاتەكەی خۆی كاری سەروەری ئەنجامبدات؟

هەندێكجار بارودۆخ وا دەخوازێت، كە سەرۆكی دەوڵەت لەو كاتەی كە لـە دەرەوەی وڵاتەكەیەتی هەستێت بە بەرێوەبردنی هەندێك كاروباری بەپەلـە و گرنگ كە تایبەتن بـە وڵاتەكەیـەوە، یـاخود بڕیارێـك، یـان مەراسـیمێك، یـان یاسایەكی ئەوتۆ واژۆبكات. لە نەریتی نێودەوڵەتیدا شتێك نییە رێگر بێت لەو كارانە، بە مەرجێك سـەروەریی ئـەو وڵاتـەی تێیدایـە پێشـێلی نـەكات، واتـە ناتوانێـت كـە كـاری داوەری لـەنێوان ئەنـدامانی شـاندی یاوەریـدا بكـات، پشتبەست بەوەی كە گوایـا ئـەوان لـە دادگـای هـەرێمی بەخشـراون، یـاخود هەستێت بە دادگاییكردنی یەكێك لەوانە بەهۆی تاوانێكـەوە، كـە ئـەنجامیان دابێت، بەڵكو پێویستە بیگێڕێتەوە بۆ وڵاتەكـەی بـۆ ئـەوەی لـەوێ دادگـایی بكرێت[(٢)].

---

(١) د. فؤاد شباط، م.س. ذ، ص ص٤١-٤٢.

(٢) بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س. ذ، ص٥١. نموونەی ئەمەش لە مێژوودا زۆرە، بۆ وێنە: شای میسر (شا فاروق) لە ساڵی (١٩٥١)، كاتێك لە ئیتاڵیا بوو،هەندێك كاروباری گرنگی دەوڵەتەكەی بەڕێوەبرد، لەوانە دیاریكردنی هەندێك وەزیر. لە بەرامبەردا شاژنی سوید (كریستیانا) لە ساڵی (١٦٥٧) لە كاتێكدا كە لە (فەرەنسا) بوو سەروەریی ئەو وڵاتەی پێشێلكرد و یەكێك لە ئەندامانی

بەپێی ماددەی (٣٩) بڕگەی (أ) لە ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩) هەمان ئەو جیاوك و پارێزبەنییانە دەبەخشێت بە ئەندامانی خێزان و ئەو کەسانەی هاوەڵ و هاوگەشتن لەگەڵیدا، تەنانەت ئەگەر ئەندامی خێزانەکەشی نەبن.

هەروەها جێگری سەرۆکی دەوڵەت سیفەتی دبلۆماتی هەیە، لەکاتێکدا کە هەڵدەستێت بە نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەتەکەی لە دەرەوە، واتە هەمان ئەو سیفەتەی هەیە، کە سەرۆکی دەوڵەت هەیەتی.

**دووەم: ئەندامانی حوکومەت**

لە کۆندا، لەبەرئەوەی پادشا و ئیمپڕاتۆرەکان خۆیان حوکمڕان بوون و نوێنەراتیی دەوڵەتی خۆیان کردووە، تەنیا خۆیان سیفەتی دبلۆماتیان هەڵگرتووە، بەڵام دوای پەرەسەندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، هەموو ئەو ئەندامانەی حوکومەتیش کە نوێنەرایەتیی سەرۆکی دەوڵەتەکانیان لە دەرەوە دەکەن و سەرۆکی دەوڵەتانی بیانی دەبینن و بەشداریی کۆڕ و کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکان دەکەن سیفەتی دبلۆماتیان هەیە، چونکە شتێکی لۆژیکی نەبوو، کە نێراوە دبلۆماسییەکان، سیفەتی دبلۆماسییان هەبێت و ئەندامانی حوکومەت ئەو سیفەتەیان نەبێت، لەکاتێکدا پلە و پۆستیان لەوان بەرزترە، هەر بۆیە یاسای نێودەوڵەتی بۆ ئەندامانی حوکومەت دانی بەو سیفەتەدا نا.

---

یاوەری بە لەسێدارەدان حوکم دا بە تۆمەتی ناپاکی و حوکمەکەشی بەسەردا جێبەجێکرد، بۆیە حوکومەتی فەڕەنسا ناچاریکرد, وڵاتەکەی جێبهێڵێت. هەمان سەرچاوە.

مەبەست لە ئەندامانی حوکومەت پۆستەبالاکانە لە دەوڵەتدا، کە بریتین لە:

١. **سەرۆکوەزیران:** زۆرجار سەرۆکوەزیران لەجێی سەرۆکی دەوڵەت نوێنەرایەتی دەوڵەتەکەی لە دەرەوە دەکات. ئەو پۆستەش دوای سەرۆکی دەوڵەت باڵاترین پۆستە، پۆستی سەرۆکوەزیران پۆستێکی سیاسییە، کە تێیدا سەرۆکەکەی بەداوداچوون بۆ پەیوەندییە دەرەکییەکانی دەوڵەتەکەی دەکات، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سەرپەرشتیی وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی دەکات. لێرەوە گرنگیی سەرۆکوەزیران لە چوارچێوە نێودەوڵەتییەکەیدا دەردەکەوێت، بەتایبەت کاتێك دەبینین زۆرجار لە کۆنگرە گرنگەکاندا، لەبری وەزیری دەرەوە، خۆی ئامادەدەبێت.

ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩)[١] سیفەتی دبلۆماتی داوە بە سەرۆکوەزیران لەکاتی نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەتەکەیدا لە دەرەوە و لەکاتی تێپەڕینی بە دەوڵەتی سێیەمدا، هەروەها مافی هەموو ئەو ئاسانکاری و پارێزبەندی و مافانەی هەیە، کە یاسای نێودەوڵەتی دانی پێدا ناون. جێگری سەرۆکوەزیرانیش هەمان مافی هەیە.

٢. **وەزیری دەرەوە:** وەزیری دەرەوە ئەرکی بەڕێوەبردنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی دەوڵەتەکەی لە ڕێگەی دەزگاگەلێکی تایبەتەوە دەگرێتەئەستۆ، کە پێیاندەوترێت نێراوە دبلۆماسییەکان.

وەزیری دەرەوە بە وتەبێژی فەرمیی وڵاتەکەی و ئەڵقەی گەیاندنی بە دەوڵەتانی تر و جیهانی دەرەکی دادەنرێت، هەروەك چۆن ڕێنمایی بۆ نێراوە

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢٣).

دبلۆماسییەکانی وڵاتەکەی لە دەرەوە دەردەکات، جگە لەمە پەیوەندی بە وەزیرانی دەرەوەی دەوڵەتان و سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکانی لای دەوڵەتەکەیەوە دەکات، بۆ گفتوگۆکردنی بابەتەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان، هەروەها ئەو نێوەندە لەنێوان حوکومەتی دەوڵەتەکەی و حوکومەتانی تر و لەجێی سەرۆکی دەوڵەتەکەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەڕێوەدەبات، بەو پێیەی کە بریتییە لەو دەستە یاساییە نێوخۆییەی، کە یاسای نێودەوڵەتی، لە پەیوەندییە دەرەکییەکاندا، وەسفی نوێنەری دەوڵەتی پێدەدات[1].

ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩) سەبارەت بە وەزیری دەرەوە، دانی بە سیفەتی دبلۆمات و هەموو ئەو پارێزبەندی و مافانەدا ناوە، کە ئەو سیفەتە دەیخوازێت.

بەڵام ئەم سیفەتەی لە ناوخۆی دەوڵەتدا نییە، بۆیە ملکەچی دادگاو یاساکانی دەوڵەتەکەی دەبێت، لە هەر سەرپێچییەك کە ئەنجامی بدات، هەموو ئەو شتانەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، کە بەسەر هەر وەزیرێکی تردا جێبەجێ دەکرێت. دەشکرێت داوای لەسەر بنووسرێت وێڕای ئەرکەکەی لەو کەیسە شارستانییانەدا، کە لەلایەن هاوڵاتییانەوە لە دادگاکانی دەوڵەتەکەیدا لەسەری بەرزدەکرێتەوە.

وەزیری دەرەوە، بەو پێیەی جێی سەرۆکی وڵاتەکەی دەگرێتەوە لە نوێنەرایەتیکردنی وڵاتەکەی و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیدا، لە سەردانە فەرمییەکانیدا هاوشێوەی سەرۆك پارێزبەندی و جیاوکی هەیە، بەڵام

---

(١) بڕوانە: د. عبدالعزیز بن ناصر بن عبدالرحمن العبیکان، م.س.ذ، ص ص١٤٣-١٤٩.

جیاوازی لەگەڵ سەرۆکدا ئەوەیە کە وەزیری دەرەکی لە سەردانە تایبەتە کەسییەکانی وەك سەردانی گەشتیاری و چارەسەر ئەو پارێزبەندییانە نایگرێتەوە[1]، مەگەر دەوڵەتی خانەخوێ، خۆی وەکو موجامەلە، پێی ببەخشێت.

٣. **وەزیرەکان:** لەگەڵ ئەوەی وەزیری دەرەوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی نوێنەری وڵاتەکەی و ئەڵقەی گەیاندنیەتی بە دەوڵەتانی بیانی، بەڵام لەراستیدا ئەو بڕیار لەسەر سیاسەتی دەرەکیی دەوڵەت نادات، بەڵکو ئەو ئەڵقەی پەیوەندییە لەنێوان وەزارەتە تایبەتمەندەکان و دەوڵەتانی بیانی، چونکە وەزارەتە تایبەتمەندەکان لە رێگەی وەزارەتی دەرەوە نەبێت ناتوانن پەیوەندیی لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیاندا لە دەوڵەتانی بیانیی ببەستن، بۆیە ئەو وەزارەتە تایبەتمەندانە بڕیار لە سیاسەتی خۆیان — لەچوارچێوەی سیاسەتی باڵای دەوڵەتدا— دەدەن، نەك وەزارەتی دەرەکی.

بۆ نموونە: کێشەکانی سنوور تایبەتن بە وەزارەتی ناوخۆوە، ئەگەر دەوڵەتێك ویستی کێشەی سنووری خۆی لەگەڵ دراوسێیەکیدا چارەسەربکات، ئەوا وەزارەتی ناوخۆی لە رێگەی وەزارەتی دەرەکییەوە هەڵدەستێت بەو کارە، وەزیری دەرەوەی لایەنی بەرانبەریش بە هەمان شێوە کێشەکە حەواڵەی وەزارەتی ناوخۆی دەوڵەتەکەی دەکات، بۆ سەیرکردنی بابەتەکەو بڕیار لێدانی. وەزارەتەکانی تریش بەهەمان شێوە، لە رێگەی وەزارەتی دەرەکییەوە پەیوەندی بە دەوڵەتانی بیانییەوە دەکەن.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص١٤١-١٤٣.

ئەم بارە وا دەكات، كە كاری وەزارەتی دەرەكی سـیفەتێكی دبلۆماسـیی لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانیدا هەبێت، كاتێـك دەچـێتە دەرەوەی دەوڵەتەكەیان بـۆ چـاوپێكەوتن بـە هاوتاكانیـان لـە دەرەوە، هـەروەها ئـەم سیفەتە وا دەخوازێت، كە پارێزبەندی و جیاوكی بریارلێدراویان هەبێت.

لەگـەڵ ئـەوەی كـە رێككەوتننامـەی نێـراوە تایبەتـەكانی سـاڵی (١٩٦٩) باسـی ئـەوەی نـەكردووە، كـە وەزیرەكـانی تـری جگـە لـە وەزیـری دەرەوە سـیفەتی دبلۆماتییـان هـەبێت، بـەڵام ئـەوان لـە ریـزی پلـەباڵاكانی دەوڵـەت هەژماردەكرێن، كە سیفەتی دبلۆماتكاریان هەیە.

٤. **پلـە باڵاكـانی دەوڵـەت:** هـەروەزارەتێك دەزگاگـەلێكی پسـپۆڕی لـە بوارەكەی خۆیدا هەیە، كە لەوانەیە وەزیری تایبەتمەند، بـەهۆی نـەبوونی كـات، یـان نـەبوونی شـارەزایی تـەواوی لـەو بوارانـەی، كـە ئـەو دەزگایانـە هەیانـە كەسانێكی پلە باڵای شارەزا لـە هەنـدێك بابەتـدا بنێرنـەدەرەوە، بـۆ پەیوەنـدی بەستن لەگەڵ وەزارەتە هاوشێوەكانی لە دەرەوە، یاخود لەوانەیـە وەزیـر خـۆی ئەو كەسانە لەگەڵ خۆی بباتەدەرەوە بۆ دانوستان لـە بـواری پسـپۆڕیی خۆیـان لەگـەڵ لایـەنی بەرانبـەر. بـەپێی رێككەوتننامـەی نێـراوە تایبەتـەكانی سـاڵی (١٩٦٩)، ئەو كەسانە لە كاتی جێبەجێكردنی كارەكـەیان لـە دەوڵـەتانی بیانیـدا سیفەتی دبلۆماتكاریان هەیە، تەنانەت لەو دەوڵەتانەش، كە پێیاندا تێپەڕدەبن.

بەڵام پێویستە ئەو كەسانە نووسراوی فـەرمیی رێگەپێـدان و هەسـتانیان بەو كارە پێببێت، كە وەزیری دەرەوەی دەوڵەتەكەیان ئیمـزای كردبێـت، بـە مەبەستی بەخشینی سیفەتی دبلۆماتكار بـەو كەسـانە بـۆ نوێنەرایـەتیكردنی دەوڵەتەكەیان.

پلـەباڵاكانی دەوڵـەت بـریتین لـە بریكـاری وەزارەتـەكان و بەڕێوەبـەرە گشتییەكان و فەرماندە پلـەباڵاكانی سـوپا و هێزەكـانی ئاساییشـی نـاوخۆ، هەركەسـێكی تـر كـە ئـەركی نماییندەكردنی دەوڵەتەكـەی لـە دەرەوە پـێ ببەخشرێت.

**سێیەم: ئەندامانی نێراوی دبلۆماسیی (المبعوث الدبلوماسي):**

ئەنـدامانی نێـراوی دبلۆماسـی بـە سـەرۆكی نێـراوە دبلۆماسـییەكە و ئەنـدامانی نێراوەكـە دەوترێـت[١]، بـەڵام نوێنـەری دبلۆماسـی، بریتییـە لـە سـەرۆكی نێراوەكـە یـان یـەكێك لـە فەرمانبـەرانی نێراوەكـە، كـە سـیفەتی دبلۆماتیان هەیە[٢].

**سەرۆكی نێراوی دبلۆماسی (رئيس البعثة الدبلوماسية):**

ئەو كەسەیە كە بەرپرسیارێتیی بەڕێوەبردنی نێـراوە دبلۆماسـیی (البعثـة الدبلوماسـية) دەگرێتەئەسـتۆ، هـەموو ئەنـدامانی ئـەو نێـراوە دبلۆماسـییە، ملكەچـی رێنماییـەكانی دەبـن، هـەر ئـەویش نماییندەیی دەوڵەتەكـەی لای دەوڵـەتی پێشـوازیكەر دەكـات، پلـەی سـەرۆكی نێـراوی دبلۆماسـیی بـەپێی ئاستەكەی دەگۆڕێت (باڵوێز، وەزیری راسپێراو، راوێژكار، سكرتێر)[٣].

چـەند مـەرجێك دیاریكراون بۆئـەوەی، كـە سـەرۆكی نێـراوی دبلۆماسـی سیفەتی دبلۆماتی هەبێت[٤]:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/ب)ی رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكانی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/هـ)ی هەمان رێككەوتننامە.

(٣) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٦٠.

(٤) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س. ذ، ص١٣٦.

- پێویسـتە دەوڵەتەکـەی سـیفەتی دبلۆمـاتی پێببەخشـێت، لەمەشـدا دەوڵەتەکە خۆی ئازادیی ڕڕەهای هەیـە و یاسـای نێودەوڵـەتیی دەسـت لەو کارە وەرنادات.
- پێویستە ئەو دەوڵەتەی کە ئەو کەسەی بۆ دەنێرێت، ئەو کەسـەی وەك سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە قبووڵ بێـت، ئەگـەر ڕەتیشـی بکاتـەوە، ئەوا دەوڵەتی نێرەر بۆی نییە ڕەخنە (اعتراض) لەو بڕیارەی بگرێت.
- پێویستە بەڵگەنامەکانی دەستنیشانکردن و دامەزراندنەکـەی پێشـکەش بە وەزارەتی دەرەکیی ئەو دەوڵەتە، کە بۆی نێراوە بکات.

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی سـاڵی (١٩٦١)[١] سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکانی بەم شێوەیە پۆلێنکردووە:

**١. باڵوێز (السفير) و (القاصد الرسولي)**

أ. **بـاڵوێز**[٢]: بـەرزترین پۆسـتە لـە نێـراوە دبلۆماسـییەکانی دەرەوەدا، سـەرۆکی دەوڵەتەکـەی دیاریـدەکات، بـۆ ئـەو پۆسـتە. تـاوەکو ڕەزامەنـدی وەرنەگرێت، ناتوانێت لەو دەوڵەتەدا کاربکات، کە بۆی نێراوە. هەروەك چۆن ناتوانێت دەسـت بـەکارەکانی بکـات، تـا لـە ئاهـەنگێکی فـەرمیی تایبەتـدا، بەڵگەنامەکانی دامەزراندنەکەی پێشکەش بە سەرۆکی دەوڵەتی بەرانبەر، یان

(١) بڕوانە: ماددەی (١/١٤).

(٢) بەگشتی باڵوێز بە "باڵوێزی ڕاسپێراوی سەروو ئاسایی" ناودەبرێت، (کە پێشتر باڵوێزی ڕاسپێراوی سەروو ئاسایی پلەیەکی بەرزتری لە پلەی باڵوێز و سەرۆك هەبوو). پشتبەست بەمە ڕاستترین ناو لەرووی مێژووییەوە بۆ سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی بریتییە لە " باڵوێزی سەروو ئاسایی و وەزیری ڕاسپێراو". د.شاكر محمود وهيب البياتي و د.علي عبدالحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص١٣.

بەو کەسەی کە ئەو بۆ ئەو کارەی رادەسپێرێت، نەکات. بەگشتی سێ ساڵ بۆ ماوەی کارکردنی دیاریدەکرێت، لە کاتی تەواوبوونی کارەکەیشیدا پێویستە ماڵاوایی لە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە بکات، کە باڵوێز بووە تێیدا، یاخود لە هەرکەسێکی تر کە لە جێی سەرۆکی ئەو دەوڵەتە بێت.

لە دەستووری هەمیشەیی (کۆماری عێراق)دا، بەپێی ماددەی (٨٠ برگەی پێنجەم) ئەنجوومەنی وەزیران دەسەڵاتی داواکردنی رەزامەندیی ئەنجوومەنی نوێنەرانی هەیە لەسەر دامەزراندنی باڵوێزەکان، بەپێی ماددەی (٦١ برگەی پێنجەم –ب–) ئەنجوومەنی نوێنەران دەسەڵاتی تایبەتمەندە بە رەزامەندیکردن لەسەر دامەزراندنی باڵوێزەکان، لەسەر پێشنیاری ئەنجوومەنی وەزیران، هەروەها بەپێی ماددەی (٧٣ برگەی حەوتەم) سەرۆککۆمار باڵوێزەکانی دەرەوە قبوولٚ دەکات[١].

باڵوێز نمایندەیی سەرۆکی وڵاتەکەی و وەزارەتی دەرەکی و وەزارەتەکانی تری وڵاتەکەی دەکات، لەبەردەم ئەو دەوڵەتەی کە بۆی نێراوە و دیاریکراوە بۆی، بۆیە مافی پەیوەندییکردنی بە سەرۆکی ئەو دەوڵەتەوە هەیە، کە بۆی نێراوە و دەتوانێت داوای چاوپێکەوتنی ئەو و هەموو بەرپرسانی تری ئەو دەوڵەتە بکات.

---

(١) بڕوانە: دەقی دەستووری هەمیشەیی (کۆماری عێراقی فیدڕاڵ)ی ساڵی (٢٠٠٥). لە پێگەی فەرمیی کۆماری عێراق/سکرتاریەتی گشتیی ئەنجوومەنی وەزیران، لەم لینکەی خوارەوە: (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/١٠)

http://www.cabinet.iq/PageViewer.aspx?id=2

**ب. نوێنەری ڤاتیكان (ممثل الفاتيكان):**

سەرۆكی ئەم نێراوانە نوێنەرایەتیی ڤاتیكان دەكەن:

– **بریكار (وكيل)، یان جێگری پاپا**: كە بەگشتی لە كاردینالەكانە (الكرادلة)[1] كە پۆستەكەی هاوتای پۆستی باڵوێزی سەروو ئاسایی (السفير فوق العادة) هەیە. كە بریتییە لە نوێنەری تایبەتی پاپا لای ئەو دەوڵەتە كاسۆلیكییانەی كە لەرووی رۆحییەوە ملكەچی دەسەڵاتی پاپان. زیاتر كارە ئاینییەكان نەك سیاسییەكان جێبەجێدەكات، سروشتی كارەكەشی كاتییە.

– **باڵوێزی پاپا (السفير البابوي)**: بریتییە لە نوێنەری ڤاتیكان و كارە سیاسییە هەمیشەییەكان و لە كاردینالەكان جێبەجێدەكات، یان لە پیاوانی ئیكلیرۆس هەڵدەبژێرێت، پۆستەكەشی هاوتایە لەگەڵ پۆستی باڵوێز.

– **(القاصد الرسولي)**: نوێنەرایەتیی پاپا دەكات، لای ئەكلیرۆسی – كاسۆلیكیی ناوخۆیی.

## ١. وەزیر، یان وەزیری راسپێراو (الوزير المفوض):

وەزیری راسپێراو لەدوای باڵوێزەوە بە پلەی دووەم دێت، چەند نازناوێكی پێدەوترێت لەوانە: راسپێراو، یان دەسەڵات رەها، یان نێراوی سەروو ئاسایی (المندوب فوق العادة). ئەو دەستە نێراوەشی، كە ئەم سەرۆكایەتی دەكات

---

(١) كاردینال (الكاردينال: كۆكەی (الكرادلة)یە، پێگەیەكی تایبەتە بۆ قەشە (أسقف)ێكی بەرپرس لە كڵێسەی كاتۆلیكیدا، پلەی ڕاستەخۆ لە دوای (پاپا)وە دێت و هەر لەلایەن ئەویشەوە دیاری دەكرێن، كاردینالەكان لە حاڵەتی مردنی (پاپا)دا ئەركی هەڵبژاردنی (پاپا)ی داهاتوویان لەئەستۆیە، بەڵام ئەو كاردینالانەی كە تەمەنیان گەیشتووەتە هەشتا ساڵ، یان زیاتر، لەو هەڵبژاردنە ریزپەڕ دەكرێن. واتە كاردینالْ پیاوێكی ئاینییە، ئەركەكەی هەڵبژاردنی پاپایە. رێژەی ئەو كاردینالانەی كە پاپا هەڵدەبژێرن (١٢٠)ـە، ئێستا كاردینالەكان رێژەیان نزیكەی (٢١٠) كاردینالە.

پێیدەوترێت، کۆمسیۆن (المفوضیة). لەکاتی بوونی باڵوێز لە باڵوێزخانـەدا، وەزیری راسپێراو کەسی دووەمـە تێیـدا، یـاخود هەڵدەسـتێت بـە پاراسـتنی بەرژەوەنـدیی تاکــەکانی دەوڵەتەکــەی و پێیــدەوترێت کونســوڵی گشــتی، سەرباری سیفەتە دبلۆماسییەکەی[1].

بــەڵام وەزیــری نیشــتەجێ (الــوزیر المقــیم) نماییــندەی دەوڵەتەکــەی بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەکات.

لەگەڵ بەردەوامیی نێراوە هەمیشـەییەکان لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی حەڤدەیەمەوە، سەرۆکی نێراوەکان لە جۆری (مندوب) و وەزیری نیشـتەجێ (الــوزیر المقــیم)، یــان سەرووئاســایی (فــوق العــادة) وردە وردە بــەرەو کەمبوونەوە چوو، لە بەرانبەردا رێژەی وەزیری راسپێراو لـە هەڵکشـان بـوو، بــەڵام لــەدوای جــەنگی دووەمــی جیهانییــەوە، بــە کەمبوونــەوەی ئــەو کۆمسیۆنانەی، کە (منـدوب)، یـان وەزیرێـك سـەرۆکایەتییان دەکـرد، رۆڵـی ئەوانیش کەمبووەوە، واتـە کۆمسـیۆنەکان لـە بەرژەوەنـدیی باڵوێزخانـەکان روویان لە کەمبوون کردووە[2].

### ٣.هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان (القائم بالأعمال):

یەکێکی تر لە پۆستی سەرۆکایەتیی نێراوە دبلۆماسـییەکان پێیـدەوترێت هەڵسووڕێنەری کاروبارەکـان، ئـەویش دوا پۆسـتە لـە پۆسـتەکانی سـەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکان. دیاریکردنی کەسێك بۆ هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان و

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص١٠٣-١٠٤.

(٢) د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص٢٤٩.

نوێنەرایـەتیکردنی دەوڵـەت لـە دەوڵـەتی پێشـوازیکەر چـەند هۆکـار، یـان پاڵنەرێکی هەیە، لەوانە: خاوبوونەوە، یان ساردیی پەیوەندیی نێوانیان، یان پاڵنەری ئـابووری، واتـە خراپیـی بـاری دارایـی دەوڵەتەکـە وا بخوازێـت، کـە نێـراوە دبلۆماسـییەکانی لـە دەرەوە کەمبکاتـەوە، یـاخود هۆکارەکـە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە سەرۆکی باڵوێزخانەکە شوێنەکەی چۆڵ بێت، یـان ناتوانێت کارەکانی ئەنجامبدات، لەبەر هۆکارێك کـە پەیوەنـدیی بـە مۆڵـەتی کـارگێڕی، نەخۆشی،بانگهێشـتکردنەوەی، یـاخود کۆتاییهێنـان بـە کارەکەیـەوە.. هـەبێت[1]. ئەمـەش بـەپێی ڕێککەوتننامـەی ڤیـەننای سـاڵی (١٩٦١)[2] پێیدەوترێت هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان لەجیاتی (قائم بالأعمال بالنيابة)، یان هەڵسووڕێنەری کاتیی کاروبارەکان.

هەروەها لەبارەی فرەنوێنەرایەتیکردن و نوێنەرایەتیی هاوبەشدا (التمثيل المتعدد والمشترك) دەوڵەتی نێرەر بۆی هەیـە لـە دەوڵـەتێك، یـان چـەند بـە لـەجیاتی دەوڵـەتێکی تـر نێراوێکـی دبلۆماسـیی بـە سـەرۆکایەتیی هەڵسـووڕێنەری کاروبارەکـان بـە لـەجیاتی لـە هەردەوڵەتێکـدا دانێـت، کـە سـەرۆکی نێراوەکـە تێیـدا بارەگـای هەمیشـەیی نـەبێت. هەڵسـووڕێنەری کاروبارەکـان بنـەڕەتی بێـت، یـان بـە لـەجیاتی پێویسـتە لـە دەسـتەی فەرمانبەرەدبلۆماسییەکان بێـت[3]، خـۆ ئەگـەر نـەتوانرا دبلۆماتێـك بـۆ ئـەو پۆسـتە دیاریبکرێـت، بەتایبـەت سـەبارەت بـەو دەوڵەتانـەی کـە لـە کـادری

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٠٤-١٠٨. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٢٤٩-٢٥١.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/١٩)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٣) بڕوانە: ماددەی (١/٥)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

دبلۆماسییدا هەژارن، ئەوا دەتوانرێت یەکێك لە فەرمانبەرە کارگێڕی، یان هونەرییەکان بۆ لەئەستۆگرتنی کاروبارە کارگێڕییەکانی نێراوە دبلۆماسییەکە راسپێرێت، بە مەرجێك پێشوەختە رەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر وەربگیرێت[1].

هەرچی پەیوەندیی بە جیاوك و پارێزبەندیی (هەڵسوورێنەری کاروبارەکان)ـەوە هەیە، لەگەڵ باڵوێز و وەزیردا هاوشێوەیە، تەنها لە مافی پێشبەندی و ئەتەکێتی مەراسیمەکاندا نەبێت[2].

هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان مافی ئەوەی نییە پەیوەندیی راستەوخۆ لەگەڵ سەرۆکی ئەو دەوڵەتەدا بکات، کە تێیدا کاردەکات. کاتێکیش کە باڵوێز سەفەردەکات، هەڵسووڕێنەرێکی کاروبارەکان لەبری خۆی دیاریدەکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی باڵوێزخانەکە، لە ماوەی ئامادەنەبوونی باڵوێزدا.

### ٢. فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان (الموظفون الدبلوماسيون):

رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان پلەی ئەو فەرمانبەرە دبلۆماسییانەی دیاری نەکردووە، کە سیفەتی دبلۆماتیان هەیە، بەڵکو بۆ یاسا ناوخۆییەکانی دەوڵەتانی بەجێ هێشتووە، بەو پێیەی ئەو کارە بە پلەی یەکەم پرسێکی ناوخۆییە. بەڵام دوو مەرجی سەرەکی داناوە بۆ ئەوەی فەرمانبەری دبلۆماسی سیفەتی دبلۆماتی هەبێت:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢/٥)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٢/١٤)ی هەمان رێککەوتننامە.

أ.	رەگەزنامەی ئەو دەوڵەتەی هەبێت کە خاوەنی ئەو باڵوێزخانە، یان نێراوە دبلۆماسییەیە کە ئەو کاری تێدا دەکات، بەڵام دروستنییە لە هاوڵاتیی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان دەوڵەتی سێیەم بێت، مەگەر بە رەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر بێت، لە هەرکاتێکیشدا بیەوێت دەتوانێت ئەو رەزامەندییەی بکێشێتەوە[١]. بەڵام پێویستە ئەوە بزانین، کە ئەو نێراوە دبلۆماسییەی کە هاوڵاتیی دەوڵەتی پێشوازیکەرە، یان لەو بیانییانەی دەوڵەتی سێیەمە کە بەشێوەی هەمیشەیی تێیدایە، تەنیا پارێزبەندیی دادوەریی، یان پارێزبەندیی کەسیی پێدەبەخشرێت لەو کارە فەرمییانەی کە لە لە راپەڕاندنی ئەرکەکانیدا پێیهەڵدەستێت، ئەمە ئەگەر دەوڵەتی پێشوازیکەر جیاوك و پارێزبەندیی تری پێنەبەخشێت[٢].

ب.	دەوڵەتی بەرانبەر –کە ئەو فەرمانبەرە دبلۆماسییە کاری تێدادەکات– لە دیاریکردنی ئەو فەرمانبەرە دبلۆماسییە و ڕۆژی دەستبەکاربوونی ئاگادار بکرێتەوە.

ت.	لەگەڵ ئەوەشدا، لە زۆربەی دەوڵەتاندا ریزبەندیی پلەکانی دبلۆماسیی بەم شێوەیە دادەنرێت[٣]:

أ.	**راوێژکار (المستشار)**: بریتییە لە کەسی یاریدەدەری سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەو بەردەوام ڕاو راوێژی پێشکەش دەکات. لە کاتی ئامادەنەبوونی سەرۆکیشدا دەبێتە جێگری، هەروەها کەسی دووەمە کە

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٨)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/٣٨)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٢٩-١٣٠. و: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١١٠-١١٢. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٢٥١-٢٥٣.

ئەنـدامانی تـری باڵوێزخانەکـە بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـانەی دێنـە بـەردەمیان بـۆ لای دەگەڕێنـەوە، راشدەسـپێرێت بـۆ ئەنجامـدانی هەنـدێك گفتوگۆی دبلۆماسیی لەبری سەرۆکی باڵوێزخانەکە، جگە لە چاوپێکەوتن بە سەرۆکی دەوڵەت، یان وەزیری دەرەوە.

ب. **سکرتێر:** ئەو کەسـەیە کـە هەڵدەسـتێت بـە یاریـدەدانی سـەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکە، یـان راوێژکارەکـەی، واتـە جیـاوازە لـە سـکرتێری کـارگێڕی، چـونکە ئەنـدامی سـلکی دبلۆماسـییە و ئـەرکی ئامـادەکردنی ڕاپۆرتـەکانی دەخرێتەئەسـتۆ و ئـەو نووسـراو و یاداشـتانەی بـۆ دێـت، کـە لەلایەنە تایبەتمەندەکانەوە بۆی دەنێرێن، ئەمە وێڕای کردنـەوەی برووسـکە رەمزییەکان و نووسین و ناردنی ئەو برووسکانەی مەبەستە بنێرێن، هەروەها رێگـەدان بـە هاتنـەژوورەوەو هەنـدێك کاروبـاری تـری وەك: چـاودێریکردنی نامـەکاری و ڕۆژنامـە و گۆڤارەکـان و ئەرشـیف و پۆلێنکردنیـان، مـۆرکردنی ئیمزاکان، بەخشینی ڤیزا بەو بیانییانەی، کە دەیانەوێت سەردانی وڵاتەکـەی بکەن، ئەمە وێڕای ئەو کارانەی تر، کە واقیعی کرداری دەیسەپێنن[١].

پۆستی سکرتێر سێ جۆری هەیە: (سکرتێری یەکەم و سکرتێری دووەم و سکرتێری سێیەم)، کە هەموویان سیفەتی دبلۆماتیان هەیە.

ج. **پاشـکۆی دبلۆماسـیی(الملحـق الدبلوماسـي):** نـزمترین پلـەی دبلۆماسییە لە پلەکانی فەرمانبەری لە وەزارەتی دەرەکیدا. کاتێـك کەسـێك بۆ یەکـەمجار بـە وەزیفەیـەکی دبلۆماسـی دابمـەزرێت، ئـەوا بـە فەرمانبـەری پاشکۆ دادەمەزرێنرێت.

---

(١) د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص٩٤.

د. **پاشکۆ (الملحق)**: فەرمانبەرێکی خاوەن پسپۆڕی سەر بە وەزارەتە جیاوازەکانە و لە نێراوە دبلۆماسییەکەدا کاردەکات، بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەر بە وەزارەتەکەی خۆیەتی. لێرەدا وەزارەتی دەرەکی تەنها ڕۆڵی نێوەندی هەیە لە گواستنەوەی نامەکانی "پاشکۆ"کان بۆ وڵاتەکەی. لەوانە: پاشکۆی سەربازی، پاشکۆی بازرگانی و کولتووری و رۆژنامەوانی، کە هەموویان سیفەتی دبلۆماسییان هەیە.

کەواتە هەموو فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان سیفەتی دبلۆماتکاریان هەیەو هەردەوڵەتێکیش مەرجی خۆی دادەنێت بۆ دامەزراندنیان.

**ناوونیشان و پلەی وەزیفیی سلکی دبلۆماسی و کونسوڵی لە (عێراق):**

بەپێی یاسای عێراقیی ڕاژە دەرەکی (قانون الخدمة الخارجية)ی (عێراق)ی ساڵی (٢٠٠٨)، ناوونیشان و پلە وەزیفییەکان لە (عێراق)دا بەم شێوەیەن، کە لە خشتەی ژمارە (٣)دا هاتووە[1]:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣)ی (یاسای عێراقیی ڕاژەی دەرەکی)ی ژمارە (٤٥)ی ساڵی (٢٠٠٨)، دەقی یاساکە لە پێگەی فەرمی (السلطة القضائية العراقية/ قاعدة التشريعات العراقية)، لەم لینکەی خوارەوە: (مێژووی سەردان: ٢٠١٦/٣/١٠)

http://www.iraqld.iq/LoadLawBook.aspx?SC=170520106760146

## خشتەی ژمارە (٣)

## ناوونیشان و پلە وەزیفییەکانی خزمەتی دەرەکی لە عێراقدا

| ناوونیشانی وەزیفە | لە ناوەندی وەزارەت | لە نێراوە دبلۆماسیی و کونسوڵییەکان |
|---|---|---|
| باڵوێز | بریکاری وەزیر | سەرۆکی فەرمانگە – باڵوێز |
| وەزیری راسپێراو | یارەدەدەری سەرۆکی فەرمانگە | بە پلەی بەرێوەبەری گشتی – وەزیری راسپێراو، یان کونسوڵی گشتی |
| راوێژکار | بەرێوەبەری بەش بە پلەی یاریدەدەری بەرێوەبەری گشتی | راوێژکار، یان کونسوڵی گشتی |
| سکرتێری یەکەم | بەرێوەبەری بەش (قسم) | سکرتێری یەکەم، یان کونسوڵی یەکەم |
| سکرتێری دووەم | بەرێوەبەری هۆبە (شعبة) | سکرتێری دووەم، یان کونسوڵی دووەم |
| سکرتێری سێیەم | بەرێوەبەری هۆبە | سکرتێری سێیەم، یان کونسوڵی سێیەم |
| پاشکۆ | پاشکۆ | پاشکۆ، یان جێگری کونسوڵ |

### ٣. ئەندامانی خێزانی کەسی دبلۆمات
### (أفراد أسرة المبعوث الدبلوماسي):

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١)، ئەندامانی خێزانی کەسی دبلۆمات سیفەتی دبلۆماتیان هەیە، لەوەی کە پەیوەندی بە پێدانی هەموو ئەو پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییانەوە، کە کەسی دبلۆمات هەیەتی، بەڵام بە چەند مەرجێك[1]:

أ. پێویستە ئەندامانی خێزانەکەی لەو کەسانە بن، کە لە خانووەکەیدا دەژین: واتە یەك سەقف کۆیان بکاتەوە، بەبێ ڕەچاوکردنی پلەی نزیکییان لێوەی. واتە ئەگەر نزیکترین کەسەکانی دبلۆمات لەو خانووەدا نەژین، کە کەسی دبلۆماتی تێدایە، ئەوا سیفەتی دبلۆماسییان نابێت، جا با بەخێویشیان بکات و خەرجیشیان بکێشێت. بەوردی ئەندامانی خێزانی نوێنەری دبلۆماسیی، کە لەژێر چاودێریی ئەودان، بریتین لەمانە[2]:

- هاوسەری فەرمیی خۆی.
- منداڵە کوڕە ناکامەکانی تا کۆتاییهاتنی خوێندنی باڵایان، یان تا ئەو کاتەی کارێك، یان پیشەیەك دەکەن.
- منداڵە کچە ناکامەکانی، یان بەشوونەدراوەکانی، یان ئەوانەی، کە لە مێردەکانیان جیابوونەتەوە.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣٧)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١)..

(٢) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٥١-١٥٢.

- دایك و باوكی و ئەو خوشكانەی كە هاوسەرگیرییان نەكردووە، یان لە مێردەكانیان جیابوونەتەوە، ئەگەر دبلۆماتەكە بەرپرسیار بوو لە بەخێوكردنیان و لە وڵاتی خۆی بەبەردەوامی لەگەڵیدا ژیابن.
- دایكی هاوسەرەكەی، ئەگەر بەبەردەوامی لەگەڵیاندا ژیابێت و مێردو منداڵی نەمابێت، كە بەخێوی بكەن.

ب. پێویستە ئەندامانی خێزانەكەی لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە نەبن، كە دبلۆمات كاری تێدادەكات، بەڵام ئەگەر لە هاووڵاتییانی دەوڵەتی خاوەن باڵوێزخانەكە، یان دەوڵەتی سێیەم بن، ئەوا سیفەتی دبلۆماسییان هەیە.

ج. پێویستە سیفەتی دبلۆماسیی تەنها لە پارێزبەندی و مافە دبلۆماسییەكاندا كورت هەڵبێت: واتە ئەندامانی خێزانی كەسی دبلۆمات نامایندەیی وڵاتەكەیان ناكەن، نابێت ئەوەشی كە دەیڵێن بە گوزارشتی دەوڵەتەكەیان دابنرێت، هەروەك چۆن نابێت ئەو دەوڵەتەی كە تێیدا دەژین گفتوگۆ و پەیوەندییان لەگەڵ ببەستێت، یان بەفەرمی وتاریان ئاراستە بكات، بەڵكو سیفەتی دبلۆماسییان تەنها پارێزبەندی و مافە دبلۆماسییەكان دەگرێتەوە.

د. پێویستە نێراوە دبلۆماسییەكە وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی میواندار، لەناوی ئەندامانی خێزانی دبلۆماتكارەكانی ئاگاداربكاتەوە: ئەم مەرجە لە رێككەوتننامەی ڤیەننادا نەهاتووە، بەڵام وەكو نەریتێكی نێودەوڵەتی پیادەدەكرێت، واتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ئەو ئەندام خێزانانەی، كە ناوەكانیان نەنێراوە سیفەتی دبلۆماسییان نییە، بەڵكو ناردنی ناوەكانیان ئاسانكارییەكە بۆ ئەو سیفەتە، لە كاتی وەرگرتنی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەكاندا.

کەواتــە ئەگــەر ئەنــدامانی خێزانــی نوێنــەری دبلۆماســیی هــەڵگری رەگەزنامــەی دەوڵــەتی پێشــوازیکەر بــوون، ئــەوا ســوود لــە پارێزبەنــدی و جیاوکە دبلۆماسییەکان وەرناگرن، مەگەر ئەو دەوڵەتــە خــۆی پارێزبەنــدی و جیاوکی زیادیان بداتیّ[١]، رای باو ئەوەیە کە پارێزبەندی و جیاوکەکان تەنها هاوســەر و کــوڕە ناکامــەکان و کچــە ناکــام، یــان بەشــوونەدراوەکان، یــان جیابووەوەکــان لــە مێردەکانیــان دەگرێتــەوە، بــە مــەرجێك هــەموویان لــە خــانووی نوێنــەرە دبلۆماســییەکەدا نیشــتەجێ بــن و ئــەو لــە بــەخێوکردنیان بەرپرس بێت[٢].

### ٤. فەرمانبەرە ئیداری و هونەرییەکان (الموظفون الإداريون والفنيون):

"فەرمانبەرە کارگێڕی و هونەرییەکان" ئــەو فەرمانبەرانــەی نێراوەکــەن، کە لە خزمەتە کارگێڕی و هونەرییەکاندا کاردەکەن[٣].

لــە هــەموو باڵوێزخانەیەکــدا کۆمەڵــە کەســانێکی ئیــداری و هونــەری لــە پسپۆڕیی جۆراوجۆردا کاردەکەن، وەك ئەندازیار و پزیشك، کە هەڵدەستن بە کارە ئیداری و هونەرییەکان. ئەمانە جگە لە هەنــدێك پارێزبەنــدی و جیــاوك، سیفەتی دبلۆماسییان نییە، بەڵام زۆربەی کات ئەو دەوڵەتەی کە دەیاننێرێت سیفەتی دبلۆماسییان پێدەبەخشێت، بۆ نموونە: سیفەتی سکرتێری یەکەم، یان دووەم دەبەخشێت بە فەرمانبەری کارگێڕی کاتێك لــە باڵوێزخانەیەکیــدا

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٣٨)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٥٢. و: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص١١٠.

(٣) ماددەی (١/و)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

دایدەمـەزرێنێت، ئەمـەش لـەپێناو ئـەوەی، کـە لـە پارێزبەنـدی و مافـە دبلۆماسییەکان بێبەش نەبێت.

٥. **ئەندامانی ستاف خزمەتگوزاری (مستخدمو البعثة):**

ئەندامانی ستاف خزمەتگوزاری نێراوی دبلۆماسیی ئەو ئەندامانەی سـتاف نێراوەکەن، کە لە خزمەتگوزاریی نـاوخۆی نێراوەکـەدا کاردەکـەن[1]. واتـە: ئەو کەسـانەن کـە وەکـو خزمـەتگوزار لـە نێراوەکـەدا کاردەکـەن. واتـە ئـەو کەسانە دەگرێتەوە کـە هەڵدەسـتن بـە ئەنجامـدانی خزمـەتێکی تایبـەت بـۆ نێراوەکە، وەك: کارمەندی چاککردنەوەی ئامێرەکان، کارەباچی، پاسـەوان، کارمەندی پۆستە و تەلەفون و...هتد.

٦. **خزمەتگوزاری تایبەت (الخادم الخاص):**

بریتییە لەو کەسەی کاری خزمەتکاریی ماڵی یەکێك لە ئەنـدامانی نێـراوە دبلۆماسییەکە دەکات، (نەك دبلۆماتەکە خۆی) و لە بەکارهێنراوانی دەوڵەتی نێرەر نییە، وەك: چێشتلێنەر، دایەن، باخەوان[2].

لەڕووی کردارییەوە هەندێك لە دەوڵـەتان سـیفەتی دبلۆماتییـان نـادەنێ، بەڵام هەندێکی تر ئیمتیازاتگەلێکی سادەیان پێدەبەخشن، هەنـدێکی تریـان سیفەتی دبلۆماسییان پێدەبەخشن، واتە دەوڵەتان لەم رووەوە جیاوازن.

لەڕاستیدا رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان پرسـی (پێدانی سیفەتی دبلۆمات بە خزمەتگوزارە تایبەتـەکان)ی بـۆ ئـەو دەوڵەتـە بەجێهێشـتووە، کـە باڵیۆزخانەکـەی لێیـە، بـەڵام بـەپێی رێککەوتننامـەی

(١) ماددەی (١/و)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/ح)ی هەمان رێککەوتننامە.

ڤیـەننای (١٩٦١)، لانیکـەم پێویسـتە ئـەو دەوڵەتـە لـەو ڕەسـم و باجانـە بیانبەخشێت، کە پەیوەستن بـەو پارانـەی، کـە لـە بەرانبـەر خزمـەتکردنیان وەریدەگرن، بەو مەرجەی ئەو خزمەتگوزارە لە هاووڵاتیی ئەو دەوڵەتە خۆی نـەبێت، کـە باڵوێزخانەکـەی لێیـە، هـەروەها لـەو بیانییانـە نـەبێت، کـە بـۆ هەمیشەیی لە دەوڵەتەکەیدا نیشتەجێن[١].

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە "هەڵگری جانتای دبلۆماسی"یش بە دبلۆمات هەژماردەکرێت و جیاوك و پارێزبەندی هەیە[٢].

## چوارەم: ئەندامی نێراوە دبلۆماسییە تایبەتەکان (أفراد البعثة الدبلوماسية الخاصة):

مەبەست لە نێراوە تایبەتەکان (البعثات الخاصة) ئەو نێـراوە کاتییانـەن، کە دەوڵەتێك بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لـە بابەتگـەلێکی دیاریکراودا دەینێرێتـە دەرەوە، لـەو بابەتانـەی کـە نێـراوە هەمیشـەییەکان نـاتوانن پێـی هەسـتن. بەگشـتی نێـراوە تایبەتـەکان لـەو کەسـە پسـپۆڕانە پێکدێن، کە پسپۆڕییەکەیان یارمەتییان بدات، بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارەی پێی هەڵدەسـتن، هـەر بـە تـەواوبوونی ئەرکەکەشـیان کارەکـەیان تـەواودەبێت، زۆرکاتیش ئەو کەسە پسپۆڕانە لە دەوڵەتەکەی خۆیاندا سیفەتی دبلۆماتیـان نییە، واتە فەرمانبەری وەزارەتی دەرەکی نین، بەڵکو لە وەزارەتەکانی ترن، بەڵام لەو دەوڵەتە بیانییـەی، کـە بـۆی دەنێـرێن بـۆ بەجێگەیانـدنی کارێـك،

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤/٣٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٢٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

سـيفەتی دبلۆمـات هەڵـدەگرن، بـە تـەواوبوونی ئەرکەکـەیان ئـەو سـيفەتە دبلۆماسییەشیان نامێنێت[1].

پاش زیادبوونی نێراوە تایبەتەکان و فراوانبوون و ئاڵۆزبوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، لە (١٦)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩) رێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان دەرچوو، کە بەوردی باس لەو بابەتانەی، کە تایبـەتن بـە نێراوە تایبەتەکانەوە دەکات.

زیـادبوونی ئـەم جـۆرە نێـراوە تایبەتانـە، بـۆ چـڕبوون و ئـاڵۆزبوون و فرەڕەهەنـدبوونی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان دەگەڕێتـەوە، فراوانبـوونی بوارەکـانی و زیـادبوونی پەرەسـەندنی تـەکنۆلۆجیای گەیانـدن و زانیـاری و نزیکبوونـەوەی زیـاتری دەوڵـەتان و دەرکـەوتنی چـەندین کێشـەو گرفـت و مەترسـیی هاوبـەش و دوولایەنـە لـە پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکانـدا، کـە پێویستییان بە چارەسـەری خێـراو بەپەلـە و کەسـانی پسـپۆڕ و تایبەتمەنـد هەیە، کە باڵوێزخانەی هەمیشەیی ناتوانێت هەموویان بەتەواوی بەڕێوەببات، یـاخود چارەسـەریان بـۆ بدۆزێتـەوە، بۆیـە زۆرێـك لـە دەوڵـەتان بـۆ دوورکەوتنەوە لە رۆتین و بەجێگەیاندنی خێـرای کـارو بەرژەوەندییـەکان لـە بوارە جیاجیاکاندا، پەنا بۆ نێراوە تایبەتەکان دەبەن.

ئـەو رێککەوتننامەیەلـە زاراوەی "نێـراوی تایبـەت" بـەم شـێوەیە پێناسـەدەکات: "نێراوێکـی کاتییـە، کـە سـيفەتی نماینـدەکاری هەیـە و دەوڵەتێك دەینێرێت بۆ دەوڵەتێکی دی، بە رەزامەندیی دەوڵەتی دووەم، بـۆ

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص٦٦-٦٧. و: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٣٢-١٣٣.

تاووتوێکردنی مەسەلەگەلێکی دیاریکراو، یاخود بۆئەوەی لە دەوڵەتی دووەم ئەرکێکی دیاریکراو رابپەڕێنێت"[١].

**بەو پێیە رێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکانی ساڵی (١٩٦٩) چەند مەرجێك دادەنێت بۆ نێراوە تایبەتەکان بۆئەوەی ئەندامەکانی سیفەتی دبلۆماتیان هەبێت:**

أ. پێویستە سیفەتی نماییندەکارییان هەبێت، واتە نماییندەی دەوڵەتێکی دیاریکراو بن.

ب. پێویستە کاری نێراوەکە کاتی بێت، نەك هەمیشەیی.

ج. پێویستە رەزامەندیی ئەو دەوڵەتە وەربگیرێت، کە بۆی دەنێرێت.

لێرەدا خاڵی جیاکەرەوەی نێوان دەستپێکردنی کاری دبلۆمات لە نێراوی تایبەت لەگەڵ نێراوی هەمیشەیی ئەوەیە، کە لە ناردن و قبووڵکردنی نێراوی تایبەتدا دانپێدانانی ئاڵوگۆڕکراو بە پێشمەرج نەگیراوە بۆ ناردنی نێراوەکە، وەك لەوەی لە ناردن و دەستپێکردنی کاری دبلۆماتی هەمیشەییدا هەیە[٢].

کەسی دبلۆمات لە نێراوە تایبەتەکاندا و ئەندامانی خێزانەکەشی هەمان ئەو سیفەتەیان هەیە، کە دبلۆماتی نێراوە هەمیشەییەکان و ئەندامانی خێزانەکانیان هەیانە[٣].

بەپێی هەمان رێککەوتننامە، بۆ ناردن، یان پێشوازیکردنی نێراوی تایبەت بوونی پەیوەندیی دبلۆماسیی، یان کونسوڵی بەمەرج نەگیراوە[١].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/أ)ی (رێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان)ی ساڵی (١٩٦٩).

(٢) د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص١٨٥.

(٣) بڕوانە: ماددەی (٣١)ی ( رێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان)ی ساڵی (١٩٦٩).

نێراوه تایبەتەكان سەرۆكی دەوڵەت و وەزیری دەرەكی و وەزیرەكانی تر و پلـەباڵاكانی دەوڵـەت دەگرێتـەوە. دەشـكرێت نێـراوی تایبـەت چـەند فەرمانبـەرێكی كـارگێڕی و هونـەری و خێزانـەكانیان و خزمـەتگوزارەكان و خزمەتگوزاری تایبەتیان لەگەڵدا بێت، كە سیفەتی دبلۆماسییان نییـە، جگـە لە هەندێك جیاوك و پارێزبەندیی دبلۆماسیی[٢].

بـەوردی دەتـوانین بڵـێین نێـراوە تایبەتـەكان ئەمانـەی خـوارەوە دەگرێتەوە[٣]:

١. سـەرۆكی حوكومـەت و وەزیـری دەرەكـی و وەزیرەكـانی تـری دەوڵەتان، كـە بـۆ ئەنجامـدانی گفتوگۆیـەكی گـرنگ، یـان كـارێكی پێویسـت دەنێرێن.

٢. شاندی هاوڕێی سەرۆكی ئەو نێراوانەی، كە بـۆ كۆبونـەوەی لووتكـە دەنێرێن.

٣. باڵوێزە گەڕۆكەكان، یان نوێنەرە كەسییەكانی سەرۆكی دەوڵـەتان، كە بۆ ئەنجامدانی ئەركێكی تایبەت، یان گواستنەوەی نامەیەكی نهێنی، یان شیكردنەوەی وردەكارییەكی گرنگ، یان بۆ وەرگرتنی راو راوێژكردن، یاخود بۆ داواكردنی پشتگیری، یان دانانی بناغەی بەرایی رێككەوتنێك دەنێرێن.

٤. بـاڵوێز و شـاندو نێراوەكـان بـۆ دانـانی بناغـەی رێككـەوتن و پەیماننامەی سیاسی، یان ئابووری، یان بۆ چارەسـەری بابـەتێكی كوتـوپڕ،

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٧)ی هەمان رێككەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەكانی (٣٦-٣٨)ی هەمان رێككەوتننامە.

(٣) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٦٢-١٦٣..

یان بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆی سەرەتایی بۆ ڕێخۆشکردن بۆ دەستپێکردنی دانوستانی فەرمی.

٥. ئەو باڵوێز و وەزیرانەی دەوڵەت، کە بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی دبلۆماسیی دەنێرێن.

٦. شاندە کولتووری و بازرگانییەکان، یان ئەو شاندانەی بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگێك، یان بۆ پێشکەشکردنی پیرۆزباییەك و...هتد ڕاسپێراون.

**پێنجەم: کونسوڵەکان(القناصل):**

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکانی ساڵی (١٩٦٣)، کاری کونسوڵەکانی ڕێکخستووە، کە بریتییە لە پاراستنی هاووڵاتییانی دەوڵەتەکەیان لەو دەوڵەتەدا، کە بۆی نێراون و کارئاسانی بۆیان. هەروەها کونسوڵەکان ئاسانکاری دەکەن بۆ گەشتی هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراون و ڤیزەی هاتنەناوەوەیان بۆ دەوڵەتەکەی خۆیان پێدەدەن، هەروەها هەموو ئەو کارانەی تریش، کە پەیوەندییان بە تاکەکانەوە هەیە.

بەو پێیەی کە کاری کونسوڵەکان کارێکی نمایندەکاری نییە بۆ دەوڵەتەکەیان، کونسوڵەکان سیفەتی دبلۆماتیان نییە، جا با پارێزبەندی و مافیشیان هەبێت، کە لە هەموو بارێکدا لەو پارێزبەندی و مافانە کەمترن، کە کەسانی خاوەن سیفەتی دبلۆماسیی هەیانە.

زوربەی دەوڵەتان کە کونسوڵ دەنێرنە دەرەوە هەوڵدەدەن، سیفەتی دبلۆماتیان پێببەخشن، ئەویش لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی بەرانبەر بەوەی، کە ئەمانە سیفەتی دبلۆماتیان هەیەو لە باڵوێزخانە بە

سیفەتی سکرتێری یەکـەم، یـان دووەم کاردەکـەن، بـەڵام باڵوێزخانەکـەیان تەنسیبیان دەکەن بۆ ئەنجامدانی کاری کونسـوڵی. لـەم بـارەدا کونسـوڵەکە دەبێـت بـە دبلۆماتکـارێکی تەنسـیبکراو بـۆ کـاری کونسـوڵی. دەوڵـەت بـە ئامـانجی ئـەوە ئـەم کـارە دەکـات، کـە کونسـوڵەکانی سـیفەتی دبلۆماتیـان هەبێت و سوود لە هەموو ئەو پارێزبەندی و جیاوکانە وەربگرن، کە دبلۆمـات هەیەتی.

**کونسوڵەکان دوو جۆرن:**

**یەکـەم: کونسـوڵی بنـەڕەتی** (القنصـل الأصـیل)، کـە لـە هاووڵاتییـانی دەوڵەتەکەی خۆیەتی (دەوڵەتی نێرەر).

**دووەم: کونسوڵی فەخری** (القنصل الفخري)، کە لە هاووڵاتییانی دەوڵەتی پێشوازیکەرە، واتە ئەو دەوڵەتەی کە کونسوڵخانەکەی لێیە.

هەرچی پلەکانی کونسوڵیشە بـریتین لـە: سـەرۆکی کونسـوڵگەری، دواتـر کونسوڵی یەکەم و کونسوڵی دووەم و کونسـوڵی سـێیەم، هـەروەها جێگـری کونسوڵ و بریکاری کونسوڵ.

یەکێك لە جیاوازییەکانی نێوان کونسوڵخانەکان و باڵوێزخانەکان ئەوەیە، کە هەردەوڵەتێك تەنها یەك باڵوێزخانە لـە دەوڵـەتێکی تـردا دەکاتـەوە، کـە بەگشتی لە پایتەختدا دەبێت، بەڵام چەند کونسـوڵگەرییەك –بـە رێککـەوتن لەنێوان هەردوولادا– لە دەوڵەتی بەرانبەردا بکاتەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە جیاوك و پارێزبەندیی باڵوێزخانەکان لە هی کونسوڵخانەکان زیاترن.

**شەشەم: نوێنەری دەوڵەتان لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و فەرمانبەری ڕێکخراوەکان:**

ڕێکخراوی نێودەوڵەتی: "کەسێکی یاسایی ئیعتیبارییە، بە ویست و ڕێککەوتنی کۆمەڵەدەوڵەتێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی هاوبەش دروستدەبێت"(١).

دوو جۆر کەس هەن، کە لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا کاردەکەن: یەکەمیان نوێنەرانی دەوڵەتانی بیانین لە ڕێکخراوەکاندا، دووەمیان فەرمانبەرانی ڕێکخراوەکەن لە بریکارو راوێژکار و شارەزا و هونەری و ئیدارییەکان و...هتد، لەوانەی کە ملکەچی ڕێنمایی ڕێکخراوەکەن.

نەتەوەیەکگرتووەکان بە گەورەترین ڕێکخراو هەژماردەکرێت، کە ئەو نوێنەرانە لەخۆ دەگرێت، کە دەوڵەتان خۆیان، وەك نمایندەی خۆیان، بە پلەی بالۆێز، یان وەزیری سەرووئاسایی و فەرمانبەرەکانیان، دیارییان دەکەن، کە لەنێوان سکرتێری گشتی و حوکومەتی ئەمەریکی (وڵاتی بارەگای ڕێکخراوەکە) و حوکومەتی ئەو دەوڵەتانەدا دیاریدەکرێن.

هەرچی فەرمانبەرانی نەتەوەیەکگرتووەکانیشە، کە نەتەوەیەکگرتووەکان دیارییان دەکات، بریتین لە نوێنەر و بریکارو راوێژکار و شارەزا و ئەمینی وەفدەکان و فەرمانبەرانی تر، کە سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان پلەکانیان دیاریدەکات، کۆمەڵەی گشتییش دانیان پێدا دەنێت.

---

(١) د. فخري رشيد المهنا و صلاح ياسين داود، المنظمات الدولية، العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠٠٧، ص٢٠.

له بەشی شانزەیەم، ماددەی (١٠٥)ی کارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا باس لەوە کراوە، کە رێکخراوەکە لە خاکی هەموو ئەندامەکانیدا ئەو جیاوك و بەخشینانە (المزايا والاعفاءات)ی هەیە، کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی پێویستن. هەروەها نوێنەرانی ئەندامانی نەتەوەیەکگرتووەکان و فەرمانبەرەکانیشی ئەو جیاوك و بەخشینانەیان هەیە، کە بۆ سەربەخۆییان لە راپەڕاندنی کارەکانی پەیوەست بە رێکخراوەکە پێویستن. کۆمەڵەی گشتییش سەربارەت بە دیاریکردنی وردەکاریی ئەم دوو بڕگەیە پێشنیاز پێشکەشدەکات، هەروەها دەتوانێت پێشنیاز بۆ ئەندامانی رێکخراوەکە بکات، بۆ گرێدانی رێککەوتن لەمەڕ ئەو بابەتە[1].

لەگەڵ ئەوەی مونتەسیبەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بەپێی "رێککەوتننامەی جیاوك و پارێزبەندییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان– اتفاقية امتيازات وحصانات الأمم المتحدة"ی ساڵی (١٩٤٦)، پارێزبەندی و مافی دبلۆماسییان هەیە، ئەوان سیفەتی دبلۆماتیان نییە[2].

ئەم رێککەوتننامەیە ئاماژەی بە سێ ئاست لە فەرمانبەر کردووە: هەندێکیان جیاوك و پارێزبەندیی رەهایان هەیە، هەندێکی تریان جیاوك و پارێزبەندییەکانیان سنووردارە، ئەمانە وەك: نوێنەری وڵاتانی ئەندام کە مافی

---

(١) بڕوانە: بڕگەکانی (١) و (٢) و (٣)ی ماددەی (١٠٥)ی کارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، لە سایتی فەرمیی نەتەوەیەکگرتووەکان، لەم لینکەی خوارەوە: (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/١٠)
http://www.un.org/ar/sections/un-charter/chapter-xvi/index.html
د. فخري رشيد المهنا و صلاح ياسين داود، المنظمات الدولية، العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠٠٧، ص٢٠.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص٥٧-٥٨. و: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٣٤-١٣٥.

بوونی هەموو ئەو جیاوك و پارێزبەندی و ئاسانكارییانەیان هەیە، كە نوێنەرە دبلۆماسییەكان هەیانە، پاشان ئەو فەرمانبەرانە دێن كە پارێزبەندیی دادوەرییان لەو كارانەدا هەیە، كە بە سیفەتی فەرمی پێی هەڵدەستن، ئەمە وێڕای ئەو ئاسانكارییانەی تر، كە پەیوەندییان بە رەسم و باج و مەرجەكانی هاتوچۆو كۆچكردنەوە هەیە، دوای ئەوانیش ئەو شارەزایانە دێن، كە ئەركێكی تایبەتیان بۆ كاری رێكخراوەكە پێدەسپێرێت، ئەوانیش ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان هەیە، كە پێویستییانە بۆ راپەڕاندنی كارەكانیان بە سەربەخۆیی تەواوەوە، وەك پارێزبەندی لە راگرتنی كەسی (التوقيف الشخصي) دەستگرتن، یان راپێچكردنی كەلوپەلە كەسییەكانی، و پارێزبەندی لە هەر دادگاییكردنێك كە تایبەت بن بەو كارانەی، كە لە كاتی جێبەجێكردنی ئەركەكانیاندا ئەنجامیانداوە، ئەمە وێڕای رێزی پەڕاو و بەڵگەنامەی تایبەت بە خۆیان، ئاسانكارییەكانی تر[(١)].

لە هەمان كاتدا، بەپێی (رێككەوتننامەی سەلامەتیی فەرمانبەرانی نەتەوەیەكگرتووەكان و ئەو تاكانەی، كە پێیانەوە پابەندن—اتفاقية سلامة موظفي الأمم المتحدة والأفراد المرتبطين بها)، كە ساڵی (١٩٩٤) لەلایەن كۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەكگرتووەكانەوە دەرچووە، لە ساڵی (١٩٩٩) چووەتە بواری جێبەجێكردنەوە، پێویستە دەوڵەتان رێوشوێنی پێویست و

(١) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، المعهد الدبلوماسي- وزارة الخارجية، ط٢، الدوحة، ٢٠١٤، ص١١٤.

خۆپارێزیی پێشوەختە لەپێناو پاراستنی فەرمانەرانی نەتەوەیەکگرتووەکان لە هەردەستدرێژییەك بگرنەبەر[١].

هەروەها کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٤٧) "ڕێککەوتننامەی جیاوك و پارێزبەندییەکانی ئاژانسە نێودەوڵەتییە تایبەتمەندەکان"ی جێگیرکرد، کە لە (٢)ی دیسەمبەری ساڵی (١٩٤٨) چووە بواری جێبەجێکردنەوە[٢].

لە (١٤)ی ئازاری ساڵی (١٩٧٥) ( ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ نوێنەرایەتیی دەوڵەتان لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە سروشت جیهانییەکان/ اتفاقية فيننا لتمثيل الدول في علاقاتها مع المنظمات الدولية ذات الطابع العالمي) دەرچوو، کە لە (٩٢) مادده پێکدێت. ئەو ڕێککەوتننامەیە پەیوەندیی دبلۆماسیی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی نێرەری شاند و نێراوە دبلۆماسییەکان لە لایەك و پەیوەندیی نێوان ئەو ڕێکخراوانەو و دەوڵەتانی بارەگا (ئەو دەوڵەتانەی کە بارەگای ڕێکخراوەکانیان لێیە) ڕێکدەخات. کەواتە ئەگەر ڕێککەوتننامە دبلۆماسییەکانی ساڵانی (١٩٦١) و (١٩٦٩) دبلۆماسیی دووانەیی هەمیشەیی و تایبەت لەنێوان وڵاتاندا ڕێکبخەن، ئەوا ڕێککەوتننامەی نوێنەرایەتیی

---

(١) بڕوانە دەقی ڕێککەوتننامەکە لە سایتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم لینکەی خوارەوە: (بەرواری سەردان: ٢٠١٧/٢/١)

http://hrlibrary.umn.edu/arabic/Convention_UN_Safety.html

(٢) بڕوانە دەقیڕێککەوتننامەکە لە سایتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم لینکەی خوارەوە: (ڕێکەوتی سەردان: ٢٠١٧/٢/١)

http://www.un.org/arabic/documents/instruments/docs_subj_ar.asp?subj=35

دەوڵەتانی ساڵی (١٩٧٥) پەیوەندیی دبلۆماسیی سێ لایەنە رێکدەخات، واتە پەیوەندیی نێوان رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و دەوڵەتی نێرەر و دەوڵەتی پێشوازیکەر[١]. ئەم رێککەوتننامەیە سیفەتی دبلۆماسیی بە نوێنەری دەوڵەتان لە رێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا بەخشی.

بەگشتی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و فەرمانبەرانیان و نوێنەرانی دەوڵەتانی ئەندام تێیاندا، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان هەیە کە پێویستن بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە، کە لەپێناویدا دروستبوون، ئەمەش لە بەرانبەر دەوڵەتانی ئەندام و دەوڵەتی بارەگادا، بە مەبەستی ئاسانکردنی کاری ئەو رێکخراوانە. هەروەها بە وردبوونەوە لە پەیماننامەی دامەزرێنەری هەندێك لەو رێکخراوە نێودەوڵەتییانە تێبینیی ئەوە دەکرێت، کە ئەو پارێزبەندی و جیاوکانەی کە بە فەرمانبەرانی ئەو رێکخراوانە دەبەخشرێت بەستراونەتەوە، بەو ئەرك و وەزیفەیەوە، کە پێی هەڵدەستن، بۆیە لە فەرمانبەرێکەوە بۆ یەکێکی تر، بەپێی ئاستی پلەو وەزیفە و بەرپرسیارێتییەکەیان، دەگۆڕێت. بۆیە گەورە فەرمانبەرە نێودەوڵەتییەکانی وەك سکرتێری گشتی و یاریدەدەرانی و ئەندامانی خێزانەکانیان، کە لەگەڵیان دەژین، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان هەیە، کە نێراوە دبلۆماسییەکان بەپێی یاسای نێودەوڵەتی هەیانە، وەك: رێزی شوێنی نیشتەجێبوون،ئازادیی پەیوەندیکردن، بەخشینە داراییەکان لە ررەسم و باج، و پارێزبەندیی

---

(١) د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص١٥٤. بڕگەی (ب)ی ماددەی یەکەمی رێککەوتننامەکە پێناسەی "رێکخراوی نێودەوڵەتیی سروشت جیهانی" بەم شێوەیە پێناسەدەکات: نەتەوە یەکگرتووەکان، ئاژانسە تایبەتمەندەکانی، ئاژانسە نێودەوڵەتییەکانی وزەی ئەتۆم، و هەر رێکخراوێکی هاوشێوە, کە ئەندامێتی و بەرپرسیارێتییان لەسەر ئاستی جیهان بێت.

دادوەری و کەسی و کارگێڕی. بەڵام چینی ئەو فەرمانبەرە پیشەییانەی کە ڕێکخراوەکە دایان دەمەزرێنێت، تەنها ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان پێدەبەخشرێت، کە بۆ راپەڕاندنی کارەکانیان پێویستن. ئەمە لەکاتێکدا کەفەرمانبەرە کارگێڕییەکان و کارگوزار و بەکارهێنراوە کاتییەکان، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان پێنابەخشرێت، کە بۆ فەرمانبەرە نێودەوڵەتییەکانی غەیری ئەوان بڕیاریان لێدراوە، بەڵام هەندێك پارێزبەندیی دادوەرییان لە کارە فەرمییەکانیاندا پێدەبەخشرێت. بەگشتی جیاوك و پارێزبەندیی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە حوکومییەکان لە پەیماننامەی دروستکەری ڕێکخراوەکاندا باسکراون، یاخود بەپێی ڕێککەوتنێکی تایبەت بەو مەبەستە ڕێکدەخرێن، کە لەنێوان ڕێکخراوە و دەوڵەتانی ئەندام تێیدا، یان لەنێوان ڕێکخراوەکەو دەوڵەتی بارەگا دەبەسترێت[١].

ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٧٥) دیارترین ئەرکەکانی نێراوی هەمیشەیی دەوڵەتی نێرەر لە لای ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بریتییە لە[٢]:

- نوێنەرایەتیکردنی وڵاتەکەی لای ڕێکخراوەکە.
- بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی نێرەر و ڕێکخراوەکە.
- ئەنجامدانی دانوستان لەگەڵ ڕێکخراوەکەو لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکەدا.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٦)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ نوێنەرایەتیی دەوڵەتان لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە سروشت جیهانییەکان)ی ساڵی (١٩٧٥).

(٢) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، م.س.ذ، ص ١١٢-١١٣.

- ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی نێرەر لە چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە و بەرزکردنەوەی راپۆرت لەسەریان.
- زامنکرنی بەشداریی دەوڵەتی نێرەر لە چالاکییەکانی ڕێکخراوەکەدا.
- پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی نێرەر لای ڕێکخراوەکە.
- کارکردن بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بنەماکانی ڕێکخراوەکە بەهاوکاری لەگەڵیدا و لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکەدا.

تەواوبوونی کاری سەرۆکی نێراوەکە، یان هەرفەرمانبەرێکی دبلۆماسیی تر، بەپێی هەمان ڕێککەوتننامە[1] لە چەند بارێکدا دەبێت، لەوانە:

- لە کاتی ئاگادارکردنەوەی ڕێکخراوەکە بە تەواوبوونی کارەکەی، لەلایەن دەوڵەتی نێرەرەوە.
- لە باری کێشانەوەی نێراوەکە بە شێوەی کۆتایی، یان کاتی.

***جیاوازیی نێوان فەرمانبەری نێودەوڵەتی (فەرمانبەری ڕێکخراوەکان) و نوێنەری دبلۆماسی:***

فەرمانبەری نێودەوڵەتی، ئەو کەسەیە کە کار بۆ ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەکات و جیاوك و پارێزبەندیی نێودەوڵەتی هەیە. بەڵام لەگەڵ نوێنەری دبلۆماسیدا چەند خاڵێك جیایان دەکاتەوە، کە لە خشتەی ژمارە (٤)دا روونیان دەکەینەوە:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤٠)ی ( ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ نوێنەرایەتیی دەوڵەتان لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە سروشت جیهانییەکان)ی ساڵی (١٩٧٥).

## خشتەی ژمارە (٤)

## جیاوازیی نێوان نوێنەری دبلۆماسی و فەرمانبەری نێودەوڵەتی

| ڕ | نوێنەری دبلۆماسی | فەرمانبەری نێودەوڵەتی |
|---|---|---|
| ١ | نوێنەرایەتیی دەوڵەتێك دەكات. | نوێنەرایەتیی ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی دەكات. |
| ٢ | جیاوك و پارێزبەندیەكانی لەپێناو بەرژەوەندیی وڵاتەكەی و ئەنجامدانی كارەكانی پێبەخشراوە، بۆیە لە بەرانبەر وڵاتی خوێدا جیاوك و پارێزبەندیی نییە. | جیاوك و پارێزبەندیەكانی لەپێناو بەرژەوەندیی ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی و ئەنجامدانی كارەكانی پێبەخشراوە، بۆیە پێویستە جیاوك و پارێزبەندییەكانی، تەنانەت بەرانبەر وڵاتەكەی خۆشی، هەبێت لە هەرشوێنێك بێت، ئەگەر لە وڵاتەكەی خۆیشی بێت و كار بۆ ئەو ڕێكخراوە بكات (لەگەڵ ئەوەی، كە دەوڵەتان لەم حاڵەتەدا لە پێدانی جیاوك و پارێزبەندییەكاندا جیاوازن). |
| ٣ | بنچینەو مەبەستی بەخشینی جیاوك و پارێزبەندییەكان پێی بە پلەی یەكەم بریتییە لە ئازادكردنی لە دەسەڵاتی هەرێمیی ئەو دەوڵەتەی كە كاری تێدادەكات. | بنچینەو مەبەستی بەخشینی جیاوك و پارێزبەندییەكان بە پلەی یەكەم بریتییە لە ئازادكردنی لە دەسەڵاتی وڵاتەكەی خۆی. |

| | | |
|---|---|---|
| | | |
| ٤ | هەندێك لە جیاوك و پارێزبەندییەکان لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە وەستاون. | تا رادەیەکی زۆر بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە لەنێوان ئەو رێکخراوەی، کە دەوڵەتەکە ئەندامە تێیدا لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی کە رێکخراوەکەی لێیە لە بەخشینی جیاوك و پارێزبەندییەکاندا بوونی نییە، چونکە لەسەر بنەمای ئەندامبوون دەبەخشرێن، لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە رێکخراوی نێودەوڵەتی خۆی خاوەنی هەرێم نییە. |
| ٥ | لە بنەڕەتدا پێویستە وەلائی تەنیا بۆ وڵاتەکەی خۆی بێت لە هەرشوێن و کاتێکدا بێت، هەر بۆیە رێسای گشتی ئەوەیە، کە دبلۆمات خاوەنی رەگەزنامەی وڵاتی نێرەر بێت، بۆ ئەوەی تووشی دووەلائی نەبێت، خۆ ئەگەر دەوڵەتەکە دبلۆماتی لە کەسانی بیانی هەڵبژارد، ئەوا پێویستی بە رەزامەندیی راشکاوانەی | لەگەڵ ئەوەی وەلائی بۆ دەوڵەتەکەی خۆیەتی و ناتوانێت بەهۆی بوونی جیاوك و پارێزبەندییەکانی سازشی لێبکات، بەڵام پێویستە نمایندەیی بەرژەوەندییەکانی رێکخراوەکەی بکات، تەنانەت ئەگەر بارەگای کارەکەشی لە سنووری وڵاتەکەی خۆیدا بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| | دەوڵەتی پێشوازیکەر هەیە و پێویستە کاری دەوڵەتی نێرەریش بکات. | |
| ٥ | لە بنەڕەتدا بنچینەی جیاوک و پارێزبەندییەکانی یاسا و نەریتی نێودەوڵەتین. | بنچینەی جیاوك و پارێزبەندییەکانی رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و یاسا نێوخۆییەکان و دەستوری رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانە. |

بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٤٩-١٥١.

(خشتەکە لەلایەن نووسەرەوە دروستکراوە).

## هێڵکاریی ژمارە (٣)

## پۆلێنی دبلۆماتکاران



# بەشی پێنجەم
# سەرەتای دەستپێکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی و کۆتاییهاتنی

باسی یەکەم: مەرجەکانی ئاڵوگۆڕکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی

باسی دووەم: هەڵبژاردنی ئەندامانی نێراوی دبلۆماسی

باسی سێیەم: رۆڵی دبلۆماسی و کار و ئەرکەکانی نوێنەری دبلۆماسی

باسی چوارەم: گوتارو پەیامگۆڕینەوەی دبلۆماتکاران

باسی پێنجەم: کۆتاییهاتنی کاری دبلۆماسی

## بەشی پێنجەم
## سەرەتای دەستپێکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی و کۆتاییهاتنی

➢ **ئامانجەکانی ئەم بابەتە:**

١. لەبەرئەوەی کاری دبلۆماسی کارێکی گرنگ و بەردەوامە و لەنێوان هەموو ولاّتانی جیهاندا هەیە، کەواتە پێویستە دەستپێك و کۆتاییەکیشی هەبێت، بۆیە زۆر گرنگە بزانرێت چۆن دەست بە کاری دبلۆماتی دەکرێت، چۆن کۆتایی دێت.

٢. ئاشنابوون بە گرنگترین هۆکارەکانی دەستپێکردن و کۆتاییهاتنی ئەم کارە و رۆڵی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لەم بوارەدا.

٣. لەکاتی دەستپێکردندا چۆن ئەندامانی نوێنەرایەتی هەڵدەبژێریت و پلەیان چۆن دەبێت.

٤. لە کاتی کۆتاییهێنان کەسی دبلۆمات، چۆن دەست لەکار هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە.

٥. زانینی هۆکارو دەرەنجامەکانی پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەنێوان ولاّتاندا.

٦. ئاشنابوون بە کاریگەریی جەنگ لەسەر پەیوەندییە دبلۆماسییەکان و جیاوازیکردن لەنێوان پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان و وەستانی ئەو پەیوەندییانە.

➢ **ناوەڕۆکی بابەتەکە:**

**دەستپێك..**

دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی بە رێککەوتنی راستەوخۆی نێوان دەوڵەتان دەبێت، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش دەستپێدەکات و بەردەوام دەبێت، تا ئەو کاتەی پەیوەندیی لایەنەکانی باش و بەردەوام بێت و ویستیان هەبێت لەسەر ئەو بەردەوامبوونە.

نێراوە دبلۆماسییەکانیش بەپێی ئەو رێوشوێن و رێسایانە کارەکانیان بەڕێوەدەبەن، کە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دیاریکردوون.

ئێمە لێرەدا باس لە مەرجەکانی نوێنەرایەتیی دبلۆماسیی و سەرەتای دەستپێکردنی و هۆکارەکانی کۆتاییپێهێنانی، یان سنووربۆدانانی دەخەینەڕوو:

## باسی یەکەم: مەرجەکانی ئاڵوگۆڕکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی

مەبەست لە ئاڵوگۆڕکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی ئەوەیە، کە دوو دەوڵەت لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسی لەنێوانیاندا رێکبکەون، ئەویش بەوەی کە هەریەکەیان نوێنەری دبلۆماسی بۆ لای ئەوی دی بنێرێت، جۆری نێراوەکەو ژمارەی ئەندامانیشی رێککەوتنەکە دیاریدەکات.

### مەرجەکانی دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسی:

بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسی لەنێوان دوو دەوڵەتدا سێ مەرج دیاریکراوە، کە بریتین لە: بوونی کەسێتیی یاسایی هەردوو دەوڵەتەکە، داننان بەیەکتریدا، و رەزامەندیی هەردوولا، کە لە رێگەی بەستنی رێککەوتنێك لە بارەیەوە لەنێوانیاندا رێکدەخرێت[١]. رێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١) ئاماژەی بەم مەرجەی کۆتاییان کردووە[٢].

### یەکەم: بوونی کەسێتیی یاسایی نێودەوڵەتی

بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسی پێویستە دەوڵەت ئەو مافەی هەبێت، واتە کەسێتیی یاسایی نێودەوڵەتی هەبێت، ئەگەر ئەو مافەی نەبوو، ئەوا بۆی نییە پەیوەندیی دبلۆماسی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا دروستبکات.

یاسای گشتیی نێودەوڵەتی ئەو لایەنانەی دیاریکردووە، کە مافی دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسییان هەیە، کە بریتین لە:

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٣٨-١٤١.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٢)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

١. **دەوڵـەت:** پێویسـتە ئـەو دەوڵەتـەی، کـە پەیوەنـدیی دبلۆماسـی دەبەسـتێت سـەروەریی تـەواوی هـەبێت، چـونکە نوێنەرایـەتیی دبلۆماسـی پابەندیگەلێکی ئاڵوگۆڕکراوی نێودەوڵەتی لەسەر لایەنـەکانی دروسـتدەکات، ئەگـەر دەوڵەتەکـە سـەروەری نـەبوو، یـاخود سـەروەرییەکەی ناتـەواو بـوو، ناتوانێت پێیانەوە پابەندبێت.

مـەرج نییـە سـەروەریی دەوڵـەت رەهابێـت، لـە پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵکو ئەوەندە بەسە کـە لـەڕووی یاسـاییەوە سـەربەخۆ بێت، چونکە دەوڵەت هەیە ملکەچی دەوڵەتێکی تـرە و بـە رەزامەنـدیی ئـەو نەبێت پەیوەندیی دبلۆماسیی نابەستێت، ئەو دەوڵەتانە لـەرووی یاسـاییەوە سەروەریی تەواویان هەیـە، بـەڵام لـەرووی واقعییـەوە ملکەچـی دەوڵـەتێکی ترن.

ئەگـەر دەوڵەتەکـە کۆنفیـدراڵی بـوو ئـەوا دەوڵەتـە پێکهێنـەرەکانی دەتـوانن پەیوەندیی دبلۆماسی لەگەڵ دەرەوە ببەستن، چونکە کەسێتیی یاسایی خۆیـان هەیـە و لێـی کەمناکرێتـەوە، هێنـدەی ئـەوە نـەبێت، کـە لـە رێککـەوتنی کۆنفیدراڵییەکەدا هاتووە. بەڵام لـە دەوڵـەتی فیدراڵیـدا لەبەرئـەوەی دەوڵـەتانی ئەنـدام کەسـێتیی یاسـاییان لەدەسـت دەدەن، تـەنها دەوڵـەتی فیـدراڵی هەڵدەسـتێت بـە دروسـتکردنی پەیوەنـدیی دبلۆماسـی لەگـەڵ دەوڵـەتانی تـردا، جگە لە (یەکێتیی سۆڤێتی)ی جاران و یـەکێتیی کۆمـاری رووسـیای ئێسـتا، کـە دەسـتووری فیـدراڵی رێگـەی بـە کۆمـارە ئەندامـەکان دابـوو، کـە پەیوەنـدیی دبلۆماسیی لەگەڵ دەوڵەتانی بیانی ببەستن(١).

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص٧٨-٧٩.

٢. **ڤاتیکان**: پێشتر پاپا دەسەڵاتی رۆحی و زەمەنی هەبوو، هەر ئەویش کەسێتیی یاسایی نێودەوڵەتی هەبوو، مافی دروستکرنی پەیوەندیی دبلۆماسییشی لەگەڵ هەردەوڵەتێکدا هەبوو. لەساڵی (١٨٧٠ز)دا سوپای ئیتاڵی رۆمای پایتەختی ڤاتیکانیان داگیرکرد و خستیانە پاڵ ئیتاڵیا و بوو بە پایتەختی ئیتاڵیا، ئیتر لێرەوە پاپا بە سیفەتی سەرۆکی کڵێسای کاسۆلیکی مایەوە. لەسەردەمی مۆسۆلینیشدا (ساڵی ١٩٢٩) رێککەوتننامەیەك لەنێوان پاپا و ئیتاڵیادا بەسترا و ناوی لێنرا (لاتران)، کە مافی دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسی لەگەڵ دەوڵەتانی بیانی بە پاپا بەخشی، ئەمە لەگەڵ ئەوەی، کە رووبەری ڤاتیکان بچووك بوو و گەلیشی تێدا نەبوو[١].

بەوپێیە مافی بەستنی پەیوەندیی دبلۆماسیی سەلبی و ئیجابیی لەگەڵ هەموو دەوڵەتاندا هەیە. هەروەها رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان سیفەتی دبلۆماسیی بەخشیوە بە نوێنەرانی پاپا و هەموو پارێزبەندی و مافێکیشیان هەیە.

٣. **رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان**: رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتییان هەیە لەسەر ئاستی کارو دادوەریی نێودەوڵەتی، و نوێنەرەکانیان لە دەوڵەتانی بیانی بەپێی رێککەوتننامەی دروستکردنی رێکخراوەکە جیاوك وپارێزبەندیی دبلۆماسییان هەیە. ئێستا رێکخراوە نێودەوڵەتییە حوکومییەکان نوێنەرایەتییان هەیە، کە لە دەرەوە

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهیل حسین الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٣٩-١٤٠. و: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص٩٠-٩٢.

نمایندەیی ڕێکخراوەکە دەکەن و کارەکانی جێبەجێ دەکەن و پارێزبەندی و مافی دبلۆماسییان هەیە، بەڵام ئەو سیفەتە دبلۆماسییەی کە ئەمان هەیانە ناگاتە ئەو سیفەتە دبلۆماسییەی، کە نێراوە دبلۆماسییە هەمیشەییەکان هەیانە.

### ٤. دووەم: دانپێدانانی دوو دەوڵەتەکە (کەسە یاساییە نێودەوڵەتییەکە) بەیەکتری

پرسی دانپێدانان، بە پلەی یەکەم، پرسێکی سیاسییە، کە لەڕێگەیەوە دەوڵەتان دان بە کیانی یەکتریدا دەنێن و یەکتری وەك ئەندامێکی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی قبووڵدەکەن. تەنانەت لەبەر گرنگیی دانپێدانان، هەندێك لە زانایانی وەك (فیتز مۆریس Fitz Maurice) و (سێل Scelle) بڕوایان وایە، کە هەردەوڵەتێك دانپێدانانی خۆی بە دەوڵەتێکی تر رابگەیەنێت، ئەوا پێویستە پابەندبێت بە دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی لەگەڵیدا، بەڵام ئەم رایە لەگەڵ واقیعی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتیدا نایەتەوەو پێچەوانەیرێبازە یاساییە نێودەوڵەتییەکانیشە کە مافی رەتکردنەوەی پەیوەندیی دبلۆماسییان بە دەوڵەت داوە و بەستوویانەتەوە بە رەزامەندی و ڕێککەوتنی دوولایەنەوە[1].

بۆیە ناکرێت پەیوەندیی دبلۆماسی لەنێوان دوو کەسی یاسایی نێودەوڵەتیدا دروستبکرێت، بەبێ ئەوەی دانیان بەکتریدا نابێت، بۆیە

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص٦٥-٦٧.

پێویسته دانپێدانانێکی یاسایی فەرمی، نەك تەنها دانپێدانانی ناراستەوخۆ، یان واقیعی، هەبێت بەو دەوڵەتەی کە پەیوەندییەکەی لەگەڵدا دەبەسترێت.

کەواتە ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان دوو دەوڵەتدا دەبەسترێت بەبێ دانپێدانانێکی دروست بە پەیوەندییەکی دبلۆماسیی نیزامی دانانرێت، ئەو کەسانەشی کە پێیهەڵدەستن لە چوارچێوەی نێراوە دبلۆماسییەکاندا هەژمارناکرێن، بەڵکو تەنیا حسابی ئەو دەوڵەتەیان بۆ دەکرێت بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی لە دەوڵەتانی تر. کەواتە پێویستە دانپێدانانێکی یاسایی و راشکاوانە هەبێت بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی هەمیشەیی[(١)].

بۆ بەردەوامبوون و مانەوەی پەیوەندیی دبلۆماسی پێویستە دانپێدانیش بەیەکتریی بەردەوام بێت، واتە ئەگەر لایەنێك دانپێدانانی خۆی کێشایەوە، ئەوا پەیوەندییەکە دبلۆماسییەکەش کۆتایی پێدێت.

**سێیەم: رێککەوتن لەسەر دروستکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسی**

بوونی کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتی و دانپێدانانی ئاڵوگۆڕکراو بەیەکتری بۆ دروستبوونی پەیوەندیی دبلۆماسی، بەس نییە، بەڵکو پێویستی بە رێککەوتنێکی راستەوخۆ لەنێوان لایەنەکانیدا لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی هەیە.

دروستکردنی نوێنەرایەتیی دبلۆماسیی مافی دەوڵەت نییە، بەسەر دەوڵەتانی ترەوە، هەروەك چۆن هیچ دەوڵەتیك بەزۆر پابەندناکرێت بە

---

(١) بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: د.علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٢٠٨-٢١٣.

قبوولکردن، یان ڕەتکردنەوەی، بەڵکو کارێکە دەوڵەت بە ڕەزامەندی و سەربەخۆیی و سەروەریی خۆی پێی هەڵدەستێت. بۆیە نوێنەرایەتیی دبلۆماسیی لەسەر بنچینەی ڕێککەوتنی ڕاستەوخۆی نێوان دەوڵەتەکان لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی ئاسایی و قەربارەکەی دروستدەبێت.

دەستپێکردنی کاری دبلۆماسییش دوو ڕووی هەیە: ڕوویەکی ئیجابی، کە بریتییە لە توانای ناردنی نوێنەری دبلۆماسیی بۆ نوێنەرایەتیی دەوڵەت لە دەرەوە، هەروەها ڕوویەکی سەلبی، کە بریتییە لە توانای دەوڵەتان بۆ قبوولکردنی نێراوی دەوڵەتانی تر لەلای خۆی و بەخشینی جیاوك و پارێزبەندیی دبلۆماسیی پێیان[١].

جگە لەمە ڕێککەوتن لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسییەکان پێویستە جۆری ئەو پەیوەندییانە دیاریبکات، ئایا پەیوەندییەکی تەواوە بە دروستکردنی باڵوێزخانە و ئاڵوگۆڕکردنی باڵوێزەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ؟ یاخود بە دروستکردنی نوێنەرایەتییەك دەبێت بۆ هەردوولا لە ئاستێکی دیاریکراودا؟ یان دروستکردنی بەشێك دەبێت بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی نێوانیان؟

لەڕووی کردارییەوە دەکرێت دروستکردنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەنێوان دەوڵەتاندا بە دوو شێواز بێت[٢]:

---

(١) د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص١٠٣.

(٢) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، م.س.ذ، ص٥٦.

أ. ئاڵوگۆڕکردنی یاداشتی دبلۆماسی لەنێوانیاندا بۆ گوزارشتکردن لە ویستی هەردوولایان بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی.

ب. دەرکردنی راگەیەنراوێکی سیاسیی هاوبەش، یان راگەیەنراوێکی رۆژنامەگەریی لەدوای سەردانێکی فەرمیی یەکێك لەو سێ دەسەڵاتە دەردەکرێت، کە پەیوەندیدارن بە کاروباری دەرەوەی دەوڵەت، کە بریتین لە: سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی حوکومەت و وەزیری دەرەوە، یان هەر کەسێکی تر کە ئەوان رایسپێرن، کە باس لە ویستی هەردوولا بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی لەنێوانیاندا دەکات.

## باسی دووەم: هەڵبژاردنی ئەندامانی نێراوی دبلۆماسی

دوای ڕێککەوتنی لایەنەکان لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی لەنێوانیاندا، هەریەکەیان بە پێکهێنانی نێراوێکی دبلۆماسیی لای لایەنی بەرانبەر هەڵدەستێت، بۆ ئەم کارەش بەم ڕیزبەندییە بۆ هەڵبژاردنی ئەندامەکانی بەکاردەهێنن(١):

**یەکەم: هەڵبژاردنی سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی**

هەڵبژاردنی سەرۆك بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت، لەوانە:

١. **هەڵبژاردنی کەسێکی گونجاو بۆ سەرۆکایەتیی نێراوە دبلۆماسییەکە:** ئەم هەڵبژاردنەش بەپێی یاسا ناوخۆییەکانی دەوڵەتەکە خۆی دەبێت، هەر دەوڵەتێکیش مافی هەڵبژاردنی سەرۆکی بۆ نێراوە دبلۆماسییەکانیدا هەیەو لەو هەڵبژاردنەشدا ئازادە، ئەویش بەپێی ئەوە دەبێت، کە لە ڕێککەوتنەکەدا لەسەری پێکهاتوون، ئایا باڵوێزخانە بێت، یان نوێنەرایەتییەك بێت بە سەرۆکایەتیی وەزیرێکی ڕاسپێراو، یان ڕاوێژکارێك، یاخود کونسوڵگەری، یان بەشێك بێت بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکان لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا لەژێر چاودێریی دەوڵەتی سێیەمدا.

پێویستە ئەوە بزانین کە دیاریکردنی سەرۆك بەپێی ڕێککەوتنەکە دەبێت، واتە جاری وا هەیە وەزیری دەرەوە فەرمانبەرێك بە پلەی باڵوێز بۆ سەرۆکایەتیی نێراوە دبلۆماسییەکە دیاریدەکات، بەڵام ڕێککەوتنەکەی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص ١٤٢-١٤٥.

نێوانیان دەڵێت پێویستە سەرۆکی نێراوەکە وەزیرێکی راسپێراو بێت، لەو کاتەدا پێویستە بەپێی رێککەوتنەکەی نێوانیان کاربکەن، بەمەش لەگەڵ ئەوەی کە سەرۆکەکە باڵوێزە بەڵام پێیدەوترێت وەزیری راسپێراو.

بەگشتی پێویستە ئەو کەسەی بۆ پۆستی سەرۆك هەڵدەبژێرێت شارەزایی سیستمی حوکمڕانی و یاسا و زمان و مێژوو و نەریتی ئەو دەوڵەتە بێت، کە بۆی دەنێرێت.

**٢. رەزامەندیی ئەو دەوڵەتەی کە بۆی دەنێرێت لەسەر سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە:** لەگەڵ ئەوەی هەڵبژاردنی سەرۆك مافی دەوڵەتی یەکەمە، بەڵام پێویستە رەزامەندیی ئەو دەوڵەتە وەربگیرێت کە بۆی دەنێرێت، واتە دوای ئەوەی سەرۆك هەڵبژێردرا، دەوڵەتی بەرانبەر لە ناو و پلە دبلۆماسیی یەکەی و کورتەیەك لە ژیاننامە و سی ڤی (Curriculum Vitae)یەکەی ئاگاداردەکرێت، پاش ئەوەی وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتی پێشوازیکەر سەیریان دەکات، بڕیاری خۆی بە قبووڵکردن، یان رەتکردنەوە دەدات، بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی روونبکاتەوە[١].

ئەگەر ئەو دوو دەوڵەتە پێشتر پەیوەندیی دبلۆماسییەمیشەییان هەبوو،حوکومەت بڕیاری گۆڕینی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەی دا، ئەوا سەرۆکی نێراوەکە بەپێی رێنمایی حوکومەتەکەی سی ڤیی ئەو کاندیدە نوێیە بۆ پۆستی سەرۆکی نێراوەکە بە هاوپێچ لەگەڵ "بیرخەرەوەیەکی

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤/ ١ ،٢)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

یاریدەدەر Aide Memore" پێشکەش بە دەوڵەتی پێشوازیکەر دەکات، کە پێیدەوترێت "داواکاریی رەزامەندی"، و تێیدا باسی نیازی حوکومەتی وڵاتەکەی دەکات بە دیاریکردنی باڵوێز (یان وەزیری راسپێراو)ی دیاریکراو بۆ پۆستی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەو سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە خودی خۆی ئەو یاداشتە پێشکەشی وەزیری دەرەوەی وڵاتی پێشوازیکەر دەکات. وەڵامدانەوەکەشی رەنگە نزیکەی مانگێکی پێبچێت، بەڵام ئەگەر لەوە زیاتری پێچوو ئەوا دواخستنی ئەو وەڵامە بە دوودڵیی ئەو وڵاتە لە قبوولکردنی ئەو کاندیدە هەژماردەکرێت، یان بەوەی کە بە کەسێکی قبوولنەکراوی داناوە، کەواتە بێدەنگی واتای رەزامەندی ناگەیەنێت، چونکە رەزامەندیی راشکاوانە مەرجی سەرەکیی دامەزراندنییەتی. ئەو دەوڵەتەش بۆئەوەی گوزارشت لە بێزاریی خۆی بکات لەو رەتکردنەوەیە، رەنگە پەنا بۆ دواخستنی دیاریکردنی کاندیدێکی نوێ ببات و یەکێك لە ئەندامانی نێراوە دبلۆماسییەکە وەك هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان بە لەبری دیاریبکات(١).

**٣. پێدانی بەڵگەنامەی دامەزراندن بە سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە (تزويد رئيس البعثة بوثيقة اعتماد):** دوای رەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر لەسەر سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە، دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات بەڵگەنامەیەکی دامەزراندن (خطاب اعتماد) دەدات بە سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەی، تەنها سەرۆك ئەو بەڵگەنامەیەی پێدەدرێت، ئەو بەڵگەنامەیە بۆ راگەیاندنی ئەوەیە کە کەسێك هەڵبژێراوە بۆ نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەت، لە لای دەوڵەتی پێشوازیکەر بەناوی سەرۆکی

---

(١) د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٧٧-٧٨.

دەوڵەتەوە، تێیدا تکادەکرێت، کە چاودێریی ئەو نوێنەرە بکرێت و هەلی پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی نێوانیانی پێببەخشرێت[١].

لە چەند بارێکدا پێویستە بەڵگەنامەی دامەزراندنەکە نوێ بکرێتەوە[٢]:

– لە حاڵەتی کۆچی دوایی یان سازشکردن یان دەستلەکارکێشانەوەی خۆویستانە، یان زۆرەملێی سەرۆکی وڵاتی نێرەر یان وەرگر. بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە ئەمرێسایە سەرۆککۆمارەکان ناگرێتەوە، چونکە ماوەی سەرۆکایەتییان خۆی کەمە (٤–٧ ساڵە). هەروەها لە حاڵەتی کۆچی دوایی پاپاشدا، پێویست ناکات بەڵگەنامەی دامەزراندنی سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی نوێ بکرێتەوە، چونکە لە نەریتی نێودەوڵەتیی باودا باڵوێزە نێراوەکان بۆ لای پاپا، وەك نوێنەر، لای پاپا دانەنراون، کە ئەویش وەك هەموو کەسێکی تر مرۆڤە و مردنی لەرێدایە، بەڵکو لای کورسیی پاپای پیرۆز دەکرێنە نوێنەر، کە هەمیشەییەو دەمێنێت.

– لە حاڵەتی بەرزکردنەوەی پلەی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە، لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەی.

– لە حاڵەتی ناردنی سەرۆکێکی کاتی بۆ دەستەی دبلۆماسیی بەهۆی ئامادەنەبوونی سەرۆکە بنەڕەتییەکە، یان نەخۆشکەوتنی یان چۆڵبوونی شوێنەکەی، پێویستە نووسراوێکی (دامەزراندنی کاتی) لەگەڵدا بنێرێت، خۆ

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص١٥١-١٥٥. و: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٠٣.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.ن، ص ص١٥٣-١٥٥. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٢٦٨-٢٧٠. د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٧٢.

ئەگەر یەكێك لە دبلۆماتەكانی دەستەكە بەو كارە هەستن، ئەوا پێویست بەو نووسراوە ناكات.

– نـــەمانی دەوڵـــەت، جـــا یـــان بـــە یـــەكگرتنی یـــان دابەشـــبوونی، سەردەكێشـــێت بـــۆ تـــەواوبوونی بەڵگەنامـــەی دامەزرانـــدن و پێویســـتیی نوێكردنەوەی.

ئەگەر سەرۆكی نێـراوە دبلۆماسـییەكە لـە پلـەی بـاڵوێز یـان وەزیـر یـان قاصیدی رەسولی و جێگرەكەی بـوو، ئـەوا نوێكردنـەوەی ئـەو بەڵگەنامـەی دامەزراندنە كاریگەریی لەسەر پلە و پێشبەندییەكەی ناكات(١).

***فرەنوێنەرایەتیكردن و نوێنەرایەتیكردنی هاوبەش (التمثيل المتعدد و التمثيل المشترك):***

بەپێی رێككەوتننامەی ڤیەنناى سالی (١٩٦١) دەوڵەتی نێرەر، دەتوانێت سەرۆكی نێراوە دبلۆماسییەكەی یان یەكێك لە ئەندامـە دبلۆماسـییەكانی بـۆ نوێنەرایەتیكردنی خۆی لە زیـاتر لـە وڵاتێـك راسـپێرێت، كـە لـە یەكێكیانـدا دەمێنێتەوەو لە وڵاتەكەی تـر بەهەمیشـەیی نامێنێتـەوە، بـەڵكو بەشـێوەی پچڕپچڕ تێیدا دەمێنێتەوە، بە مەرجێك ئەو وڵاتانە لەسـەری رەزامەنـد بـن و راستەخۆ نارەزایی خۆیان دەرنەبڕن لەسەر ئەم شێوەكارەی دبلۆمات و ئـەو جـۆرە راسـپاردنەی، كـە پێیـدەوترێت فرەنوێنەرایـەتیكردن و (التمثيـل المتعـدد). هـەروەها هـەروڵاتێك دەتوانێـت كەسـێك دیاریبكـات، بـۆ

(١) بڕوانە: ماددەی (٢/١٦)ی (رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكان)ی سالی (١٩٦١).

نوێنەرایەتیکردنی لە وڵاتێك و لەهەمان کاتدا نوێنەریشی بێت لە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیدا، یاخود نوێنەری بێت لە زیاتر لە ڕێکخراوێکی نێوەوڵەتی[(١)].

بەڵام نابێت هەمان کەس نوێنەری دوو دەوڵەت بێت لە یەك ڕێکخراودا، چونکە ئەم کارە گرفتی کردەیی لێدەکەوێتەوە، بۆ نموونە: کاتێکە کە ئەو نوێنەرە قسە دەکات، نازانرێت وەکو نوێنەری کام وڵاتەیان قسەدەکات، جگە لەمە دەقی پێڕەوی ناوخۆی هەندێك لە ڕێکخراوەکان وا دەخوازێت، کە هەروڵاتێك لە کاتی دەنگداندا دەنگێکی هەبێت[(٢)].

ئەم ماددەیە کاری لەسەر تێکەڵکردنی نوێنەرایەتیکردنی دووانەیی و فرەیی لەگەڵ شێوەی نێراوە هەمیشەییەکاندا کردووە، چونکە دانی بەوەدا ناوە کە دەوڵەتی نێرەر دەتوانێت نێراوێکی هەمیشەیی بە سەرۆکایەتیی "هەڵسووڕێنەرێکی کاروبارەکان بە لەبری" لە هەردەوڵەتێك دروستبکات، کە سەرۆکی نێراوەکە تێیدا بارەگای هەمیشەیی نەبێت. ئەمەش جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی، کە نێراوەکە وەکو دەستەیەك سەربەخۆ و

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٥)ی هەمان ڕێككەوتننامە.

(٢) بڕوانە: د. أحمد أبو الوفا، الوسیط في قانون المنظمات الدولية، دار النهضة العربية، القاهرة، ٢٠١١، ط٨، ص١٠٣. بەڵام هەندێك ریزپەڕ هەیە لە باری کردەییدا ڕوودەدەن، بۆ نموونە: لە هەندێك کۆنگرەدا، یان لە هەندێك دەزگای ڕێکخراوە نێودەڵەتییەکاندا ڕێگە دراوە بە هەمان وەفد, کە نوێنەرایەتیی دوو دەوڵەت، یان زیاتر بکات، بەتایبەت لە دەزگا هونەرییەکاندا، ئەمەش بۆ نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەتێك و ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەبێت, کە بە سیفەتی چاودێر ئامادەبن، یاخود دەوڵەتێکی ئەندام و دەوڵەتێکی چاودێر، یاخود دوو دەوڵەت, کە هەردووکیان بە سیفەتی چاودێر ئامادەبن.

جیایـه لـه ئەندامـەکانی و بـە سـەرۆك و بـەبێ سـەرۆکیش کاردەکـات و لـەو بارەشدا هەڵسووڕێنەرێکی کاروبارەکان بە لەبری سەرۆکایەتی دەکات[١].

بەپێی رێککەوتننامەی ڤیەنناى سـاڵی (١٩٦١): "دروسـتە دوو دەوڵـەت، یان زیـاتر یـەك کـەس وەك سـەرۆکی نێـراوی دبلۆماسـی لـە دەوڵـەتێکی تـر دیاریبکــەن، ئەگــەر ئــەو دەوڵەتــە نــاڕازی نــەبێت بــەو نوێنەرایەتییــە هاوبەشە"[٢]. ئەمەش بۆ کارئاسـانییە بـۆ وڵاتـانی تـازە سـەربەخۆ، یـاخود نزیــك لــە یەکترییــەوە، هــەروەها ئــەم جــۆرە حاڵەتــە لــەو کاتانەشــدا پیادەدەکرێت، کە پەیوەندیی نێوان دوو دەوڵەت دەپچڕێت و هەریـەکێکیان پەنا دەباتە بەر دەوڵەتی سییەم بۆ ئەوەی چاوێریی بەرژەوەندییـەکانی لای دەوڵەتی بەرانبەربکات[٣].

## ٤. پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی دامەزراندنی سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی (تقديم أوراق اعتماد رئيس البعثة) [٤]:

دوای رەزامەندیی ئەو دەوڵەتـەی، کـە سـەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکەی بـۆ دەنێرێت و دوای وەرگرتنی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی، دەوڵـەتی پێشـوازیکەر زانیـاری لەسـەر رێککـەوتی گەیشـتنەکەی دەبێـت و فەرمانبـەرێکی وەزارەتـی دەرەکیـی لـە فڕۆکەخانـە، یـان لەسـەر سـنوور پێشـوازیی لێـدەکات و دواتـر دەگوێزرێتـەوە بـۆ بارەگـای مانـەوەی. هـەر بەگەیشتنیشـی سـەرۆکی نێـراوە

---

(١) د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص٢٣٠.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٦)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص١١٠-١١١.

(٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص١٥٣-١٥٥. د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٣١٦-٣٢٠.

دبلۆماسییەکە وێنەیەکی کراوە لە بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی پێشکەش بە وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتی پێشوازیکەر دەکات، هەروەها هەندێکجار بەڵگەنامەیەکی ڕێگەپێدان (وثيقة تفويض)ی دانوستان لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت بۆ ئەو دەوڵەتە. پاشان وادەیەکی بۆ دیاریدەکرێت، بۆ چاوکەوتن بە سەرۆکی دەوڵەت، یان هەرکەسێکی تر، کە ئەو بۆ ئەو کارە رایسپێرێت. یەکێکیش لە فەرمانبەرانی تەشریفات سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە، لە مەراسیمی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەکانی بە سەرۆکی دەوڵەت ئاگاداردەکاتەوە، چونکە هەردەوڵەتێك شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەیە بۆ ئەو کارە.

ئینجا سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە بە ئۆتۆمبیلێکی فەرمی و بەرێزەوە لە شوێنی مانەوەیەوە دەگوێزرێتەوە بۆ بارەگای سەرۆکی دەوڵەت. لە کاتی گەیشتنی لە کاتی دیاریکراودا، راستەوخۆ بەڵگەنامەکانی پێشکەش بە سەرۆکی دەوڵەت دەکات، ئەمە هاوکات لەگەڵ دەربڕینی وشەگەلێکی دۆستایەتی و موجامەلە. پاشان سەرۆکی نێراوەکە چاوی دەکەوێت بە سەرۆکوەزیران و وەزیری دەرەکی و راگری سلکی دبلۆماسیي و سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکانی دەوڵەتانی تر لەو دەوڵەتەدا.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی ئەگەر باڵوێز، یان وەزیری راسپێراو بێت، نوێنەرایەتیی سەرۆکی وڵاتەکەی لای وڵاتی خانەخوێ دەکات[1].

---

(١) بڕوانە: ياسين ميسر عزيز العباسي، م.س.ذ، ص١٠٣.

## ٥. دەستبەکاربوونی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە:

دوای تەواوبوونی ئەو ڕێکارانەی کە باسکران، سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە لە بارەگای باڵوێزخانە دەست بە کارەکانی دەکات، هەر لە ڕێککەوتی رادەستکردنی بەڵگەنامەکانی دامەزراندنییەوە بۆ سەرۆکی دەوڵەتی پێشوازیکەر سیفەتی دبلۆماسیی هەیە. سەرۆك لە کارەکانی بەردەوام دەبێت تا کۆتاییهاتنی ماوەی کارەکەی، کە زۆرجار ئەو ماوەیە بە سێ ساڵ دیاریدەکرێت، پاشان دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی. هەر لەگەڵ دەستبەکاربوونیشیدا هەواڵی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی، بە نووسراوێکی کەسی، دەنێرێت بۆ باڵوێز و هەڵسووڕێنەری کاروباری وڵاتانی تر و هاوپیشەکانی لەو وڵاتەی کە کاری تێدادەکات، پاشان چەند سەردانێکی موجامەلە بۆ لای باڵوێزەکان دەکات و بە ڕاگری سلکی دبلۆماسیی دەستپێدەکات. سەبارەت بە هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان دەگونجێت تەنها کارتی کەسیی خۆناساندنیان بداتێ، کاتێك بۆ پیرۆزبایی سەردانی دەکەن، دەشگونجێت سەردانیان بکات، بەتایبەت لە پایتەختە بچووکەکان، بەتایبەتریش کاتێك کە پەیوەندیی وڵاتەکانیان بەهێزبێت، دواتر ئەوانیش لە نزیکترین دەرفەتدا سەردانی دەکەنەوە[١].

لێرەدا پێویستە جیاکارییەك بکەین لەنێوان ساتی بەخاوەنبوونی جیاوك و پارێزبەندییەکان بۆ سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی و ئەندامەکانی و ساتی دەستبەکاربوونیان بە کارە دبلۆماسییەکانیان، چونکە لەگەڵ ئەوەی مێژووی بەخاوەنبوونی جیاوك و پارێزبەندییەکان لە ساتی هاتنەناوەوەی

(١) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٧٣.

ســـەرۆکی نێـــراوە دبلۆماســـییەکەوە بـــۆ خـــاکی دەوڵـــەتی پێشـــوازیکەر دەستپێدەکات، بەڵام مێژووی دەستبەکاربوونی لە کارە دبلۆماسییەکەیدا لە ساتی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی، یان لە ساتی راگەیاندنی گەیشـــتنی و پێشکەشـــکردنی وێنەیـــەکی ئەصـــلی ئـــەو بەڵگەنامەیـــەوە دەستپێدەکات. واتە سەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکە هـەر بـە گەیشـتنی بـە خاکی ئەو دەوڵەتە –دوای رەزامەندیی وڵاتەکە– دەبێتـە خـاوەنی جیـاوك و پارێزبەندییـەکان، تەنانـەت ئەگـەر دەسـتبەکاریش نـەبووبێت، یـاخود لـە پێشکەشـکردنی بەڵگەنامـەی دامەزراندنەکـەی بـۆ سـەرۆکی ئـەو دەوڵەتـە دواکـەوتبێت، چـونکە دامەزرانـدنی لەلایـەن وڵاتـی نێـرەرەوە و رازیبـوونی دەوڵـەتی پێشـوازیکەر و چـوونەناوەوەی بـۆ خـاکی ئـەو وڵاتـە بەسـن، بـۆ وەرگرتنی جیاوك و پارێزبەندییەکان. بەڵام پاش پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکـەی رێگـەی پێـدەدرێت، کـە دەسـت بـەکارە دبلۆماسـییەکەی بکات،دەشکرێت بە پێوەر بۆ ریزبەندیی سـەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکە لـە پێشبەندیدا. خۆ ئەگەر مێژووی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکـەی وەکـو سـەرۆك کۆتایشیی هـات، ئـەوا جیـاوك و پارێزبەندییـەکانی هـەر بـەردەوام دەبـن تـا خاکی ئەو دەوڵەتە جێدەهێڵێت(١).

### دامەزراندنی وەزیری راسپێراو و هەڵسووڕێنەری کارەبارەکان:

ســەبارەت بــە دامەزرانــدنی وەزیــری راســپێراو، هــەمان ئــەو رێوشــوێنانە دەگیرێنەبـەر، کـە بـۆ بـاڵوێز بڕیاریـان لێـدراوە، تـەنها ئـەوە نـەبێت، کـە

(١) بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص٢٦٧.

کەمکرنەوەی ڕێژەی ئەو پاسەوانانەی، کە لە کاتی هاتنەژوورەوەی وەزیرە ڕاسپێراوەکە، بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی یان کۆشکی شا، ئەرکی سڵاوکردنیان لە ئەستۆیە، رەچاودەکرێت[١].

هەرچی سەبارەت بە دامەزراندنی ئەو کەسانەوە هەیە، کە سەرۆکی نێراوەکەن بەو سیفەتەی، کە لە بنەڕەتدا هەڵسووڕێنەری کاروبارەکانن (القائمون بالأعمال الأصليون)، ئەوا پێویستە لەلایەن وەزیری دەرەکیی وڵاتەکەیانەوە بنێرێن و وەزیری دەرەکیی دەوڵەتی خانەخوێ پێشوازییان لێدەکات، ئەمەش، یان بە نووسراوێکی فەرمی دەبێت، یان بە بروسکەیەك دەبێت، کە ناوی نێراوەکە و پلەکەی لە سلکی دبلۆماسیدا و داوای ئاسانکاریی بۆی، لەخۆدەگرێت. وەزیری دەرەوەی وڵاتی پێشوازیکەریش بە هاوشێوەی خۆی، نووسراو بە نووسراو و برووسکە بە برووسکە، وەڵامی دەداتەوە. دوای ئەوەی لە ڕێگەی بەڕێوەبەری مەراسیمەکانەوە وادەیەك بۆ چاوپێکەوتنی دادەنرێت، هەڵسووڕێنەری بنەڕەتیی کاروبارەکان نووسراوی دامەزراندنەکەی بەدەستی خۆی ڕادەستی وەزیری دەرەوە دەکات، پاشان هاوپیشەکانی لە باڵوێز و هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان لە دەستبەکاربوونی ئاگادارەکاتەوە، سەردانیان دەکات و سەردانەکانیشی بە ڕاگری سلکی دبلۆماسی دەستپێدەکات، دواتر هاوپلەکانی خۆی سەردانی دەکەنەوەو باڵوێزەکانیش، کە پلەیان لەو بەرزترە، کارتی ناساندنی خۆیانی بۆ

(١) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٧٣.

دەنێرنەوە، یاخود ئەگەر پەیوەندیی نێوان وڵاتەکانیان بەهێز بوو سەردانی دەکەنەوە[١].

بەڵام دامەزراندنی بریکاری هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان (القائمون بالأعمال الإنابة)، لە ڕێی یاداشتێکی زارەکییەوە دەبێت کە سەرۆکی بنەڕەتیی نێراوە دبلۆماسییەکە ئاراستەی وەزارەتی دەرەکییبەڕێوەبەرایەتیی مەراسیمی دەکات، ئەویش بە بۆنەی گەشتکردنی، یان ئامادەنەبوونی بۆ ماوەیەکی کورت، بۆ مەبەستی چارەسەر، یان کاری تر، یاخود بەهۆی تەواوبوونی ئەرکەکەی و گەڕانەوەی کۆتاییەتی بۆ وڵاتەکەی، وەزارەتی دەرەکیی ئەو وڵاتەش وەڵامی دەداتەوەو لە لیستی تۆماری سلکی دبلۆماسیدا تۆماری دەکات[٢].

لێرەدا نموونەیەکی نووسراوی دامەزراندنی باڵوێز (نموذج كتاب اعتماد سفير) دەخەینەڕوو:

---

(١) م.ن، ص٧٣.

(٢) م.ن، ص٧٤.

## نموونەی نووسراوی دامەزراندنی باڵوێزی (عێراقی) [(١)]

بسم الله الرحمن الرحيم

**سەرۆکایەتیی کۆمار**

**لە: سەرۆك کۆمار عێراقەوە ..................**

**بۆ: بەڕێز سەرۆك کۆمار (یان جەلالەتی پاشا).....................**

هاوڕێی خۆشەویستم

لەبەر زۆر پەرۆشیمان بۆ هێزکردنی رایەڵەکانی دۆستایەتیی نێوان هەردوو وڵاتمان، بڕیاری دامەزراندنی بەڕێز ........................... م دا بۆ ئەوەی لای بەڕێزتان باڵوێز (جا موقیم بێت یان نا) یان (باڵوێزێکی سەروو ئاسایی) یان (باڵوێزێکی دەسەڵات رەها) یان (وەزیرێکی راسپێراو یان جێگرێکی راسپێراو)ی کۆماریی ......................... بێت.

ئەو سیفەتە بەرزانەی کە بەڕێز ............................... هەڵی گرتوون، وایان لێکردم, کە دڵنیابم لەوەی کە هەموو هەوڵێکی دەخاتە گەڕ، بۆ بەجێهێنانی ئەرکە گرنگەکەی، بەو شێوەیەی کە ببێتە جێی رێز و رەزامەندیتان، بە جۆرێك کە ببێتە بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر متمانەی زۆری من بەو.

منیش داواتان لێ دەکەم نەرمونیانی و متمانەی تەواو و پشتبەستنی رەهای خۆتانی ,لە هەموو ئەو شتانەدا بدەنێ, کە بە ناوی منەوە ئەنجامیدەدات، بەتایبەت کاتێك کە رێزی من بۆ ئێوە و هیوای پێشکەوتن بۆ وڵاتەکەتان دەنوێنێت.

لە بەغداد لەڕۆژی ....... مانگی....... ساڵی ........کۆچی

بەرامبەر رۆژی ....... مانگی....... ساڵی ......... زایینینووسراوە

| | |
|---|---|
| **وەزیری دەرەوە** | **هاوڕێی بەئەمەکتان** |
| **واژۆ** | **واژۆ** |

---

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س. ذ، ص٤٤٥.

**دووەم: هەڵبژاردنی ئەندامانی نێراوە دبلۆماسییەکە**

زۆربەی کات ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوان دوو دەوڵەتدا دەبەسترێت، بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی، جۆری دبلۆماتکارەکان و ژمارەیان دیاریدەکات. ئەگەر لە ڕێککەوتنەکەدا ئەوە باس نەکرابوو ئەوا پێویستە ئەندامانی باڵوێزخانەکە لەگەڵ سروشتی کارەکەیان و نەریتی نێودەوڵەتیدا بگونجێت. لە هەموو بارەکانیشدا ژمارەی نێراوە دبلۆماسییەکان بەپێی بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە (مبدأ المعاملة بالمثل) دەبێت. هەرچی هەڵبژاردنی جۆری دبلۆماتکارەکانیشە، ئەوا بەپێی جۆری پەیوەندیی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دەبێت، ئەگەر سیفەتی سیاسی، یان سەربازی، یان بازرگانی بەسەر ئەو پەیوەندییەدا زاڵبوو، ئەوا دبلۆماتکارەکان لە کەسانی پسپۆڕی بواری سیاسی، یان سەربازی، یاخود بازرگانی هەڵدەبژێرێن، لەنێو ئەندامانی باڵوێزخانەکەشدا کەسانێکی ئیداری و هونەری لە پسپۆڕییە جۆربەجۆرەکاندا بوونیان دەبێت، بۆ یارمەتیدانی ڕاپەڕاندنی کارەکانی باڵوێزخانە[1].

بەڵام پێویست ناکات ئەندامانی تری نێراوە دبلۆماسییەکە بەڵگەنامەی دامەزراندنیان پێشکەشبکەن، تەنانەت ئەوانەشی کە سیفەتی دبلۆماسییان هەیە، بەڵکو تەنها ئەوەندە بەسە کە نێراوە دبلۆماسییەکە وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی پێشوازیکەر، لە گەیشتنی ئەو دبلۆماتانە و وەرگرتنی کارەکانیان ئاگاداربکاتەوە، ئەویش لە ڕێگەی یاداشتێکەوە کە ناو و کاری ئەو دبلۆماتانەی تێدا بێت، وەك ئەوەی کە لە پاسپۆرتە دبلۆماسییەکانیاندا

---

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٤٤.

هاتووه، هەروەها رێککەوتی گەیشتنی تێدا بێت جا بەتەنیا بوو بێت، یان بە هاورێیەتیی خێزان و منداڵەکانی و ناوونیشانی شوێنی نیشتەجێبوونی، هەروەها بەپێی ریزبەندیی پلەکەی لە لیستی ئەندامانی نێراوە دبلۆماسییەکەدا تۆماردەکرێت. هەروەها ئەندامی نوێی نێراوە دبلۆماسییەکە کارتێکی تایبەت بە خۆی دەنێرێت بۆ هاورێکانی لە باڵوێزخانەکانی تر بەمەستی یەکترناسین، ئەوانیش کارتی تایبەتی خۆیانی بە مەبەستی پیرۆزبایی بۆ دەنێرن(١).

لەکۆتایی ئەم باسەدا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە جۆر و ئاستی دبلۆماتکاران و جیاواز و هەمەچەشنن، هەندێکیان پلە باڵان و هەندێکی دی پلەیان نزمترە، هەندێکیان هەمیشەیین و هەندێکی تریان کاتین، هەندێکیان نوێنەری دەوڵەتانن لە رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و هەندێکی تریان نمایندە و فەرمانبەری رێکخراوەکانن، هەر ئەمەش وایکردووە، کە بەهانە و بنچینە و جۆر و ئاستی جیاوك و پارێزبەندییەکانیشیان جیاواز بێت.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٤٥. و: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٢٧٦-٢٨٤.

## باسی سێیەم: رۆڵی دبلۆماسی و كار و ئەركەكانی نوێنەری دبلۆماسی

دبلۆماسیی دیارترین ئامرازی سەرەكیی سیاسەتی دەرەكیی دەوڵەتانە، بۆیە هەم دبلۆماسیی رۆڵ و كاریگەریی بەهێزی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكاندا هەیە، هەم دبلۆماتكاریش، لە رێگەی ئەرك و كارەكانییەوە، شوێندەستی خۆی لەو پەیوەندییانەدا دیاریدەكات، بۆیە جێی خۆیەتی باس لە شێوازی بەكارهێنانی دبلۆماسی بكەین، كە دەوڵەتان لە هاریكاری و ململانێكانیشیاندا بەرانبەر یەكتری بەكاریدەهێنن، هەروەها پێویستە تیشك بخەینە سەر كار و ئەركەكانی ئەو نێراوە دبلۆماسییە هەمیشەییانەی، كە لە وڵاتی پێشوازیكەر دەمێننەو ئەركێكی گران لەسەر شانییان دەبێت، لە بەڕێوەبردن و پەرەپێدانی پەیوەندییەكانی وڵاتەكەیان لەگەڵ وڵاتی پێشوازیكەر.

### یەكەم: شێوازەكانی بەكارهێنانی دبلۆماسی:

مامەڵەی دبلۆماسیی بە درێژایی مێژوو ئەوەمان پێدەڵێت كە دبلۆماسیی، وەك ئامرازێكی سیاسەتی دەرەكیی دەوڵەتان، بەچەندین شێواز بەكارهاتووە، دیارترینیان بریتین لەمانەی خوارەوە[١]:

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٥٢-٥٤.

١. زۆرلێکـردن و سـەپاندن (الإکـراه Coercion): واتـە بـەکارهێنانی دبلۆماسـی بـۆ دروسـتکردنی فشـار لەسـەر لایـەنێك، بـە بـەکارهێنانی دبلۆماسییانەی ئەو ئامرازانەی زۆرلێکردن کە لەبەردەستدان، وەك:

– پچڕاندنی پەیوەندیی دبلۆماسی، یان هەڕەشەی پچڕاندنی.

– هەوڵـدان بـۆ دەرکـردن، یـان دەرکردنـی کرداریـی دەوڵـەتێك لـە ڕێکخراوێکی نێودەوڵـەتی، یـان بێبەشـکردنی لـە بەشـداریکردن لـە کۆنگرە نێودەوڵەتییـەکان، وەك ئـەوەی وڵاتـانی عـەرەبی لـە دوای ئیمزاکردنـی (ڕێککەوتننامەی کامپ دیڤد) بەرانبەر (میسر) ئەنجامیان دا.

– پچـڕاندنی، یـان هەڕەشـەی پچـڕاندنی کۆمـەکی ئـابووری، یـان سەربازی.

– پەنابردن بۆ ئاگادارکردنەوەی دواوادە بـۆ دانوسـتان و گەیشـتن بـە ڕێککەوتن، واتە وادەیەك بـۆ گەیشـتن بـە ڕێککـەوتن دادەنرێـت، ئەگـەر لـەو وادەیەدا نەگەیشتنە ڕێککەوتن ئەوا دانوستانەکان کۆتاییان دێت.

– تۆمـارکردنی نـاڕەزایی فـەرمی، یـان نافـەرمی، یـان پێشکەشـکردنی شکاتنامە.

– زۆرلێکردنـی سـایکۆلۆجی، یـان تێکـدان وەك بەشـێك لـە جـەنگی دەروونی، یان جەنگی سارد، کـە شـێوازێکی دوورە لەرێسـاکانی موجامەلـەو ئاکاری دبلۆماسیی کلاسیکی، کە بریتییە لە بـەکارهێنانی وشـەی ناشـرین و جنێو و تۆمەت و وەسفی شەرمهێن.

- تێکـدان[١]: کـە لــەرووی بەکارهێنانــەوە نوێترینیانــە. لەکاتێکـدا ئامرازەکانی تر ئامـانج لێیـان دروسـتکردنی کاریگەرییـە لەسـەر حوکومـەتی مەبەست، ئامانجی تێکدان لـەو رووەوە جیـاوازە، کـە کۆمـەڵێکی دیـاریکراو لـەناو دەوڵـەتی بەرانبـەردا دەکاتـە ئامـانج، بـە مەبەسـتی لـەناوبردن، یـان خستنی ئەو حوکومەتە، ئـەویش بـە شـێوازی جیـاوازی وەك: پڕوپاگەنـدە و چـالاکیی سـیخوڕیی و یارمەتیـدانی کۆمەڵـە یـاخی، یـان ئۆپۆزسـیۆنەکان. لەبەرئـەوەی بەگشـتی ئـەو جـۆرە چـالاکییانە –ئەگـەر بویسـترێت کاریگـەر بێـت– بـەنهێنی ئەنجامدەدرێنئـەم ئـامرازە بـە دیـاریکراوی بـە پڕۆسـەی دبلۆماسییەوە پەیوەست نییە.

٢. قەناعەتپێکردن (الإقناع Persuasion): یەکێکـە لـە ئـامرازە زۆر باوەکان لە دبلۆماسیدا، کە زۆرجار دەرەنجامـەکانی لـە زۆرلێکـردن باشـتر و

---

(١) سەبارەت بەم ئامرازە بڕوانە: برایان وایت، م.س. ذ، ص٥٤٦. نموونەی دبلۆماسییەتی تێکدان: لە سێپتەمبەری ساڵی (١٩٧٠)، (سلڤادۆر ئەلیندی)، وەك یەکەم سەرکردەی مارکسی, کە بە شێوازی دیموکراسی هەڵبژێرێت، بە سەرۆکی (چیلی) هەڵبژێرا، دواتر (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا)، بە پاڵنەری ئایدۆلۆجی، بڕیاریدا بۆ خستنی حوکومەتەکەی هەموو ئامرازێك –جگە لە ئامرازی داگیرکردنی سەربازی- بەکاربهێنێت. بۆیە زۆر ئامرازی دبلۆماسی و ئابووری و تێکدانی بەکارهێنا بۆ پشتیوانیکردنی سیاسەتێك, کە ئامانجی نانەوەی پشێوی و ناجێگیری بوو، بەمەش (چیلی)ی بە شێوازێکی کاریگەر لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دابڕی. پێگەی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) لە بانکە نێودەوڵەتییەکان بەکارهێنرا بۆ گرتنەوەی قەرزی ئابووری بە (چیلی)، ئەمەش جۆرێك لە ناجێگیری و پاشاگەردانی لە ئابووری (چیلی)دا دروستکرد. هەروەها (مس)، کە بابەتی هەناردەی سەرەکیی وڵاتەکە بوو، ئیفلیج بوو. لە هەمان کاتدا بڕی نزیکەی (هەشت ملیۆن دۆلار) بۆ (ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندیی ئەمەریکی) تەرخانکرا, بۆ دەستوەردانی نهێنی لە ناوخۆی چیلیدا، و پشتیوانیی دارایی پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان و گرووپە نیمچە سەربازییە دژەکانی حوکومەت کرا، لە ئەنجامدا زنجیرە مانگرتنێك روویاندا, کە سەریان کێشا بۆ پەکخستن، لەنێویاندا ئەو مانگرتنە بەناوبانگەی کە خاوەن بارهەڵگرەکان لە ساڵی (١٩٧٢) ئەنجامیان دا. دواجار حوکومەتە شیوعییەکەی (چیلی) بە کودەتایەك لە سێپتەمبەری (١٩٧٣) خرا و (ئەلیندی) کوژرا. بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٥٤٦-٤٣٧.

بــەردەوامتر دەبــن، هــەروەها پایەیــەكی بــەهێزتری ئاشــتی و ئــارامیی نێودەوڵەتییە، بـەڵام تێبینیـی ئـەوە دەكرێـت، كـە سـنووری جیاكـەرەوەی نێــوان قەناعــەتپێكردن و زۆرلێكــردن، زۆر جــار، بەتــەواوی روون نییــە، هەندێكجار قەناعەتپێكردن جۆرێك لـە ئامـاژەی زۆرلێكردنـی تێدایـە، جـاری واش هەیە قەناعەتكردنەكە دەرەنجـامی زۆرلێكردنـە، وەك: ئامـاژەكردن بـە شێوەی ناڕاستەوخۆ و لە دەرەوەی چوارچێوەی دانوستانە كردەییـەكان بـە بــڕینی كۆمــەكی ئــابووری، یــان لایــەنگریركردنی نــەیار و دروســتكردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵیدا. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەكی گەوهەری لەنێوان ئـەو دوو شـێوازەدا هەیـە، ئـەویش خـۆی لـە نیـازی لایەنـەكان و كەشـوهەوای دانوســـتانەكاندا دەبینێتـــەوە، چـــونكە زۆربـــەی دەستپێشـــخەرییە دبلۆماسییەكان لانیكـەم لـە سـەرەتادا لـە چوارچـێوەی قەناعەتپێكردنـدان، بــەڵام پاشــان لــە قۆناغــەكانی دواتــری دانوســتانەكاندا پەرەدەســێنن بــۆ زۆرلێكردن، بەتایبەت كاتێك كە لایـەنێك نكـوڵی دەكـات و لەسـەر بۆچـوونی خۆی سووردەبێت، هەموو جۆرە چارەسەرێكی ناوەند رەتدەكاتەوە.

هەنــدێكجار دبلۆماســی پەیوەســت بــە ئامرازگــەلێكی سیاســیی تــرەوە دەبێت، بۆ بەرهەمهێنانی ئەوەی پێیدەوترێت " دبلۆماسیی تێكەڵ". لێرەدا دبلۆماسـیی دەبێتـە كـەناڵێكی پەیوەنـدیی كـە لـە رێگەیـەوە بـەكارهێنانی ئـامرازی تـر، یـان هەڕەشـەپێكردنی لەلایەنـەكانی تـر، دەخرێتـەڕوو. هـەر لەمێژیشە دەوڵەتان ئەوە فێربوون،كـە زۆربـەی جـار قەناعـەتپێكردن كاتێـك ئامانجی خۆی دەپێكێت، كە ببەسترێتەوە بە سیاسەتی "گێـزەر و گۆچـان/ العصا والجزرة"ەوە. لێرەدا سێ جۆر ئامرازی سیاسی هەن، كە بـە شـێوازی

جۆراوجۆر بەكاردەهێنرێن، جا وەك پاداشت بن، یان وەك سزا، لەپێناو زامنكردنی ئەو رەفتارە كە دەویسترێت لایەنی بەرانبەر هەیبێت[1].

٣. تەسویە (التسويةAdjustment): تەسویە یارمەتیی دوو لایەن، یان دوو دەوڵەت، یان زیاتر دەدات بۆ كەمكردنەوەی توندیی هەڵوێستیان سەبارەت بە پرسێكی هەڵواسراو لەنێوانیاندا و گەیشتن بە رێگەچارەیەك، كە هەموو لایەنەكان پێی قاییل بن و سەربكێشێت بۆ بەرپاكردنی پەیوەندییەكی جێگیر لەنێوانیاندا. بنچینەی تەسویە بریتییە لە نەرمونیانی و دووركەوتنەوە لە هەڵوێستی توند.

٤. رێككەوتن (الاتفاقAgreement): دبلۆماسی ئامرازێكە بۆ گەیشتن بە رێككەوتن لەنێوان دەوڵەتاندا. لەمێژە وتراوە دبلۆماسیی بریتییە لە هونەری دانوستانی رێككەوتنی نووسراو، بەڵام تێبینیی ئەوە دەكرێت، كە زۆرجار رێككەوتنەكانیش رەنگە رەگەزی زۆرلێكردن، یان قەناعەتپێكردن، یان تەسویە لەخۆبگرن بەپێی بارودۆخی لایەنەكان و پێگەی هێزیان. لە هەموو ئەم بارانەی كە باسكران رێككەوتن هەرچۆنێك بنووسرێتەوە، ئەگەر میكانیزم و رێوشوێنی جێبەجێكردنی دیاری نەكرێت، ئەوا هیچ بایەخێكی كردەیی نابێت.

كەواتە دبلۆماسیی بریتییە لە شێواز و تەكنیكی بەكارهێنانی ڕەگەزە جۆراوجۆرەكانی هێزی دەوڵەت، بە شێوازی ئاشتییانە و بەكارهێنانی تا دواسنووری گونجاو لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەكان.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن ، ص٥٤٥.

**دووەم: ئەرك و كاری نێراوە دبلۆماسییە هەمیشەییەكان:**

نێراوە هەمیشەییەكان رۆڵی سەرەكی دەبینن لە جیهانی دبلۆماسیدا، بۆئەوەی بتوانن بە شێوازێكی دروست و یاسایی مامەڵەبكەن، كاریگەریی خۆیان هەبێت، چەندین ئەرك و كاریان پێدەسپێرێت.

رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكان، كارەكانی (مهام) نێراوە دبلۆماسییەكانی دیاریكردووە[(١)]، لە هەمان كاتدا، چەند ئەركێكشی (واجبات) دیاریكردووە، دیارترینیان بریتین لە[(٢)]:

**١. نوێنەرایەتیی وڵاتەكەی:**

هەموو نێراوێكی دبلۆماسی نوێنەرایەتیی دەوڵەتەكەی لای ئەو دەوڵەتە دەگرێتەئەستۆ، كە بۆی نێراوە. بەگشتی سەرۆكی نێراوە دبلۆماسییەكە، یان ئەو كەسەی لە كاتی چۆڵبوونی پۆستەكەی جێگەی دەگرێتەوە، ئەو ئەركە دەگرێتەئەستۆ، لە دیارترین ئەو ئەركانەی كە نێراوە دبلۆماسییەكە پێی هەڵدەستێت، بریتییە لە ئامادەبوونی هەموو بانگێشتە فەرمییەكان و ئەو ئاهەنگ و كۆنفرانس و كۆنگرانەی، كە لە دەوڵەتی پێشوازیكەر سازدەكرێن[(٣)].

دەكرێت شێوازەكانی نوێنەرایەتیكردنی دبلۆمات بۆ وڵاتەكەی، لەم چەند جۆرەدا كۆبكەینەوە[(٤)]:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٣) (رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: ماددەی(٤١)ی هەمان رێككەوتننامە.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. إسماعيل صبري مقلد، العلاقات السياسية الدولية: دراسة في الأصول والنظريات، ذات السلاسل للطباعة والنشر والتوزيع، الكويت، ط٥، ١٩٨٧، ص ص٤٢٩-٤٣٠.

(٤) بەراورد بكە لەگەڵ: ياسين ميسر عزيز العباسي، م.س.ذ، ص ص١٦٦-١٦٧.

- نوێنەرایــەتیکردنی ڕرەمزیـــی: وەك ئامـــادەبوون لـــەو نمایيشـــە ســـەربازییانەی بـــۆی بانگهێشـــت دەکرێـــت، یـــاخود ئـــەو بۆنـــە و مەراسیمانەی تر، کە دبلۆمـات لەلایـەن دەوڵـەتی میوانـدارەوە بۆیـان بانگهێشت دەکرێت.
- نوێنەرایــەتیکردنی یاســایی: واتــە نوێنەرایــەتیکردنی وڵاتەکــەی لــە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان و دەنگدان تێییاندا و نوێنەرایـەتیکردنی لـە پرسە یاساییەکاندا.
- نوێنەرایەتیکردنی سیاسی: دبلۆمات بەم نوێنەرایەتیکردنە بەشداری لە گەڵاڵەکردنی سیاسەتی دەرەکیـی وڵاتەکەیـدا دەکـات، لـەم حاڵەتـەدا دەبێتــە ئەڵقــەی گەیانــدنی ناوەنــدی بڕیــاری وڵاتەکــەی و جیهــانی دەرەوە، بەتایبەت ئەو وڵاتەی، کە کاری تێدا دەکات.

هەندێکجار، زیاتر لە یەکێك لـەم جـۆرە نوێنەرایەتیکردنانـە لـە کۆنگرەیـەك، یان مەراسـیمێکدا کۆدەبێتـەوە، واتـە دبلۆمـات لـە یـەك کاتـدا دەتوانێـت چـەند جۆرێــك لــە نوێنەرایــەتیکردن مومارەســەبکات، بــەم کارەشــی هەوڵــدەدات بەباشترین شێوە ئەرکە دبلۆماسییەکەی جێبەجێ بکات.

### ٢. دانوستان:

نێراوی دبلۆماسیی لەبری دەوڵەتەکەی سەبارەت بە هەموو بابەتە سیاسـی و ئــابووری و ئیدارییــەکان ئــەرکی دانوســتان لەئەســتۆ دەگرێــت، ئەمــە وێــڕای نزیککردنەوەی دید و بۆچوونەکان لـە مەسـەلە هاوبەشـەکاندا، بـۆ ئـەم کـارەش سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە -یان هەرکەسێك کـە خـۆی رایسـپێرێت- لەگـەڵ لایەنـە فەرمییـەکانی دەوڵـەتی پێشـوازیکەر دانوسـتان دەکـات، هـەرکاتێك کـە دەوڵەتی پێشوازیکەر داوای بکات.

### ٣. پاراستنی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی:

نوێنەری دبلۆماسیی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی و بەرژەوەندیی ئەو کەسانەی کە رەگەزنامەی وڵاتەکەیان هەیە، لەو دەوڵەتەدان کە ئەو کاری تێدادەکات، دەپارێزێت، ئەویش لەو چوارچێوەیەدا کە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دانی پێداناوە. هەرکاتێك سامانی وڵاتەکەی، یان بەرژەوەندییە ئابووری، یان سیاسییەکانی وڵاتەکەی لە رێگەی رۆژنامەکانەوە، یان لە رێگەی وتە و ڕاگەیاندنە فەرمییەکان و غەیری ئەوانەشەوە تووشی هەڕەشەو مەترسی، یان زیان بوون، ئەوا نێراوە دبلۆماسییەکە بەپەلە هەمووڕێوشوێنێکیرێپێدراو بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی وڵاتەکەی دەگرێتەبەر، بەڵام نابێت بگاتە ئاستێك، کە دەستێوەردان بێت بۆ کاروباری ناوخۆیی ئەو دەوڵەتەی، کە کاری تێدادەکات.

هەروەها کار بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی هاووڵاتییەکانی و ماڵ و سامانیان لەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراون دەکات. مافی ناردنی نوێنەریشی بۆ فەرمانگە فەرمی و دادوەرییەکان هەیە، بە مەبەستی بەدواداچوونی کاروباری هاووڵاتیانی، دوای رەزامەندیی وەزارەتی دەرەکی، بەڵام دروست نییە نێراوە دبلۆماسییەکە بەو کارە هەستێت تەنها دوای ئەوە نەبێت کە هاووڵاتییەکەی هەموو رێگە ئاساییەکانی، بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆی بەپێی یاساکانی ئەو دەوڵەتە، گرتووەتەبەر. واتە کاری ئەو لەو کاتەدا دەستپێدەکات، کە هاووڵاتییەکە بەرێگەی ئاسایی نەیتوانی مافی خۆی بەدەست بهێنێت.

**٤. بەدەستهێنانی زانیاری و بەدواداچوون بۆ پێشهاتەکان:**

نوێنـەری دبلۆماسـیی بـۆی هەیـە بەدواداچـوون بـۆ بارودۆخـە سیاسـی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستییەکانی ئەو دەوڵەتـە بکـات، کـە کـاری تێـدا دەکات، زانیارییان لەسەر کۆبکاتەوە و لە رێگەی راپۆرتەوە بیگوێزێتەوە بۆ وڵاتەکـەی، بۆیـە بـۆی هەیـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە، لـە رێگـەی ئـەو ئامێرانـەی گەیاندنەوە کەرێگە بە هەموو نێراوێکی دبلۆماسیی دەدرێـت لـە بارەگاکەیـدا دایان بنێت، پەیوەندیی بە وڵاتەکەیەوە بکات، هـەروەك چـۆن دەتونێـت لـە رێگـەی پۆسـتەی دبلۆماسـییەوە بیانگوازێتـەوە کـە پارێزبەنـدیی خۆیـان هەیە[1].

رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانیارییانە مەرجی ئەوەی داناوە کە بە رێگەی رێگەپێدراو بێت، نەك لـە رێگەی سیخوڕییەوە.

نێـراوی دبلۆماسـیی کاتێـك سـەرکەوتوودەبێت، کـە ئاگـای لـە هـەموو بارودۆخێکی دەوڵەتی پێشوازیکەر بێت، مێژووەکەی و پێگەو سـامانەکەی و بـاری دارایـی و ئیـداری و کولتـووری و زانسـتی و سـەربازی و پیشەسـازی و کشتوکاڵی، ئاستی کاریگـەریی گـۆڕاوە سیاسـییەکان و هێـزە سیاسـییەکان لەسەر بڕیاری سیاسـی، هـەروەها پێگـەی بڕیاربەدەسـتان و کاریگـەرییان و کەسە هەڵسووڕێنەرەکانی داینەمۆی سیاسەتی دەوڵەتەکە، ئەو لایەنانەی کە شیاو و ئامـادەی وەرگـرتنی دەسـەڵاتن لـە داهـاتوودا، ئەمـە وێـڕای ئاسـتی جـەماوەریی دەسـەڵات و لایەنـەکان، بەشـێوەیەك وێنەیـەکی دروسـتی

---

(١) بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٩٨.

بارودۆخی ئەو دەوڵەتە و گۆڕانکاری و ڕووداوەکانی بەتەواویی بۆ وڵاتەکەی بگوازێتەوە و پێشبینیی داهاتووش بخاتە بەردەست.

تەنانەت پێویستە دبلۆمات وڵاتەکەی لە ئاستی شکست، یان سەرکەوتنی سیاسەتی دەرەوەی بەرانبەر وڵاتی پێشوازیکەر و لێکەوتەو کاردانەوەکانیشی ئاگاداربکاتەوە، لە هەمان کاتدا پێشنیاری پێویست پێشکەش بە وڵاتەکەی بکات، لە بەرانبەردا پێویستە چاودێریی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتی پێشوزایکەر و هەڵوێستی بەرانبەر وڵاتەکەی بکات،لێڵی و تەمومژ لەبەردەم بەرپرسانی وڵاتەکەی نەهێڵێت و گۆڕانکارییە کوتوپڕەکانی هەڵوێستی ئەو وڵاتەش ڕوونبکاتەوە، هەموو ئەمانەش لە ڕێگەی ڕاپۆرتەوە ئەنجامدەدرێن(١).

جۆری ڕاپۆرتەکان لەرووی کات و بابەتەوە جیاوازن: ڕاپۆرتی خولی (بۆ نموونە: هەفتانە)، ڕاپۆرتی تایبەت بە بابەتێکی دیاریکراو، ڕاپۆرتی بەپەلە، و ڕاپۆرتی پەیوەست بە دانوستانێك لەمەڕ ڕێککەوتن، یان پرۆتۆکۆلێکی بازرگانی، یان کولتووری.. بۆ پێدانی زانیاری و پێشنیازی نوێ دەبێت. ڕاپۆرتەکانیش بە چەند شێوازێك دەنێرێن(٢):

- بە نووسراو (کە ئەمە ڕێسای گشتییە و لە ڕێگەی جانتای دبلۆماسییەوە هەفتانە دەنێرێت).
- برووسکەی ڕەمزی و کورت.

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٦١-٦٢.

(٢) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٩٦.

– به شێوەی زارەکی بۆ سەرۆکی وڵاتەکەی، یان وەزیری دەرەکی کاتێك باڵوێز بۆ راوێژکردن بانگهێشتی پایتەختی وڵاتەکەی دەکرێتەوە، یان لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانی نوێنەرە دبلۆماسییەکاندا، کە وەزیری دەرەوە تێیدا بەشداردەبێت.

کەواتە نوێنەری دبلۆماسیی لە رێگەی راپۆرتی سیاسی و ئابووری و رۆژنامەوانی یان تایبەتەوە، یان لە رێگەی چاوپێکەوتنی راستەوخۆوە زانیارییەکان دەگەیەنێتە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی، بەڵام پێویستە زانیارییەکان و شێوازی دارشتنیان ورد و دروست و روون بێت و لە راستیی ناوەرۆك و سەرچاوەکانی دڵنیا بێت. گرنگترین سەرچاوەکانی زانیاریی دبلۆماتییش ئەمانەن(١):

– سەرچاوە فەرمییەکان: کە بریتین لەو سەرچاوە حوکومییانەی، کە دبلۆمات پەیوەندییان پێوە دەکات، ئەویش لە رێگەی چاوپێکەوتنی راستەوخۆ و کەسیی، یان لە رێگەی ئەو ئاهەنگانەوە دەبێت کە بۆی بانگهێشت دەکرێت.

– سەرچاوەکانی راگەیاندن: کە بریتین لە رۆژنامەو پەخشی رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئاژانسەکانی هەواڵ و ئینتەرنێت و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان و...هتد، دبلۆماتی خاوەن ئەزموون، دەتوانێت زۆرینەی هەواڵە راستەکان لە میدیاوە دەستبخات و شیکردنەوەیان بۆ بکات و لێیان تێبگات.

– سەرچاوە نهێنییەکان: زۆر کات دبلۆمات بۆ دەستخستنی ئەو زانیارییانەی، کە بە شێوازی ئاسایی دەستی ناکەوێت، پەنا بۆ سەرچاوە

---

(١) بڕوانە: یاسین میسر عزیز العباسي، م.س.ذ، ص ص١٨٩-١٩٠.

نهێنییەکانی دەبات، ئەو سەرچاوانەش زۆرن، گرنگترینیان: ئەو کەسایەتی و دەستە و پارت و رێکخراو و لایەنانەن، کە بە جۆرێك لە جۆرەکان (بۆ نموونە: لەرووی بیروباوەڕەوە) نزیکن، یان پەیوەستییەکیان بە وڵاتی نێراوە دبلۆماسییەکەوە هەیە، بەڵام پەیوەندیکردن بەم کەسایەتی و لایەنانەوە پێویستی بە وریایییەکی زۆر و ئاگاداربوون هەیە، بۆ ئەوەی دبلۆمات دووچاری لێپێچینەوە نەبێت و بە کەسێکی نەخوازراو لەقەڵەم نەدرێت، بۆیە پێویستە پەیوەندیی بەو کەس و لایەنانەوە نەکات، کە جێی گومانن.

- پەیوەندیی کەسی: پەیوەندیی کەسی و پەیوەندییە گشتییەکانی دبلۆمات، یارمەتیدەدەن بۆ دەستخستنی زۆر زانیاریی گرنگ و تەنانەت چارەسەرکردنی زۆر گرفتیش، کە رەنگە چارەسەرکردنیان بە شێوەی فەرمی ئاسان نەبێت.

پێویستە ناوەڕۆکی راپۆرتەکان ئەم چەند خاڵە لەخۆ بگرێت[1]:

- بە دواداچوون و تۆمارکردن، واتە پێویستە وەك ئامێرێکی وێنەگرتن وێنەی دیاردەو رووداوەکان بگوێزێتەوە.
- شیکردنەوە، کە بریتییە لە پرۆسەی کردنەوە و لێککردنەوەی رووداوەکان، پاشان دووبارە لێکدانەوەیان بەپێی دیدێکی بابەتییانە و دواتر هەڵهێنجانی واتا و رەهەندەکانی.
- خوێندنەوەدۆزی و پێشبینی (الاستقراء والتنبؤ)، واتە خوێندنەوەی رەهەندە ئاییندەییەکان و کاردانەوە پێشبینیکراو و چاوەڕوانکراوەکان لە بەرانبەریاندا.

---

(١) بڕوانە: جمال بركات، الدبلوماسية (ماضيها وحاضرها، مستقبلها)، مطابع الفرزدق، الرياض، ١٩٨٥، ص١٥١.

- پێشـــنیاز، واتـــە پێشکەشـــکردنی پێشـــنیازگەلێك، کـــە هـــەڵگرتنی هەنگاوێکی تایبـەت، یـان وەرگـرتنی هەڵوێسـتێکی ئـەوتۆ دەخوازێـت سەربارەت بەو بابەتەی کە راپۆرتەکە شیکردنەوەی بۆ کردووە.

ئەم سێ خاڵەی کۆتـایی کـاری دبلۆمـات لـە سـیخوڕ جیادەکەنـەوە، چـونکە سـیخوڕ، بـەبێ شـیکردنەوەو پێشکەشـکردنی پێشـنیاز بـۆ بڕیاربەدەسـتانی وڵاتەکەی، تەنها رووداو و زانیارییەکان دەگوێزێتـەوە، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی، کـە گوێ بە رێسا یاساییەکانی کۆکردنەوەی زانیـاری نـادات و بـە هـەر جۆرێـك بێـت هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری دەدات.

لـە هـەمان کاتـدا چـەند مـەرجێکی تـر هـەن، کـە پێویسـتە دبلۆمـات لـە نووسین و ناردنی راپۆرتەکاندا پێڕەوییان بکات، دیارترینیان[١]:

- پێویستە راپۆرتەکان لە کاتی پێویستدا و بەپەلـە و پـێش لەدەسـتدانی بەها و گرنگییەکەیان بگەیەنرێنە شوێنی پێویست، بەتایبەت لە رووداو و پێشهاتە کوتوپڕ و بەپەلەکاندا.
- پێویستە ڕاپۆرتەکان تەواوکار و گشتگیر بن، واتە وردەکاری و رەهەندە جیاوازەکـانی بابەتەکـە بخەنـەروو، لـە هـەمان کاتـدا زیـادەی بێسـوود لەخۆنەگرن و بابەتە گرنگەکان لە بابەتە لاوەکییەکان جیابکەنەوە.
- پێویسـتە راپۆرتـەکان، تـا ئەوەنـدەی بتوانرێـت، روون و کـورت بـن، هەریـەکێکیان تـەنیا مەسـەلەیەك باسـبکات، بـۆ ئـەوەی کاریگـەری و بەرەنجامی خێرای هەبێت.

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص٩٦-٩٨.

- پێویستە لە ڕاپۆرتەکاندا ڕووداوەکان بەشێوازی بابەتییانە، بەبێ زیاد و کەم، تۆماربکرێن، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ پێشبینییەکانی دبلۆمات، یان لەگەڵ خواستی حوکومەتەکەیشیدا نەگونجێن، بە پێچەوانەوە حوکومەتی وڵاتەکەی بەهەڵەدا دەبات.
- پێویستە لە پێشەکییەکەیدا پوختەیەك بۆ پێدانی بیرۆکەیەکی سەرەتایی و خێرا بە سەرۆك، یان وەزیری دەرەکیی وڵاتەکەی هەبێت.

بەراستی راپۆرتەکان کەسێتیی دبلۆمات و توانای وێژەیی و ئاستی پێگەیشتنی دەردەخەن، بۆیە پێویستە، لە دارشتن و وردیی واتاکانی و راستیی زانیارییەکاندا، گرنگیی تەواویان پێبدات. نووسینی راپۆرتیش هونەرێکی گرنگە و پێویستی بە رۆشنبیرییەکی گشتیی فراوان و تۆکمە هەیە، بۆئەوەی یارمەتیدەر بێت بۆ ئاشنابوون بە لایەنە سیاسی و مێژووییەکان و یاداشتی گەورە کەسایەتییە جیهانییەکان و بەدواداچوون و خوێندنەوە و لێکدانەوەی رووداو و پێشهاتەکان.

رێگەدانی دەوڵەتان بە گواستنەوەی ئەو زانیارییانە دەگەرێتەوە بۆئەوەی، کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی بونیادنراون، پێویستە دەوڵەتی نێرەر ئاگاداری بارودۆخی دەوڵەتی پێشوازیکەر بێت، بۆ ئەوەی بزانێت لەسەر چ بنەمایەك و بە چ جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا بکات. بەڵام لە واقیعدا، زۆربەی دەوڵەتان لە زۆر حاڵەتدا، ئەم حاڵەتە بۆ سیخوڕیکردن بەکاردەهێنن، هەرکاتێکیش دەرکەوت، کە یەکێك لە ئەندامانی نێراوە دبلۆماسییەکە سیخوڕی ئەنجامداوە، یان دەستێوەردانی لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی پێشوازیکەردا کردووە، ئەوا

ئەو دەوڵەتە بۆی هەیە بەکەسێکی نەخوازراو هەژماری بکات، واتە ئەو دەوڵەتە نایەوێت لەسەر خاکەکەی بمێنێت و کاربکات.

نموونەی حاڵەتەکانی سیخوڕی و دەستێوەردان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا زۆرە، بۆ وێنە:

لەکاتی جەنگی سارددا، یەکێك لە دیارترین رووداوەکان ئەوە بوو، کە (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) لە ساڵی (١٩٥٢) (یەکێتیی سۆڤێتی) ئەو کاتەی بەوە تۆمەتبارکرد، کە مایکرۆفۆنێکی بچووکی لەناو دروشمی فەرمیی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا)دا داناوە، کە بە دیواری باڵوێزخانەکەیدا لە مۆسکۆ هەڵواسراوە. هەروەها لە ساڵی (١٩٦٤) وەزارەتی دەرەکیی ئەمەریکی دۆزینەوەی (٤٠) چل مایکرۆفۆنی راگەیاند، کە ماوەی (١١) یانزە ساڵە بە شوێنە جیاوازەکانی باڵوێزخانەکەیدا لە مۆسکۆ دانراون. لە بەرانبەریشدا بە هەمان شێوە، ڕاپۆرتەکانی فەرمانگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵیی (F.B.I.) ئەمەریکی دەریانخستووە، کە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی ئەو باڵوێزخانە و نێراوە دبلۆماسییانەی، کە لە واشنتن کاردەکەن، تۆمارکراون[١].

دیارە لەدوای پەرەسەندنی تەکنۆلۆجیای گەیاندن و زانیاریی بوار و جۆر و شێوازەکانی سیخوڕیکردن و دژە سیخوڕیکردن زۆر زیادیکردووە و دەوڵەتان لە ملانێکانیاندا پەنای بۆ دەبەن، تەنانەت کۆمپانیا فرەرەگەزە زەبەلاحەکانیش سیخوڕی بەسەر کارو چالاکی و بەرهەمەکانی یەکترییەوە دەکەن.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص١٣٦.

### ٥. پەرەپێدانی پەیوەندییەکان:

لــە دیــارترین ئــەرك و کارەکــانی نوێنــەری دبلۆماســیی، بریتییــە لــە پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە، لە ڕێگەی ئاسـانکاریی بۆ هەموو ڕێوشوێنە پێویستەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و ئابووری و زانستی و کولتـووری و سـەربازی و...هتـد، لـە بابەتـە هاوبەشـەکانی نێـوان ئـەو دوو دەوڵەتە.

لـە بابەتـە سیاسییەکانیشـدا هـەوڵی نزیککردنـەوەی دیـدو بۆچـوونەکان دەدات، ئەمە وێـڕای هـەوڵی بـەهێزکردنی پەیوەنـدیی نێـوان گـەلانی هـەدوو دەوڵەت، لە ڕێگەی ئاسانکاری و هاوکاری و لابردنی ئاستەنگەکانی نێوانیان.

سەرکەوتنی نوێنەری دبلۆماسی لەم ئەرکـەدا پێویسـتی بـە پەیوەنـدی و کاری بەردەوام هەیە، بە سەرکەوتنێکی گرنگ دادەنرێت بۆی.

### ٦. چاودێریکردنی پابەندییەکانی (إلتزامات) ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات:

نوێنەری دبلۆماسی بەدواداچوون بـۆ پابەندییـەکانی دەوڵـەتی خانـەخوێ بەرانبەر وڵاتەکەی دەکات، هەرکاتێکیش کەموکوڕییەکی لـە جێبـەجێکردنی ئەو پابەندییانە بۆ دەرکەوت، ئەوا ڕاستەوخۆ پەیوەندی بـە فەرمانگـە، یـان ئەو لایەنەوە ناکات، کە ئـەو کـارەی کـردووە، بـەڵکو لـە ڕێگـەی وەزارەتـی دەرەکییـەوە دەبێـت، کـە ئـەو ئەرکـە دەگرێتـە ئەسـتۆ، بـەڵام هەنـدێکجار وەزارەتی دەرەکیی ئەو دەوڵەتە ڕێگە بە نێراوە دبلۆماسـییەکە دەدات، کـە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە بکات.

### ٧. ڕێزگرتنی یاساکانی ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات:

پێویستە نوێنەری دبلۆماسیی ڕێز لە یاساکانی ئەو دەوڵەتە بگرێت، کە کاری تێدادەکات. بۆیە پێویستە دبلۆماتەکان ڕێز لە دەستوور و سیستمی فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتە بگرن و هیچ کارێك ئەنجام نەدەن، کە بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی ئەو دەوڵەتە هەژماربکرێت، هەروەها پێویستە ئاژاوە نەنێنەوە، بۆ هەرمەبەستێك بێت، هەروەها پێویستە هاوکاریی هیچ بزوتنەوەیەکی شۆڕگێڕی نەکەن و هانی هیچ جۆرە هەڵگەڕانەوەیەك، یان هەر جۆرە هەڵمەتێکی سیاسی نەدەن، کە دژی کارو رەفتار و بڕیاری دەوڵەتەکە بێت، هەروەها نابێت پشتیوانیی پارتێك لە دژی پارتێکی تر بکەن، یان دەست وەربدەنە نێو ناکۆکییە ناوخۆییەکان، هەروەك چۆن نابێت هەر جۆرە کارێك ئەنجامبدەن، کە هەستی گەلانی ئەو دەوڵەتە بریندداربکات، یاخود لە بیروباوەڕیان بدات، بەڵکو پێویستە ڕێزی دابونەریت و بیروباوەڕ و ئایینی گەلانی ئەو دەوڵەتە بگرن، کە کاری تێدا دەکەن، تەنانەت ئەگەر لە کولتوورو ئایینی دبلۆماتیشدا بە شتێکی نامۆ لەقەڵەم بدرێت.

لەلایەکی ترەوە پێویستە دبلۆماتەکان بەشداری لە خۆشی و ناخۆشی و مەراسیمەکانی ئەو دەوڵەتەدا بکەن، کە تێیدا کاردەکەن، بەتایبەت ئەوانەی تایبەتن بە سەرۆك و خانەوادەکەی و هەریەکێکی تر لە فەرمانڕەوایان، یاخود ئەو کارەساتانەی کە تووشی گەلانی ئەو دەوڵەتە دێن. پێویستە دبلۆمات بەردەوام گرنگی بەو مەسەلانە بدات، تەنانەت ئەگەر پەیوەندیی نێوانیشیان تووشی ساردی بووبێت.

### ٨. کاری سەربار:

نوێنەری دبلۆماسیی سەرباری ئەو کارانەی کە باسکران، ئەو کارە ئیدارییانەش رادەپەڕێنێت کە بەپێی یاسا و رێنمایی ناوخۆیی وڵاتەکەی پێی دەسپێرێت، وەك ئەو کارانەی کە پەیوەستن بەهاووڵاتیانی وڵاتەکەی لە وڵاتی خانەخوێدا، بۆ نموونە: تۆماری مندالّبوون، کۆچی دوایی، گرێبەستی هاوسەرگیری، پێدانی ڤیزە و...هتد، کە لە بنەڕەتدا ئەم کارانە، لە ژێر چاودێریی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەدا، بە کونسوڵەکان دەسپێرێن، یاخود هەر لە سەرەتاوە کونسوڵەکان بە سیفەتی ئەسڵی بەو کارانە هەڵدەستن[١]. (لە باسی پەیوەندییە کونسوڵییەکاندا بە درێژی لە ئەرکەکانی کونسوڵ دەدوێین).

---

(١) د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص١٠٨.

## باسی چوارەم: گوتارو پەیامگۆڕینەوەی دبلۆماتکاران
## (الخطابات التي يتبادلها الدبلوماسيون)

لێرەدا بەپێویستی دەزانین باس لەو نامە و پەیام و هەڵوێستانە بکەین، کە باڵوێز و دبلۆماتکاران لەنێوان خۆیاندا، یان لەگەڵ بەرپرسانی وڵاتی میوانداردا ئاڵوگۆڕی دەکەن، کە هەموویان بەگشتی سیفەتی فەرمییان هەیە، بەڵام بە پلەی جیاواز، ئەویش بەپێی بایەخی بابەتەکان و گرنگی و ئاستی پلە و پۆستی لایەنەکانی ئاڵۆگۆڕەکە، کە لە ڕێی باڵوێزەوە دەبێت، ئەویش تەنها لە ڕێی وەزارەتی دەرەکیی وڵاتەکەیەوە هەڵوێستەکانی وڵاتەکەی دەزانێت و دەیگەیەنێت بە وڵاتی میواندار.

ئەو ڕێسا گشتییەی کە لە پەیوەندی و نامەگۆڕینەوەکانی نێوان نوێنەری دبلۆماسیی و حوکومەتی دەوڵەتی پێشوازیکەردا پێویستە ڕەچاوبکرێن، بریتیین لەوەی کە هەر جۆرە پەیوەندییەك پێویستە بەناوی سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەوە بکرێت و لەگەڵ وەزارەتی دەرەکیدا، یان لە ڕێگەی ئەوەوە ئەنجامبدرێت، تەنیا لە حاڵەتی تایبەت بە پاشکۆ تایبەتمەندەکاندا نەبێت، کە بۆیان هەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ وەزارەت، یان فەرمانگەی پەیوەندیدار بەکاری ئەوانەوە بکەن، وەك: پەیوەندیی پاشکۆی بازرگانی بە وەزارەتی بازرگانی و دارایی، پەیوەندیی پاشکۆی ڕۆژنامەوانی بە وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە و...هتد، بە مەرجێك بابەتی پەیوەندییەکانیان ئاسایی بن و پەیوەست بن بە کاری ڕۆتینیی ڕۆژانەوە و پەیوەست نەبن بە سیاسەتی کارەوە، چونکە ئەوان ناتوانن باسی پرسی زیندووی وەك: ڕێککەوتنی بازرگانی و میدیایی و پێشکەشکردنی پێشنیاز بۆ بەستنی ڕێککەوتننامە بکەن، لەبەرئەوەی ئەو کارانە تەنها لە ڕێگەی وەزارەتی دەرەوە ئەنجامدەدرێن، بەڵام ئەگەر

ڕەزامەندیی پێشوەخت، بۆ پەیوەندیکردن بە وەزارەتێکی ترەوە، وەرگیرا، ئەوا دروستە، بەڵام لەو دوو حاڵەتەشدا، بەبێ زانیاری و ڕەزامەندیی وەزیری تایبەتمەند، دروست نییە پەیوەندیی بە هۆبە و بەشە لاوەکییەکانی وەزارەت و دامەزراوە حوکومییەکانەوە یان سەرۆکی باڵای فەرمانگەکە بکرێت. بۆ نموونە: دروست نییە پاشکۆی ڕۆشنبیریی نێراوێکی دبلۆماسیی بیانی، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سەرۆك بەشی یەکێك لە کۆلێژەکانی زانکۆیەکەوە بکات، سەبارەت بە بابەتێکی فەرمی، یان ئەنجامدانی سەردانێکی فەرمی، مەگەر لە ڕێی ڕاگری کۆلێژەکەی و ئاگاداریی سەرۆکی زانکۆکەوە بێت.

## بەگشتی نامە فەرمییە دبلۆماسییەکان ئەم شێوازانە دەگرێتەوە[١]:

### ١. نامەی فەرمی( الرسالة الرسمية Official Letter ):

نامەی فەرمی لەنێوان باڵوێز و وەزیری دەرەکیی دەوڵەتی میواندار، یاخود باڵوێزەکان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕی دەکەن. تێیدا باس ئەو بابەتانە دەکرێت، کە گرنگییەکی تایبەتیان هەیە و پێویستە بەنهێنی بپارێزرێن. بە زمانی وتارئاڕاستەکەر (لغة المخاطب) دەنووسرێت و بە وشەی: (بەڕێز وەزیر، یان بەڕێز باڵوێز –سيادة أو معالي الوزير أو سيادة أو سعادة السفير) دەستپێدەکات و بەم گوزارشتە کۆتایی دێت: (ڕێز و خۆشەویستیمان قبووڵ بفەرموون)، هەروەها نێرەر ناوی تەواوی خۆی و واژۆی لەسەر دادەنێت.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. فاضل زكي محمد، م.س. ذ، ص ص٤٥٢-٤٥٥. و: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٠٠-١٠٢.

## ٢. یاداشــتی فــەرمی یــان یاداشــتی دبلۆماســی (المــذكرة الرسميــة Official Note or Diplomatic Note):

یاداشــتی فــەرمی بــە دارِشــتنی کەســی ســێیەم دەنووســرێت لــەو نامەگۆڕینەوانەدا، کە نوێنـەرە دبلۆماسـییەکان لەگـەڵ وەزارەتـی دەرەکـی، یان هاورێکانیان لە کاروبارە فەرمییە جۆربەجۆرەکاندا ئاڵوگۆڕی دەکەن.

یاداشـتی فـەرمی بـەم گوزارشـتە دەسـتپێدەکات: (باڵوێزخانـەی ......... جـوانترین سـڵاوی خـۆی ئاراسـتەی......... دەکـات و شـەرەفمەند دەبێـت بـە ئاگادارکردنــەوەتان.........)، هــەروەها بــەم گوزارشــتە کۆتــایی دێــت: (باڵوێزخانەی..... ئەم بۆنەیە دەقۆزێتەوە بۆ دەربڕینی تەواوی ڕێزی خۆی).

لەکۆتاییشـدا بـە مـۆری باڵوێزخانەکـە و ئیمـزای نێـرەرەوە دەنێرێـت. هەروەها پێویستە لەسەر پەڕەیەکی فەرمی بنووسرێت، کـە دروشمـی وڵاتـی خاوەن باڵوێزخانەکە و ناوونیشـانەکەی تێـدابێت. دەبێـت ئـەوە بـزانین، کـە ئاڵوگۆڕکردنی یاداشتی فەرمی لـەنێوان دەسـتە دبلۆماسـییەکان و وەزارەتـە دەرەکییەکاندا زیاتر باوە.

جیاوازییــەکی ئــەوتۆ لــەنێوان نامــەی فــەرمی و یاداشــتی فەرمیــدا بەدیناکرێت، بۆیە نێراوی دبلۆماسیی و سەرۆکەکەی خۆی سەرپشکە لەوەی کامیان بەکاردەهێنێت، هەندێکجاریش یاداشـتی فـەرمی درێـژترە لـە نامـەی فەرمی. دەکرێت باڵوێز یاداشتێکی کەسی بـۆ هەریـەك لـە هاوپیشـەکانی لـە سـلکی دبلۆماســییدا بنێرێــت، کاتێــك بەڵگەنامــەی دامەزراندنەکــەی پێشکەشدەکات، هەروەها دەکرێـت لـە پرسـە پرۆتۆکۆڵلییەکانـدا بینێرێـت، وەك: پیرۆزبایی بە بۆنەی جەژن، یان یادە نەتەوەییەکانەوە، یان بە بۆنـەی ئاهەنگە تایبەتەکانی بەرپرسە باڵاکانی دەوڵەتی میواندارەوە.

### ٣. **یاداشتی زارەکی** (**المذكرة الشفهية** Note Verbale):

یاداشتی زارەکی، یان بۆ روونکردنەوە، یان جەختکردنەوە لە هەندێك خاڵ بەکاردێت، کە لە وتووێژێکی شەخسیی پێشتردا ئەنجامدراوە. داڕشتنەکەشی بە زاری کەسی سێیەم دەنووسرێت و بە پیتەکانی یەکەم (الأحرف الأولى) واژۆدەکرێت، دەستپێك و کۆتاییەکەشی بە گوزارشتی موجامەلەی هاوشێوەی یاداشتە فەرمییەکان دەبێت.

### ٤. **بیرخەرەوەی یاریدەدەر** (**المفكرة المساعدة** Aide Memoir):

بەگشتی بیرخەرەوەی یاریدەدەر بریتییە لە پوختەیەکی نووسراو بۆ شیکردنەوە،روونکرنەوەی تێڕوانینی حوکومەتی نوێنەری دبلۆماسیی لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، کە تێیدا ئەو بەڵگەو واقیعانە رووندەکرێنەوە، کە وای لەو حوکومەتە کردووە، کە جۆرە هەڵوێستێکی هەبێت لەمەڕ دانوستانێك کە هەیە، یان روونکردنەوە دەدات لەسەر پلانێکی دیاریکراو کە گرتوویەتییە بەر، ئەمەش بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە خراپتێگەیشتنێك، یان شێواندنێکە بۆ هەڵوێستی فەرمیی ئەو دەوڵەتە. بۆیە پێویستە خستنەرووی بیرۆکەکان بەشێوەیەکی لۆژیکی و رێکوپێك پشت بە بەڵگەو راوبۆچوونی یاسایی ببەستن. هەروەها بیرخەرەوەی یاریدەدەر گوزارشتی موجامەلەی دبلۆماسی لەخۆناگرێت، بە داڕشتنی کەسی سێیەم دەنووسرێت، هەروەك چۆن واژۆی نێرەر، یان مۆری دەستەی دبلۆماسیی لەسەرناکرێت، تەنها رێککەوتی ناردنەکەی نەبێت.

جـۆری هەریـەکێك لـەم گوتـار و نامانـە ئاسـتی گرنکییەکـەی و پلـەی نهێنیبوونی و فـەرمیبوونی دیاریـدەکات. لـە هـەمان کاتـدا پێویسـتە هـەموو نامەیەك وەڵام بدرێتەوە، مەگەر هۆکاری تایبـەت هـەبێت کـە رێگـر بێـت لـە وەڵامدانەوە. بۆ نموونە: کاتێك وەزارەتی دەرەوەی وڵاتێك، وای دابنێت کـە نامەی حوکومەتی وڵاتێکی تر گوزارشتی نەشیاو و ناشـرین لـەخۆ دەگرێـت، ئەوا دەتوانێت قبووڵکردنی رەتبکاتەوە، تەنانەت کاتێك کە وەریشیگرتووەو خوێندوویەتییـەوە، لـەم بـارەدا وەزارەتـی دەرەکـی، یـان خـودی وەزیـر سـەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکە بانگـدەکات و نامـە وەرگیراوەکـەی پێدەداتـەوەو ئاگـاداری دەکاتـەوە، کـە حوکومـەتی وڵاتەکـەی ئـەم نامەیـە قبووڵ ناکات(١).

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٧٠.

## باسی پێنجەم: کۆتاییهاتنی کاری دبلۆماسی

پێویسـتە لێـرەدا جیاکـاری لـەنێوان سـێ جـۆر کۆتاییهاتنـدا بکـەین، یەکـەمیان تایبەتـە بـە کۆتاییهـاتنی کـاری نێـراوە تایبەتـەکان، دووەمیـان تایبەتــە بــە کۆتاییهــاتنی کــاری نێــراوی دبلۆماســیی هەمیشــەیی وەکــو دەزگایەکی دبلۆماسی، سێیەمیان کۆتاییهـاتنی کـاری دبلۆماسـیی نوێنـەری دبلۆماسییە (دبلۆماتکار)، با بزانین هەریەکێکیان بە چ شێوازێك کۆتـایی بـە کارەکانیان دێت!

### یەکەم: کۆتاییهاتنی کاری نێراوە تایبەتەکان

لەبەرئەوەی کارو ئەرکی نێراوە تایبەتەکان کارێکی کاتییە، ئەوا سـیفەتە دبلۆماسییەکەشیان بە کۆتاییهـاتنی کـارە دبلۆماسـییەکەیان و گەڕانـەوەیان لــەو دەوڵەتــەی، کــە بــۆی نێــراون کۆتــایی دێــت، نێــراوی تایبــەت لــەو دەوڵەتانەشدا، کـە پێیـدا تێپـەڕدەبێت تـا دەگەڕێتـەوە دەوڵەتەکـەی خـۆی سیفەتی دبلۆماسیی هەیە.

بەڵام با بزانین ئەگەر ئەندامانی نێراوی تایبەت، یان هەندێکیان ویسـتیان بــۆ مەبەســتی گەشــتوگوزار، یــان چارەســەر بمێننــەوە، ئایــا ســیفەتە دبلۆماسییەکەیان دەمێنێت؟

لەڕاسـتیدا ئەنـدامانی نێـراوی تایبـەت، لەبەرئـەوەی پۆسـتی باڵایـان لـە دەوڵەتەکانیانـدا هەیـە سـیفەتی دبلۆماسـییان دەدرێـتێ، ئەگـەر دەوڵـەتی پێشوازیکەر ڕێگەی مانەوەی پێدان ئەوا سیفەتە دبلۆماسییەکەیان تـا کـاتی جێهێشـتنی خـاکی ئـەو دەوڵەتـە بـەردەوام دەبێـت، بـەڵام ئەگـەر ڕێگـەی مانەوەی پێنەدان و لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە خاکەکەیـدا مانـەوە، ئـەوا سـیفەتە

دبلۆماسییەکەیان نامێنێت، تەنها سەرۆکی دەوڵەت نەبێت، کە بە حوکمی پۆست و پێگەکەی لە دەوڵەتدا، تەنانەت ئەگەر لەدوای تەواوبوونی کارە فەرمییەکەشی مایەوە، سیفەتە دبلۆماسییەکەی هەر بەردەوام دەبێت، چونکە سیفەتە دبلۆماسییەکەی لەو پێگەیەوە وەرگرتووە، کە لە دەوڵەتەکەیدا هەیەتی، نەك لەسەر بنەمای ئەو کارەی، کە لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا پێی هەڵدەستێت.

### دووەم: کۆتاییهاتنی کاری نێراوی دبلۆماسیی هەمیشەیی (وەکو دەزگایەکی دبلۆماسی)

لەم بارانەدا ئەرکی نێراوی دبلۆماسیی هەمیشەیی کۆتایی دێت:

#### ١. داخستنی نێراوە دبلۆماسییەکە:

لەم حاڵەتەدا هەردوو دەوڵەتەکە بەپێی رێککەوتنێکی ئاڵوگۆڕکراو دەزگا نێراوە دبلۆماسییەکە دادەخەن، جا بەهۆی نەمانی پێویستی بێت بەو نێراوە، یان لەبەر هۆکاری ئابووری و خەرجییەکانییەوە بێت، یان لەبەر هەر هۆکارێکی دی[١].

---

(١) د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص٧٤.

## ٢. حاڵەتی نەمانی دەوڵەتی خاوەن نێراوە دبلۆماسییەکە:

هــەرکاتێك دەوڵــەتی خــاوەن نێــراوە دبلۆماســییەکە نــەما ئــەوا نێــراوە دبلۆماسییەکانیشــی لــەدەرەوە کۆتاییــان دێــت، کــە یــەکێك لــەم بارانــە دەگرێتەوە[1]:

أ. **چوونەپاڵی دەوڵەتەکە بۆ سەر دەوڵەتێکی تر**: لـەم بـارەدا نێراوە دبلۆماسییەکەش دەچێتە پاڵ ئەو دەوڵەتەی تر، یەکێك لە نێراوەکان هەڵدەوەشێنرێتەوە، بەبێ رەچاوکردنی ئەوەی، کە ئایا ئـەم چوونەپاڵە بـە ویستی دەوڵەتەکە خۆی بووە، وەك ئەوەی بە رێککەوتن بووبێت، یاخود بـە ویستی خۆی نەبووە، وەك ئەوەی دەوڵەتێکی تر داگیری بکات.

ب. **دابەشبوونی دەوڵەت بۆ چەند دەوڵەتێك**: لەم بارەدا نێراوەکانی ئـەو دەوڵەتـەی، کـە دابەشـبووە کۆتاییـان دێـت،هیچ یـەکێك لـە دەوڵەتـە نوێیەکان ئەو نێراوانەی پێشوویان بۆ نامێنێتەوە، تەنیا لـەو بـارەدا نـەبێت، کــە دەوڵەتــە ســەرەکییەکە مابێتــەوەو چــەند دەوڵــەتێکی تــری لــێ جیابووبێتەوە، وەك یەکێتیی سۆڤێتی جـاران، کـە لـە سـاڵی (١٩٩١) چـەند دەوڵــەتێکی لــێ جیــا بــووەوەو (رووســیای فیــدراڵ) هــەموو نێــراوە دبلۆماسییەکانی یەکێتیی سۆڤێتی بۆ مایەوە.

بەڵام دەوڵەتە نوێیەکان نێراوە دبلۆماسییەکانی دەوڵەتە کۆنـەکانیان بـۆ نامێنێتەوە، بەڵکو بۆ دروستکردنی نوێنەری دبلۆماسیی پێویستە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانـەدا رێکبکـەوێت، کـە ویسـتیان لەسـەر دروسـتکردنی پەیوەنـدیی دبلۆماسیی لەگەڵیاندا هەیە.

---

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٥٠-١٥١.

### ٣. نەمانی ئەو دەوڵەتەی نێراوە دبلۆماسییەکەی بۆ نێراوە:

ئەگـەر ئـەو دەوڵەتـەی نێـراوە دبلۆماسـییەکەی بـۆ نێـراوە نـەما، جـا بەچوونەپاڵی بێت بۆ لای دەوڵەتێکی تـر، یـان بـە یـەکگرتن، ئـەوا بارەگـای نێـراوە دبلۆماسـییەکە تەحـەککوم بـەو حاڵەتـەوە دەکـات، واتـە نێـراوە دبلۆماسییەکە وەك نوێنەری دەوڵەتەکەی لە بارەگای پێشووی دەمێنێتـەوە بـە لەبەرچـاونەگرتنی ئـەوەی، کـە ئایـا کـێ دەسـەڵاتی ئـەو شـوێنەی بـە دەسـتەوەیەك کـە نێـراوە دبلۆماسـییەکەی لێیـە، ئەگـەر ئـەو شـوێنەی کـە بارەگای نێراوەکەی لێیە بـوو بـە پایتـەخی دەوڵەتـە نوێیەکـە، ئـەوا نێـراوە دبلۆماسییەکە وەك نوێنەری دەوڵەتەکەی لەو پایتەختە دەمێنێتـەوە، بـەڵام ئەگەر پایتەختەکە گوێزرایەوە بۆ شوێنێکی تر، ئـەوا ئـەو نێـراوەی کـە لـەو شوێنەدا بوونی هەیەك دەبێتە نوێنەری دەوڵـەت، بـەڵام ئەگـەر ئـەو شـوێنە نێراوی دبلۆماسیی تێدا نەبوو، ئەوا نێراوەکە دەگوێزرێتەوە بـۆ ئـەو شـوێنە نوێیەی کە کراوە بە پایتەخت.

بـەڵام ئەگـەر دەوڵـەتی نێـرەر دوو نێـراوی هـەبوو لـە دوو دەوڵەتـدا، کـە دەچنە پاڵ یەك و یەك دەوڵەت پێکدەهێنن، ئەوا هەردوو نێراوەکـە لـە یـەك نێـراوی دبلۆماسـییدا یـەکیان پێـدەگیرێت و دەبرێنـە پایتـەختی نـوێ. بـۆ نموونە: کاتێك ساڵی (١٩٩٠) هەردوو (یەمەن) یەکیان گرت، هەرچی نێـراوی دبلۆماسـیی یەمـەن بـوو لـە (عـەدەن) یـەکیان گـرت لەگـەڵ نێـراوە دبلۆماسیی،ەکانی (صەنعا)، کە دواتر بوو بە پایتەختی نوێی دەوڵەت[1].

---

(١) م.ن، ص١٥١.

### ٤. پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان:

هەروڵاتێك لە وەزارەتی دەرەکیی خۆی ئاست و جۆری پەیوەندیی نێوان خـۆی و وڵاتـانی تـر بـە یـەکێك لـەم بارانـە دیاریـدەکات: نایابـە، باشـە، مامناوەندە، قەیراناوییە.. زۆر جار خراپیی باری پەیوەندیی نێوان دوو وڵات، دەبێتەهۆی پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی نێوانیان و کۆتاییهێنـان بـە کارو چالاکیی نێراوە دبلۆماسییەکان و داخستنیان.

مەبەست لە پچڕاندنی پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان ئـەو راگەیەندراوەیـە، کـە دەوڵـەت دەریـدەکات و تێیـدا بڕیـاری کۆتاییهێنـان بـە نوێنەرایـەتیی دبلۆماسـیی لـەنێوان خـۆی و دەوڵـەتێکی تـردا دەردەکـات، لـە رێگـەی کێشـانەوەی نێـراوە دبلۆماسـییەکان لەنێوانیانـدا و گەڕانـەوەی نێـراوە دبلۆماسییەکان بۆ دەوڵەتەکانیان[١].

پچـڕاندنی پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان دەکرێـت تـاك لایەنـە بێـت، دەشکرێت کۆمەڵی بێت، وەك ئەوەی ئەنـدامانی رێکخراوێکـی هـەرێمی، یـان نێودەوڵـەتی، لەبـەر هۆکـاری جیـاواز، پـەنا بـۆ پچـڕاندنی پەیوەنـدیی دبلۆماسیی، یان لەگەڵ دەوڵەتێکدا ببـەن. بـۆ نموونـە: رێکخـراوی یـەکێتیی ئـەفریقی لـەکاتی هـەردوو جـەنگی سـاڵانی (١٩٦٧) و (١٩٧٣)دا بڕیـاری پچـــڕاندنی پەیوەنـــدییان دا لەگـــەڵ ئیســـرائیل دا، وەك گوزارشـــتی ناڕەزاییـدەربڕین لـە سیاسـەتی ئـەو کاتـەی ئیسـرائیل و هاوخـەمی لەگـەڵ دەوڵەتـە عەرەبییـەکان. لەراسـتیدا پچڕاندنی پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان، بەپێی کارنامـەی نەتەوەیـەکگرتووەکان/ مـاددەی (٤١)، لـە رێکـارە توندە

---

(١) م.ن، ص ص١٥١-١٥٢.

ناسەربازییەکانە، کە ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێت داوای جێبەجێکردنی لە دەوڵەتانی ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکان بکات، دژی هەردەوڵەتێك کە هەستێت بە کارێك لەو کارانەی کە هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکەن، ملکەچی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی نابێت، کە بۆ پارێزگاریکردنی ئاشتی و گێڕانەوەی بۆ رەوشی ئاسایی گرتوویەتییەبەر[١].

بۆ باشتر تێگەیشتن لە پێناسەی پچڕان (قطع)ی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، باشتر وایە لە رێگەی خشتەی ژمارە (٥)ەوە جیاکاری لەنێوان پچڕان (القطع) و وەستان (الوقف)ی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان بکەین[٢]:

(١) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص٧٩.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هادي نعيم المالكي، قطع العلاقات الدبلوماسية، مكتبة السنهوري، بغداد، ٢٠١١.

## خشتەی ژمارە (٥)

## جیاکاری لەنێوان پچڕان و وەستانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان

| پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان | وەستانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان |
|---|---|
| پچڕانی تەواوی چالاکیی نێراوی دبلۆماسیی هەردوو لایەنەکە، و داخستنی نێراوە (البعثة) دبلۆماسییەکەیانی لێدەکەوێتەوە، بەبێ دیاریکردنی کات. | وەستانی کاتیی چالاکیی نێراوی دبلۆماسیی لایەك، یان هەردوولای پەیوەندییەکەی لێدەکەوێتەوە، لەگەڵ مانەوەی نێراوە دبلۆماسییەکەیان، بەبێ بوونی وەزیفەیەکی دیاریکراو بۆیان. |
| پچڕان واتە پچڕانی پەیوەندیی دبلۆماسی بەگشتی. | وەستان واتە وەستانی پەیوەندی تەنیا لەسەر ئاستی نێراوی دبلۆماسی و بەردەوامبوونی بەشێوەکانی تر. |
| پێویستە رێککەوتنێکی نوێ بکرێت بۆ دروستکردنەوەی پەیوەندی دبلۆماسی. | بۆ دەستبەکاربوونەوەی پەیوەندییەکان پێویست بە رێککەوتنی نوێ ناکات. |
| لەرووی رێکارەوە: بۆ دەستپێکردنەوەی پەیوەندییەکان و دروستکردنەوەی نێراو (البعثة)ی دبلۆماسی، پێویست بە پێشکەشکردنەوەی بەڵگەنامەی دامەزراندن دەکات. | لەرووی رێکارەوە: زۆربەی حاڵەتەکان پێویست بە پێشکەشکردنەوەی بەڵگەنامەی دامەزراندن ناکات، لەلایەن سەرۆکی وڵاتەوە (بەتایبەت ئەگەر وەستانی پەیوەندییەکە لەنێوان دوو وڵاتدا ڕوویدابێت کە هەردوولا دانیان بەیەکتریدا نابێت)، بەڵام لەدوای گۆڕانی نادەستوریی حوکومەت (بۆ نموونە: لە پاشایەتییەوە بۆکۆماری) ئەوا (أوراق الاعتماد) پیشکەش دەکرێتەوە. |
| نموونە: تێکچوونی پەیوەندیی نێوان | نموونە: لە کاتی ڕوودانی کودەتا لە وڵاتێك |

| | |
|---|---|
| دوو وڵات بەتەواوی بەهۆی قەیرانێکی ئـاڵۆزەوە کـە لـە پێشـێلکردنێکی یاسـایی، یـان هۆکارگـەلێکی سیاسییەوە سەریهەڵدابێت، و دەبێتە هـۆی داخسـتنی باڵوێزخانـەکانیان، لەگـەڵ مـانی سـیفەتی دەوڵـەت بـۆ هەردوولا. | تا روونبوونەوەی بارودۆخەکە، هەندێك وڵات پەیوەنـدیی خۆیـان دەوەسـتێنن، تـا کـاتی یەکلابوونـەوەیان لەسـەر پچـڕاندنی پەیوەنـدیی لەگـەڵ حوکومـەتی کودەتاچییەکان، یان بەردەوامبوونی، پـاش روونبوونـەوەی بارودۆخەکـە. (واتـە تـا ئـەو کاتە پەیوەندی و نێراوەکانیان سڕ (تجمیـد) دەکەن). |

هۆکارەکـانی پچـڕانی پەیوەندییـەکان زۆرن، لەوانـە: تێکچـوونی پەیوەندییـەکان، بـەکارهێنانی پچـڕاندنی پەیوەندییـەکان وەك ئامرازێـك بـۆ زۆرکردن لە دەوڵەتێك بۆ ئەوەی بەکارێك هەستێت، یـان واز لـە کارێـك، یـان بڕیارێك بهێنێت، یاخود بۆ کێشانەوەی دانپێدانانە لە دەوڵەتێك، یان بـەهۆی ئەنجوومەنی ئاساییشەوە دەبێت سەبارەت بـە پچڕاندنی پەیوەنـدی لەگـەڵ دەوڵەتێکی تر[1]. (بۆ نموونە: کۆمەڵـەی گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان لـە ساڵی (١٩٧٨)، بەهۆی پیادەکردنی سیاسەتێکی رەگەزپەرستییەوە، بڕیاری پچـڕینی پەیوەنـدیی نێـوان ئەنـدامانی نەتەوەیـەکگرتووەکان و دەوڵـەتی ئەفریقای باشووری دا).

لێـرەوە بۆمـان روونـدەبێتـەوە، کـە **هەنـدێکجار پچـڕانی پەیوەنـدیی دبلۆماسی ئامانجە**، جا دوولایەنـە بێـت، یـان لـە چوارچێوەی کوتلـە، یـان هاوپەیمانێتییەکدا بێت، لەپێناو سزادانی لایەنێك، یان کوتلەیەکی تر، **جاری**

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٥٢.

**واش هەیە پچڕانی پەیوەندیی دبلۆماسی دەرەنجامە**، واتە دەرەنجامی گۆڕانی ئەو بارودۆخەی، کە پەیوەندییەکەی تێدا بەستراوە، ئەمیش لە دوو حاڵەتدا روودەدات:

یەکەم: گۆڕانی دەسەڵاتی شەرعیی وڵاتێك بەشێوەیەکی نادەستووری (وەك ئەوەی کە لە میسر لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠١٣ روویدا بە ئەنجامدانی کودەتا بەسەر سەرۆکی هەڵبژێراو (د. محمد مورسی) و لەکارخستنی دەستووری وڵات لەلایەن وەزیری بەرگرییەوە).

دووەم: گۆڕانی حاڵەتی ئاشتی بۆ جەنگ.

لە باری پچڕاندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکاندا نوێنەرایەتیی بەرژەوەندییەکان و پاراستنیان، دەدرێتە دەوڵەتێکی تر کە لە رێگەی نێراوی دبلۆماسیی خۆیەوە پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانە دەگرێتەئەستۆ، جاری واش هەیە ژمارەیەك لە دبلۆماتکارانی نێراوی پێشوو لەژێر ئالای ئەو دەوڵەتەدا دەهێڵرێنەوە، کە بەرژەوەندییەکانی دەپارێزێت، بەمەش نێراوە دبلۆماسییەکە، دەبێتە بەشێك (شعبة) بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکان.

### ٥. هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا:

ناتوانرێت لە باری هەڵایسانی جەنگدا پەیوەندییە دبلۆماسییەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بەردەوام بن، چونکە ئەو پەیوەندییانە یەکێکن لە دیاردەکانی پەیوەندییەکی ئاشتییانەو دۆستانە. لە باری جەنگدا ئەرکی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی نێرەر و بەرژەوەندیی هاووڵاتییەکانیشی لەو دەوڵەتە دەدرێت بە دەوڵەتێکی بێلایەن، ئەویش

لەسەر داوای دەوڵەتی نێرەر دوای رەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر[1]. بۆ نموونـە: (سویسـرا) لـە كـاتی جـەنگی یەكـەمی جیهانیـدا ئـەركی پاراسـتنی بەرژەوەندیی (٢٥) وڵاتی لەئەستۆ گرتبوو،ئەم رێژەیە لـە جـەنگی جیهـانیی دووەمدا بۆ (٣٥) وڵات بەرزبووەوە.

دوو ئاڕاستە هەیە بۆ دیاریكردنی شوێنەواری جـەنگ بەسـەر پەیوەندییـە دبلۆماسییەكانی وڵاتانی بەجەنگهاتوو[2]:

**١. ئاراسـتەی كلاسـیكی: جـەنگ دەبێتـەهۆی پچـڕانی پەیوەندییـە دبلۆماسییەكان:**

جـاران تـەنها هەڵگیرسـانی جـەنگ دەبـووە هـۆی داخسـتنی نێـراوە دبلۆماسـییەكانی دەوڵەتـە بەجـەنگهاتووەكان و پچـڕانی پەیوەنـدیی دبلۆماسیی نێوانیان، بەڵكو هەندێك لە زانایان بڕوایان وابوو، كە پەیوەندییە دبلۆماسـی و كونسـوڵییەكانیش بـەهۆی جەنگـەوە دەپچـڕێن، تـەنها چـەند حاڵەتێكی دەگمەن و رێزپەڕ نـەبن. بـۆ نموونـە: (عێـراق) كاتێـك لـە شـەوی (١٦–١٧/١/١٩٩١) هێرشی كرایەسـەر لـە ئـەنجامی داگیركردنـی (كوەیـت)، پەیوەندییـەكانی خـۆی لەگـەڵ (وڵاتەیـەككگرتووەكانی ئەمـەریكا، بـەریتانیا، فەرەنسا، میسر و سعوودیە) پچـڕاند. هـۆی ئـەم پچـڕانەش دەگێڕنـەوە بـۆ نەمانی یەكێك لە بنچینە یاساییەكانی دروسـتكردنی پەیوەنـدیی دبلۆماسـی، كـە بریتییـە لـە ویسـتی هاوبـەش لەنێوانیانـدا بـۆ بـەردەوامیی پەیوەنـدیی دبلۆماسیی و نێراوەكانیان.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤٥)ی (رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هادي نعیم المالكي، م.س.ذ، ص ص٧٥-٨١.

## ٢. ئاڕاستەی نوێ: جەنگ دەبێتە هۆی وەستانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان:

بەپێی ئاڕاستەی نوێ لەکاتی جەنگدا پچڕاندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەرووی یاساییەوە کارێکی پێویست نییە، بەڵکو وڵاتانی بەجەنگهاتوو، ئازادن لە بانگێشتکردنەوەی ئالوگۆڕکراوی نوێنەرە دبلۆماسییەکانیان و ئەو کارە شتێکی حەتمی و سەپێنراو نییە. لە مێژوودا نموونەمان زۆرە، کە وڵاتان لە کاتی جەنگدا بەردەوامبوون لە پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیان، یان تێهەڵچوونەتەوە لەو پەیوەندییانە لە کاتی جەنگدا، چونکە بوونی پەیوەندیی دبلۆماسی بەشداردەبێت لە گێڕانەوەی ئاشتی بەشێوەیەکی خێراتر.

بۆیە لە حاڵەتی ئەو جەنگانەی هۆکارەکەی ناکۆکییەکی سنووری، یان یاساییە، نەك نییەتی داگیرکردنی تەواوەتی، ئەوا هەندێکجار وڵاتان پەنا بۆ وەستاندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیان دەبەن نەك پچڕاندنی. بۆ نموونە: لە کاتی هەڵایسانی جەنگی (عێراق–ئێران) لە (١٩٨٠/٩/٤) نە ڕاگەیاندنی جەنگ هەبوو نە پچڕاندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیان، بەڵکو تەنیا نوێنەرایەتیی دبلۆماسیی نێوانیان وەستێنرا، بۆیە باڵوێزخانەی (ئێران) لە (بەغداد) مایەوەو ئەندامەکانیشی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکانیان هەر مابوو.

کەواتە بەپێی ئاڕاستەی نوێ نێراوە دبلۆماسییەکان دەمێننەوە، بەڵام پەیوەندییە دبلۆماسییەکان دەوەستێنرێن، چونکە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان پەنا بۆ نێراوە دبلۆماسییەکان نابەن.

کەواتە: جەنگ دەبێتەهۆی وەستانی پەیوەندییە دبلۆماسییە بەجەنگهاتووەکان، نەك پچڕانی، مەگەر وڵاتێك بە ویستی خۆی پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی هەڵبژێرێت.

## سێیەم: کۆتاییهاتنی کاری نوێنەری دبلۆماسی (دبلۆماتکار):

ئەگەر نێراوە دبلۆماسییەکان هەمیشەیی بوون لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا، ئەوا هەرتاکێك لە نێراوە دبلۆماسییەکە کارەکەی بەشێوەیەکی کاتییەو لە ماوەیەکی دیاریکراودا کۆتایی دێت. هەردەوڵەتێکیش ئازادە لە دیاریکردنی ئەو ماوەیەدا، بەلاّم بەگشتی دەوڵەتان سێ ساڵ دیاریدەکەن، پابەندبوون بەو ماوەیەوە، یان زیادکردن و کەمکردنەوەی، بەستراوەتەوە بە بارودۆخی کارو ئاستی سەرکەوتنی ئەو دبلۆماتە لە کارەکەیدا، ئەو لایەنەشی ئەو ماوەیە دیاریدەکات بریتییە لە دەوڵەتی نێرەر و پەیوەندیی بە دەوڵەتی بەرانبەرەوە نییە.

هۆکاری سەرەکیی جێگیرنەکردنی دبلۆمات لە کارەکانی تاکە نێراوێکی دبلۆماسیدا، دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی، کە گەڕانەوەی دبلۆمات بۆ دەوڵەتەکەی هەلی دەداتێ تا ئاگای لەو گۆڕانکارییانە بێت، کە لە دەوڵەتەکەیدا لەو ماوەیەدا روویانداوە. ماوەیەك لە دەوڵەتەکەیدا دەمێنێتەوە و دواتر تەنسیب دەکرێت بۆ نێراوێکی دبلۆماسیی تر، بەلاّم مانەوەی دبلۆمات بۆ ماوەیەکی زۆر وای لێدەکات، کە لای دامەزراوە ئەمنییەکان ناسراوبێت، ئەمەش وا دەکات هەموو جموجووڵێکی بخرێتە ژێر چاودێرییەوە، بەلاّم ئەگەر جار جار بگۆرێت ئەوا ئەو کارە تا ماوەیەك بەو ئاسانییە ناکرێت.

ئەگەر دەوڵەت بڕیاری کێشانەوەی دبلۆماتێکی خۆی دا، ئەوا دەوڵەتی میواندار بۆی نییە ڕەخنەی لێ بگرێت، چونکە ئەو کارە تایبەتە بە دەوڵەتی خاوەن دبلۆماتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەوڵەتی پێشوازیکەر بۆی هەیە داوای جێهێشتنی دەوڵەت لە یەکێك، یان زیاتری دبلۆماتەکانی دەوڵەتی نێرەر بکات، لە ماوەیەکی دیاریکراودا بەو وەسفەی کەسێکی نەخوازراوە، واتە (غیر مرغوب فیە)یە[١].

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان ڕێگەی بە دەوڵەتی پێشوازیکەر داوە، کە لە هەمووکاتێکدا –بەبێ ڕاگەیاندنی هۆکاری بڕیارەکەی– ئەوە رابگەیەنێت بۆ دەوڵەتی نێرەر، کە سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکەی، یان هەر دبلۆماتێکی تری کەسێکی نەخوازراوە، واتە کەسێکی (غیر مرغوب فیە)یە، یان هەر دبلۆماتێکی تری قبووڵ نییە (غیر مقبول)، لەم بارەدا دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات، یان هەڵدەستێت بە بانگکردنەوە (استدعاء) ئەو دبلۆماتە، یان کۆتاییهێنان بە راژەکەی لەو نوێنەرایەتییەدا، تەنانەت دەوڵەتی پێشوازیکەر بۆی هەیە پێش گەیشتنیان بە خاکی وڵاتەکەی، ئەوە رابگەیەنێت کە کەسێك، یان زیاتر لە دبلۆماتەکانی نێراوی دبلۆماسیی دەوڵەتی نێرەر کەسانێکی نەخوازراون، یان قبووڵ نین.

نموونەی دەرکردنی دبلۆماتکاران لە مێژووی پەیوەندیی نێودەوڵەتییەکاندا زۆرە، کە بەشێکیان هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرپێچی و ڕێزنەگرتنی ڕێسا و یاسا و ئاساییش، یان دەستێوەردان لە کاروبای ناوخۆی دەوڵەتی پێشوازیکەر. بۆ وێنە: (باراك ئۆباما) سەرۆکی

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٤)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

پێشـــووی (وڵاتەیـــەکگرتووەکانی ئەمـــەریکا)، لـــە کۆتـــا ڕرۆژەکـــانی سـەرۆکایەتییەکەیدا لـە کۆتـایی سـاڵی (٢٠١٦)دا، بڕیـاری دەرکردنـی (٣٥) دبلۆماتی رووسی دەرکرد و ماوەی (٧٢) کـاژێری بـۆ دیـاریکردن کـە خـاکی وڵاتەکەی جێبهێڵن، کە کۆشکی سپی ناوی پەرچـەکرداری لێنـا لـە بەرانبـەر ئـــەو "دەســـتدرێژییە" ئەلیکترۆنییانـــەی مۆســـکۆ لـــە هەڵبژاردنـــەکانی سەرۆکایەتیی ئەمەریکا ئەنجامیداوە. لە بەرانبەردا (رووسیا) ئەو تۆمەتانەی رەتکـردەوەو ئیدانـەی کارەکـەی کـرد، بـەڵام بڕیاریـدا، کـە پەرچـەکرداری هاوشێوەی خێرای نەبێت و دان بەخۆیدا بگرێت تا سەرۆکی نـوێی هەڵبـژێراو "دۆناڵد ترەمپ" دێتە سەرکار[١].

نـەریتی دبلۆماسـی وایـە، کـە ئەگـەر دەوڵـەتی پێشـوازیکەر یـەکێك لـە دبلۆماتـەکانی دەوڵـەتی نێـرەر دەربکـات، ئـەوا ئـەمیش هەڵدەسـتێت بـە دەرکرنـی یـەکێك، یـان زیـاتر لـە دبلۆماتـەکانی ئـەو دەوڵەتـە. لـە حاڵـەتی کۆتاییهـــاتنی مـــاوەی کـــاری دبلۆمـــات، یـــان کێشـــانەوەی لەلایـــەن دەوڵەتەکەیەوە، هیچ کاریگەرییەك لەسەر پەیوەندیی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دروستنابێت، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت کە مەبەست لەو کارە کەمکردنەوەی ئەندامانی نوێنەرایەتییەکە، یان نزمکردنەوەی پلەیان بێت بـەهۆی خراپیـی پەیوەنـدیی نێـوان ئـەو دوو لایەنـەوە، چـونکە ئەمـە وا دەکـات، دەوڵـەتی بەرانبـــەریش هـــەمان کاربکـــات و رێـــژە، یـــان پلـــەی دبلۆماتکارەکـــانی کەمبکاتەوە. کاتێکیش دەوڵەتی خـاوەن دبلۆمـات یـەکێك لـە دبلۆماتـەکانی

---

(١) تاريخ طرد الدبلوماسيين الروس من أمريكا، تأريخ الزيارة (٢٠١٧/١/١٧) على الرابط التالي: http://www.asiaelyoum.com/39752/2016/12/30/القرار-الأمريكي-بطرد-الدبلوماسيين-ال

دەكێشـێتەوە ئـەوا پێویسـتی بـە ڕرەزامەنـدیی ئـەو دەوڵەتـە نییـە، كـە دبلۆماتەكـە كـاری لـێ دەكـات، تـەنیا ئەوەنـدەی لەسـەرە كـە وەزارەتـی دەرەكیـی ئـەو دەوڵەتـە لـە تـەواوبوونی كـاری ئـەو دبلۆماتـەو تـەواوبوونی ڕاژەكەی و كاتی جێهێشتنی خاكی ئەو دەوڵەتە ئاگاداربكاتەوە [١].

بەڵام سەبارەت بە سەرۆكی نێراوە دبلۆماسییەكە تەنها ئاگاداركردنەوەی وەزارەتی دەرەكی بە تەواوبوونی كارەكەی بەس نییە، بەڵكو پێویستە ئیزن لە سەرۆكی دەوڵەت –یان هەركەسێك كە خـۆی بـۆ ئـەو كـارە رایسـپێرێت– وەربگرێت بۆ جێهێشتن و پێویستە بۆ ماڵئاوایی، لە مەراسـیمێكی تایبەتـدا، چـاوی پێـی بكـەوێت، كـە لـە ئێسـتا لـە هەنـدێك دەوڵەتـدا هـەر لـەو چاوپێكەوتنەدا سـەرۆكی دەوڵەتەكـە نامـەی دامەزرانـدن دەبەخشـێتە ئـەو كەسـەی، جێگـەی باڵوێزەكـە دەگرێتـەوە. لـە هـەمان كاتـدا نێـراوە دبلۆماسـییەكە نوێنـەران و باڵوێزخانـەكانی تـر لـەو گۆڕانكارییـە ئاگاداردەكاتەوە [٢].

لەڕاسـتیدا دەتـوانین هۆكارەكـانی كۆتاییهـاتنی كـاری سـەرۆكی نێـراوی دبلۆماسیی لە چوار حاڵەتدا كۆبكەینەوە [٣]:

١. ئەو هۆكارانەی كە پەیوەندییان بە سـەرۆكی نێـراوە دبلۆماسـییەكە خۆیەوە هەیە، كە ئەمانەن:

–دەستلەكاركێشانەوەی.

---

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٥٣-١٥٤.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٤١-٤٢.

(٣) د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٨٠-٨١.

- خانەنشینکردنی.
- کۆچی دوایی.

٢. ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندییان بە دەوڵەتی نێرەرەوە هەیە:

- گواستنەوەی.
- وازپێهێنانی (فصله).
- کۆتاییهاتنی ئەو وادەیەی، کە لە بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەیدا هاتووە.

٣. ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندییان بە دەوڵەتی پێشوازیکەرەوە هەیە:

- تەواوبوونی کاری ئەو نێراوە دبلۆماسییەی، کە سەرۆکەکەی لە پێناودا نێراوە، یان تەواوبوونی ماوەی ناردنەکەی.
- بێزاری و ناڕازیبوونی دەوڵەتی پێشوازیکەر لە رەفتارە کەسییەکانی سەرۆکی نێراوەکە.
- بێزاری و ناڕازیبوونی دەوڵەتی پێشوازیکەر لە رەفتارە گشتییەکانی سەرۆکی نێراوەکە.

٤. هۆکارگەلێکی هاوبەش کە ناکرێت، بەتەنیا بدرێتە پاڵ یەکێك لە دوو دەوڵەتەکە:

- دەستلەکارکێشانەوە، یان سازشکردن، یان کۆچی دوایی سەرۆکی هەریەکێك لە دەوڵەتی نێرەر، یان پێشوازیکەر.
- گۆڕانی سیستمی حوکمڕانی لە یەکێك لەو دوو دەوڵەتە.
- هەڵگیرسانی باری جەنگ لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا (بەپێی ئاڕاستەی کلاسیکی).
- لەناوچوونی یەکێك لەو دوو دەوڵەتە.

-مامەڵە بە هاوشێوە، یان تۆڵەکردنەوە.

ماوەتەوە بڵێین: پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان و یەکە نێوەوڵەتییەکانی تریش بەگشتی، پەیوەندییەکی هەستیار و ئاڵۆزە، دەیان ڕێسا و پرەنسیپی یاسایی و عورف و ئەخلاقیی تەحەککومی پێوەدەکەن، بۆیە نوێنەرایەتیکردنی کەسە یاساییە نێودەوڵەتییەکان کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پێویستە دەوڵەتان و نوێنەرە دبلۆماسییەکانیشیان، بە باشترین شێوە، ئەو پەیوەندییان بەڕێوەببەن و خۆیان لە بێزارکردنی بەرانبەرەکانیان و پێشێلکرنی یاسا و ڕێسا ناوخۆییەکانیان بپارێزن، هەروەها پێویستە بێڕێزی بە مێژوو و بەها و کولتوور و پیرۆزییەکانیان نەکەن، تا پەیوەندی و هاریکاری و نوێنەرایەتییەکەیان بە رووە پۆزەتیڤەکەیدا بەردەوام بێت، بەڵام لەبەرئەوەی یەکێك لە دوو باڵە سەرەکییەکەی پەیوەندیی نێودەوڵەتییەکان بریتییە لە ململانێ، پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیش ئەگەری دروستبوونی هەموو جۆرە گرژی و ئاڵۆزییەکی تێدایە، کە زۆرجار دەوڵەتان و خۆیان بەمەبەست، لە چوارچێوەی ئەو ململانێیە و سەپاندنی هەژموون و ئیرادەی خۆیان، دروستیدەکەن، لێرەدا گرنگی و پێویستیی ڕێسا و یاسا دبلۆماسییەکان دەردەکەوێت، کە هەوڵی ڕێکخستن و سنووردانان بۆ ئەو حاڵەتانە دەدەن، تا پێکەوە ژیانی ئاشتییانە باڵ بەسەر پەیوەندییەکاندا بکێشێت.

لێرەدا نموونەی نووسراوێکی بانگکردنەوەی باڵوێز (نموذج كتاب استدعاء سفير) دەخەینەروو:

**نموونەی نوسراوێکی بانگکردنەوەی باڵوێز ( نموذج كتاب استدعاء سفير )ی "عێراقی"**(١).

بسم الله الرحمن الرحيم

سەرۆکایەتیی کۆمار

**لە: سەرۆك کۆماری عێراقەوە ..............**

**بۆ: فەخامەت یان بەرێز سەرۆك کۆمار (یان بۆ جەلالەتی پاشا)** ............

**هاورێی خۆشەویستمان**

لەبەر تەواوبوونی ئەو ئەرکە گرنگەی کە بەرێز ............................ شەرەفی لەئەستۆگرتنی پێ برا بوو، پێمان باش بوو جەنابتان ئاگادار بکەمەوە بە بانگکردنەوەی (یان دانانی لە پۆستێکی تر). دڵنیاشین لەوەی کە لە کاتی مانەوەی لای جەنابتان هەموو هەوڵێکی خۆی خستوەتە گەڕ بۆ بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی کە لەنێوان وڵاتەکانماندا هەیە، دڵنیاشین لەوەی کە ئەو جێی رێز و رەزامەندیی بەرێزتان (یان فەخامەتتان یان جەلالەتتان) بووە.

ئەم هەلە دەقۆزینەوە بۆ جەختکردنەوەمان لەسەر دۆستایەتیی بەردەوام و رێزی تەواومان بۆ فەخامەتتان (یان جەلالەتتان).

لە بەغداد لەرۆژی ....... مانگی....... ساڵی .........کۆچی

بەرامبەر رۆژی ....... مانگی....... ساڵی ......... زاینینوسراوە

**هاورێی بە ئەمەکتان** — **وەزیری دەرەوە**

**(واژۆ)** — **(واژۆ)**

---

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س. ذ، ص٤٤٧.

# بەشی شەشەم
# پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان

باسی یەکەم: واتای جیاوك و پارێزیەندی و جیاوازیی نێوانیان

باسی دووەم: بنچینەی یاسایی پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان

باسی سێیەم: جیاوکە دبلۆماسییەکان

باسی چوارەم: پارێزبەندیی دادوەریی

## بەشی شەشەم: پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان

**(الحصانات والإمتيازات الدبلوماسية)**

➢ ئامانج لەم بابەتە:

١. زانینی مانای جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکان.

٢. ئاشنابوون بە بنچینەی دروستبوونی پارێزبەندی و جیاوکەکان و هەڵسەنگاندنی دیارترین تیۆرەکان لەو بارەیەوەو دیاریکردنی باشترینیان.

٣. ئاشنابوون بەو جیاوك و پارێزبەندیانەی، کە دبلۆماتکارو ئەندامانی خێزانەکەی هەیانە،زانینی ئاست و جۆرەکانیان و سروشتی ئەو ماف و پارێزبەندییانە.

٤. زانینی شێوازی کۆتاییهاتنی ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی، کە دبلۆماتکاران هەیانە.

➢ ناوەرۆکی بابەتەکە:

**دەستپێك..**

نوێنەری دبلۆماسیی پارێزبەندییەکی تایبەت و ئیمتیازاتگەلێکی دبلۆماسیی هەیە، کە یاسای نێودەوڵەتی لەپێناو بەجێهێنانی کارەکانی وەکو پێویست بڕیاری لێداوە، نوێنەری دبلۆماسی ئەو جیاوك (ئیمتیازات)انەی لەو دەوڵەتەدا هەیە کە بۆی نێراوەو کاری تێدادەکات، نەك لەناو وڵاتەکەی خۆیدا.

## باسی یەکەم: واتای جیاوك و پارێزیەندی و جیاوازیی نێوانیان

**سەرەتا با بزانین جیاوك (إمتیاز) و پارێزبەندی (الحصانة) واتایان چییە؟**

لەگەڵ ئەوەی (٤٣ جار) ئەم دوو زاراوەیە لە رێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١)دا هاتوون، رێککەوتننامەکە پێناسەیەکی دیاریکراوی بۆ نەکردوون، هەر بۆیە تا ئێستا پێناسەیەکی وردو دیاریکراو بۆ ئەو دوو زاراوەیە، کە زانایان کۆکبن لەسەری نییە، بەڵکو زانایان زۆرجار، بەبێ جیاکارییەکی ورد لەنێوانیاندا، بەکاریان هێناون، لە هەمان کاتدا هەندێکیان جیایان کردوونەتەوە، هەندێکیان واتای (رێزێکی باڵا)یان بۆ جیاوك و واتای (گرێنتییەکان)یان بۆ پارێزبەندییەکان داناوە. هەندێکی تر دەڵێن: جیاوك (ئیمتیاز) بریتییە لە گۆڕینی رێسایەك لە رێسا ناوخۆییەکانی دەوڵەتی میواندار بە یاسایەکی تایبەت، کە بەسەر فەرمانبەرە دبلۆماسییەکاندا جێبەجێ بکرێت. هەروەها پارێزبەندییەکان سیستمێکە بۆ ریزپەڕکردنی هەندێك کەس لە جێبەجێکردنی هەندێك یاسای ناوخۆیی و لە ملکەچبوون بۆ ئەو سزایانەی، کە لە ئەنجامی پێشێلکردنی ئەو یاسایانەوە دەسەپێنرێن[١].

بنەڕەتی وشەی (حصانات) دەگەرێتەوە بۆ وشەی لاتینیی (Immunitas) و ڕەگوڕیشەکەی (Munus)، کە واتای "بەخشین لە چەند ئەرکێکی دیاریکراو" دەگەیەنێت. هەروەها فەرهەنگی (رووبیر) بە چەند واتایەك لێکی دەداتەوە، لەوانە: بەخشینە لە ئەرکێك، یان جیاوکێکە کە بەپێی یاسا دەبەخشرێت، بە دەستەیەکی دیاریکراو لە خەڵکی[٢].

---

(١) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١١٠.

(٢) وەگیراوە لە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص٤١٨.

وشـــەی جیــاوك (Privilege)یــش وشـــەیەكی لاتینییـــەو لـــە وشـــەی (Privilegium)ـــەوە داتاشــراوە، بــەپێی فەرهــەنگی (رووبــێر) بەچــەند واتایەك دێت، لەوانە تایبەتمەنـدی (میـزة)، بەخشـین (الاعفـاء)، ئەفزەڵیـەت (الأفضـلیة) و خۆشویسـتن (المحابـات). بـەڵام لـەرووی یاسـاییەوە بـەپیێ (فەرهەنگی رووبێر) جیاوك بە واتای تایبەتمەندی و ئەفزەڵییـەتێكی تایبـەت دێت، كە دەبەخشرێت بە كەسێك، یان كۆمەڵە كەسێك، لەگـەڵ ئـەوەی كـە دەتوانرێت ئەو تایبەتمەندییـەیان لـە دەرەوەی چوارچـێوەی یاسـای گشـتی هەبێت. وشەی جیاوك لەرووی مێژوییەوە ئەو ماف و ئەفزەڵییەتـە فـەخری، یان سوودگەرییانەیە كە هەندێك كەس بە حوكمی پشت و رەچـەڵەك هەیانـە (وەك شـیخ و پیاومـاقووڵان)، یـان بـە حـوكمی وەزیفەكـەیان هەیانـە (وەك دادوەران)، یـان هەنـدێك پیشـەوەر، یـاخود دانیشـتووی شـوێنێكی تایبـەت هەیانە. كەواتە جیاوك (ئیمتیازات) تایبەتمەندییەكی فـەخری، یـان دانـراوە، یاخود ماف، یان دەسەڵاتێكی حەصرییە كە تاكێك، یان كۆمەڵێك هەیانـە، و پەیوەسـتە بـە مومارەسـەكردنی وەزیفەیـەكی دیـاریكراو، ئـەویش بـەهۆی ئینتیمابوون بۆ چینێكی كۆمەڵایەتی، یان بەهۆی حاڵەتێكی یاساییەوە[١].

كەواتە رای جیاواز لەسەر جیاوازیی نێوان "پارێزبەنـدی" و "جیـاوك"ـــە دبلۆماسییەكان هەیە[٢]:

هەندێكیان بڕوایان وایە كە هەوڵدان بۆ جیاكاریكردن لەنێوانیاندا كـارێكی بێئەنجامـە. زۆرێكـیش لـە زانایـان رایـان وایـە كـە "پارێزبەنـدی"، نێـراوی

(١) وەگیراوە لە: م.ن، ص٤١٩.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٤٢١-٤٢٢.

دبلۆماسـیی و بارەگاكـەی لــە دەسـەڵاتی دادوەریـی وڵاتـی پێشـوازیكەر دەپارێزێت، بەڵام "جیاوكەكان" بریتین لە كۆمەڵە تایبەتمەندییەك كە لەسەر بنەمای موجامەلەو نەریت دەبەخشرێن، كەزۆركات لایەنی دارایـی و ئـابووری دەگرێتەوە، ئەویش لەلایەكەوە بۆ ئاسانكاریی كـاری دبلۆماسـی و لەلایـەكی ترەوە بۆ پاراستنی سەروەریی وڵاتی بەرانبەر دەبەخشرێن.

بەپێی ئەم بۆچوونە رێساكانی یاسای گشتیی نێودەوڵـەتیی پارێزبەنـدیی دبلۆماسیی دەپارێزن، واتە پێشـێلكردنی ئـەو پارێزبەندییـە بەرپرسـیارێتیی نێودەوڵەتیی بەدوای خۆیدا دێنێت، تەنانەت ئەگـەر لـە رێگـەی "مامەڵـە بـە هاوشێوە"شەوە بێت، بـەڵام جیاوكـە دبلۆماسـییەكان، لەبەرئـەوەی لەسـەر بنـەمای موجامەلـە دانـراون، هـیچ پابەندییـەك نییـە بـۆ بەخشـینیان و هـیچ لێپێچـینەوەو بەرپرسـیارێتییەكیش لــە نەبەخشـینیان ناكەوێتـەوە، مەگـەر بە"مامەڵە بە هاوشێوە"[(١)].

هەندێكی تر بڕوایان وایە، كە جیاوكەكان فراوانترن لـە پارێزبەندییـەكان، بەڵكو پارێزبەندییەكانیش جۆرێكن لە جیاوكی دبلۆماسی.

ئەمە لەكاتێكدا كە هەندێكی تر لە شارەزایان پێكەوە پۆلێنیان كـردوون، بەڵام لە دوو ئاستی جیاوازدا، واتـە: پارێزیەنـدی و جیاوكـە بنچـینەییەكان و پارێزبەندی و جیاوكە نابنچینەییەكان، بنچـینەییەكان ئەوانـەن كـە حـوكمی یاسایان وەرگرتووەو پێویستە دەوڵـەتان و یەكەنێودەوڵەتییـەكان پێیانـەوە پابەند بن و پێشێلكردنیشـیان، بـە پێشـێلكردنی رێسـاكانی یاسـای گشـتیی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. رحاب شادیة، الحصانة الدبلوماسیة للمبعوث الدبلوماسي وتأثیرها علی حقوق الإنسان، مجلة جیل حقوق الإنسان، مركز جیل البحث العلمي، لبنان- طرابلس، العدد ١ شباط/٢٠١٣، ص ص١٧-١٩.

نێودەوڵـەتیی هـەژماردەکرێت، بەرپرسـیارێتیی نێودەوڵـەتی بـەدوای خۆیـدا دەهێنێت (وەك: ڕێزی کەسیی دبلۆمـات و باڵوێزخانـە، ملکەچـنەبوونیان بـۆ دادگای هەرێمی)، بەڵام پارێزیەندی و جیاوکە نابنچینەییەکان ئەوانەن کە لە چوارچـێوەی موجامەلـەدا خۆیـان دەبیننـەوەو دەوڵـەتان بـۆ بـەهێزکردنی پەیوەندییەکانیان لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕکردن ڕەچاوی دەکەن بەبێ ئەوەی لەرووی یاسـاییەوە پابەنـدکرابن (وەك: بەخشـین لـە هەنـدێك بـاج و ڕەسمـە گومرگییــەکان)، خــۆ ئەگــەر پێڕەویشــی نەکــەن ئــەوا تاکــە ڕێگــە بــۆ وەڵامدانەوەی جێبەجێکردنی "بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە"یە[1].

پارێزبەندی و مافە دبلۆماسییەکان لـە گـرنگترین ڕێسـاکانی دبلۆماسـین، پێشــتر ئــەو مــاف و پارێزبەندییانــەو جێبــەجێکردن و بەخشــینیان لــە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر جیاواز بوون، ئاستەکەی بەسترابوو بە جۆری پەیوەندیی نێوان دەوڵەتانەوە، بەڵام ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییـە دبلۆماســــییەکانی ســــاڵی (١٩٦١) ڕێســــاکانی پارێزبەنــــدی و مافــــە دبلۆماسـییەکانی بـەوردی دیـاریکرد، ئەمــەش بـواری بـۆ نـاکۆکیی نێـوان دەوڵەتان لەسەر جێبەجێکردنیان کەمکردەوە.

هەرچەندە ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١) جیاکارییەکی وردی بۆ جیـاوك و پارێزبەندییـەکان نـەکردووە، بـەڵام گـەر وردببینـەوە لـە مـاددە و بڕگـەکانی دەبیـنین چارەسـەرێکی ناوەنـدی دۆزیوەتـەوە، ویسـتوویەتی بـە شێوازێکی نەرم ئەو جیاکارییە بکات، بۆیە جەختی کردووەتەوە لـەوەی کـە پارێزبەندی بنچینەی یاسـایی خـۆی لـە یاسـای نێودەوڵەتیـدا دەبینێتـەوە،

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٢٩.

لەکاتێکدا کە جیاوکەکان بەشێکیان بەپێی یاسای نێودەوڵەتی دەبەخشرێن، وەك: بەخشین لە باجەکان، بەشەکەی تریشیان جۆرێکن لە ئاسانکاری، کە یاسای نێودەوڵەتی دەوڵەتی پێشوازیکەریان پێوە پابەند ناکات، بەڵکو بە ئەحکامی خۆویستی و ئیختیاری (ئارەزوومەندانە) باسیان دەکات، پابەند بوون و دیاریکردنی سنوور و شێوازەکەیان بۆ یاسای نێوخۆییەکانی دەوڵەتی میواندار جێدەهێلێت، نموونەی ئەمەش هەردوو ماددەی (٣٤) و (٣٦)ی رێککەوتننامەکەن[١]، باسی ئەو باج و رەسمە گومرگی و تەکلیفانە دەکەن، کە دەکەونە سەر دبلۆمات لە وڵاتی پێشوازیکەر، هەروەها ئەوانەشی کە لێیان دەبەخشرێن، کە دواتر باسیان دەکەین.

لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ئەم دوو زاراوەیە بەتەواوی یەکلانەکراونەتەوە، تەنانەت لە رێککەوتننامەکانی ڤیەنناش بەڕوونی جیاکارییان نەکراوە، بۆیە زۆرجار وەك هاوواتای یەك بەکارهاتوون. بەوردبوونەوە بۆمان رووندەبێتەوە، کە پارێزبەندی زیاتر لایەنە دادوەرییەکان دەگرێتەوە، کە پابەندبوون پێیانەوە ئەرکێکی یاساییە، بەڵام هەندێك لە جیاوکەکان بەشێکیان بە یاسای نێودەوڵەتی دیاریکراون، بەشەکەی تریشی نەرمییەکی زۆریان تێدا بەدیدەکرێت، چوارچێوەیەکی گشتییان هەیە و شێوزای جێبەجێکردن و پابەندبوون پێیانەوە جێهێڵراوە بۆ رێساکانی موجامەلەو ئاستی پەیوەندیی ئەو دوو لایەنەو بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە، کە هەریەکێك لەمانەش کارگەریی لەسەر ئەوانی دی دروستدەکات.

---

(١) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، م.س.ذ، ص٦٧.

جیاوك و پارێزبەندییەكان چەند پۆلێنێكیان بۆ كراوە، هەندێك لە پسپۆڕان جیاوك و پارێزبەندیی بارەگای نێراوە دبلۆماسییەكان بە جیا لە جیاوك و پارێزبەندیی دبلۆماتكاران پۆلێنكردووە، هەندێكی تریان پێكەوە باسیان كردووە، بەڵام جیاوكەكانیان جیاكردووەتەوە لە پارێزبەندییەكان.

## – مەبەست لە "بارەگای نێراوی دبلۆماسیی" چییە؟

ڕێككەوتننامەی ڤیەننا (١٩٦١) بەم شێوەیە پێناسەی كردووە: "مەبەست لە بارەگای نێراوی دبلۆماسیی ئەو بینایانە (باڵەخانانە)، یان ئەو بەشە بینا و زەوییانەیە، كە سەر بە نێراوەكەن و بەكاردەهێنرێن بۆ مەبەستی نێراوەكە، بەبێ ڕەچاوكردنی خاوەندارێتییەكەی، بە خانووی سەرۆكی نێراوە دبلۆماسییەكەشەوە"[١].

هەر لەو ڕێككەوتننامەیەدا هاتووە: "ئەو خانووەتایبەتەی، كە سەرۆكی نێراوی دبلۆماسیی تێیدا نیشتەجێیە، هەمان ئەو پارێزبەندی و پارێزگارییەی هەیە، كە بارەگای نێراوە دبلۆماسییەكە هەیەتی"[٢].

لەمەڕ بارەگای نێراوی دبلۆماسیی پێویستە چەند ڕێسایەك ڕەچاوبكرێت[٣]:

١. دەكرێت نێراوی دبلۆماسیی یەك بارەگا، یان زیاتری هەبێت كە پاشكۆی بن، بە مەرجێك بۆ كاری دبلۆماسیی تەرخان كرابن، كەواتە باخچەو

---

(١) ماددەی (١/گ)ی (ڕێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەكان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) ماددەی (١/٣٠)ی هەمان ڕێككەوتننامە.

(٣) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، م.س.ذ، ص ص٧٠-٧١.

گـەراجی ئوتـومبێلیش بەشـێکی دانـەبڕاون لـە بارەگاکـە و پارێزگـاری و پارێزبەندییەکانیش دەیانگرنەوە.

٢. دەوڵەتی نێرەر، بەبێ ڕێگەدانی پێشوەختی دەوڵەتی پێشـوازیکەر، بۆی نییە نوسینگە، وەك بەشـێك لـە نێـراوە دبلۆماسـییەکەی لـە شـوێنێکی غەیری ئەو شوێنەی بارەگای نێراوەکەی لێیە، بکاتەوە"[١].

٣. بارەگای نێـراوی دبلۆماسـیی و مـاڵی سـەرۆکی نێـراوی دبلۆماسـیی پارێزبەندی و پارێزگارییان هەیە، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایـا بـەکرێ گـیراون، یان خاوەندرێتییەکەی هی دەوڵەتی نێرەرە.

٤. هەمیشـە بارەگـای نێـراوە دبلۆماسـییەکان لـە پایتـەختی دەوڵـەتی پێشـوازیکەردا دەبـن، کـە بەگشـتی پایتـەخی سیاسـی دیاریـدەکرێت بـۆ ئـەو مەبەستە، چونکە هەندێك دەوڵەت پایتەختی کارگێڕییـان جیـاوازە لـەو شـوێنە، کـە دیاریدەکـەن، بـۆ شـوێنی بارەگـای نێـراوە دبلۆماسـییەکان، بـۆ نموونـە: دەوڵەتی سعودیە شاری (جیددە)ی تەرخانکردووە بۆئەوەی کە بارەگای نێـراوە دبلۆماسییەکانی تێدا بن، لەکاتێکدا (ریاز) بە پایتەختی ئەو دەوڵەتە ناسراوە.

٥. بەگشـتی دەوڵـەتان هەوڵـدەدەن شـوێنێکی گونجـاو و پـارێزراو بـۆ کۆکردنەوەی باڵوێزخانەو بارەگا دبلۆماسییەکان تەرخانبکەن، چونکە بەمـە زۆر کاری پارێزگاری و چاودێریکردنیان بۆ ئاساندەکات.

زۆرن ئەو پێشێلکاری و هێرشـانە بەرانبـەر بارەگـای نێـراوە دبلۆماسـییەکان ئەنجامدراون، لەوانـە هێـرش بـوو بـۆ سـەر باڵوێزخانـەی سـعوودیە لـە تـاران لـە (٢٠١٦/١/٢) و سووتاندیان و شتەکانی ناویان برد و ئاڵای سـعوودییەیان هێنایـە

(١) ماددەی (١٣)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

خوارەوە، لە هەمان کاتدا لە (مەشهەد) کونسوڵخانەی سعوودیە هێرشی کرایە سەر و سووتێنرا و تاڵانکرا. ئەمانەش لە بەرانبەر لە سێدارەدانی کەسی دیار و ئۆپۆزسیۆنی شیعەمەزهەبی سعوودی (نەمر ئەلنەمر) لەنێو (٤٧) کەسی تر بەپێی بڕیاری دادگایەکی سعوودی ئەنجامدران. لە بەرانبەردا سعوودیە پەیوەندییەکانی لەگەڵ (ئێران)دا پچڕاند و ماوەی (٤٨) کاژێری بۆ دبلۆماتکارانی ئێرانی دانا، کە خاکی وڵاتەکەی جێبهێڵن، ئەمە وێڕای راگرتنی گەشتە ئاسمانییەکان و کۆتاییهێنان بە پەیوەندیی بازرگانی و رێگەنەدان بە هاووڵاتیانی خۆی بۆ گەشتکردن بۆ (ئێران). بە دوای ئەویشدا (بەحرەین و سودان و سۆماڵ و جیبۆتی و جوزورولقەمەر) پەیوەندییان لەگەڵ (ئێران) پچڕاند، و (ئیماراتی عەرەبیی یەکگرتوو)ش ئاستی نوێنەرایەتیی خۆی بۆ هەڵسورێنەری کاروبارەکان دابەزاند و (ئوردن و قەتەر)یش بانگهێشتی باڵوێزی ئێرانیان لای خۆیان کرد و نیگەرانیی خۆیان لەو کارەنە دەربڕی. ئەمە وێڕای ئیدانەی نەتەوەیەکگرتووەکان و کۆمکاری عەرەبی و چەندین وڵات و لایەن و رێکخراوی تر[١].

پێش ئەوەی بچینە ناو وردەکاریی جیاوك و پارێزبەندییەکانەوە، پێویستە بزانین بنچینەی یاسایی ئەو جیاوك و پارێزبەندییانە چییە، کە بە دبلۆماتکاران و بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکان دەبەخشرێن.

---

(١) بڕوانە: السعودية توقف التبادل التجاري والرحلات الجوية مع إيران، تأريخ الزيارة (٢٠١٧/١/١٧) على الرابط التالي:

http://www.bbc.com/arabic/middleeast/2016/01/160104_saudi_extends_ties_breaching_iran

و: السعودية تمهل الدبلوماسيين الإيرانيين ٤٨ ساعة لمغادرة أراضيها، على الرابط التالي:

http://www.bbc.com/arabic/middleeast/2016/01/160104_washington_saudi_iran_calm_tensions

## باسی دووەم: بنچینەی یاسایی پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکان

بێگومان پێویستە کاتێك پارێزبەندی و جیاوك بە دبلۆماتکاران دەدرێت، بنچینەیەکی یاسایی هەبێت کە پاڵپشتیان بکات، چونکە هەردەوڵەتێك مومارەسەی دەسەڵاتی خۆی لەسەر خاکەکەی بە یەکێك لە گرنگترین پایەکانی مومارەسەی سەروەری دادەنێت، خۆ ئەگەر دەوڵەت نەتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر چەند کەسێکدا، یان بەسەر بەشێك لە خاکەکەیدا، جێبەجێ بکات، ئەوا واتای ئەوە دەگەیەنێت کە سەروەریی ئەو دەوڵەتە ناتەواوە. بۆ رێکخستنی ئەم حاڵەتە لەرووی یاساییەوە پێویستمان بە چارەسەر هەیە. بە شێوازێکی تر دەتوانین بڵێین: لەبەرئەوەی کە یاسای نێودەوڵەتی بڕیاری لە پرەنسیپی جیاوك و پارێزبەندیی باڵوێزخانە و کەسی دبلۆمات داوە، زانایان هەوڵێکی زۆریان داوە، پاساوێك یان گونجانێك بۆ چارەسەرکردنی دژیەکیی نێوان دوو شت بدۆزنەوە: یەکەمیان بریتییە لە سەروەریی دەوڵەت لە سەپاندنی دەسەڵاتی دادگاکانی، بەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە لە هەرێمەکەیدا دەمێننەوە، دووەمیان بریتییە لە پرەنسیپی پارێزبەندیی دادوەریی کە بۆ دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەت بە ڕێزپەڕێك دادەنرێت [(١)].

لێرەوە چەند تیۆرێك دارێژراون بۆ لێکدانەوەی بنچینەی پارێزبەندیی دادوەریی کەسی دبلۆمات، لەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات، دیارترینیشان ئەمانەن[(٢)]:

---

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٧٠.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم تیۆرانە بڕوانە: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص ص٢٠٨-٢١٣. و: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٧٠-١٧٧. و: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١١١-١١٦. د. علي حسين الشامي، م.س. ذ، ص ص٤٤٢-٤٧٨. و: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٠٣-١٠٥.

### ١.  تیۆری درێژبوونەوەی هەرێم، یان تێپەڕاندنی هەرێمی (نظرية امتداد الإقليم أو التجاوز الإقليمي):

ئەم تیۆرە لەسەر گریمانەکردنی نەبوونی کەسی دبلۆمات، لە دەوڵەتی میواندار بونیادنراوە، یان لەسەر بنچینەی درێژبوونەوەی هەرێم (امتداد الإقليم)، واتە دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات بەسەر ئەو کەسانەشدا دەچەسپێت کە لە دەرەوەی سنوورەکەیدان، لەوانەش دبلۆمات. لێرەشەوە نێراوی دبلۆماسی ملکەچی دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتەکەی دەبێت، نەك ئەو دەوڵەتەی کە بۆی نێراوەو کاری تێدادەکات.

بیرۆکەی ئەم تیۆرەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی، کە نێراوی دبلۆماسیی (البعثة الدبلوماسية)، بە بەشێك لە خاکی ئەو دەوڵەتە دەژمێرێت کە دەینێرێت و ملکەچی سەروەرییەکەشییەتی، دبلۆماتکارەکانیشی بە شێوەیەك کاردەکەن، وەك ئەوەی کە لە خاکی دەوڵەتی خۆیاندا بن و ملکەچی یاسا و دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتەکەی خۆیانن، هەروەها وەك ئەوەی کە ئەو بارەگایەی کە کردوویانە بە نووسینگەی خۆیان لەنێو خاکی دەوڵەتی خۆیاندایە، کە وەك درێژکراوەی یاسایی خاکی نیشتمانیان وایە، گواستنەوەی کردارەکییان کار لەو حاڵەتە ناکات. بۆیە دەستدرێژیکردنە سەر دبلۆماتکاران و نووسینگەکەیان وەك دەستدرێژیکردنە بۆ سەر سەروەریی دەوڵەتەکەیان و پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتییە. کەواتە دەوڵەتی میواندار سازش لە بەشێك لە سەروەرییەکەی دەکات، بەڵام ئەو سازشە خۆویستانە و یەکجارییە، واتە بە ویستی خۆیەتی بەڵام ناتوانێت ئەوەی بەدەستی ڕاست دەیدات، بەدەستی چەپی بیکێشێتەوە.

بنەڕەتی ئەم تیۆرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرۆکە دەستورییە کۆنەی، کە دەڵێت (سەروەریی دەوڵەت رەهایە و نابێت ملکەچی هیچ سانسۆرێکی دەرەکی بێت).

## رەخنەو هەڵسەنگاندن:

أ. لەسەر گریمانەیەکی خەیاڵی وەستاوە.

ب. لەرووی کردارییەوە شیاوی جێبەجێکردن نییەو ناتوانێت لێکدانەوە بۆ ئەو حاڵەتانە بکات، کە کەسی دبلۆمات تێیدا ملکەچی دادگاکانی ئەو دەوڵەتە دەبن، کە بۆی نێراوە، وەك: ئەو داوا عەینییانە(١)ی کە

---

(١) مافی عەینیی (الحق العيني) بریتییە لەو دەسەڵاتەی, کە یاسا دەیدات بە کەسێکێکی دیاریکراو بەسەر شتێکی دیاریکراوەوە، بەوپێیەش ئەو کەسە دەتوانێت سوودە ئابوورییەکانی ئەو شتە بۆ خۆی بەکاربهێنێت. بەڵام مافی کەسیی (الحق الشخصي) بریتییە لە رایەڵەیەکی یاسایی لەنێوان دوو کەسدا، قەرزدەر و قەرزدارێك، قەرزدەرەکە بەپێی ئەو ڕایەڵەیە رێگە بە قەرزدارەکە دەدات, کە داوای پێدانی شتێك، یان ئەنجامدانی کارێك، یان هەڵنەستان بە ئەنجامدانی ئەو کارە بکات. مافی عەینی دوو جۆری هەیە: یەکەم: مافی عەینیی بنەڕەتیی (أصلي)، کە بریتییە لەو مافەی کە خودی خۆی بوونی هەیە و لە بوونیدا پشت بە مافێکی تر نابەستێت، وەك: مافی خاوەندارێتی و ئەو مافانەی کە لە خاوەندارێتی دەکەونەوە. پێنج مافی عەینیی بنەڕەتی لە مافی خاوەندارێتی دەکەونەوە, کە بریتین لە: (مافی سوودوەرگرتن/حق الانتفاع، مافی بەکارهێنان/حق الاستعمال، مافی نیشتەجێبوون/ حق السكنى، مافی ئیرتیفاق/ حق الارتفاق، مافی قۆرخکردن/حق الحكر). دووەم: مافی عەینیی شوێنکەوتە (تبعي): ئەو مافانەن, کە لە خودی خۆیاندا بە سەربەخۆیی بوونیان نییە، بەڵکو لە بوونیاندا پشت بە مافێکی تر دەبەستن، مەبەستیش لێی زامنکردنی وەفاکردنە بەو مافەوە. واتە: بوونی ئەم مافە بۆ زامنکردنی وەفاکردنە بە مافێکی کەسییەوە، کە شوێنکەوتەی ئەو مافەیە، لە بنەڕەتدا هەموو سامانی قەرزدار، بەبێ دیاریکردن، بە زامنکەری وەفاکردن بەو مافەوە دادەنرێت، واتە دڵنیایی (تأمينات)ی عەینییە. نموونەی ئەم مافە: مافی بارمتە (ڕەهن)ی فەرمی، مافی ئیختیساس (حق الاختصاص)، مافی بارمتەی حیازی (حق الرهن الحيازي)، مافی ئیمتیاز (حق

پەیوەندییان بە خانووبەرەوە هەیە، ئەو داوایانەی کە پەیوەستن بە میراتەوە و ئەو کارە بازرگانییەی کە دبلۆمات بۆ بەرژەوەندیی خۆی پێی هەڵدەستێت.

ج. جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە سەردەکێشێت بۆ درێژبوونەوەی دەسەڵاتی دادگاکانی دەوڵەتی نێرەری دبلۆمات بۆئەوەی ئەو تاوانانەش بگرێتەوە، کە لەناو بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکەدا لەلایەن کەسانێکەوە ئەنجامدەدرێن، کە پارێزبەندیی دادوەرییان نییە، ئەمە لەکاتێکدا کە فیقهو مامەڵەی نێودەوڵەتییش بڕیاری ئەوەیان داوە، کە دەسەڵاتی دادوەری لەو حاڵەتانەدا بۆ دەوڵەتی میواندار دەبێت، بەوپێیەی کە بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکان و پاشکۆکانیان بەشێکی دانەبڕاون، لە هەرێمی ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکەن، ئەمەش وا دەکات کە دەسەڵاتی دادگاکانی تاوانی ئەو کەسانە بگرێتەوە، کە لەناو باڵوێزخانەکاندا تاوان ئەنجامدەدەن، پارێزبەندیی دادوەرییشیان نییە، لێرەدا سەرۆکی باڵوێزخانەکە دەتوانێت داوا لە دەسەڵاتی ناوخۆیی ئەو دەوڵەتە بکات کە ڕێوشوێنی بەدواداچوونی یاسایی بگرنەبەر، بۆ ئەو ڕووداوانەی کە لەناو باڵوێزخانەدا ڕوودەدەن.

د. ئەم تیۆرە ناتوانێت تەفسیری زۆر حاڵەت بکات، بۆ نموونە: سازشکردنی دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات لەو پارێزبەندییە دادوەرییەی کە هەیەتی، بەپێی ئەم تیۆرە واتای سازشکردن دەگەیەنێت لە سەروەرییەکەی، یان واتای دەستێوەردانی دەوڵەتی میواندار دەگەیەنێت، لە

---

الإمتياز). بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عبدالرزاق أحمد السنهوري، الوسيط في شرح القانون المدني، الجزء الثامن عشر؛ حق الملكية: م.س.ذ، ص ص١٨٢-٢٢٣.

کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات لە ڕێگەی دادگاییکردنی ئەو نێراوە دبلۆماسییانەوەی، کە ئەو دەوڵەتە سازشی لە پارێزبەندیی دادوەرییان کردووە.

٥. جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە کێشەی لێدەکەوێتەوە، بۆ نموونە: سیستمی یاسایی دەوڵەتان جۆراوجۆرە، دەگونجێت کاتێك کەسی دبلۆمات بەپێی یاسای دەوڵەتەکەی هەڵسوکەوتێکی یاسایی دەکات، هەڵسوکەوتەکەی پێچەوانەی یاسای ئەو دەوڵەتە بێت کە کاری تێدادەکات، بە شێوەیەك کە ئەو دەوڵەتە نەتوانێت ڕێگری لێ بکات، لەبەر ئەوەی بەپێی یاسای دەوڵەتەکەی ئەو کارە دروستە.

لە ئێستادا زۆرینەی دەوڵەتان وازیان لەم تیۆرە هێناوە، زۆرێك لە دادگاکانیش کاری پێ ناکەن و بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکانیان بە بەشێکی دانەبڕاو لە هەرێمی دەوڵەتی میواندار داناوە، و هەرشتێکیش لەنێو بارەگای ئەو نێراوە دبلۆماسییانەدا ڕووبدات، ملکەچی یاساو دادگاکانی دەوڵەتی میواندار دەبێت.

### ٢. تیۆری سیفەتی نمایندەکاری (نظرية الصفة التمثيلية):

بەهۆی کەموکورتییەکانی تیۆری نەبوونی هەرێمی، هەندێك لە نووسەران ئەم تیۆرەیان داناو ناویان نا تیۆری سیفەتی نمایندەکاریی. بەپێی ئەم تیۆرە دەوڵەت و سەرۆکەکەی لەبەرانبەر دادگا بیانییەکاندا پارێزبەندیی دبلۆماسییان هەیە، لەبەرئەوەی دبلۆماتیش بە نوێنەری دەوڵەتەکەی و سەرۆکەکەی هەژماردەکرێت، ئەوا پارێزبەندییە دبلۆماسییەکەشی لەوانەوە

وەردەگرێت. لە واقیعدا بەخشین لە دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتانی میواندار بریتییە لە بەخشینی دەوڵەتەکەو سەرۆکەکەی بەپێی یاسای نێودەوڵەتی.

لەسەر ئەم بنەمایە هەر کردارو هەڵسوکەوتێك لە کەسی دبلۆماتەوە دەربچێت، بەو سیفەتە دەردەچێت کە نمایندەی دەوڵەتەکەی و سەرۆکەکەیەتی، نەك بە سیفەتی کەسی، پاشان ئەو پارێزبەندییەی کە سەرۆك هەیەتی بۆی دەگوێزرێتەوە، واتە پێویستە هەمان رێزو حورمەت لەو کەسە بگیرێت، کە سەرۆك دەینێرێت.

ئەم تیۆرە، لە سەدەی هەژدە لە چاخی پادشایەتیدا لە ئەورووپا، سەری هەڵدا، کاتێك پادشاکان بە سیفەتی فەرمی، یان نا فەرمی سەفەریان لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر بکردایە. بە مەبەستی هاندانی ئەو جۆرە سەردانانەو زیادکردنی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان، کاری نێودەوڵەتی لەسەر ئەوە رۆیشتووە، کە وەك رێزلێنانێك پارێزبەندیی دادوەریی بە پادشاکان ببەخشرێت.

## رەخنەو هەڵسەنگاندن:

أ. ئەم تیۆرە رەخنەی ئەوەی لێدەگیرێت، کە نوێنەری دبلۆماسیی ئەو پێگە یاساییەی نییە، کە سەرۆکی دەوڵەت هەیەتی، بەپێی دەستووری هەندێك دەوڵەت، سەرۆك دوورە لە هەموو هەڵەیەك و نابێت لەسەر ئەو کارانەی، کە دەیکات لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێت.

ب. ئەم ئاراستەیە سەردەکێشێت بۆ بەرتەسکبوونەوەی ئەو پارێزبەندییە دبلۆماسییەی، کە نوێنەری دبلۆماسیی هەیەتی، چونکە سەرۆکی دەوڵەت هەموو ئەو پارێزبەندییە دادوەرییانەی نییە، کە نوێنەری دبلۆماسیی هەیەتی،

چونکە ئەو پارێزبەندییەی کە نوێنـەری دبلۆماسـیی هەیـەتی گرنگییـان کـەمترە لەوانەی کە سەرۆك هەیـەتی، چـونکە ئـەو پارێزبەندییـەی نوێنـەری دبلۆماسـیی هەیەتی بە تەواوبوونی کارەکـەی و گەڕانـەوەی بـۆ دەوڵەتەکـەی کۆتـایی دێـت، بەڵام ئەو پارێزبەندییەی سەرۆکی دەوڵەتی بیانی هەیـەتی، تـا کۆتـایی تەمـەنی لە کارە وەزیفییەکەیدا بەردەوام دەبێت.

ج. جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە، پارێزبەندیی دادوەریی دەدات بـەو کـارە فەرمییانـەی، کـە نێـراوی دبلۆماسـی ئـەنجامی دەدات، بـەڵام بنچـینەی پارێزبەندیی دادوەریی بۆ کارە تایبەتەکانی ڕووننەکاتەوە.

د. ئـەم تیـۆرە ناکرێـت جێبـەجێ بکرێـت، چـونکە چـەند بڕیارێـك لەسـەر بنەمای بەراوردکردن (قیاس) بونیاددەنێت، ئەمە لەکاتێکدا کـە جیاوازیگـەلێکی بنـەڕەتی هەیـە لـەنێوان سـەرۆکی دەوڵـەت و نوێنـەری دبلۆماسـیدا لـەرووی وەزیفـەو سـیفەت و جیاوکەکانـەوە، جـا لەسـەر ئاسـتی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکان بێت، یان لەسەر ئاستی ناوخۆیی، بۆیـە ئـەم تیـۆرە ناتوانێـت لێکدانەوەی دروست بۆ پارێزبەندی و جیاوکەکانی نوێنەری دبلۆماسی بکات.

### ٣. تیۆری پێویستیی وەزیفی (نظرية الضرورة الوظيفية):

بەپێی تیۆری پێویستی، یـان بەرژەوەنـدیی وەزیفـی بنچـینەی بیرۆکـەی پارێزبەندیی دادوەری بریتییە لە گرێنتیکردنی ئەدائی دبلۆماتکـاران بـۆ ئـەو ئەرکەی کە پێیان سپێراوە. واتە بۆئەوەی دبلۆماتکاران بتوانن بەشێوەیەکی دروسـت مومارەسـەی کـاری خۆیـان بکـەن، بـە ئامـانجی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکان، پێویسـتە دبلۆماتکـاران سـەربەخۆیی تـەواویان هـەبێت و ملکەچی دەسەڵاتی دادوەریی نیشتمانیی ئەو دەوڵەتە نەبن، کە بۆی نێـراون و کاری تێدادەکەن.

لەگـەڵ ئـەوەی رێسـاو رێککەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکان لنیکـەمی ئـەو پارێزبەندییانە دیاریدەکەن کە پێویستن بۆئـەوەی دبلۆمـات بتوانێـت ئەرکـە وەزیفییـەکانی خـۆی بـە ئـازادیی تـەواوەوە ئەنجامبـدات، نـەك بەخشـینی پارێزبەندیی زیاتر لەو سنوورە، بەڵام دەرگاش والایە لـە بـەردەم دەوڵەتانـدا بۆ بەخشینی پارێزبەندیی زیاتر بەپێی یاسا ناوخۆییەکانی خۆی، واتە ئەگەر ئەو کارەی کرد، ئەوا وەکو موجامەلەی نێودەوڵـەتی و میوانـداری ئـەنجامی دەدات.

ئەم تیۆرە جۆرێك لە هاوسەنگی راگرتووە لـەنێوان پێویسـتیی دەوڵـەتی نێـرەر و مـاف دەوڵـەتی پێشـوازیکەردا، بۆیـە شـارەزایانی بـواری یاسـای نێودەوڵەتی پێشوازییان لێکـرد و سروشـتی پـەیوەندییـە دبلۆماسـییەکانیش زیاتر ئەم تیۆرەی سەپاند، چونکە لە ئێسـتادا پـەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان بەم تایبەتمەندییانە جیادەکرێتەوە[١]:

– زیادبوونی قەبارەی نێراوە دبلۆماسییەکان.

– زیـــادبوونێکی نائاســـایی ژمـــارەی فەرمانبـــەرانی پاشـــکۆی باڵوێزخانەکان (وەك: پاشکۆی سەربازی و بازرگارنی و راگەیاندن و...هتـد)، کە کارێك دەکەن، سروشتی دبلۆماسییان نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا جیـاوك و پارێزبەندییەکانیان و سیفەتی دبلۆماسییشیان هەیە.

– زیادبوونی خێرای ژمارەی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، کە پێویستە جیاوك و پارێزبەندییان پێببەخشرێت لەسەر بنەمای پێویستیی وەزیفی.

(١) بڕوانە: المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، م.س.ذ، ص ص٦٨-٦٩.

## هەڵسەنگاندن:

### خاڵی بەهێز:

أ. زۆرێك لە نووسەران پشتگیریی ئەم تیۆرە دەکەن، لەسەر ئاستی زانایان و دادوەرییش هەر ئەم تیۆرە باوە، هەروەها لەرووی جێبەجێکردنەوە ئاسانترینی تیۆرەکانە و زیاتر لە تیۆرەکانی تر لەگەڵ واقیع و لۆژیکدا دەگونجێت و ئەو کێشانەی چارەسەر،کرد کە تیۆرەکانی پێشوو هەیانبوو و نەیاندەتوانی راڤەی دروستی بۆ بکەن. هەروەها ئەم تیۆرە زیاتر لەگەڵ ئاراستە نوێیەکاندا دەگونجێت.

ب. بە بڕوای لایەنگرای ئەم تیۆرە، تیۆرەکە گرێنتیی پارێزبەندییە دادوەرییەکانی دبلۆماتەکان و فەرمانبەرانی رێکخراوە نێودەولەتییەکانیش دەکات، چونکە ناکرێت لەسەر بنەمای درێژبوونەوەی هەرێمی پارێزبەندیی دادوەریی بە فەرمانبەرانی رێکخراوە نێودەولەتییەکان ببەخشرێت، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا رێکخراوە نێودەولەتییەکان هەر لە بنەڕەتدا هەرێمێکی تایبەت بە خۆیان نییە، هەروەك چۆن ناکرێت لەسەر بنچینەی سیفەتی نمایندەکاری ئەو پارێزبەندییەیان پێبدرێت، چونکە ئەو کارەی ئەنجامی دەدەن لەبری دەولەتێك ئەنجامی نادەن، بۆیە جگە لە پێویستیی وەزیفەو کارکردن نەبێت هیچ بەهانەیەك نییە بۆئەوەی پارێزبەندیی دادوەرییان هەبێت.

ج. ئەم تیۆرە سنوور بۆ پارێزبەندیی دادوەریی دادەنێت، بەلام بەو ئەندازەیەی کە لەگەڵ کاری دبلۆماسیدا دژ نەوەستێتەوە، واتە دبلۆمات لە هەموو ئەحکامەکانی یاسا ناوخۆییەکان نابەخشرێت، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی ملکەچیان دەبێت و تەنیا لە کاتی وەرگرتنی ئەو رێوشوێنە ئیداری و

دادوەرییانەدا دەوەستێنرێت، کە لـە بەرانبـەری ئەنجامـدەدرێن، لەبەرانبـەر دەسەڵاتە ناوخۆییەکاندا،لەبری ئەوە رێگەچارەی تر لە بەرانبەریدا دەگیرێتە بەر.

**خاڵی لاواز:**

أ. لەگەڵ راستێتیی بەڵگـەو بەهانـەکانی ئـەم تیـۆرە بـۆ پارێزبەنـدیی دبلۆمات لەو دەوڵەتەی، کە بۆ نێراوەو کاری تێدادەکات، دەبینین ئەم تیۆرە بەهانەی نییە بۆ ئەو پارێزبەندییـە دادوەرییـەی، کـە دبلۆمـات لـە دەوڵـەتی سـێیەمدا هەیـەتی، واتـە ئـەو دەوڵەتـەی کـە پێیـدا تێپـەڕ دەبێـت، چـونکە دبلۆمــات لــەو دەوڵەتــەدا کــارێکی دیــاریکراو ناکــات، لەگــەڵ ئەوەشــدا پارێزبەندیی دادوەریی هەیە لەو دەوڵەتەدا کاتێك پێیدا تێپەڕدەبێت.

دیارە وەڵامـی ئـەم رەخنەیـەش ئاسـانە، چـونکە دبلۆمـات تێپـەڕبوونی دبلۆمات بە وڵاتی سێیەمدا، یەکێکە لە پێویستییەکانی گەیشـتنی بـە وڵاتـی پێشوازیکەر و دەستبەکاربوونی، بەمەش ئەو تێپەڕبوونە دەبێتـە مـەرجێکی تەواوکـەری وەزیفەکـەی، بۆیـە دەکرێـت لەسـەر ئـەو بنەمایـە، لـە کـاتی تێپەڕبوونی بە وڵاتی سێیەمیشدا، جیاوك و پارێزبەندییەکانی پێببەخشرێت.

ب. ئـەو بنچـینەیەی ئـەم تیـۆرە پشـتی پـێ بەسـتووە لەگـەڵ چـەمکی پارێزبەندیی دادوەرییدا ناگونجێت، چونکە کاتێك دبلۆمات مومارەسەی کاری وەزیفیی خۆی دەکات، پێویستە بە ئاڕاسـتەی پتـەوکردنی پەیوەندییـەکانی دەوڵەتەکەی و ئەو دەوڵەتەی بۆی نێراوە کاربکات، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە هەموو کردەوەکانی بەتەواوی بەپێی ئەحکامی یاساکانی ئەو دەوڵەتە بن کـە کـاری تێـدادەکات. ئەگـەر ئـەو یاسایانەشـی پێشـێلکرد، ئـەوا سـنووری وەزیفیی خۆی بەزاندووە، بەمـەش لـە چوارچـێوەی پارێزبەنـدیی دادوەریـی

دەردەچێت بە پێچەوانەی ئەو واقیعەوەی، کە لە زۆربەی کاتەکاندا، لە سۆنگەیەوە پارێزبەندیی دادوەری بە دبلۆماتەکە دراوە.

ج. دەکرێت ئەو بنچینەیەی کە ئەم تیۆرە بونیادی ناوە لەگەڵ ناوو ناوبانگی کەسی دبلۆماتدا نەگونجێت، چونکە ئەم تیۆرە لەپای ئەو پێشێلکارییانەی کە دبلۆمات پێی هەڵدەستێت و بەشێك نین لە کارە دبلۆماسییەکەی نە تۆمەتباری دەکات، نە لێی دەگرێت، وەك ئەو پارێزبەندییە دبلۆماسییەی کە لەو کارە تایبەتییانەی هەیەتی کە پەیوەندییان بە کارە فەرمییەکەیەوە نییە، دەگونجێت پشتبەستن بەم تیۆرە پاڵنەرێك بێت بۆ دبلۆمات، کە هەستێت بە ئەنجامدانی چەند کارێکی مەترسیداری وەك سیخوڕی.

بەگشتی لە دیباجەی رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی ساڵی (١٩٦١)دا هاتووە: "... بەراستی ئەو جیاوك و پارێزبەندییانە بۆ سوودی تاکەکان نییە، بەڵکو بۆ گرێنتیکردنی ئەدائی کارای ئەرکەکانی نێراوە دبلۆماسییەکانە بەو وەسفەی کە نوێنەری دەوڵەتن".

لێرەوە روونەبێتەوە، کە رێککەوتننامەکە هەردوو تیۆری بەرژەوەندیی وەزیفی و سیفەتی نمایندەکاریی وەرگرتووە، مەبەستیش لەمە فراوانکردنی بازنەی ئەو پارێزبەندییە دبلۆماسییانەیە، کە دبلۆماتکار هەیەتی.

## باسی سێیەم: جیاوکە دبلۆماسییەکان (الإمتیازات الدبلوماسیة)

هەندێك جیاوکی دبلۆماسی هەیە پەیوەندییان بە رێزی کەسییەوە هەیەو هەندێکی تریان بریتین لە جیاوکە کەسییەکان، هەندێکی تریشیان جیاوکی دارایین، لێرەدا بە جیا باس لە هەریەکێکیان دەکەین.

### یەکەم: رێزی کەسی (الحرمة الشخصیة)

رێزی کەسی لە کۆنترین ئەو مافانەیە، کە کەسی دبلۆمات هەیەتی، هەموو مافەکانی تریش هەر لەم مافە بوونەتەوە.

رێزی کەسیی لە یاسای دبلۆماسی و جێبەجێکردنی کرداریشدا ئەوەیە، کە کەسێتیی دبلۆمات پارێزراوە و نابێت سووکایەتیی پێ بکرێت، بەڵکو پێویستە بەشێوەیەکی شیاو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، واتە بە نەرمی و جوانی و بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی و دوور لە دیاردەکانی هەڵچوون و بێزارکردن بێت و هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی بدرێت کە دێنە رێی، لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی گشتیدا، بۆیە دروست نییە بە هەر هۆکارێك بێت دەستگیربکرێت[1].

لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی دبلۆماتیش بۆ یاساکانی ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات، پێویستە ئەو دەوڵەتە باڵوێزخانەکەی دبلۆماتەکەی لێ ئاگاداربکاتەوە، چونکە دروست نییە ئازادیی سنووردار بکرێت، یاخود خۆی دەستبەسەر بکرێت، یان رێگە لە بەجێگەیاندنی کارەکەی بگیرێت، بەڵکو پێویستە ئەو دەوڵەتە هەموو رێوشوێنێکی گونجاو بگرێتەبەر بۆ پاراستنی لە

(١) ماددەی (٢٩)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

هەردەستدرێژییەك، كە لەلایەن دەسەڵاتە ناوخۆییەكانەوە، یان لەلایەن هاوڵاتییانەوە، یاخود هاوڵاتیانی وڵاتەكەی خۆیەوە، یان هەر لایەنێكی ترەوە دووچاری بێت، هەروەها پێویستە سامانە تایبەتەكانیشی پارێزراو بن و دووچاری دەستدرێژی، یان دەستبەسەراگرتن نەبنەوە لەلایەن دەسەڵات، یان هاووڵاتییانەوە.

پێویستە ئەو دەوڵەتە سەلامەتیی نامەو پۆستەناردنی كەسی دبلۆمات و ئەوراقە تایبەتەكانی بگرێتەئەستۆ و سەیریان نەكات، ملكەچی سانسۆری نێوخۆییان نەكات، ئەمە وێڕای ئەو ڕۆژنامەو پۆستانەی كە دبلۆمات لە ناوخۆ، یان دەرەوەی دەوڵەتەوە بۆی دێن.

هەروەها پێویستە شوێنی تایبەتی (خانوو) نیشتەجێبوون هەمیشەیی و كاتیی كەسی دبلۆمات و بارەگای كاری فەرمیشی پارێزراو بێت، نابێت بەبێ ڕەزامەندیی ڕاشكاوانە هیچ كەسێك بچێتە ژوورەوە بە هەر هۆكارێك بێت، تەنانەت ئەگەر بڕیارێكی دادوەریش دەرچووبێت، كە بڕیاربدات بەوەی كە لایەنە تایبەتمەندەكان، یان دادگا خۆی ئەو خانووە بپشكنێت، كە نێراوە دبلۆماسییەكەی تێدا نیشتەجێیە، یان بارەگای كاری فەرمیی دبلۆماتەكە بپشكنێت(١).

ئەگەر بڕیارێكی دادوەریش دەرچوو بۆ پشكنینی ئەو خانووەی، كە دبلۆماتەكەی تێدا دەژیت، یان پشكنینی بارەگا فەرمییەكەی، پێویستییەكیش هەبوو پەیوەست بوو بە سەلامەتیی دبلۆماتەكەوە، ئەوا دروست نییە دادگا بچێتە ژوورەوە هۆكارەكەی هەرچییەك بێت، تەنها دوای

(١) ماددەی (١/٣٠)ی هەمان ڕێككەوتننامە.

پەیوەندیکردن نەبێت بە نێراوە دبلۆماسییەکەوە لە ڕێگەی وەزارەتی دەرەکییەوە، کە لە ڕێگەی خۆیەوە داوای ڕەزامەندیی دبلۆماتەکە دەکات، خۆ ئەگەر رازی نەبوو ئەوا بۆیان نییە بچنەژوورەوە.

هەرچەندە ڕایەك هەیە، کە دەڵێت: بەپێی ماددەی (٣/٣١)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننای (١٩٦١)[١] ئەگەر حوکومەتی پێشوازیکەر دڵنیا بوو، کە باڵەخانەی باڵوێزخانەکە چەکی تێدایە، یان پیلانی دژی وڵاتەکەی تێدا دەگێرێت، ئەوا بۆی هەیە بچێتە ناویەوە، بەڵام زۆرینەی شارەزا (فەقیه)ە نێودەوڵەتییەکان بەتوندی ئەم بیرۆکەیەرەتدەکەنەوەو بڕوایان وایە، کە ئەو دەوڵەتە تەنها دەتوانێت چواردەوری باڵوێزخانەکە بە پۆلیس بگرێت، ئەگەر پێویستیشی کرد دەتوانێت باڵوێزەکە بانگێشت بکات، یاخود پەیوەندیی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا بپچڕێنێت[٢].

---

(١) دەقی ماددەی (٣/٣١) دەڵێت: "دروست نییە هەر ڕێوشوێنێکی جێبەجێکاریی لە بەرامبەر نێراوی دبلۆماسیدا بگیرێتە بەر، تەنها لەو بارانەدا نەبێت کە لە بەندەکانی (أ) و (ب) و (ج)ی بڕگەی (١)ی ئەم ماددەیەدا هاتووە، بە مەرجێکیش کە بتوانرێت، بەبێ سووکایەتی و زیانگەیاندن (المساس) بە کەسی دبلۆمات و شوێنی مانەوەی، ئەو ڕێوشوێنانە بگیرێتە بەر". شیاوی باسە بڕگەی (١)ی ئەم ماددەیە باس لە پارێزبەندیی دادوەریی نێراوی دبلۆماسیی دەکات، لەوەی کە پەیوەندیی بە دادگای سزاییەوە هەیە, لە دەوڵەتی پێشوازیکەر، هەروەها دادگای شارستانی و ئیداری، بەندەکانی ئەم بڕگەیەش کە (أ) و (ب) و (ج)ن، ڕێزپەڕن بۆ ئەو پارێزبەندیی شارستانی و ئیداری و باس لە ئەو داوایانە دەکەن, کە پەیوەستن بە خانووبەرەی دبلۆمات و میرات و ماوە و چالاکیی پیشەیی و بازرگانی، بەڵام هەر یەکەیان بە مەرجی خۆی، کە دواتر باسیان دەکەین.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١١٩-١٢١. لە مێژووی دبلۆماسیدا چەند حاڵەتێکی چوونەناوەوەی دەوڵەتی پێشوازیکەر بۆ باڵوێزخانەکان، لە ئەنجامی ڕووداوی کوتوپڕ ڕروویداوە، لەوانە: لە ساڵی (١٩٢٧) حوکومەتی (چین) چووە نێو یەکێك لەو باڵوێزخانانەی کە لە (پەکین) کاردەکەن و ڕێژەیەك چەك و تەقەمەنی و بەڵگەنامەی دۆزییەوە تێیدا, کە دەیانسەلماند

بەشێوەیەکی گشتی، بەشێوەی کرداری زۆربەی دەوڵەتان بەشێوەیەك رەها دانیان بە رێزی باڵوێزخانەدا ناوە، چونکە بەزاندنی ئەو رێزە بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی لێدەکەوێتەوە، بەڵام هەندێك دەوڵەتی تر رێگە بە خۆیان دەدەن، کە لە حاڵەتی مەترسیی گەورەدا بچنە ناو باڵوێزخانەکانەوە، بۆ نموونە: لە حاڵەتی ئاگرکەوتنەوەیەك، کە مەترسیی بۆ دراوسێکانیش هەبێت، ئەنجامدانی تاوان، سەلماندنی بوونی چەکی جەنگیی تێیاندا[(١)].

### پەناهەندەی دبلۆماسی (اللاجيء الدبلوماسي):

لەبەرئەوەی کە شوێنی نیشتەجێی کەسی دبلۆمات و بارەگای کاری فەرمیی پارێزراویی دبلۆماسییان هەیە، کێشەیەك سەرهەڵدەدات، کە بریتییە لە پەنابردنی تاوانباران بۆیان لەسەر ئەو بنەمایەی کە پۆلیسی ناوخۆی ئەو دەوڵەتە ناتوانن بچنە ژوورەوە. بەڵام لەرووی کردارییەوە کار لەسەر ئەوە جێگیربووە، کە کەسی دبلۆمات پابەند بکرێت بە رادەستکردنی تاوانباری ئاسایی، یاخود رێگەدان بە پۆلیسی ئەو دەوڵەتە بە چوونەژوورەوە بۆ دەستگیرکردنیان. بەڵام سەبارەت بە ڕادەستکردنی تاوانباری سیاسی رای جیاواز هەیە، باشترینیشیان ئەوەیە کە لەبەر هۆکاری مرۆیی نابێت رادەست بکرێت[(٢)].

---

کە ئەم باڵوێزخانەیە پشتیوانی پارتێکی دیاریکراو دەکات، بۆیە حوکومەتی (چین) ناڕەزایی دەربڕی و پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتەکەیدا پچڕاند. هەمان سەرچاوە، ل١٢٠.

(١) بڕوانە: م. ن ص ص١٢٠-١٢١.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ياسين ميسر عزيز العباسي، م.س.ذ، ص ص٢٢٦-٢٣٤.

واتـه رێسـای گشـتیی ئەوەیـە کـە بەخشـینی پـەنادان لەسـەر نێـراوی دبلۆماسـییئەرك نییـە، بـەڵکو خۆویسـتانەیە و بەهەنـدگرتنی لایـەنی مرۆیـی دەیسەپێنێت، بەڵام، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو پەنادانە رەنگە هەندێك مەترسـی لەخۆ بگرێت، سەربکێشێت بۆ تێکچوونی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی نێوان نێراوەکە و دەسەڵاتی دەوڵەتی پێشوازیکەر، کارێکی دروستە[١].

رێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١) سەبارەت بە پێدانی پەنابـەرێتی دبلۆماسی (اللجوء الدبلوماسي)، بێدەنگ بووەو بـە دەقێکـی تایبـەت باسـی نەکردووە، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە لە ماددەی (٤١/أ)دا هاتووە، کـە بـاس لـەوە دەکـات پێویسـتە دبلۆماتکـاران رێـزی یاسـا و سیسـتمی دەوڵـەتی خانەخوێ بگرن و دەست وەرنەدەنە کاروبارە ناوخۆییەکانییـەوە، هـەروەها وەك ئـەوەی کـە لـە مـاددەی (٤١/ج)ی رێککەوتننامـەی ڤیـەننای (١٩٦١)دا هـاتووە پێویسـتە باڵوێزخانـە بـە شـێوەیەك بەکارنـەهێنرێت، کـە لەگـەڵ ئەرکەکانیـدا نـەگونجێت، ئـەو ئەرکانـەی کـە لـەم رێککەوتننامەیـەدا رروونکراونەتەوە، یان لە رێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتیی، یاخود هـەر رێککەوتنێکی تـردا هـاتوون، کـە لـەنێوان دەوڵـەتی نێـرەر و پێشـوازیکەردا بوونیان هەبێت.

بەو پێیە رێککەوتننامەکە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ پەنادانی تاوانبـاری ئاسـایی قەدەغـەکردووە، چـونکە ناکرێـت باڵوێزخانـە بکرێتـە جێگـەی پەنادەدانی کەسانی تاوانبار، کە دەبێتە جۆرێك لـە دەسـتێوەردان، یـاخود بێڕێزیـی بـە یاسـا و سیسـتمی وڵاتـی خانـەخوێ. بـەڵام رێککەوتننامەکـە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتربڕوانە: د. غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص١٣٨-١٤٢.

پەنابەرێتیی دبلۆماسی راستەوخۆ قەدەغە نەکردووەو بەجێی هێشتووە بۆ وڵاتان خۆیان. بۆیە زۆرێك لە زانایان بڕوایان وایە، کە پێویستە پەنابەرێتی دبلۆماسیی کاتی، لەبەر هۆکاری مرۆیی، رێگەی پێ بدرێت.

ئەمەش بەستراوەتەوە بە مافی مرۆڤەوە، هەروەك لە جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤدا هاتووە: "هەموو تاکێك مافی ئەوەی هەیە کە پەنا بۆ وڵاتانی تر ببات، یان هەوڵی بەدەستهێنانی دالدەیەك بدات بۆ راکردن لە چەوساندنەوە" لە هەمان کاتدا، تێیدا هاتووە: "هەرکەسێك لەسەر تاوانی ناسیاسی یان کارێك بخرێتە بەردەم دادگا، کە دژی ئامانج و پرنسیپەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بێت، ئەوا سوود لەم مافە وەرناگرێت"[(١)].

لە هەمان کاتدا دەوڵەتان دەتوانن لە رێگەی رێککەوتننامەی تایبەتەوە مافی پەنابەرێتیی سیاسی بۆ نێراوە دبلۆماسییەکان رێکبخەن، وەك: رێککەوتننامەی نێوان (پیرۆ) و (کۆلۆمبیا) لەو بارەیەوە[(٢)].

بەڵام لە حاڵەتێکدا کە باڵوێزخانەیەك دالدەی دبلۆماسیی کەسێکی لە خاکی دەوڵەتی پێشوازیکەردا، داو ئەو دەوڵەتەش سووربوو لەسەر ئەوەی، کە پێویستە ئەو کەسەی رادەست بکرێت، چی دەکرێت؟

ئەو دەوڵەتە دەتوانێت پەنا بباتە بەر پچڕاندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی و داوای جێهێشتنی خاکەکەی لە ئەندامانی ئەو باڵوێزخانەیە بکات، کە پەناهەندەکەیان لەخۆ گرتووە، دواتر پەناهەندەکە بۆ چارەنووسی

---

(١) بڕگەکانی (١) و (٢)ی ماددەی (١٤)ی (جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ) ی ساڵی (١٩٤٨). بڕوانە دەقی جاڕنامەکە لەم لینکەی سایتی نەتەوەیەکگرتووەکان: (مێژووی سەردان ٢٠١٧/٣/١٠)
http://www.un.org/ar/documents/udhr/

(٢) د. عدنان البکري، م.س.ذ، ص١٠٧.

خۆی وازلێبهێنن، واته بیخەنە ژێر بەزەیی دەوڵەتی پێشوازیکەرەوە، ئەمە ئەگەر دەوڵەتی خاوەنی باڵوێزخانەکە چاودێریی بەرژەوەندییەکانی و پاراستنی پەناهەنەدەی سیاسییش نەخاتە ئەستۆی دەوڵەتی سێیەم[1].

بۆ چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتە نەخوازراوانە، هەندێك لە پسپۆڕان، وێڕای ئەوەی ڕایان وایە، کە پێویستە داڵدەدانی پەناهەندەی سیاسی، بەپێی پەیماننامە و ڕێککەوتننامەی نێوان دەوڵەتان ڕێکبخرێت، جەخت لەوە دەکەنەوە کە پێویستە مافی داڵدەدانی سیاسی، ئەم مەرجانەی تێدا بێت[2]:

أ. پەناهەندەی سیاسی وەرنەگیرێت، تەنها لە حاڵەتی پێویستیی زۆر نەبێت، ئەویش تا ئەو کاتەی شوێنێکی ئارامی بۆ زامن دەکرێت.

ب. پێویستە نێراوی دبلۆماسی، ڕاستەوخۆ دەسەڵاتی ناوخۆیی ئەو دەوڵەتی پەناهەندەکە ئاگاداربکاتەوە.

ج. حوکومەتی کەسەپەناهەندەکە، مافی داواکردنی دوورخستنەوەی پەناهەندەکەی لە نزیکترین کاتدا هەیە، هەروەك چۆن نێراوە دبلۆماسییەکەش مافی داواکردنی گرێنتیی پێویستی بۆ دڵنیابوون لە چوونەدەرەوەی پەناهەندەکە لەو وڵاتە بە سەلامەتی هەیە.

د. نابێت پەناهەندە سیاسییەکە لە ماوەی پەنابردنەکەیدا هیچ کارێك ئەنجامبدات، کە ئاساییشی گشتی تێکبدات.

هـ. حوکومەتی پەناهەندەکە لە هەرتێچوویەك کە لەو پەنابردنە دەکەوێتەوە پابەند نییە.

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٢٣.

(٢) بۆ زانیاری زیاتربڕوانە: د. غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص١٣٨-١٤٢.

کەواتە مامەڵەکردنی نێراوی دبلۆماسی لەگەڵ پەناهەندە، کارێکی سانا نییە، بەڵکو پێویستە زۆر بەوریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەگەر نا ڕەنگە ببێتەهۆی تێکچوونی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان و تەنگژەو قەیرانی لێ بکەوێتەوە.

**جانتای دبلۆماسی و هەڵگرەکەی (الحقيبة الدبلوماسية وحاملها):**

پێویستە جانتای دبلۆماسیی و هەڵگرەکەشی ڕێزی تایبەتیان بگیرێت. لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننای (١٩٦١)دا هاتووە: "کردنەوەی جانتای دبلۆماسی و دەستبەسەرداگرتنی دروست نییە"(١). هەروەها ئەو ڕێککەوتننامەیە باس لەوە دەکات، کە پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر هەڵگری جانتای دبلۆماسی لە هەستانی بە کارەکەی بپارێزێت، بە مەرجێك بەڵگەنامەیەکی فەرمی پێبێت، کە پێگەی خۆی و ئەو بەشانە ڕوونبکاتەوە، کە جانتا دبلۆماسییەکەیان لێ پێکدێت، کەسی هەڵگری جانتاکە پارێزبەندی هەیە و نابێت ملکەچی هیچ جۆرە دەستبەسەرکردن، یان دەستگیرکردنێك بکرێت(٢).

لەراستیدا کێشەیەکی دێرین هەیە، کە تەنانەت ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١)یش نەیتوانیوە چارسەری بکات، ئەویش بریتییە لە دیاریکردن و جیاکردنەوەی ئەو شتانەیە کە ڕێگەپێدراو و ڕێگەپێنەدراون، کە بە جانتای دبلۆماسی بگوازرێنەوە. ئەوەی کە ڕێککەوتننامەکە ئاماژەی پێکردووە ئەوەیە، کە ئەو بەشانەی کە جانتا دبلۆماسییەکەی لێ پێکهاتووە تەنها

---

(١) ماددەی (٣/٢٧)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: ماددەی (٥/٢٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

بەڵگەنامەی فەرمی و شتی تایبەت بە بەکارهێنانی فەرمی تێدا بێت[١]. بەڵام ئایا بابەتی تری وەك پڕوپاگەندە دەچێتە نێو بەڵگەنامە فەرمییەکانەوە؟ چین ئەو شتانەی کە تایبەتن بە بەکارهێنانی فەرمی؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستە جیاکاری لەنێوان دوو حاڵەتدا بکەین[٢]:

یەکەم: لەبەرئەوەی دەوڵەتی پێشوازیکەر پابەندکراو نییە، بە شرۆڤەیەکی یاسایی بۆ ئەو بەڵگەنامە فەرمی و شتە تایبەتانەی، کە بۆ بەکارهێنانی فەرمی بەکاردێن، جۆر و ئاستی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی نێرەر و پێشوازیکەر تەحەککوم بە جۆری ئەو شرۆڤەکردنەوە دەکات. واتە ئەگەر ململانێیان توندبێت، ئەوا شرۆڤەیەکی توند بۆ دەقی رێککەوتننامەکە دەکەن و رێگری لە جانتای دبلۆماسی دەکەن، یان کێشەی بۆ هاتوچۆی دروستدەکەن و ئەمە دەکەن بە جۆرێك لە تۆڵەکردنەوە، بەڵام ئەگەر پەیوەندییان دۆستانە بێت،ئەوا ئاسانکاری بۆ دەکرێت. لە مێژوودا زۆر حاڵەت هەیە کە رێگریکردن لە جانتای دبلۆماسی وەك سزایەك لە بەرانبەر جموجووڵ و چالاکیی بێزارکەر و دەستتێوەردانی دەوڵەتی نێرەر بەکارهێنراوە، بۆ نموونە: لە ساڵی (١٩٥١) حوکومەتی (ئەرجەنتین) دەستیگرت بەسەر بارهەڵگرێکدا کە بۆ باڵوێزخانەی (پۆڵەندا) نێرا بوو، بە بیانوی ئەوەی کە بابەتی پڕوپاگەندەی تێدایە، دوای ئەوەش دەستیکرد بە پشکنین ئەو جانتایانەی، کە بۆ باڵوێزخانەی دەوڵەتانی بلۆکی شیوعی دەنێران.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤/٢٧)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٣٠-١٣٥.

دووەم: حاڵــــەتی خراپبــــەکارهێنانی جانتـــــای دبلۆماســــیی: واتـــــە خراپبەکارهێنانێکی حاشاهەڵنەگری جانتای دبلۆماسی، کە دوو جۆری هەیە:

– خراپبەکارهێنانی جانتای دبلۆماسـیی بـۆ دەسـتکەوتی کەسـی: کـە زیاتر باوە و ڕوودەدات لەنێوان دەوڵەتاندا و بەشێکی زۆری لە رێگەی بردن و گواستنەوەو ئاودیوکردنی (تهريب) ماددەی بێهۆشکەر و پارە و خشڵ و زێڕ و کانزای بەنرخ ئەنجامدەدرێت. دۆزینەوەی ئەم حاڵەتانە زۆر جـار دەوڵـەتی پێشوازیکەر تووڕە ناکات، نابێتـەهۆی ئـاڵۆزبوونی پـەیوەندییـەکان، چـونکە پاڵنەرەکە سیاسی نەبووە بەڵکو کەسی بووە، بەڵکو دەبێتە هـۆی تـووڕەیی دەوڵەتی نێرەر، خۆ ئەگـەر دەوڵـەتی پێشـوازیکەر دەستبەسـەر ماددەکانـدا بگرێت و سزای ئـەو دبلۆماتکـارەش بـدات، بەگشـتی نارەزایـەتیی دەوڵـەتی نێرەری لێناکەوێتەوە، بەڵکو رەنگە پارێزبەندیشی لێ بسەنێتەوە.

– خراپبەکارهێنانی جانتای دبلۆماسـی بـۆ گواسـتنەوەو ئـاودیوکردنی ماددەگەلێك، کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ئاسایش و ئـارامیی دەوڵـەتی پێشـوازیکەرەوە هـەبێت: وەك بردنـەناوەوەی چـەك و تەقەمـەنی و بابـەتی پڕوپاگەندەی وێرانکەر و بانگەشـەکار بـۆ شـۆڕش و ڕاپـەڕین، یـان کودەتـا، یاخود بردنەدەرەوەی ئامێرگەلێك، کە بردنەدەرەوەی مەترسیی هـەبێت بـۆ سەلامەتیی سیاسی و ئابووری و سەربازیی دەوڵەتی پێشوازیکەر.

هەندێکجار مەبەسـتەکە راسـتەوخۆ خراپـەکردن نییـە بەرانبـەر دەوڵـەتی پێشوازیکەر، بـەڵکو مەبەسـت بـەکارهێنانی هەرێمەکەیـەتی بـۆ ئەنجامـدانی کارێـك لــە دژی دەوڵــەتی ســێیەم، لــە رێگــەی بــەکارهێنانی پارێزبەنـدیی دبلۆماسییەوە. ئەم حاڵەتەش زۆر جار ئاڵۆزی لە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی نێرەر و پێشوازیکەردا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، دروستدەکات. لـە

مێژووی دبلۆماسیدا نموونەی سەیروسەمەرە هەیە، کە جانتای دبلۆماسی تێیاندا بە خراپ بەکارهێنراون، کە هەندێکیان زیاتر لە خەیاڵی و سیناریۆ دەچن وەك لەوەی ڕووداوێکی دبلۆماسی بن. بۆ وێنە: لە کاتی ئەنجامدانی کاری ڕۆتینی بۆ جانتایەکی زۆر گەورە کە لێی نووسرابوو "پۆستەی دبلۆماسیی"، بە مەبەستی گواستنەوەی لە ڕێگەی ئاسمانییەوە لە باڵوێزخانەی (میسر)ەوە لە ڕۆما بۆ فڕۆکەخانەی (قاهیرە)، لەو کاتەدا یەکێك لە فەرمانبەرانی گومرگ لە نزیکەوە گوێ لە دەنگێکی نزم بوو کە بە زمانی ئیتاڵیی دەڵێت: "فریامکەون! بکوژن!!". لەم کاتەدا فەرمانبەرە میسرییەکان بەپەلە صندوقەکەیان فرێدایەوە ناو ئەو ئوتومبێلەی، کە جانتاکەی هێنابوو بۆ فڕۆکەخانەو زۆر بەپەلە فڕاندیان! دوای ڕاوەدوونانێکی زۆر، پۆلیس ڕای گرتن. کاتێك سندوقەیان کردەوە بینییان مرۆڤێکی بە دەست و قاچ بەستراوی تێدایە! پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت، کە سیخوڕێکی ئیسرائیلییە. پاش ماوەیەکی کەم و لە نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٦٤) دەسەڵاتی ئیتاڵی بڕیاری دوورخستنەوەی دوو فەرمانبەری باڵوێزخانەی کۆماری عەرەبیی یەکگرتووی لە (ڕۆما) دا، کە پلەی سکرتێری یەکەمیان هەبوو. دیارە لێرەدا مەبەست لەم کارە (ئیتاڵیا) نەبووە، بەڵکو (ئیسرائیل) بووە، چونکە لە کاتی ئەو ڕووداوەدا پەیوەندیی (ئیتاڵیا) لەگەڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو ئاسایی بوو، بەڵام خاکی ئیتاڵیای بۆ جێبەجێکردنی دژەسیخوڕی (الجاسوسیة المضادة) بەکارهێنابوو[١].

---

(١) م.ن، ص ص١٣٤.

هەڵگری جانتای دبلۆماسیی، پاسپۆرتێکی دبلۆماسیی هەڵدەگرێت، بۆ ئەوەی ئەرکەکەی بەئاسانی و بێگرفت ئەنجامبدات، زۆرینەی زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن، کە مومارەسەی ئەرکەکانی لە ساتی جێهێشتنی وڵاتەکەی خۆیەوە دەستپێدەکات و تا کاتی گەڕانەوەی بەردەوام دەبێت، واتە دروست نییە، دەستبەسەر بکرێت پاش ئەوەی، کە جانتا دبلۆماسییەکەی ڕادەستی ئەو نێراوە دبلۆماسییە کرد، کە بۆی نێراوە، مەگەر ئەرکەکەی کاتی بێت و سیفەتەکەشی لە بنەڕەتدا نادبلۆماسیی بێت و تەنها ئەو وەك نێراوێکی دبلۆماسیی تایبەت ئەو کارەی پێ سپێرابێت[١]، خۆ ئەگەر وابێت (واتە ئەگەر دەوڵەت نێراوێکی دبلۆماسیی تایبەتی بۆ هەڵگرتنی جانتای دبلۆماسیی دیاریکرد، کە لە بنەڕەتدا دبلۆمات نەبێت)، ئەوا هەر بە رادەستکردنی جانتا دبلۆماسییەکە ئەویش پارێزبەندیی نامێنێت[٢].

هەر بەپێی رێککەوتننامەی ڤیەننا، دروستە جانتای دبلۆماسیی بدرێتە سەرپەرشتیار، یان سەرۆکی فڕۆکەیەکی بازرگانی، کە بڕیاربێت لە یەکێك لە بەندەرەکاندا بنیشێتەوەو پێویستە بەڵگەیەکی فەرمی پێبدرێت، کە ژمارەی ئەو بەشانە روونبکاتەوە کە جانتا دبلۆماسییەکەی لێپێکهاتووە، بەڵام بە هەڵگری جانتای دبلۆماسی هەژمارناکرێت. دواتر نێراوە دبلۆماسییەکە یەکێك لە ئەندامانی خۆی دەنێرێت،بۆئەوەی جانتاکەی بەشێوەیەکی ئازادانەو ڕاستەوخۆ لێوەربگرێت[٣].

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٢٧.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٦/٢٧)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٣) بڕوانە: ماددەی (٧/٢٧)ی هەمان رێککەوتننامە.

له ئێستادا زۆرێك له وڵاتان ئه‌م شێوازه په‌یڕه‌وده‌كه‌ن، به‌ڵام ئه‌و كه‌سه كه هه‌ڵگری جانتاكه‌یه له‌م حاڵه‌ته‌دا به هه‌ڵگری جانتای دبلۆماسیی هه‌ژمارناكرێت، بۆیه پارێزبه‌ندیشی پێنادرێت.

پێویسته هه‌ڵگری جانتای دبلۆماسی له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵاتی ئاسایشی فرۆكه‌خانه و گومرگه‌كانه‌وه ئاسانكارییان بۆ بكرێت و رێگه‌یان لێنه‌گیرێت، خۆ ئه‌گه‌ر گومانیشیان له‌سه‌ر جانتا دبلۆماسییه‌كه هه‌بوو، له‌رووی كێش و گه‌وره‌ییه‌وه، یان له‌رووی ئاساییشه‌وه، ئه‌وا ئه‌و پرسه ده‌خه‌نه به‌رده‌می وه‌زاره‌تی ده‌ره‌كیی وڵاته‌كه‌یان، كه پێویسته به وریایی و داناییه‌وه چاره‌سه‌ری بكات(١).

له ئێستادا، به‌هۆی پێشكه‌وتنی ته‌كنۆلۆجیاوه، له رێگه‌ی ئامێری تایبه‌ته‌وه ده‌توانرێت به‌بێ كردنه‌وه‌ی جانتای دبلۆماسی جۆرێك له پشكنینی بۆ بكرێت، كه زۆرێك له گومانه‌كان ده‌ڕه‌وێنێته‌وه.

خۆ ئه‌گه‌ر جانتا دبلۆماسییه‌كه‌و هه‌ڵگره‌كه‌ی به وڵاتی سییه‌مدا تێبپه‌ڕن، ئه‌وا پێویسته ئه‌و ده‌وڵه‌ته هه‌مان ئه‌و رێز و پارێزبه‌ندی و پاراستنه‌ی پێبده‌ن، كه ده‌وڵه‌تی پێشوازیكه‌ر پێیان ده‌دات(٢).

به‌ڵام ئه‌گه‌ر فرۆكه‌كه تایبه‌ت بوو به گواستنه‌وه‌ی جانتای دبلۆماسیی و ئه‌ركی سه‌ركرده‌ی فرۆكه‌كه‌ش له گه‌شته‌كه‌یدا گه‌یاندنی ئه‌و جانتایه بوو، ئه‌وا ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌ته‌كه‌ی به‌ڵگه‌نامه‌ی فه‌رمی بداتێ و به هه‌ڵگری جانتای

---

(١) بڕوانه: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص١٠٨-١٠٩. و: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٢٧-١٢٨.

(٢) بڕوانه: بڕگه‌كانی (٣) و (٤)ی مادده‌ی (٤٠)ی (رێككه‌وتننامه‌ی ڤیه‌ننا بۆ په‌یوه‌ندییه دبلۆماسییه‌كان)ی ساڵی (١٩٦١).

دبلۆماسی بیناسێنێت، لەو کاتەدا سیفەت و پارێزبەندیی نوێنەری دبلۆماسیی پێدەدرێت[1].

هەروەها دروست نییە شتومەکە کەسییەکانی دبلۆمات لەلایەن دەسەڵاتە ئەمنی، یان گومرگییەکانەوە بپشکنرێن لەکاتی هاتنە ژوورەوە، یان چوونەدەرەوەیان لەو دەوڵەتە، چونکە پێویستە هەموو ئەو شتانەی، کە بۆ بەکارهێنانی دبلۆمات ئامادەکراوە، پارێزراو بێت، وەك: ئۆتۆمبێل و حسابی بانکی و هەرشمەکێکی شەخسیی تر.

لە حاڵەتی دەستدرێژیکرانە سەر دبلۆماتیشدا، پێویستە دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی باڵوێزخانەکەی لێیە، بەپەلە و راستەوخۆ رێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر بۆ لابردنی ئەو دەستدرێژییە و لێپێچینەوە لەوانە بکات، کە بەو کارە هەستاون، جا فەرمانبەرانی دەوڵەت بووبن، یان هاوولاتی ئاسایی. هەروەها پێویستە ئەو رێوشوێنانەی کە دژی دەستدرێژیکەرەکان دەگیرێتە بەر لەگەڵ کەسایەتیی دبلۆماتەکەدا بگونجێن، واتە رێوشوێنی توند بگیرێتەبەر بۆ فەراهەمکردنی پاراستنی، لە رێگەی توندکردنی سزای ئەو کەسانەی کە دەبنە هۆکار لەو جۆرە کارانەدا. نەك هەر ئەوە، بەڵکو پێویستە هەرزیانێك کە بەر نێراوە دبلۆماسییەکە کەوتووە وەك پێش دەستدرێژیکردنەکەی لێ بکرێتەوە، ئەگەر ئەوەش نەتوانرا، پێویستە قەرەبووی زیانە ماددی و مەعنەوییەکان بکرێتەوە، واتە لە رێگەی پارە و پۆزشهێنانەوەو داوای لێبوردن کردن لە زیانەکان.

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٢٨.

دەوڵەتی خاوەن باڵوێزخانەکە (نێرەر) مافی داواکردنی قـەرەبووی هەیـە، بۆ ئەو زیانانەی کە تووشی نێراوە دبلۆماسییەکەی دەبن، ئەگەر نا ئەوا بۆی هەیە رێوشوێنی پێویست لە دژی ئەو دەوڵەتە بگرێتەبەر، کە باڵوێزخانەکەی لەوێیە، ئەویش بە جێبەجێکردنی بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە (مبدأ المعاملة بالمثل).

دەوڵەتان بە جیاوازیی سیستمە سیاسییەکانیانەوە رێز لـە رێسـای رێـزی کەسی دبلۆمـات دەگـرن، هـەروەها لـەڕووی تیـۆری و پراکتیکـی و تەنانـەت دادوەرییشەوە کۆدەنگی هەیـە لەسـەر رەچـاوکردنی ئـەو رێـزە و زۆرێـك لـە پەیماننامـــە نێودەوڵەتییـــەکانیش بـــە دەق باســـیان کـــردووە، لەوانـــە: (رێککەوتننامەی رێگرتن لەو تاوانانەی، کە دژی ئەو کەسانە ئەنجامدەدرێن، کـە پارێزبەنـدیی نێودەوڵـەتی دەیانگرێتـەوە و سـزادانی ئەنجامـدەرانی، لەنێویاندا فەرمانبەرە دبلۆماسـییەکان/ اتفاقیـة منـع الجـرائم المرتكبـة ضـد الأشخاص المتمتعين بحمايـة دوليـة، بمـا فـيهم الموظفـون الدبلوماسـييون)ی (ساڵی ١٩٧٣)، بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە سەرۆکی دەوڵەت و هەر نوێنـەر، یان فەرمانبەرێکی دەوڵـەت، یـاخود نوێنـەری هـەرێکخراوێکی نێودەوڵـەتیی حوکـومی و ئەنـدامانی خێزانـەکانیان، ئەگـەر بـەپێی یاسـای گشـتیی نێودەوڵەتی پارێزراوی نێودەوڵەتییان هەبێت، پێویستە پارێزراوبن، هەروەها پێویسـتە بەشـێوەیەکی تایبـەت پارێزگـاری لـە خـودی خۆیـان و بارەگـا فەرمییـــەکانیان و شـــوێنی تایبـــەتی نیشـــتەجێبوونیان و هۆکارەکـــانی گواستنەوەیان بکرێت، لە دژی هەرهێرشێك بۆ سەر خۆیان، یـان ئازادییـان،

یان ڕێز و کەرامەتیان، هەروەها ئەنـدامانی خێزانـەکانیان، کـە لـەلایان ژیـان بەسەردەبەن[1].

**هەروەها ئەو ڕێککەوتننامەیە پێویستی کردووە لەسەر دەوڵەتان، کە لە یاسای سزادانیدا ئەم جۆرە تاوانانە دابنێن[2]:**

١. کوشتن و فڕاندن، یان هەرهێرشێك بۆ سەر کەسێك، یان ئازادیی ئەو کەسەی کە پارێزگاریی نێودەوڵەتی هەیە.

٢. هێرشـی توندوتیـژ بـۆ سـەر بارەگـای فـەرمی، یـان شـوێنی نیشتەجێبوون، یان هۆکارەکانی گواستنەوە.

٣. هەڕەشەکردن بە ئەنجامدانی هەریەکێك لەو دەستدرێژییانە.

٤. هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی هەریەکێك لەو دەستدرێژییانە.

٥. هـەرکارێك کـە هاوبەشـییەك لـە یـەکێك لـەو دەسـتدرێژییانە دروستبکات.

جگە لەمە چەندین یاسای نێوخۆیی دەوڵەتان باسـیان لـە ڕێـزی کەسـیی دبلۆمات کردووە.

(کۆمـاری عێـراق)یـش، وێـڕای مـۆرکردنی (تصـدیق) ڕێککەوتننامـەی ڕێگریکرتن و سزادانی ئەو تاوانانە، کە دژی ئەو کەسانە ئەنجامـدەدرێن، کـە

---

(١) بڕوانە: دەقی ڕێککەوتننامە کە لە پێگەی فەرمیی نەتەوەیەکگرتووەکان، لەم لینکەی خوارەوە :(مێژووی سەردان ٢٠١٧/٣/١٠)

https://treaties.un.org/Pages/PageNotFound.aspx

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/٢)ی (ڕێککەوتننامەی ڕێگرتن لەو تاوانانەی, کە دژی ئەو کەسانە ئەنجامدەدرێن, کە پارێزبەندیی نێودەوڵەتی دەیانگرێتەوە و سزادانی ئەنجامدەرانی، لەنێویاندا فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان) ساڵی (١٩٧٣).

پارێزبەندیی نێودەوڵەتی دەیانگرێتەوە (کە لە ساڵی ١٩٧٤ بەستراوە)، دەبینین ماددەی (٢٢٧)ی یاسای سزادانی عێراقی سووکایەتیکردنی بە نوێنەری دبلۆماسیی بەو تاوانانە داناوە، کە بەرانبەر دەسەڵاتی گشتی ئەنجام،دەدرێن. بۆیە تێیداهاتووە، کە هەرکەسێك بە رێگەیەکی ئاشکرا سووکایەتی بە دەوڵەتێکی بیانیی، یان رێکخراوێکی نێودەوڵەتیی، کە بارەگای لە (عێراق)دا هەبێت، یان سووکایەتی بە سەرۆکەکەی یان نوێنەرەکەی لە (عێراق)دا بکات، یان سووکایەتی بە ئاڵاکەی یان دروشمی نیشتمانی بکات، ئەگەر بە شێوازێك بەکارهێنرابن، کە پێچەوانەی یاسا عێراقییەکان نەبێت، ئەوا سزای بەندکردن و غەرامەی بەسەردا دەسەپێنرێت[١].

**رێزی کەسی بەم چەند تایبەتمەندییە جیادەکرێتەوە[٢]:**

أ. رێزی کەسی لەو جیاوکە هەمیشەییانە هەژماردەکرێت، کە دبلۆمات هەیەتی، جا لە کاتی مومارەسەکردنی کاری فەرمییدا بێت، یان کاری تایبەتی خۆی.

ب. کەسی دبلۆمات مافی سازشکردنی نییە لە رێزی کەسی، هەروەك چۆن دەوڵەتەکەی بۆی نییە سازشی لیَ بکات، چونکە ئەگەر سازشیش لە رێزی کەسی بکرێت ئەوا ناتوانرێت ئەو سازشە بگوێزرێتەوە بۆ پارێزبەندیی دادوەری.

---

(١) بڕوانە: دەقی (یاسای سزادان)ی عێراقی, ژمارە (١١١)ی ساڵی (١٩٦٩)، لە لەم لینکەی خوارەوە: (بەرواری سەردان: ٢٠١٧/٣/١٠)
http://wiki.dorar-aliraq.net/iraqilaws/law/20706.html
(٢) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٦٠. و: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص٢١٥.

ج. ڕێزی کەسی مافێکی ڕەهای کەسی دبلۆماتە و هیچ ڕێزپەڕێکی نییە، ئەو مافەی هەر هەیە تەنانەت ئەگەر کارێکی وا بکات، کە بەپێی یاساکانی ئەو وڵاتەی، کە تێیدا کاردەکات بە سەرپێچی بژمێرێت.

د. کەسی دبلۆمات لە بەرانبەر دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراوەو کاری تێدا دەکات،ڕێزی کەسیی هەیە، هاووڵاتییەکانیشی هەروەها بەرانبەر ئەو هاووڵاتیانەی دەوڵەتەکەی خۆشی، کە لەو دەوڵەتەدا دەژین کە ئەو کاری تێدادەکات.

هـ. ڕێزی کەسی دبلۆمات خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی و نووسینگەی فەرمی و سامانی تایبەتی و سامانی ئەندامانی خێزانەکەی و خزمەتکارەکانیشی دەگرێتەوە.

**دووەم: جیاوکە کەسییەکان (الإمتیازات الشخصیة)**

کەسی دبلۆماتکار چەندین جیاوکی کەسیی هەیە، کە نە هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە هەیانە، کە ئەوی بۆ نێراوەو کاری تێدادەکات، نە ئەو بیانییانەش هەیانە، کە لەو دەوڵەتەدا ماونەتەوە و تێیدا نیشتەجێن (واتە موقیمن).

مەبەست لە جیاوکی کەسی ئەو ئاسانکاری و ڕێز و حورمەتەیە، کە لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا لە کەسی دبلۆمات دەگیرێت.

***دیارترینی ئەو جیاوکە کەسییانە ئەمانەن[1]:***

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٦١-١٦٥. و:د. غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص١٧٨-١٨١.

١. مافى چوونه ناو ئەو دەوڵەتەی، کە دبلۆماتەکەی بۆ نێراوە:

مـافى هەردەوڵەتێکـە کاروبـاری هاتنـەناوەوەو چـوونەدەرەوەی کەسـانی بیانی بۆ خاکەکەی ڕێکبخـات، ئەمـەش بەشـێکە لـە سـەروەرییەکەی و هـیچ دەوڵەتێکی تر، یان هەرکەسێکی بیانی بۆی نییە ڕەخنەی لێ بگرێت، چونکە ئەو کارە پەیوەندیی بە پاراستنی کیان و ئاساییشی ئەو دەوڵەتەوە هەیە.

لەبەرئەوەی کاری دبلۆمات لەو دەوڵەتەدایە کە بۆی دەنێرێت و کاتێکیش خاکی دەوڵەتەکەی خۆی جێدەهێڵێت هەندێکجار ناچـارە بـە خـاکی چـەند دەوڵەتێکدا تێپەڕ بێت، تا دەگاتە دەوڵەتی مەبەسـت، پێویسـتە ئاسـانکاری بـۆ بکرێـت، بۆیـە پێویسـتە ئـەو دەوڵەتـەی کـە بـۆی دەچـێت ڤیـزەی چـوونەناوەوەی بـۆ خـاکی دەوڵەتەکـەی پێبـدات، بـۆ ئەمـەش وەزارەتـی دەرەکی پەیوەندیی بە باڵوێزخانە، یان نێراوی دبلۆماسـیی ئـەو دەوڵەتـەوە دەکات، کە ڤیزەی هاتنەناوەوەی پێبدەن، هەنـدێك لـە دەوڵـەتانیش وەکـو موجامەلە بەبێ بوونی ڤیـزە ڕێگـە بـە دبلۆماتکارەکـان دەدەن بچـنە خـاکی دەوڵەتەکەیانەوە، لەوانە: (نەمسا).

٢. ما فى مانەوە (حق الإقامة):

لەبەرئـەوەی دبلۆمـات وەك کەسـێکی بیـانی مامەڵـەی لەگەڵـدا ناکرێـت، داوای بەدەستهێنانی مۆڵەتی مانـەوە (الإقامـة)ی لەلایەنـە پەیوەندیـدارەکان لێ ناکرێت، چونکە کەسی دبلۆمـات و ئەنـدامانی خێزانەکەشـی لـەو مەرجـە دەبەخشرێن، کە مافى مانەوە بەدەست بهێنن، هەروەها مافى ئەوەیان هەیـە، کە بەدرێژایی ماوەی کارەکەیان لەو دەوڵەتە بمێننەوە کە کاری تێدادەکەن.

### ٣. مافی گەڕان و هاتوچۆکردن (حق التجول والتنقل):

دبلۆمات مافی گەڕان و هاتوچۆکردنی لە خاکی ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراوە تا کاری دبلۆماسیی تێدابکات، هەیە، دروستیش نییە مانەوەی بەزۆر (الإقامة الجبرية)ی لە بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکە، یان لە ماڵەکەیدا بەسەردا بسەپێنرێت، چونکە دەتوانێت بۆ هەرشوێنێك بچێت کە دەیەوێت، جگە لەو شوێنانەی کە هاتوچۆکردن تێیاندا قەدەغەیەو بەپێی راگەیەنراوی فەرمی دیاریدەکرێن، ئەویش لەبەر گرنگیی ئەمنیی ئەو ناوچانە. زۆربەی کاتیش ئەو ناوچانە ناوچەی سەربازی، یان جەماوەرین، کە ترسی ئەوە هەیە ژیانی کەسی دبلۆمات تێیاندا بکەوێتە مەترسییەوە، مەگەر رراگەیەندراوێکی وەزارەتی دەرەکیی پێشوەخت لەو بارەیەوە بەدەست بهێنێت، بە مەبەستی رێگەدان بە چوونەناوەوەی بۆ ئەو ناوچانە بۆ کاتێکی دیاریکراو.

ئەم جیاوکە بۆ ئەوەیە کە دبلۆمات بتوانێت بەتەواوی کارەکانی ئەنجامبدات، چونکە ئەرکەکەی تەنها لە کۆکردنەوەی زانیاریدا کورت هەڵنایەت، بەڵکو ئەوە دەخوازێت کە ئاگای لە پەرەسەندنە پیشەسازی و بیناسازییەکانی ئەو دەوڵەتە بێت.

هەروەها پێویستە ئەو دەوڵەتەی کاری تێدادەکات، مافی مانەوەی پێبدات، ئاسانکاریی دەستکەوتنی شوێنی نیشتەجێبوونی بۆ بکات لە بارێکدا، کە نەتوانێت شوێنێکی نیشتەجێبوون پەیدابکات، لەو ناوچانەی کە ئەو دەوڵەتە دیاریکردوون، ئەویش بەوەی کە وەزارەتی دەرەکیی ئەو دەوڵەتە یەکێك لە فەرمانبەرانی رابسپێرێت بۆ گەڕان بەشوێن خانوویەکی گونجاو بۆ مانەوەی کەسی دبلۆمات، هەروەها دبلۆمات مافی ئەوەی نییە، کە

خـۆی شـوێنی نیشـتەجێبوونی خـۆی هەڵبـژێرێت بـەبێ ڕەزامەنـدیی ئـەو دەوڵەتە، ئەمەش لەبەر هۆکاری ئەمنی کە پەیوەستە بە کەسی دبلۆماتەوە، بۆ ئەوەی تووشی بێزارکردن و ناڕەحەتکردن نەبێت.

### ٤. مـافی چـوونەدەرەوە لـەو دەوڵەتـەی کـە بـۆی نێـراوەو کـاری تێداکردووە:

کەسی دبلۆمات مافی ئەوەی کە لە هەرکاتێکدا ویستی لەسـەر بێت ئـەو دەوڵەتە، کە نێراوە بۆی کاری دبلۆماسـیی تێـدا ئەنجامـدەدات، جێبهێڵێـت، بەو مەرجەی کە وەزارەتی دەرەکیی لێ ئاگاداربکاتـەوە، هـەروەها دبلۆمـات ملکەچـی ئـەو کـۆت و مەرجانـە نابێـت، کـە بەسـەر ئـەو کەسـە بیانییانـە دەسەپێنرێت، کە ئەو دەوڵەتە جێدەهێڵن، هەروەها جیاواز لەو کەسانەی کە لـە دەوڵـەتانی بیـانی کاردەکـەن، هـەروەها کەسـی دبلۆمـات داوای ڤیـزەی جێهێشتنی لێناکرێت، کە بۆ پشتگیریی ئەستۆپاکیی ئەو شوێنەی، کە کاری تێدادەکات داوادەکرێت.

### ٥. ملکەچنەبوونی بۆ پشکنین:

کەسی دبلۆمات و سامانەکەشی ملکەچی ئەو پشکنینە نابێت، کە لەکاتی هاتنەناوەوە و چوونەدەرەوەو مانـەوەدا دەسـەپێنرێت بەسـەر هاووڵاتیـان و بیانییانی تری ئەو دەوڵەتەی دبلۆماتەکەی لێیـە، جگـە لـەو حاڵەتانـەی کـە گومـانێکی یـەکجار زۆر دەکرێـت، لـەوەی دبلۆماتەکـە ماددەگـەلێکی هـەڵگرتووە، کـە بـەپێی یاسـا هـەڵگرتن و هـاوردەکردن و هـەناردەکردنیان یاساغە، یاخود ماددەگەلێك کـە پێویسـتە ملکەچـی سیسـتمی یاسـاغکردنی

تەندروستیی ئەو دەوڵەتە بێت، لەم حاڵەتەشدا پشکنینەکە بە ئامادەیی کەسی دبلۆمات، یان نوێنەری یاسایی ئەو ئەنجامدەدرێت.

لەبەرئەوەی لە ئێستادا دەوڵەتان لەوە دەترسن کە دبلۆماتکار چەك، یان ماددەگەلێکی یاساغ هەڵبگرێت، پەنایان بۆ دانانی ئامێری سانسۆر و دۆزینەوە بردووە، کە بتوانێت بەبێ کردنەوەی صندوق و جانتاکان ئەو ماددانە بدۆزێتەوە، یان بناسێتەوە. هەروەها پەنایان بۆ ئامێری پشکنینی مرۆڤ، یاخود سەگی پشکنین، بردووە، ئەم ئامێرانە گومانەکانیان لەسەر دبلۆماتکارەکان کەمکردووەتەوە، بۆیە شتومەکی دبلۆمات ناکرێتەوە، مەگەر لە بارێکدا بێت کە ئەو ئامێرانە ئەوە بدۆزنەوە کە ماددەی یاساغیان هەڵگرتووە، بۆیە ئەم ئامێرانە زۆرێك لەو کێشانەیان کەمکردووە، کە لەسەر ئەم بابەتانە تووشی دەوڵەتان دەهاتن.

## ٦. ملکەچنەبوونی بۆ تەکلیف و داوای کەسی (عدم خضوعه للتكاليف الشخصية):

کەسی دبلۆمات ملکەچی ئەو ئەرك و تەکلیفە کەسییانە نابێت، کە ئەو دەوڵەتەی تێیدایەتی ئاراستەی هاووڵاتیانیانی خۆی، یان کەسانی بیانیی سەر خاکەکەی دەکات. واتە داوای خزمەتی سەربازی هەمیشەیی، یان کاتیی لێناکرێت لە کاتی جەنگ لەگەڵ دەوڵەتانی تردا، یان لە حاڵەتی جەنگی ناوخۆییدا، تەنانەت لەکاتی بوونی هاوپەیمانیی سەربازی لەنێوان دەوڵەتەکەی و ئەو دەوڵەتەی، کە لێیەتی داوای خزمەتی سەربازیی لێ ناکرێت. تەنانەت ئۆتۆمبێلەکەی دەستی بەسەردا ناگیرێت و خانووەکەی بەکارناهێنرێت، بۆ کاری سەربازی و لەخۆگرتنی سەرباز، یاخود بۆ مەبەستی

تەندروستی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش و برینداران‌ی هێزە چەکدارەکان.

هەروەها ناچارناکرێت بە پێشکەشکردنی پارەو شمەك لە کاتی کۆکردنەوەیدا، داوای ناونووسکردنیشی لێناکرێت لە سوپای جەماوەریدا، هەروەها لە حاڵەتی ڕوودانی کارەساتی سروشتی، یان جەنگیی لەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات، ناچارناکرێت بە ئەنجامدانی پڕۆسەی ڕزگارکردن و فریاکەوتن. دروستیش نییە داوای هیچ کارێکی خێرخوازیی و خۆویستی لێ بکرێت، لە کارە میللییەکاندا، مەگەر ئەو دبلۆماتە خۆی وەك موجامله ئەو کارەبکات.

لێرەدا دەپرسین: هۆکاری ئەوە چییە، کە دبلۆمات داوای ئەو کارانەی لێناکرێت لەکاتی جەنگدا، تەنانەت بۆ کارە مرۆییەکانی وەك یارمەتیدان و چارەسەرکردنی نەخۆش و برینداریش؟

لە سادەترین وەڵامدا دەتوانین بڵێین: لەبەرئەوەی کە دبلۆماتەکە لە هاوڵاتییانی ئەو دەوڵەتە نییە، کە کاری تێدا دەکات،ئەو جۆرە کارانەش لەسەر دەوڵەتەکەی ئەژماردەکرێت، ئەمەش وا دەکات کە ئەو دەوڵەتە ببێتە لایەنگری ئەو دەوڵەتەی، کە دبلۆماتەکە کاری تێدادەکات.

### ٧. دابینکردنی شوێنی مانەوەو گرێنتیکردنی مومارەسەکردنی مافە کەسییەکانی:

وێڕای ئەوەی دبلۆمات هەموو ئەو مافانەی هەیە، کە کەسێکی بیانی هەیەتی، ئەو بارێکی یاسایی و سیاسیی تایبەتی هەیە، چونکە پێویستە ئەو دەوڵەتەی دبلۆماتەکە کاری تێدادەکات، هەموو ئەو پێداویستییانەی بۆ فەراهەم بکات کە شوێنی مانەوەکەی خۆش بکات و دووربێت لە هەموو ئاڵۆزکارییەك، بەڵکو پێویستە ئاسانکاری بۆ بکات لە هەموو ئەو

ئاستەنگانەی دێنە بەردەمی و پێویستە مانەوەی ئاسان بکات، جگە لەمە پێویستە مافی بەکارهێنانی دروشمە ئاینییە تایبەتەکانی و بەرزکردنەوەی ئالای دەوڵەتەکەی لەسەر ئۆتۆمبێل و خانووەکەی –ئەگەر سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی بوو– پێ بدات، منداڵەکانیشی لە خوێندنگە و زانکۆ حوکومەییەکاندا وەربگیرێن.

جگە لەمە دەوڵەتی پێشوازیکەر پابەنددەبێت بە دابینکردنی پێداویستییە پێویستەکان بۆ دبلۆماتەکان و شوێنی تایبەتیان بۆ تەرخاندەکات بۆ شتکڕین بازاڕکردن. هەروەها مۆڵەتی هاوردەکردنیان پێ دەبەخشێت بۆ هاوردەکردنی ئەو شمەکانەی حەزیان لێیەتی وەك مۆبیلیاتی ناو ماڵ و ئۆتۆمبیلی تایبەت بە خۆیان و باڵوێزخانەکەیان. ئەمە وێڕای دابینکردنی شمەك و خزمەتگوزاری لەکاتی جەنگ و ئەو کارەساتانەی، کە دووچاری دەوڵەتەکە دێن.

### جیاوکە کەسییەکان لەسەر ئەم بنچینانە وەستاون(۱):

أ. جیاوکە کەسییەکان لەسەر ئەو ئاسانکارییانە وەستاون، کە دەوڵەتی پێشوازیکەر پێشکەشی دبلۆماتکارانی دەکات، کە یارمەتی دەدەن لە باش جێبەجێکردنی ئەرك و کارەکانیان، هەروەها نزیکیان دەکاتە لەو دەوڵەتە و زمانی تێگەیشتن ئاسانتردەکات.

ب. جیاوکە کەسییەکان بەوردی دیاری نەکراون، دەوڵەتی پێشوازیکەر دەتوانێت هەرچەندێکی بوێت لەم جیاوکانە لە شێوەی موجامەلەدا بیبەخشێت بە دبلۆماتکار، هەروەك چۆن دەتوانێت لە هەندێکیان بێبەشی بکات و تەنها

(۱) بڕوانە: م.ن، ص١٦٥.

ئەو جیاوکە کەسییانەی بداتێ کە پێویستن، ئەو کارەش بەرپرسیارێتی لێ ناکەوێتەوە، واتە ئاستی جیاوکە کەسییەکان، لەسەر جۆری پەیوەندی و پێگەی هەردەوڵەتێکیان لەلای ئەوی دی و مامەڵە بە هاوشێوە وەستاون.

ج. کەسی دبلۆمات دەتوانێت خۆی بەبێ وەرگرتنی رەزامەندیی دەوڵەتەکەی واز لە بەکارهێنانی جیاوکە کەسییەکان بهێنێت.

**سێیەم: جیاوکە داراییەکان (الإمتیازات المالیة)**

مەبەست لە **جیاوکە داراییەکان:** بەخشینی دبلۆماتە لەو داواکارییە داراییانەی، کە بەسەر هاووڵاتییان و ئەو بیانیانەدا دەسەپێنرێت، کە لەو دەوڵەتەدا کاردەکەن[1].

بەپێی یاسای نێودەوڵەتی پێویستە کەسی دبلۆمات لە هەموو رەسم و باجە راستەوخۆکان ببەخشرێت، لەوانە ئەو رەسمی مانەوەیەی، کە بەسەر بیانییەکاندا دەسەپێنرێت، رەسمی گومرگ و باجی پاککردنەوەی شەقامەکان، کە لە هەندێك ولاتدا دەسەپێنرێت.

هەروەها کەسی دبلۆمات لەو باجی دەرامەتە دەبەخشرێت، کە بەسەر هاووڵاتییان و بیانییەکانیشدا دەسەپێنرێت، بەڵام بەو مەرجەی کە دبلۆماتەکە لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە نەبێت کە کاری تێدادەکات، واتە ئەگەر لە هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە بوو دەتوانێت ئەو باجەی لێ بسەنێت، تەنانەت ئەگەر دەوڵەتی خاوەن باڵوێزخانەکەش ئەو باجەیان بەسەردا بسەپێنێت و داواش لە دەوڵەتی میواندار بکات، کە ئەو باجەیان لێ نەسەنێت.

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص١٦٦.

هەروەها کەسی دبلۆمات لەو ررەسمەی فرۆکەخانە دەبەخشرێت، کە لەو هاوولاتی و بیانیانە دەسێنرێت، کە هاتوچۆی لێوە دەکەن. ئەمە وێڕای بەخشین لە باجی خانووبەرە لەو خانووانەی کە موڵکی حوکومەتە بیانییەکانن و لەلایەن باڵوێزخانەو کونسولگەرییەکانیانەوە وەك فەرمانگەو خانووی نیشتەجێبوون بەکاردەهێنرێن. ئەمە وێڕای باجی ئەو رەسمە گومرگییانەی بەسەر کەلوپەلی ناوماڵدا دەسەپێنرێن، هەروەها باجی کەلوپەلی کەسی و باجی سەپێنراو بەسەر ئۆتۆمبێلدا(١).

لێرەدا دەپرسین: ئەی کەسی دبلۆمات چ جۆرە باجێك دەدات؟

**پێویستە دبلۆماتکار ئەم باجانە بدات:**

أ. ئەو باج، یان رەسمە ڕاستەوخۆیانەی کە لە بەرانبەر شتێکدا، یان خزمەتگوزارییەکدا دەسەندرێن، کە پێشکەش دبلۆمات دەکرێن، وەك: کرێی ئاو و کارەبا و چارەسەری پزیشکی.

ب. رەسم و باجی تۆماری خانووبەرە، مەگەر خانووبەرەکەی بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتەکەی کڕیبێت و بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتەکەی بەکاری بهێنێت.

ج. باج و رەسمە ناڕاستەوخۆکان، کە بریتین لەوانەی کە پێشوەختە بەسەر ئەو شمەك و خزمەتگوزارییانەدا سەپێنراون، کە بە نرخێکی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٦٦-١٦٨. و: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ١٤٥-١٤٨.

یەکگرتووی دیاریکراو دەفرۆشرێن بە بەکاربەر بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات، وەك ئەو باجانەی، کە بەسەر شەکرو جگەرەو ...هتد دا دەسەپێنرێن.

د. ئەو باجانەی کە لەو دەوڵەتەدا بەسەر شتی جێماو (الترکات)دا دەسەپێنرێن، بەڵام پێویستە لەمەدا رەچاوی ماددەی (٤/٣٩) بکرێت، کە رێگەدەدات ئەوە سامانە گواستراوانەی دبلۆماتی کۆچکردوو بگوێزرێتەوە بۆ وڵاتەکەی، کە خۆی هەیبووەو لە وڵاتی میوانداردا پەیدای نەکردووە، بە مەرجێك ئەو دبلۆماتە هاووڵاتی خۆی نەبێت و لەو بیانییانەش نەبێت، کە بەهەمیشەیی لە وڵاتەکەیدا دەمێننەوە.

هـ. ئەو رەسم و باجانەی کە بەسەر ئەو داهاتە تایبەتییەدا دەسەپێنرێن، کە کەسی دبلۆمات لەو دەوڵەتەدا دەستی دەکەوێت، هەروەها ئەو باجانەی کە بەسەر ئەو سەرمایەیەدا دەسەپێنرێن، کە لە پرۆژەی بازرگانیدا لە خاکی ئەو دەوڵەتەدا وەبەردەهێنرێن.

و. رەسمی تۆمارکردن و بەبەڵگەنامەکردن (التوثیق) و بارمتە (الرهن)ی خانووبەرە و پوول و رەسمی دادوەریی سەبارەت بە سامانی خانووبەرەوە لەو داوایانەدا، کە بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بەرزی دەکاتەوە[١].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣٤)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

ز.   ئـەو بەخشـینانەی کـە بینـا و خانووەکـانی نێراوەکـە و سـەرۆکی دەوڵەتەکە دەگرنەوە، کە کڕیویانە، یان بەکرێ گرتوویانە، کە بریتین لـە رەسـم و گومرگـە نەتـەوەیی و هـەرێمی و شـارەوانییەکان، ئەگـەر لەبەرامبەر خزمەتگوزارییەکی دیاریکراودا نەبن، ئەو کەسانە ناگرنەوە، کـە گرێبەسـتیان لەگـەڵ دەوڵـەتی نێـرەر، یـان سـەرۆکی نێراوەکـەی بەستووە[1].

(١) بڕوانە: ماددەی (٢،١/٢٣)ی هەمان ڕێککەوتننامە وماددەی (٢٤)ی (ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان)ی ساڵی (١٩٦٩).

## باسی چوارەم: پارێزبەندیی دادوەری (الحصانة القضائية)

سەرەتا پێویستە بزانین مەبەست لە پارێزبەندیی دادوەری چییە؟ پارێزبەندیی دادوەری بریتییە لە بەخشین، یان ریزپەڕکردن، یان ملکەچنەبوونی کەسی دبلۆمات بۆ دەسەڵاتی دادوەریی ناوخۆیی ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراوەو کاری تێدادەکات.

دبلۆماتکار چوار جۆر پارێزبەندیی هەیە لەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات، ئەوانیش بریتین لە: (پارێزبەندیی مەدەنی"باری شارستانی"، پارێزبەندیی سزادان (حصانة جزائية)، پارێزبەندی لە دادوەریی ئیداریی، پارێزبەندیی لە شایەتیدان و جێبەجێکردنی ئەحکامەکان (الحصانة من أداء الشهادة وتنفيذ الأحكام).

### یەکەم: جۆرەکانی پارێزبەندیی دادوەریی (أنواع الحصانة القضائية)

چوار جۆری سەرەکیی پارێزبەندیی دادوەری هەیە، کە ئەمانەن:

### جۆری یەکەم: پارێزبەندیی دادوەریی شارستانی (الحصانة القضائية المدنية)

ملکەچنەبوونی نوێنەری دبلۆماسیی بۆ دەدگای دەوڵەتی میواندار، لە مەسەلە شارستانییەکاندا پشت بە دوو شت دەبەستێت[1]:

یەکەم: مانەوەی نوێنەری دبلۆماسی لەو دەوڵەتەدا، هەرچەندە ماوەکەشی درێژ بێت، مانەوەیەکی کاتییە و ئەرکەکەی لەسەری پێویست دەکات. شوێنی مانەوەی جێگیریشی لە دەوڵەتی نێرەردا بریتییە لە شوێنی

---

(١) د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٣٩.

بنەڕەتیی خۆی، بۆیە پێویستە ملکەچی ئەو دادگایانە بێت، کە لە شوێنی مانەوە بنەڕەتییەکەی ئەون.

دووەم: سروشــتی کارەکــەی لــە دەوڵــەتی میوانــداردا و پێویســتیی پارێزگاریکردنی لە سەربەخۆیی خۆی لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەیدا و پاراستنی مۆرکی سیفەتی نمایندەگی خۆی بۆ وڵاتەکەی، دژ دەوەستێت و ناگونجێت لەگــەڵ ڕێگــەدان بــە داوابەرزکردنــەوە لەســەری و دادگــاییکردنی وەك هەرکەسێکی ئاسایی لەبەردەم دادگاکانی ئەو دەوڵەتەی، کە ئەم کاری تێدادەکات.

مومارەسەکردنی دەسەڵاتی دادوەری، گوزارشتە لە مومارەسەکردنی دەوڵەت بۆ سەروەرییەکەی لەسەر هەرێمەکەی خۆی، بەڵام دبلۆمات لەو دەسەڵاتە ڕێزپەڕ دەکرێت، لەبەرئەوەی ئەرك و وەزیفەکەی وادەخوازێت.

کەسی دبلۆمات پارێزبەندی لەبەرانبەر دەسەڵاتی دادوەریی شارستانیدا هەیە لەو دەوڵەتەی، کە بۆی نێراوەو کاری تێدادەکات، بەڵام ئەو پارێزبەندییە ڕەها نییە وەك پارێزبەندیی دبلۆمات لە بەرانبەر دەسەڵاتی دادوەریی تاوان (جنائی)، بەڵکو زۆرێك حاڵەت هەن، کە دبلۆمات تێیاندا ملکەچی دەسەڵاتی دادوەریی شارستانی دەبێت.

بەگشتی کەسی دبلۆمات مافی پارێزبەندیی دادوەریی شارستانیی هەیە، جگە لە چەند حاڵەتێك. با بزانین ئاستی ئەو پارێزبەندییە دادوەرییە شارستانییە چۆنە، کە دبلۆمات هەیەتی.

پێش ئەوەی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندیی دبلۆماتییەکانی ساڵی (١٩٦١) دەربچێت، نەریتی نێودەوڵەتی لەسەر ئاستی ئەو پارێزبەندییە دادوەرییە جێگیر نەبووبوو، کە دبلۆمات هەیەتی. بۆیە هەندێك دەوڵەت لە

سـنووری کـاری وەزیفــەی فــەرمیی کەســی دبلۆماتــدا، ئــەو پارێزبەندییــەی دەبەخشـی بـە دبلۆمـات، ئـەویش بـە پارێزبەنـدیی دادوەریـی کۆتـدار (الحصـانة القضائية المقيدة) ناودەبرێت، هەندێك دەوڵەتی تر ئـەو پارێزبەندییـەی بـە کـارە فەرمی و تایبەتەکانی دبلۆمـات بەخشـیوە، ئەمـەش بـە پارێزبەنـدیی دادوەریـی رەها ناو براوە.

دوای دەرچــوونی ئــەو رێککەوتننامەیــە (رێککەوتننامــەی ڤیــەننا بــۆ پەیوەندییــە دبلۆماسـییەکانی سـاڵی ١٩٦١) و رێککەوتننامــەی ڤییــەننا بـۆ پەیوەندییــە کونسـوڵییەکان لـە سـاڵی (١٩٦٣)، و رێککەوتننامــەی نێـراوە تایبەتـــەکانی لـــە ســـاڵی (١٩٦٩)، پارێزبەنـــدیی کەســـی دبلۆمـــات و کونسـوڵگەرەکان بـوو بـە بابــەتێکی روون، هــیچ کـام لــەو رێککەوتنانــە جیاکارییان نەکرد لەنێوان ئەو کارو هەڵسوکەوتە فـەرمی و تایبەتانـەی، کـە نێراوی دبلۆمات لە دەوڵەتی میواندار ئەنجامی دەدات. دواتر دەقەکان چـەند ریزپــەڕێکیان هێنــاوە، کــە تایبــەتن بــەو کــارە تایبەتانــەی کــە دبلۆمـات پارێزبەندیی دادوەرییان تێیاندا نییە.

بــەپێی رێککەوتننامــەی ڤیــەننا بـۆ پەیوەندییــە دبلۆماسـییەکانی سـاڵی (١٩٦١) و رێککەوتننامــەی نێـراوە تایبەتــەکانی سـاڵی (١٩٦٩)، رێسـاکانی پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمات بەم رێسایانە دیاریدەکرێن[١]:

(١) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٨٣-١٨٤.

١. **كارو هەڵسوكەوتە فەرمییەكان:**

كەسی دبلۆمات پارێزبەندیی ڕەهای هەیە، سەبارەت بە كارو هەڵسوكەوتە فەرمییەكانی، مەبەستیش لە كارو هەڵسوكەوتە فەرمییەكان ئەو ئەركانەیە كە پەیوەندییان بە كاری پەیوەست بە باڵوێزخانەكەوە هەیە. پشتبەست بەوە، دبلۆمات سەبارەت بە مامەڵە فەرمییەكانی پارێزبەندیی دادوەری مەدەنیی لەو داوایانەدا هەیە، كە سەرچاوەی پابەندبوونەكە گرێبەستێك بێت، جا ئەو گرێبەستە سەبارەت بە موڵكدارێتیی خانووبەرەیەك (عقار) بێت (وەك كڕین و بەخشین و بەكرێدان لەو دەوڵەتەی، كە كاری تێدادەكات)، یاخود شتە گواستراوەكان (المنقولات)ی وەكو ئەساس و پێداویستیی بەكارهێنان بۆ مەبەستی باڵوێزخانەكە، هەروەها ئەو كارە خزمەتگوزارییانەی، كە پەیوەندییان بە باڵوێزخانەكەوە هەیە، یاخود تایبەتن بە خانووی كەسی دبلۆماتەوە. هەروەها دبلۆمات پارێزبەندیی دبلۆماسیی هەیە لەو كاروبارە بازرگانییانەدا، كە پەیوەستن بە ئەوراقی بازرگانیی تایبەت بە كاری فەرمیی.

٢. **كارو هەڵسوكەوتە تایبەتەكان:**

كارو هەڵسوكەوتە تایبەتەكان ئەوانەن، كە پەیوەندییان بە كاری فەرمیی دبلۆماتەوە نییە، بەڵكو بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی ئەنجامیان دەدات. دبلۆمات لەو كارو هەڵسوكەوتانەشدا پارێزبەندیی دادوەریی هەیە، جگە لە چەند ڕێزپەڕێك كە دبلۆمات تێیاندا پارێزبەندیی دادوەریی شارستانیی نییە، هەر بۆیە پارێزبەندیی تایبەت بە كارو هەڵسوكەوتە تایبەتەكان بە پارێزبەندیی كۆتدار (الحصانة المقیدة) ناودەبرێت، واتە هەندێك داوای تایبەت هەن، كە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی نییە تێیاندا.

ئەو ڕێسایەی کە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) هێناویەتی، ئەوەیە کە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی هەیە سەبارەت بەو کارو هەڵسوکەوتانەی، کە پەیوەندییان بەکاروباری تایبەتی خۆیەوە هەیە، بەڵام ڕێککەوتننامەکە چەند ڕێزپەڕێکی هێناوە بۆ ئەو پارێزبەندییە، چونکە کەسی دبلۆمات لە چەند مەسەلەو حاڵەتێکدا ملکەچی دەسەڵاتی دادوەریی دادگا نیشتمانییەکان دەبێت لە دەوڵەتی میوانداردا، لێرەدا چەند نموونەیەك لەو مەسەلانە باسدەکەین[1]:

أ. **داوای تایبەت بە موڵك و خانووبەرە (الدعاوى العينية العقارية):**

نەریتی نێودەوڵەتی لەسەر ئەوە جێگیر بووە کە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی لەو داوا عەینییانەدا نییە، کە پەیوەستن بە خانووبەرەوە. ئەو داوایانەش کە پەیوەستن بە مافە عەینییەکانەوەو دبلۆمات پارێزبەندیی دبلۆماسیی نییە لە بەرانبەریاندا بریتین لە مافە عەینییە بنەڕەتییەکان (الحقوق العينية الأصلية)ی وەك مافی موڵکداریێتی و مافی هەڵسوکەوتکردن (حق التصرف) و بەکارهێنان (الاستعمال) و نیشتەجێبوون (السكنى) و مافی بەکرێگرتنی ماوەدرێژ (حق الإجارة الطويلة). هەروەها مافە عەینییە تەبەعییەکان (الحقوق العينية التبعية)ی وەك مافی بەرەهنگرتن بۆ دڵنیایی (حق الرهن التأميني)، و مافی بەرەهنگرتنی بەکارهێنان (حق الرهن الحيازي)، و مافی ئیمتیاز[2].

---

(١) بڕوانە: ن.م، ص ص١٨٤-١٨٨.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/٣١/أ)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

کەواتــە پارێزبەنــدیی دادوەریــی نابەخشــرێت بــە دبلۆمــات لــەو داوا عەینییانەدا، کە پەیوەستن بە خانووبەرە، ئەگەر ئەم مەرجانە بێنەدی[١]:

١. ئەگەر داواکە پەیوەست بێت بە خانووبەرەوە، بـەڵام ئەگـەر داواکـە پەیوەست بوو بە شـتی گـوازراوەوە (المنقـول)، ئـەوا دبلۆمـات پارێزبەنـدیی دادوەریی هەیە تێیاندا.

٢. پێویسـتە خانووبەرەکـە لەسـەر خـاکی ئـەو دەوڵەتـە بێـت، کـە دبلۆماتەکە ئیشی لێ دەکات، واتـە ئەگـەر لـە دەرەوەی سـنووری دەوڵـەتی میواندار بێت، ئەوا دبلۆمات پارێزبەنـدیی دادوەریـی هەیـە تێیانـدا، جـا ئـەو خانووبەرەیە لە دەوڵەتی دبلۆمات بێت، یان لە دەوڵەتێکی تر.

٣. پێویسـتە داواکـە پەیوەنـدیی هـەبێت بـە مـافێکی عەینییـەوە، کـە لەسەر خانووبەرە بێت، بۆ ئـەوەی دبلۆمـات ئـەو پارێزبەندییـە دادوەرییـەی نەبێت، وەك فرۆشتنی خانووبەرە، یـان بـەرەهنگرتنی. بـەڵام ئەگـەر داواکـە پەیوەندی بە مافـە کەسـییەکان (الحقـوق الشخصـية) بەسـەر خانووبـەرەوە هەبوو (وەك بەکرێدانی خانووبەرە، یان پاسەوانیگرتنی، یان بریکـارییکردن) ئەوا دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەری تێیاندا هەیە.

٤. پێویســتە خانووبەرەکــە لــەژێر دەســتی دبلۆماتەکــەدا بێــت بــۆ بـەکارهێنانی شەخسـیی خـۆی، بـەڵام ئەگـەر موڵکەکـەی لـەبری دەوڵـەت لـەژێر دەستدا بوو (حيازته للعقار نيابـة عـن الدولـة) ئـەوا پارێزبەنـدیی داوەریـی هەیـە تێیدا.

---

(١) بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٨٥.

**ب. ئەو داوایانەی پەیوەندییان بە میرات و جێماوەوە هەیە (الدعاوى المتعلقة بالميراث والتركات):**

میرات لە زاراوەی زانایان (الفقهاء)دا بریتییە لە: ڕێساگەلێك لە فیقهو حساب، کە بە هۆیانەوە دەزانرێت کێ میرات دەبات و بەشی هەریەکێك لە میراتگران لە جیماوەکە چەندە. بەڵام جێماو (التركة): بریتییە لەو ماڵ و سامانەی، کە کەسی کۆچکردوو لەدوای بەجێ دەمێنێت و تەنها ماڵی خۆی بووە.

ڕێککەوتننامەی ڤییەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) ئەو داوایانەی لە بازنەی پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمات دەرکردووە، کە پەیوەندییان بە کاروباری میرات و جێماو (التركات)وە هەیە[(١)].

لەراستیدا ریزپەڕکردنی ئەو جۆرە داوایانە لە پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمات نە لە رابردوودا ڕوویداوە، نە لەسەر یەکێك لە ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی وەستاوە، نە رای زانایانیش پشتگیری کردووە،نە کارو مومارەسەی نێودەڵەتی لەسەری ڕۆیشتووە، نە یاسا جۆراوجۆرەکانیش کاریان پێکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە بڕیاری هەندێك لە دادگاکان پارێزبەندیی دادوەرییان داوە بە دبلۆمات لەو داوایانەدا، کە پەیوەندییان بە میرات و جێماوەوە هەبووە[(٢)].

بەڵام لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی قەناعەتی بەوە کرد، کە ئەم ریزپەڕە بخاتە ناو پڕۆژەکەیەوە لەبەر چەند ئیعتیبارێك، کە پەیوەندییان بە ئەحکامەکانی یاسای نێودەوڵەتیی تایبەتەوە هەیە، چونکە بەپێی ئەو یاسایە

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٣١/ب)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٨٦.

"گواستنەوەی جێماو و بەڕێوەبردنی" ملکەچی یاسای شوێنی خانووبەرەکە کردووە، ئەمەش لەپێناو لەکارنەخستنی ئەو ڕێوشوێنانەیە کە تایبەتن بە میرات، وێڕای ئەمە دبلۆمات زیان لەو داوایانە ناکات، کە پەیوەندییان بە میرات و جێماوەوە هەیە، چونکە دادگاکانی دەوڵەتی میواندار زۆربەی کات ئەو ڕێسا بابەتییە بیانییانە جێبەجێ دەکات، کە پەیوەستن بە میرات و جێماوەوە. هەندێکجاریش یاسای دەوڵەتی دبلۆماتەکە جێبەجێ دەکەن، ئەگەر ئەو کەسەی کە کۆچیکردووەو سامانی لەدوای خۆی جێهێشتووە ڕەگەزنامەکەی وەك ڕەگەزنامەی دبلۆماتەکە بێت[١].

بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە ڕێککەوتننامە ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان هەموو داوایەکی پەیوەست بە میراتەوەی ملکەچی یاسای دادگاکانی دەوڵەتی میواندار نەکردووە، بەڵکو ئەو داوایانەی بە چوار حاڵەتەوە بەستووەتەوە، کە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی نییە تێیاندا، بەڵام بە مەرجگەلێکی دیاریکراو، کە پێویستە لەو حاڵەتانەدا بوونیان هەبێت. هەرچی حاڵەتەکانی ترە کە ڕێککەوتننامەکە باسی نەکردوون ئەوا دبلۆمات پارێزبەندی دادوەریی لە بەرانبەریاندا نییە.

**کەواتە بەپێی ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١)، ئەو حاڵەتانەی کە پەیوەندیدارن بە میرات و جێماوەوەو دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی نییە لە بەرانبەریاندا بریتین لە[٢]:**

---

(١) م.ن، ص ص١٨٦-١٨٧.

(٢) م.ن، ص١٨٧.

١. ئەو حاڵەتەی، کە کەسی دبلۆمات جێبەجێکەری میرات و جێماوەکە (الإرث والتركة) بێت، واتە لەرووی یاساییەوە دبلۆماتەکە کەسی یەکلاکەرەوە بێت لە میراتییەکەدا.

٢. ئەو حاڵەتەی کە دبلۆمات بەڕێوەبەری جێماوەکە بێت، واتە بەرپرسی بەڕێوەبردنی بێت.

٣. ئەو حاڵەتەی کە دبلۆمات خۆی میراتگر بێت، واتە لەو کەسانە بێت کە مافی میراتبردنیان هەیە.

٤. ئەو حاڵەتەی کە کەسی دبلۆمات وەسیەتبۆکراو (موصى لـه) بێت، واتە بەپێی وەسیەتی وەسیەتکەرەکە بەشەمیرات وەربگرێت.

هەروەها بۆ ئەوەی کە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی لەم حاڵەتانەدا نەبێت کە باس کران، مەرجی ئەوە دانراوە کە ئەو داوایەی لەسەر دبلۆمات دەنووسرێت بە سیفەتی شەخسیی دبلۆماتەکە بنووسرێت، نەك وەك نوێنەری دەوڵەتەکەی، چونکە ئەگەر وەکو نوێنەری دەوڵەتەکەی داواکەی لەسەر بنووسرێت، ئەوا دبلۆماتەکە پارێزبەندیی دادوەری دەبێت.

**ج.ئەو داوایانەی کە پەیوەندییان بە چالاکیی پیشەیی و بازرگانییەوە هەیە (الدعاوى المتعلقة بالنشاط المهني والتجاري):**

مەبەست لە چالاکیی پیشەیی ئەو پیشانەیە، کە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە ژیانی کۆمەڵگەوە هەیە، وەك: پزیشکی و دەرمانسازی و پارێزەری و مومارەسەکردنی هونەر و نووسین و ڕۆژنامەگەری، بە مەرجێك مەبەست لێیان بەدەستهێنانی قازانجی ماددی بێت، کە بە پیشە ئازادەکان ناودەبرێن.

بەڵام چالاکیی بازرگانی ئەو چالاکییانەیە کە پەیوەندیی بە مومارەسەکردنی بازرگانییەوە هەیە، ئامانج لێی بەدەستهێنانی قازانجە، هەروەها ئاڵوگۆڕکردنی

ئـەوراقی بازرگـانی و پیشەسـازی و گواسـتنەوەو وەکالـەتی کـارو فرۆشـتن بـە مەزادی ئاشکرا و دروستکردنی خانووبەرەو دڵنیایی.

رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) دبلۆمـاتی لــە پارێزبەنــدیی دادوەری بێبــەش کــردووە ئەگــەر دبلۆمــات مومارەســەی چالاکیی پیشەیی و بازرگانی بکات، لەو دەوڵەتەی کە بۆی نێراوە[١].

هەمان رێککەوتننامە جەخت لەوە دەکاتەوە، کە دروست نییـە نوێنــەری دبلۆماسیی هەر جۆرە چالاکییەکی پیشەیی، یان بازرگانی بـۆ بەرژەوەنـدیی خۆی لە دەوڵەتی میوانداردا بکات[٢]، خۆ ئەگەر ئەو جۆرە کارانە بکات ئەوە سازشی لەو پارێزبەندییە دادوەرییە کردووە کە هەیەتی.

**جـۆری دووەم: پارێزبەنـدیی دادوەریـی سـزایی (لـە یاسـای سـزاکان) (الحصانة القضائية الجزائية)**

پارێزبەنــدیی دادوەریــی ســزایی هــەموو بەدواداچــوونە یاســاییەکان لــە بەرانبەر دبلۆماتدا دەوەستێنێت، نــە دەســتگیر دەکرێـت، نــە لێکۆڵینــەوەی لەگەڵدا دەکرێت، نە خۆی و نەماڵەکەشی دەپشکنرێت، نە دەستی بەسەردا دەگیرێت، نە هیچ رێوشوێنێکی تر لە بەرانبەریدا دەگیرێتەبەر.

رێسای گشتی ئەوەیە دبلۆمات ملکەچی یاسای ناوخۆیی دەوڵەتی خانـەخوێ نابێــت، جــا هــەر جــۆرە کــارێکی نایاســایی ئــەنجام دابێــت (تــاوان، کــەتن، سەرپێچی)، سزاکەشی هـەر جـۆرە سـزایەك بێـت (لەسـێدارەدان، بەنـدکردن بـە درێژایی تەمەن، زیندانیکردنی سوککراوو توندکراو، بەندکردن، غەرامە).

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٣١/ج)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

(٢) بڕوانە: ماددەی (٤٢)ی هەمان رێککەوتننامە.

## ١. سروشتی پارێزبەندیی دادوەریی سزایی:

زۆرن ئەو تیۆرانەی سروشتی پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمات دیاریدەکەن، بەڵام باوترینیان ئەوەیە کە پێیوایە ئەم پارێزبەندییە وەك کۆتێك وایە بۆ دەسەڵاتی دادوەری، واتە ئەو تاوانانەی کە دبلۆمات ئەنجامی دەدات لە دەرەوەی دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتی میواندان، هەروەها تاووتوێکردن و گەڕان بەشوێن ئەو پارێزبەندییەو سنوورەکەیدا نابێت لە یاسای سزاداندا بێت، بەڵکو دەچێتە چوارچێوەی یاسای ئوصولی دادگاکردنە سزاییەکانەوە (قانون أصول المحاكمات الجزائية)، ئەو پارێزبەندییە لەبەر ڕێگرێکی ئیجرائی بڕیاری لێ نەدراوە، ڕێگرێك کە وا بکات، کە نەتوانرێت هیچ ڕێوشوێنێك لە بەرانبەر دبلۆمات بگیرێتەبەر، تەنانەت ئەگەر تاوانێکیشی لەسەر خاکی ئەو دەوڵەتە ئەنجام دابێت، بۆیە ئەو پارێزبەندییە ریزپەڕ نییە بۆ ڕێسای هەرێمیبوونی یاسای سزایی (قاعدة إقليمية القانون الجزائي) بەڵکو ریزپەڕە بۆ دەسەڵاتی دادگا (ولاية القضاء) [(١)].

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە کەسی دبلۆمات پارێزبەندیی هەیە لە بەرانبەر هەموو ئەو سکاڵایانەی، کە لە دادگا تایبەتمەندەکان لە دژی تۆماردەکرێن.

لێرەدا بەخشین لە دادگای سزایی بە یەکێك لە ڕێساکانی سیستمی گشتیی هەژماردەکرێت، بۆیە دروست نییە دادگاکان سەرپێچیی بکەن، لە هەمان کاتدا دروست نییە دبلۆمات سازشی لێ بکات، چونکە ئەو بەخشینە مافێکی کەسی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شادية رحاب، الحصانة القضائية الجزائية للمبعوث الدبلوماسي: دراسة نظرية وتطبيقية، جامعة الحاج لخضر – باتنة، كلية الحقوق والعلوم القانونية، أطروحة دكتوراه غير منشورة، ٢٠٠٦، ص ص٦١-٨٣. و: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص ١٨٩-١٩٠.

نییـه، بـەڵکو مـافی ئـەو دەوڵەتەیـە کـە ناردویـەتی، هـەروەها هـەر هـەوڵێك بـۆ دادگـاییکردنی لەبـەردەم دادگـای هەرێمیـدا بـە پێشـێلکاریی سـەربەخۆیی ئـەو دەوڵەتە دادەنرێت، کە دبلۆماتەکە نمایندەی دەکات، بۆیە پێویسـتە دادگاکـان کاتێك داوایەکی سزاییان لەسەر دبلۆمـاتێکی بیـانی بـۆ بەرزدەکرێتـەوە، کـە لـە وڵاتەکەیاندا کاردەکات، ئەوا هەر کە زانیی ئـەو کەسـە دبلۆماتـە بڕیاربـدات، کـە ئەو دەسەڵات و تایبەتمەندیی بینینی ئەو داوایەی نییە[١].

کەواتـە مـافی دبلۆمـات لـە بـوونی پارێزبەنـدیی دادوەریـی وا دەکـات کـە دەوڵەت مافی جووڵاندنی داوای گشـتی لـە بەرانبـەردا نـەمێنێت، چـونکە ئـەو پارێزبەندییە ڕێگر دەبێت لە ملکەچبوونی دبلۆمات بۆ دەسـەڵاتی دادگاکـانی دەوڵەتی میواندار سـەبارەت بـەو تاوانانـەی، کـە لـە هەرێمەکەیـدا ئـەنجامی دەدات، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو پارێزبەندییە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە لە بەرزکردنەوەی داوا ڕێگردەبن[٢].

ئەو تەکییفە بۆ سروشتی پارێزبەندیی دادوەریی چەند خاڵێك دێنێتە دی، دیارترینیان[٣]:

أ. دبلۆمات کەسـایەتیی پـارێزراوە لـە هـەموو ڕێوشـوێنێکی تـر، بۆیـە دروست نییە بهێنرێتە بـەردەم دەزگاکـانی لێکۆڵینـەوە، یـاخود خـۆی، یـان ماڵەکەی بپشکنرێت، هەروەها نابێـت بـە شـێوەی ئیحتیـات دەسـت بەسـەر سامانیدا بگیرێت.

---

(١) شادية رحاب، م.ن، ص٩٧.

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص١٩٠.

(٣) م.ن، ص ص١٩٠-١٩١.

ب. ئەو پارێزبەندییە دادوەرییە سزاییەی، کە دبلۆمات لە دەوڵەتی میوانداردا هەیەتی، لە دادگاییکردنی لە دادگاکانی دەوڵەتەکەی نایبەخشێت.

ج. ئەو پارێزبەندییە دادوەرییە سزاییەی، کە دبلۆمات لە دەوڵەتی میوانداردا هەیەتی، واتای ئەوە نییە، کە سەرپێچیکردنەکانی بۆ یاسا دروستن، بەڵکو پێویستە پابەندی جێبەجێکردنی سیستم و یاساکان بێت.

د. ئەو پارێزبەندییە دادوەرییە سزاییەی کە دبلۆمات هەیەتی، رێگە بەوە دەدات، کە ئەگەر یەکێك لەلایەن دبلۆماتەکەوە تاوانی لەبەرانبەر ئەنجامدرا، مافی بەرگریی ڕەوای هەبێت لە دژی دبلۆماتەکە. بۆ نموونە: ئەگەر دبلۆماتەکە هەوڵی کوشتنی هاووڵاتییەکی دا، ئەوا هاووڵاتییەکە مافی بەرگریی رەوای لە ژیانی خۆی هەیە، تەنانەت ئەگەر ئەو بەرگریکردنە سەربکێشێت بۆ کوشتنی دبلۆماتەکە.

ه. ئەگەر دەوڵەت سازشی لە پارێزبەندیی دبلۆماتەکەی کردو بڕیارێکی دادوەریی لەبارەیەوە دەرچوو، دروست نییە بڕیارەکەی بەسەردا جێبەجێ بکرێت تەنها لەو کاتەدا نەبێت، کە دەوڵەتەکەی سازش بکات و رەزامەندیش بێت لەسەر **جێبەجێکردنی بڕیارەکە** بەسەریدا.

و. دادوەر دەسەڵاتێکی تەقدیریی نییە سەبارەت بەوەی کە کێ پارێزبەندیی دادوەریی هەیە، بەڵکو وەزارەتی دەرەکی لایەنی پەیوەندیدارەو پشتبەست بە بەڵگەنامەکانی بڕیار لەوە دەدات، کە کێ سیفەتی دبلۆماسی و دواتر پارێزبەندیی دادوەری هەیە، کاتێکیش وەزارەت دادگای لەوە ئاگادارکردەوە، کە کەسی داواکراو پارێزبەندیی دادوەریی هەیە، ئەوا پێویستە دادگا داواکە دابخات، بەبێ ئەوەی مافی تانەدانی هەبێت لە بڕیاری وەزارەتی دەرەکی.

### ٢. ئاستی پارێزبەندیی دادوەری (مدى الحصانة القضائية):

زۆرینـەی نووسـەران بڕوایـان وایـە، کـە دبلۆمـات پارێزبەنـدیی دادوەریـی رەهـای هەیـە لـە کاروبـارە سـزاییەکاندا، سـەبارەت بـەو تاوانانـەی کـە لـە دەوڵەتی میوانداردا ئەنجامی دەدات، جا ئـەو تاوانـەی بـە سـیفەتی فـەرمی، یان تایبەتی (نافەرمی) ئەنجام دابێت جیاوازیی نییە، هەروەها جیاوازی نییە ئەو تاوانەی ئەنجامی دەدات تاوان (جناية)، یان کەتن (جنح)، یان سەرپێچی (مخالفة) بێت، یاخود تاوانێکی مەترسیدار، یـان ئاسـایی بێـت، یـاخود لـەو تاوانانە بێت، کە دەسـتی تێیـدا هـەبووبێت، یـان بـە فـەرمانی دەوڵەتەکـەی ئەنجامی دابێت، یان بەتەواوی ویستی خۆی ئەنجامی دابێت(١).

لایەنگرانی پارێزبەندیی دادوەریـی رەهـا لـە کاروبـارە سـزاییەکاندا بـەوە پاساوی بۆ دەهێننەوە، کە ئەو پارێزبەندییە لە گـرنگترین ئـەو پارێزبەندییـە دادوەرییانەیە، کە دبلۆمات هەیەتی و پێویستە، چـونکە دوور لـە سانسـۆری دەسـەڵاتی ئـەو دەوڵەتـەی کـە کـاری تێـدادەکات، مومارەسـەکردنی کـاری وەزیفەکەی بۆ ئاساندەکات، هەروەها گرێنتیـی سـەربەخۆیی و نەکەوتنـەژێر کاریگەریی ئەو دەسەڵاتە دەکات، چونکە ئەگەر دروست بێت دەسەڵاتی ئـەو دەوڵەتە دبلۆمات دەستگیر بکات و تۆمەتباری بکـات بـەوەی، کـە تـاوانێکی ئەنجامداوەو پاشان دادگایی بکات و عقوبەیەکی جەزائی بەسـەردا جێبـەجێ بکـات، ئـەوا ئـەم کـارە رێگـر دەبێـت لـە ئـازادیی دبلۆمـات و دەیخاتـە ژێـر رەحمـەتی دەسـەڵاتی دەوڵـەتی میوانـدارەوە، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـە

(١) م.ن، ص١٩٢.

نهێنییەکانی دەوڵەتی دبلۆمات ئاشکرا،دەکرێت بە بیانووی گەڕان بەشوێن ئەو تاوانەی کە دەدرێنە پاڵی، یان ئەوانەی کە لە بارەگای کارەکەی، یان لە ماڵەکەیدا ئەنجامدرابێت[1].

هەروەها دادگاییکردنی لەبەردەم دادگای سزاداندا لەوانەیە هۆکارێك بێت بۆ ناوزڕاندن و تۆڵەکردنەوە لە دبلۆمات، بە مەبەستی سنووردانان بۆ چالاکییەکانی. لەبەر ئەوە سوودی رێزگرتن لە پارێزبەندییەکانی دبلۆمات، بەهای زیاترە لە سوودی سزادانی لەسەر تاوانەکان، چونکە ئەو نوێنەری وڵاتەکەیەتی و دەوڵەتێکی تر مافی سزادانی نییە.

***رەخنە:***

چەند نووسەرێك رەخنەیان لە پارێزبەندیی دادوەریی سزایی دبلۆمات گرتووە،گومانیان لە رەوایەتییەکەی هەیە. بڕوایان وایە کە کەموکوڕییەکەی بریتییە لە جیاکاریکردنی یاساکان لەسەر بنەمای پارێزبەندیی دبلۆمات، بە ئامانجی ئەوەی بتوانن بە باشی کارەکانیان ئەنجامبدەن، ئەمەش پێشێلکردنی مافی مرۆڤی لێدەکەوێتەوە[2]. بۆیە لێرەدا زۆر کەس مافخوراو دەبن، بەتایبەت کاتێك بەهۆی کاری دبلۆماتکارێکەوە، کە پارێزبەندیی دادوەریی سزایی هەیە، گیانی کەسانی تر دەکەوێتە مەترسییەوە.

هەندێك لە پسپۆڕان پێشنیازی جیاکردنەوەی کاتی تاوانەکە دەکەن، کە ئایا لە کاتی ئەنجامدانی کاری فەرمیدا بووە، یان نا؟ بۆیە داوادەکەن، کە ئەو

---

(١) م. ن.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. رحاب شادية، الحصانة الدبلوماسية للمبعوث الدبلوماسي وتأثيرها على حقوق الإنسان، م.س.ذ، ص ص١٩-٢١.

کارانـەی کـە لـەکاتی کـاری فەرمیـدا نییـەو تـاوانی لێدەکەوێتـەوە پارێزبەنـدیی نەدرێتێ. بەڵام دووبارە ئەم رایەش لەگەڵ دەقی رێککەوتننامەی ڤیەنناى سـاڵی (١٩٦١) دژ دەوەستێتەوە، بۆیە هەندێکی تر لـە توێـژەران پێشـنیاری ئـەوەیان کـردووە، کـە جیاکـاری بکرێـت لـەنێوان ئـەوەی ئایـا دبلۆماتەکـە کارەکـەی بەئەنقەسـت ئەنجامـداوە، یـان بەپێچـەوانەوە، چـونکە ناکرێـت بـۆ نموونـە: کەسێکی دبلۆمات لە شوێنێکی گشتیدا تەقە لە خەڵکی مەدەنی بکـات، یـان بـە شۆفێرەکەی بەخێرایی لە منداڵی بێتاوان بدات، تەنها بـەوەی بوترێـت کەسـێکی نــەخوازراوەو بنێرێتــەوە وڵاتــی خــۆی، بــەڵکو -بــە رای ئــەوان- پێویســتە پارێزبەنـدی لەسـەر هـەڵبگیرێت و بدرێتـە دادگـا، چـونکە مافـەکانی مـرۆڤ لـە کۆمەڵگـەو یاسـای نێودەوڵەتیشـدا پێگەیـەکی گـرنگ و پیرۆزیـان هەیـە، نابێـت دبلۆماتکاران بە بیانووی بوونی پارێزبەندییەوە پێشێلیان بکەن[١].

بـۆ ئەمـەش مـاددەی (١٠٣)ی کارنامـەی نەتەوەیـەکگرتووەکان دەکـەن بـە بەڵگە، کە جەخت لە باڵایی پرەنسیپی پارێزگاری لە مافـە بنەڕەتییـەکانی مـرۆڤ بەسـەر پابەنـدبوون بـە رەچـاوکردنی جیـاوك و پارێزبەندییـە دبلۆماسـییەکاندا دەکاتەوە، کە ئاماژە بەوە دەکات کـە: ئەگـەر ئیلتیزامـەکانی ئەنـدامانی نەتـەو یــەکگرتووەکان کــە بــەپێی ئــەحکامی ئــەم کارنامەیــە لەســەری دەڕۆن دژوەسـتانەوە لەگـەڵ هـەر ئیلتیزامێکـی نێودەوڵـەتی تـر، ئـەوا پێویسـتە بـەو ئیلتیزامانەوە پابەندبن، کە لە کارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکەوێتەوە.

بەڵام دبلۆماتێك کە تـاوان ئەنجامبـدات، مـافی پارێزبەنـدیی نییـەو نابێـت کـاری دبلۆماسـیش بکـات، چـونکە ئـەوەی کـە دبلۆمـات و کەرامەتەکـەی دەپارێزێت بریتییە لە دوورکەوتنەوەی لە خراپەو تاوان، هەرکاتێکیش ترسی

(١) شادية رحاب، الحصانة القضائية الجزائية للمبعوث الدبلوماسي، م.س.ذ، ص٩٩.

ئەوە هەبوو کە تۆمەتی بخرێتەپاڵ بۆ ئەوەی لەو رێگەیەوە فشاری بخرێتە سەر، ئەوا ئەو ترسە لە شوێنی خۆیدا نییە، چونکە هۆکارگەلێکی تر هەن بۆ فشاردروستکردن کە زۆر ئاسانتر و خێراتر و باشترن لە تۆمەتبارکردن، وە لەبەرئەوەی کە رێگریکردن لە دادگاییکردنی دبلۆمات نابێتە رێگر لە فشاردروستکردن لەسەری و کاریگەری خستنەسەری، ئەوا ئەو بەڵگەو پاساوانەی کە زانایان پشتی پێ دەبەستن بۆ رێگریکردن لە دادگاییکردنی دبلۆمات بە هیچ جۆرێك نابنە پاساو بۆ ئەو رێگریکردنە.

ئەمە وێڕای ئەوەی کە نوێنەری دبلۆماسیی یەکێکە لە هاوڵاتییانی دەوڵەتێکی بیانی و دەوڵەتیش مافی سزادانی هاوڵاتییانی بیانی هەیە، هەرکاتێك تاوانێکێکیان لەسەر خاکەکەی ئەنجامدا، هەروەها دروست نییە جێبەجێکردنی یاسا بەسەر دبلۆماتدا کارەکانی دبلۆمات پەکبخات مادەم ئەو رێزی یاسا دەگرێت و گوێڕایەڵی دەبێت و خۆی ناخاتە داوی یاساوە[١].

لەراستیدا ئەم رەخنەیە لە جێی خۆیدا نییە، چونکە ملکەچبوونی دبلۆمات بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتی میواندار لە مەسەلە سزاییەکاندا بەردەوام دووچاری تۆمەتبارکردنی دەکات بە ئامانجی فشارخستنە سەری بۆ هاوکاریکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی میواندار و درکاندنی زانیارییگەلێکی نهێنی دژی دەوڵەتەکەی خۆی. ئەمە وێڕای ئەوەی، کە گەڕان بە شوێن بەڵگەو دۆزینەوەی و سووکایەتیکرن بە رێزی کەسی و رێزی خانووی دبلۆمات بە بیانووی گەڕان بەشوێن بەڵگەی تاواندا بە پێشێلکردنی رێزی کەسی دبلۆمات و ئاشکراکردنی نهێنیی دەوڵەتەکەی هەژماردەکرێت.

---

(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص ١٩٣-١٩٤.

پێویستە ئەوە بڵێین کە دەوڵەتان دبلۆماتەکانی خۆیان لە کەسانی دەستپاك و بەرێز و بەرەوشت و بەهای بەرز هەڵدەبژێرن، دەگمەنە کە دبلۆمات ناوبانگی دەوڵەتەکەی توشی زڕان و زیان بکات، یان تاوان لە دەوڵەتی میوانداردا ئەنجامبدات، هەرکاتێکیش تاوانێکی ئەنجامدا، ئەوا گومان زیاتر بەلای ئەوەدایە، کە بە فەرمانی دەوڵەتەکەی ئەنجامی دابێت، بۆیە وڵاتەکەی بەپێی سروشتی تاوانەکە بەرپرسیارێتیی هەڵدەگرێت[1].

بەراستی لەلایەن فیقهو دادوەریشەوە کۆدەنگی لەسەر پارێزبەندیی دبلۆمات هەیە، لە مەسەلە سزاییەکاندا، هەروەها رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) پارێزبەندیی دادوەریی رەهای داوە بە دبلۆماتکاران لە مەسەلە سزاییەکاندا[2]. تەنانەت یاساکانی زۆربەی دەوڵەتانیش دانیان بەو پارێزبەندییەدا ناوە.

دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی سزایی لە نێراوە هەمیشەی و کاتییەکانیشدا هەیە. دبلۆمات ئەو پارێزبەندییە دادوەرییەی لەهەموو کاروبارە سزاییەکاندا هەیە، بەبێ سەیرکردنی جۆری ئەو تاوانەی کە ئەنجامدەدرێت، چونکە ئەو پارێزبەندییە هەموو ئەو تاوانانە دەگرێتەوە، کە ژیانی مرۆڤ و سەلامەتیی جەستەی بگرێتەوە، وەك: کوشتی بەئەنقەست و لێدانێك کە سەربکێشێت بۆ مردن، کوشتنیهەڵە، تاوانی بریندارکردن، لێدان، ئازاردانی بەئەنقەست و هەر تاوانێکی تر.

هەروەها فەرمانبەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی تریش پارێزبەندیی دادوەریی سزاییان هەیە، بەڵام تەنها لەو

---

(١) م.ن، ص١٩٤.

(٢) ماددەی (١/٣١)ی (رێککەوتنامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە کاری وەزیفەی فەرمییانەوە هەیە، واتە ئەو پارێزبەندییەیان نییە لەو تاوانانەی، کە لە کاتی کاری تایبەتییاندا ئەنجامی دەدەن، واتە ئەگەر یەکێکیان تاوانێکی لە دەرەوەی وەزیفەکەی خۆی ئەنجامدا ئەوا پارێزبەندیی دادوەریی سزایی نابێت[(١)].

### جۆری سێیەم: پارێزبەندیی لە دادوەریی ئیداریی (الحصانة من القضاء الإداري)

زۆربەی ئەو سەرپێچییانەی کە تووشی دبلۆمات دەبن ئەو سەرپێچییانەن کە پەیوەستن بەو سیستم و ڕێنماییانەوە، کە دەوڵەت بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی ڕۆژانە دەری دەکات.

لەبەر سادەیی ئەو تاوانەو زۆری ڕێژەکەیان، دەوڵەتان زۆرکات دەسەڵاتی سەپاندنی سزا بەسەر سەرپێچیکارانی دەدەن بە دامودەزگا کارگێڕییەکان، بۆیە هەندێك نووسەر بەو پارێزبەندییە دەڵێن (پارێزبەندی لە دادوەریی کارگێڕیی) کە لە بەرانبەر سەپێچیکردنی سیستم و ڕێنماییە کارگێڕییەکان دێتەبوون.

دیارترین ئەو سەرپێچییانە ئەوانەن، کە پەیوەستن بە ڕێنماییەکانی هاتوچۆ و ئۆتۆمبێل و سیستمە گشتییەکانەوە، کە بریتین لە[(٢)]:

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤) و ماددەی (١٨)ی ڕێککەوتننامەی جیاوك و پارێزبەندییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان)ی ساڵی (١٩٤٦)، بۆ دەقی ڕێککەوتننامەکە لە پێگەی فەرمیی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕوانە ئەم لینکەی خوارەوە: (بەرواری سەردان: ٢٠١٧/٣/١٠)
https://documents-dds-ny.un.org/doc
/RESOLUTION/GEN/NR0/032/73/IMG/NR003273.pdf?OpenElement

(٢) بڕوانە: م.ن، ص ١٩٦-١٩٩.

### ١. سەرپێچیکردنی سیستمی گشتی و هاتوچۆ:

سیستم و ڕێنماییە کارگێڕییـەکان کۆمەڵـە ڕێسـایەك لـەخۆ دەگـرن، کـە ئامانج لێیان پاراستنی سیستم و سەلامەتیی گشتییە لە دەوڵەتـدا، وەك ئـەو ئەحکامانەی کە تایبەتن بە بیناسازییەوە بـۆ پاراسـتنی ژیـانی هاووڵاتیـان و ڕەچـــاوکردنی ڕێکـــوپێکی و ســـتاییلی دیـــزایینی شـــارەکان. هـــەروەها ئەحکامەکانی تایبەت بە تەندروستیی گشتییەوە، هەروەها ئەو کۆتانەی کـە دەوڵـــەت دەیســـەپێنێت بـــۆ پاراســـتنی ئاساییشـــی شارســـتانی، وەك قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە چەند کاتێکی دیاریکراودا.

پێویسـتە دەوڵـەت ئـەو ڕێنماییانـە بـەبێ جیـاوازی بەسـەر هاوڵاتییـان و بیانییانی سەر خاکەکەیدا جێبەجێ بکات، بۆیە پێویسـتە دبلۆمـاتیش پێیانـەوە پابەندبێت، چونکە ئەو ڕێنماییانە بۆ پاراستنی کۆمەڵگـەو زامنکردنـی ئاسـاییش و ئـــارامی دانـــراون و کەســـی دبلۆمـــاتیش لێیـــان ســـوودمەند دەبێـــت. بـــەڵام سەرپێچیکردنی ئـەو سیسـتم و ڕێنماییانـە واتـای ئـەوە نییـە، کـە دبلۆمـات لـە پارێزبەندیی دادوەریی دادەڕنرێت، واتـە ئەگـەر سەرپێچیی ئـەو ڕێنماییانەشـی کـرد پارێزبەنـدیی دادوەریـی هـەر هەیـە، لـە حاڵـەتی سەرپێچیکردنی بـۆ ئـەو ڕێنماییانە ڕێوشوێنە ئاساییەکانی لەبەرانبـەردا ناگیرێتەبـەرو ئاگـادار ناکرێتـەوە بۆ ئامادەبوون لەبەردەم دادوەردا، بەڵام دیسانەوە ئەمە واتـای ئـەوە نییـە، کـە پابەند نابێت بە ڕێنماییە ئیدارییەکانی دەوڵەتی میواندار و ڕێزیان لێ ناگرێت.

لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی دەوڵەتان دبلۆماتکاری بیـانی ملکەچـی دەسـەڵاتی دادگـا ناوخۆییـەکانیان ناکـەن، لـەو سەرپێچـییە هاتوچـۆییانەی کـە لەسـەر خاکەکـەی ئـەنجامیان دەدەن، بـەڵام لێناگـەرێن کـە هەرچـۆنێك بیانـەوێت سەرپێچی بکەن، بەڵکو بۆیان هەیە هۆکاری پێویست بگرنە بەر بۆ ڕێزگرتن لـەو

ڕێنماییانەی کە دەریدەکەن، بۆیە زۆرێك لە دەوڵەتان کارێك دەکەن، کە زامنی پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی هاتوچۆوە بکەن[1]، لە گرنگترین ئەو کارانە[2]:

أ. هەندێك دەوڵەت یاداشتێك ئاڕاستەی نێراوە دبلۆماسییە بیانییەکان دەکەن، کە تێیدا داوا لە فەرمانبەرانیان دەکەن، کە پێویستە پابەند بن بە سیستم و ڕێنماییەکانی هاتوچۆوەو سەرپێچی نەکەن.

ب. هەندێك دەوڵەت مافی موڵکداریێتی، یان لێخوڕینی ئۆتۆمبیلێکی دیاریکراو بۆ دبلۆمات ڕەتدەکەنەوە، ئەگەر دڵنیا نەبن لەو ڕووداوانەی، کە لە ئۆتۆمبیلەکەی دەکەونەوە.

---

(١) لە عێراقدا، یاسای هاتوچۆی ژمارە (٨٦)ی ساڵی (٢٠٠٤)، بەشی چوارەمی تەرخان کردووە بۆ ڕیزپەڕە دبلۆماسی و کونسوڵییەکان. بەو پێیە فەرمانبەرانی سلکی دبلۆماسی و کونسوڵی ڕیزپەڕ دەکرێن لە بەشی سێیەمی هەمان یاسا بڕگەی ژمارە (١/ ب، ج، د)، لە پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی پێویست بۆ مۆڵەتی شۆفێری. واتە لەم بڕگانە بەخشراون لە بەشی سێیەم (توانست و پێویستییەکانی پێدانی مۆڵەتی شۆفێری) بڕگەی(١/ب): پێویستە ئەو کەسە بڕیارێکی دادوەری لەسەر دەرنەچووبێت, کە ڕێگری بکات لە لێخوڕینی ئوتومبێل. هەروەها (ج): پێویستە لەلایەن لیژنەیەکی پزیشکیی پسپۆڕەوە, کە وەزارەتی تەندروستی دیاریدەکات، پشتگیریی لایەنی تەندروستیی بکرێت. هەروەها (د): پێویستە تاقیکردنەوەیەکی هونەری سەبارەت بە لێخوڕینی ئوتومبێل و یاساکانی هاتوچۆ ببینێت، بەپێی جۆری ئەو مۆڵەتەی, کە دەیەوێت بەدەستی بهێنێت. لەبری ئەو مۆڵەتی لێخوڕینە، بەپێی یاساکە هەمان بڕگەی، پێویستە فەرمانبەری دبلۆماسی، یان کونسوڵی مۆڵەتێکی شۆفێریی نێودەوڵەتی، یان مۆڵەتێکی کارپێکراو، کە لە وڵاتەکەی، یان نیشتمانی دایکی دەچووبێت، پێشکەش بکات بە وەزارەتی دەرەوە (ی عێراق)، وەزارەتی دەرەوەش بەڵگەنامەیەکیان پێدەدات, کە ڕێگەیان پێدەدات ئوتومبێل لێبخوڕن. هەروەها بەپێی بەشی (حەوتەم/ بڕگەی ٢) —پشتبەست بە بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە- ئوتومبێلی فەرمانبەرانی سلکی دبلۆماسی و کونسوڵی ڕەسمی تۆمارکردنی ئوتومبێلیان لێ وەرناگیرێت.

بڕوانە: دەقی یاساکە لە پێگەی: (بەرواری سەردان: ٢٠١٧/٣/١٠)

http://www.iraq-lg-law.org/en/node/358

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص١٩٧-١٩٨.

ت. هەندێك دەوڵەت داوا لە نێراوی دبلۆماسیی دەکەن، کە ڕێوشوێنی تەئدیبی لە بەرانبەر دبلۆماتکاری سەرپێچیکەردا بگرنەبەر، یاخود بانگی دەکەن بۆ دیوانی وەزارەت و ئاگاداری دەکەنەوە، کە ئەو کارە دووبارەنەکاتەوە.

## ٢. ڕووداوی ئۆتۆمبیل[١]:

ڕووداوەکانی ئۆتۆمبێل دیارترین ئەو کێشانەن، کە دووچاری دبلۆماتکاران دەبنەوە، بەهۆی ئەو قوربانیانەی لێیان دەکەوێتەوە لە مردن و برینداربوون و...هتد.

ئەگەر دبلۆماتێك زیانی بە هاووڵاتییەك گەیاند ئەوا ئەو هاووڵاتییە مافی شوێنکەوتنی کۆمپانیاکانی دڵنیایی هەیە، بۆ دەستکەوتنی قەرەبووی گونجاو لێیان، هەروەها زیانمەند مافی ئەوە هەیە ڕاستەوخۆ داوا لەسەر کۆمپانیاکانی دڵنیایی (شرکات التأمین) بەرزبکاتەوە، چونکە ئەو کۆمپانیایانە ئەو بەرپرسیارێتییە مەدەنییە لەئەستۆ دەگرن، کە بەهۆی ڕووداوەکانی ئۆتۆمبێلەوە دەکەونەوە.

بەڵام کێشە لەو حاڵەتەدا ڕوودەدات، کە دبلۆماتەکە لە پرۆسەی دڵنیاکردنی ئۆتۆمبێلەکەیدا بەشدارنەبێت، بۆیە لەو حاڵەتەدا ڕێگەیەك بۆ ناچارکردنی بە قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووانی ڕووداوەکانی ئوتومبێل نییە، چونکە پارێزبەندیی دادوەریی سزایی ڕێگرە لەبەردەم داواکردنی ئەو قەرەبووە، هەر بۆیە هەندێك دەوڵەت بۆ مۆڵەتدان بە مولکدارێتیی

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص ص١٩٨-١٩٩.

ئۆتۆمبێـل، یـان لێخـوڕینی بـۆ دبلۆمـات مـەرجی ئـەوەی دانـاوە، کـە ئۆتۆمبیلەکەی بەشداربکات لە پڕۆسەی دڵنیایی (التأمین).

باڵوێزخانـەی هەنـدێك دەوڵـەت پـەنا بـۆ قەرەبووکردنـەوەی ئـەو زیانلێکەوتووانە دەبەن، لە ڕێگەی پێدانی برێك لـە پـارە کـە ڕازییـان بکـات، چـونکە ئەگـەر وا نـەبێت ئـەم حاڵەتـە سەردەکێشـێت بـۆ بێبەشـبوونی ژمارەیەکی زۆر لە زیانلێکەوتووان لە جیاوکەکانیان، ئەمـەش سەردەکێشـێت بۆ دروستبوونی کێشە لەنێوان هاووڵاتییانی خاوەن ماف و دبلۆماتەکان.

بەڵام ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتـەکان (١٩٦٩) داوای زیانلێکـەوتووانی ئەو ڕووداوانەی ئۆتۆمبێلی ڕیزپەڕ کردووە، لە پارێزبەندیی دادوەری، کـە لـە کاری تایبەتدا ڕوودەدەن و پەیوەندییان بەکاری فـەرمیی دبلۆماتـەوە نییـە. واتە دبلۆمات پارێزبەندیی دادوەریی سزایی هەیە سەبارەت بـە ڕووداوەکـانی ئۆتۆمبێـل و دروسـت نییـە، بـەهۆی سەرپێچـیکردنی ڕێسـاکانی هاتوچـۆوە دادگایی بکرێت، بەڵام دروستە لەبەردەم دادگادا داوای قەرەبووی ماددی لـێ بکرێـت لـەو زیانـەی، کـە بـەهۆی ڕووداوی ئۆتۆمبێلـەوە بـە هاووڵاتییـەکی گەیاندووە.

ئەو بارەی کە ئەم ڕێککەوتننامەیە باسیکردووە لۆجیکی و دادوەرانەیە و مافی زیانلێکەوتووان دەپارێزێت، بە ڕاستی پێویست وابوو، کە هەمان شتیش لە ڕێککەوتننامـەی ڤیـەننا بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان (١٩٦١)دا بـاس بکرایە.

## جۆری چوارەم: پارێزبەندی لە شایەتیدان و جێبەجێکردنی بڕیار (الحصانة من أداء الشهادة وتنفيذ الأحكام)[1]

بەپێی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان نوێنەری دبلۆماسیی لە شایەتیدان دەبەخشرێت[2].

ئەو پارێزبەندییەی دبلۆمات هەیەتی تەنها لەو بارانەدا نییە، کە داوا لەسەرتۆمارکراوە، یان تۆمەتبارە، بەڵکو هەموو ڕێوشوێنە دادوەرییەکانی تریش دەگرێتەوە، بۆیە دروست نییە ناچاربکرێت بە شایەتیدان لەبەردەم دەسەڵاتی دادوەریدا، جا داواکە شارستانی بێت، یاخود داوای تاوان (جنائی)، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات، خۆی سازش لەو پارێزبەندییە بکات، یان شایەتیدانەکە لە حاڵەتی دەستدرێژیکرنەسەریدا لە بەرژەوەندیی دبلۆمات بێت بە مەبەستی سزادانی تاوانباران.

هەروەها سازشکردنی دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات لە پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمات و ملکەچبوونی بۆ دەسەڵاتی دادگاکانی دەوڵەتی میواندار، واتای ئەوە نییە کە دەتوانرێت ئەو بڕیارەی لەبارەیەوە دراوە بەسەریدا جێبەجێ بکرێت، چونکە دبلۆمات پارێزبەندیی هەیە لە بەرانبەر جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی، کە لە بارەیەوە دەردەچن، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت کە دەوڵەتەکەی سازش لەو پارێزبەندییەش بکات، کە دبلۆمات لە بەرانبەر ڕێوشوێنەکانی جێبەجێکردندا هەیەتی.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٢٠٣-٢٠٧.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٢/٣١)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

**دووەم: ڕێگاکانی لێپێچینەوە لە کەسی دبلۆمات**

**(طرق مساءلة المبعوث الدبلوماسي)**

بەخشینی پارێزبەندیی دادوەریی بەپێی سیستمێکی گشتی بە کەسی دبلۆمات لەلایەن دەوڵەتی میوانداراەوە وەك پابەندییەکی نێودەوڵەتی، واتای ئەوە نییە کە ئەو ئیمتیازە ماف پێشێلکردنی سیستم و یاساکانی دەوڵەتی میوانداری دەداتێ هەرچۆنێك بیەوێت و دوورە لە هەموو لێپێچینەوەیەك، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دبلۆمات ملکەچی ڕێساگەلێك دەبێت کە زامنی سیستم و یاساکانی دەوڵەتی میواندارو ماف هاووڵاتییان دەکات، ماف هاووڵاتییانی خاوەن ماف دەپارێزێت. لێرەدا بە کورتی ڕێگاکانی لێپێچینەوە لە کەسی دبلۆمات باسدەکەین، کە بریتین لە[1]:

**١.ملکەچبوونی دبلۆمات بۆ دادگاکانی ئەو دەوڵەتەی کاری تێدادەکات:**

لە دوو حاڵەتدا دبلۆمات ملکەچی دادگاکانی ئەو دەوڵەتە دەبێت، کە بۆی نێراوەو کاری تێدادەکات، یەکەمیان حاڵەتی سازشکردنی دەوڵەتەکەیەتی لە پارێزبەندییە دبلۆماسییەکەی، دووەمیشیان بریتییە لە حاڵەتی پەنابردنی دبلۆمات بۆ دادگاکانی دەوڵەتی میواندار.

**٢. تۆمارکردنی داوا لە دادگاکانی وڵاتی خۆی:**

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) باسی لەوە کردووە، کە بوونی پارێزبەندیی دادوەریی بۆ دبلۆمات لە دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەتەکەی خۆی نایبەخشێت، بەمەش ڕێککەوتننامەکە بەپێی دابونەریتی نێودەوڵەتی ڕۆیشتووە.

---

(١) بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٢٠٨-٢١٥.

### ٣. ڕێگا دبلۆماسییەکانی لێپێچینەوە لە کەسی دبلۆمات:

بۆ پاراستنی پابەندبوون بە یاساو ڕێزگرتنی لەلایەن دبلۆماتەوە لە لایەك و پاراستنی کەسێتی دبلۆمات، دەوڵەتەکەی لە لایەکی تـرەوە، هـەروەها بـۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەنێوان پێویستی پاراستنی کەسی دبلۆمـات و ناوبـانگی خۆی و دەوڵەتەکەی لەلایەك و زایەنەبوونی ماف خاوەن مافان لـەلای کەسـی دبلۆمات لە لایەکی ترەوە، دەوڵەتان هەندێکجار پەنا بۆ ڕێگا دبلۆماسییەکان دەبەن بـۆ پاراسـتنی کەسـێتیی دبلۆمـات و گەڕانـەوەی مـافیش بـۆ خـاوەن مافان، بەتایبەت لەو حاڵەتانەدا کـە پرۆسـەی دادگـاییکردن کـارێکی ئاسـان نییە.

ئاسانترین و باوترین و کـاراترین ڕێگـای دبلۆماسـیش پەیوەندیکردنـە بـە وەزارەتـی دەرەکییـەوە و سـەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکەش فەرمانبـەرانی خۆی ئاگاداردەکاتەوە، کە بۆ پاراسـتنی پەیوەنـدیی دۆسـتانەی هـەردوولا و پاراستنی ناوبانگی وڵاتەکەیان پابەندبن، بەڕێزگرتنی یاسـاو ڕێسـاو ڕێنمـایی دەوڵەتی میواندارەوە.

لێرەدا پێویستە جیاکاری لەنێوان دوو حاڵەتدا بکەین:

یەکەم ئەگەر دبلۆمـات **کـارێکی فـەرمی** ئەنجامـدا و لـە ئاکامـدا کەسـێك زیانمەنـدبوو، ئـەوا کەسـی دبلۆمـات دووچـاری لێپێچـینەوە نابێـت لەلایـەن دەوڵەتەکەیـەوە، یـان لەلایـەن باڵوێزخانەکەیـەوە، چـونکە ئـەو کـارەی بـە فەرمان، یان بە ڕەزامەندیی دەوڵەتەکەی کـردووە، بـەڵکو دەوڵەتەکـە خـۆی قەرەبووکردنەوەی زیانمەندەکـە لەئەسـتۆ دەگرێـت، مـاف بـۆ دەگێڕێتـەوە. هەروەها زیانمەندەکە پەنا بۆ وەزارەتـی دەرەوەی دەوڵەتەکـەی دەبـات تـا ڕێوشوێنی پاراستنی مافەکانی بگرێتە بەر.

دووەم ئەو حاڵەتەیە کە ئـەو زیانـەی کـە کەوتووەتـەوە بـەهۆی **کـارێکی تایبەتی دبلۆماتەوە** بووبێت، نەك کارێکی فەرمی، لەو کاتەدا دەوڵەتەکەی، یـــان باڵوێزخانەکـــەی داوای لـــێ دەکـــات، کـــە کێشـــەکە بـــە دۆســـتانە چارەسەربکات. جاری واش هەیە وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی میواندار داوا لە باڵوێزخانەکە دەکات، کە بابەتەکە بە دۆستانەچارەسەربکرێت، بەڵام ئـەو داوایە پابەندکەر نییە، باڵوێزخانەکە دەتوانێت رەتیبکاتەوە، بـەڵام لـەرووی کردارییـــەوە زۆربـــەی کـــات باڵوێزخانـــەکان لـــەپێناو پاراســـتنی پەیوەندییـــە دبلۆماسییەکان بەباشی، پەنا بۆ چارەسـەری دۆسـتانە دەبـەن، جـاری واش هەیە وەزارەتی دەرەکیی دەوڵـەتی میوانـدار لـەپێناو پاراسـتنی پەیوەنـدیی دۆستانەی نێوانیان بڕیاری چارەسەرکردن، یان داخستنی دۆسییەکە دەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یـەکێك لـە رێککەوتننامـەی ڤیـەننا بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسییەکان (١٩٦١)و رێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان (١٩٦٩) باسیان لە دەستێوەردانی وەزارەتی دەرەکیـی هـیچ لایـەکیانییان نـەکردووە، بـەڵام پێویستیی کردارەکی ئەوەی خواستووە، ئـەویش بـۆ ئـەوەی لـە یـەك کاتـدا ماف بۆ خاوەن مافان بگێرێتەوە، رێزیش لە پارێزبەندیی دادوەریی دبلۆمـات بگیرێت.

## سێیەم: چوارچێوەی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەكان (نطاق الحصانات والامتيازات الدبلوماسية)

ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی كە دبلۆمات هەیەتی سیفەتی بەردەوامییان نییە، واتە نە بە درێژایی تەمەنی، بەردەوام دەبن و نە تا كۆتایی ماوەی بوونی لە راژەی دبلۆماسیدا بەردەوام دەبن، بەڵكو كاتین وبە كاتێكی دیاریكراو دەستپێدەكەن و كۆتاییان دێت.

هەروەك چۆن دبلۆمات ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی لە هەمووشوێنێكدا نییە، كە دبلۆماتی تێدا بێت، بەڵكو شوێنی دیاریكراویان هەیەو سنووری ئەو شوێنە تێیناپەڕێنێت كە بۆی دیاریكراوە، تەنانەت ئەگەر سیفەتە دبلۆماسییەكەشی بەردەوام بێت.

كەواتە لەرووی شوێن و كاتەوە ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی دبلۆمات هەیەتی دیاریكراون. ئەمەش لە دوو خاڵدا باسدەكەین:

### ١. سەرەتای جیاوك و پارێزبەندییەكان و كۆتاییهاتنیان[(١)]:

#### أ. كاتی دەستپێكی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەكان:

كاتێك دەوڵەتێك بڕیاری دامەزراندنی یەكێك لە فەرمانبەرە دبلۆماسییەكانی لە دەرەوە دەدات، پرسیارگەلێك دەورووژێت: ئایا ئەو جیاوك و پاراستنانەی ئەو دبلۆماتە هەیەتی كەی دەستپێدەكات؟ لە كاتی دەرچوونی بڕیاری دامەزراندنی نێراوە دبلۆماسییەكەوە؟، یان لە ساتی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢١٦-٢٢٢.

گەشتنییەوە بـە خـاکی ئـەو دەوڵەتـەی بـۆی نێـراوە؟ یـاخود لـە سـەرەتای دەستکردنی بە ڕاپەڕاندنی کارەکانی لەو باڵوێزخانەیەی کە بۆی دامەزراوە؟

لەرووی تیۆری و کردارەکیشەوە جیاوازییەك هەیە لەنێوان دەوڵەتاندا لەم بارەیەوە. بەڵام رای پەسەند ئەوەیە، کە دبلۆمات لە ساتی گەیشتنییەوە بە هـــەرێمی دەوڵـــەتی میوانـــدار بـــۆ وەرگـــرتنی پۆســـتەکەی ئـــەو مـــاف و پارێزبەندییانـــەی هەیـــە. ڕێککەوتننامـــەی ڤیـــەنناش بـــۆ پەیوەندییـــە دبلۆماسییەکان هەر بەو ئاڕاستەیەدا کاری کردووە.

بەڵام ئەگەر ئەو دبلۆماتـە لـەو هاوڵاتییانـەی ئـەو دەوڵەتـە بێـت، کـە لـە دەوڵەتی میواندار‌دا مابێتەوە (موقیم بێت)، ئـەوا دیسـان رای جیـاواز هەیـە، بەڵام رای پەسەند ئەوەیە کە ئەو ماف و پارێزبەندییانەی لەو کاتەوە هەیـە، کە وەزارەتی دەرەکی، یان هەر وەزارەتێکی تر کە لەسـەری ڕێککـەوتن لـە دامەزرانـدنی ئـەو دبلۆماتـە لـە باڵوێزخانەئاگاداردەکرێتـەوە، ئەگـەر لەسـەر هـەرێمی ئـەو دەوڵەتـەدا بێـت. ڕێککەوتننامـەی ڤیـەنناش بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسییەکان هەر بەو ئاڕاستەیەدا کاری کردووە.

بەڵام ئەم ئاڕاستەیە دووچاری رەخنە بووەتەوە، پوختەکەی ئەوەیـە کـە دەکرێت دەوڵەتی خاوەن دبلۆمات ئەو جۆرە دامەزراندنـەو ئـەو دیـاریکردنی سەرەتای کاتە بۆ جیاوك و پارێزبەندییەکان بە خراپ بەکاربهێنێت، لـەپێناو پاراستنی یەکێك لە هاووڵاتییانی خۆی لە دەرەوە لە دەسـتی دادگـا کاتێـك، کە تاوانێك ئەنجامدەدات، ئەویش بە رێگەی دامەزرانـدنی لـەو دەوڵەتـەدا لـە باڵوێزخانەی خۆی، واتـە لـەو دەوڵەتـەی، کـە ئـەو کەسـەی تێداماوەتـەوە، بۆئەوەی پارێزبەندیی دبلۆماسی بیگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر ئـەو کەسـە لـە دەوڵەتێکدا بـوو و فـەرمانی دامەزرانـدنی لـە باڵوێزخانەدا دەرچوو بۆ دەوڵەتێکی تر، ئەوا هەر لە ساتی ئاگادارکرانەوە لە دامەزراندنەکـەی ئـەو دبلۆماتـە جیـاوك و پارێزبەندییـەکانی هەیـە تـا لـەو دەوڵەتـە دەردەچـێت و دەگاتـە ئـەو دەوڵەتـەی بـۆی دامـەزراوە، هـەروەها ئەگەر لەبەر هەرهۆکارێك گەڕایەوە بۆ وڵاتەکـەی خـۆی پاشـان گەڕایـەوە،بۆ ئەو دەوڵەتەی بۆی دامەزراوە ئەوا جیاوك و پارێزبەندییەکەی هـەر بـەردەوام دەبێت.

ئەم حوکمە هەموو ئەنـدامانی نێـراوی دبلۆماسـیی دەگرێتـەوە، جگـە لـە سـەرۆکەکەی، چـونکە سـەرۆك تـەنها لـە رێککـەوتی رەزامەنـدیی دەوڵـەتی میوانـدار لەسـەر دامەزراندنەکـەی سـیفەتی دبلۆماسـی وەردەگرێـت، بـەڵام ئەندامەکانی تر لە رێککەوتی گەیشتنیان بە خاکی ئەو دەوڵەتە ئەو سـیفەتە دبلۆماسییە وەردەگرن.

### ب. کۆتاییهاتنی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکان:

جیاوك و پارێزبەندییـەکانی دبلۆمـات تـا کـاتی تـەواوبوونی کارەکـەی لـە دەوڵەتی میواندار بەردەوام دەبێت.

رێککەوتننامـــەی ڤیـــەننا بـــۆ پەیوەندییـــە دبلۆماســـییەکان کـــاتێکی دیاریکراوی دانەناوە بـۆ مـاوەی کـارکردنی دبلۆمـات لـە دەوڵـەتی میوانـدار، بەڵکو ئەو دیاریکردنەی جێهێشتووە بۆ یاسای ناوخۆیی دەوڵـەتان، زۆربـەی دەوڵەتانیش ئەو ماوەیە بە سێ ساڵ دیاریدەکەن.

زۆربەی زایانایان و لایەنی کرداریی دەوڵەتانیش بەو ئاڕاستەیەدا کاردەکەن، کە ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی دبلۆمات تەنها بە تەواوبوونی کارە دبلۆماسییەکەی، یان بە گەیشتنی ئاگادارکردنەوەی ئەوراقی بانگرکردنەوەی بە وەزیری دەرەکیی دەوڵەتی میواندار کۆتاییان نایەت، بەڵکو تا ماوەیەکی گونجاو بەردەوام دەبێت، تا بتوانێت کارە فەرمی و تایبەتەکانی لەپێش جێهێشتنی دەوڵەتی میواندار تەواوبکات.

رێککەوتننامەی ڤیەنناش بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان هەر بەو ئاڕاستەیەدا کاری کردووە، تەنانەت لە حاڵەتی بوونی ناکۆکیی چەکدارییشدا.

بەپێی رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان (١٩٦١) جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکان لەم حاڵەتانەدا کۆتاییان دێت(١):

– جێهێشتنی خاکی دەوڵەتی میواندار لەلایەن دبلۆماتەوە دوای گەیشتنی ئەوراقی بانگکردنەوەی بۆ وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتەکەی، تەنانەت ئەگەر دبلۆماتەکە ئەوراقی بانگکردنەوەکەی گەیشت بە وەزارەتی دەرەکی و خۆی لە دەرەوەی ئەو دەوڵەتە بوو کە کاری تێدادەکات، ئەوا حسابی ئەوەی بۆ دەکرێت کە ئەو دەوڵەتەی جێهێشتووە، جا جیاوازیی نییە کە لەو کاتەدا لە دەوڵەتی خۆیدا، یان لە هەر دەوڵەتێکی تردا بووبێت.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢/٣٩)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

- بەسەربردنی ماوەیەکی گونجاو لە دوای گەیشتنی ئەوراقی بانگکردنەوەکەی بۆ وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتی میواندار، ئەگەر خاکی ئەو دەوڵەتەی راستەوخۆ بەجێ نەهێشت.

بەڵام رێککەوتننامەکە دیاری نەکردووە، کە ئەو ماوە گونجاوە چەندە، بۆیە دەوڵەتان لە جێبەجێکردنیدا جیاوازن، بۆ نموونە: لە باری ئاساییدا (بەریتانیا) دوو مانگی داناوە، بەڵام دادگاکانی (فەرەنسا) بیست ڕۆژ و دادگاکانی (ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا) پێنج مانگیان بۆ دیاریکردووە.

لە بارە نائاساییەکانیشدا بە هەمان شێوە جیاوازی هەیە، بۆ نموونە: (سویسرا) لە کاتی پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانیان لە ساڵی (١٩٤٥)، سێ رۆژی مۆڵەت بە نێراوی (ئەڵمانیا) دا، لە (عیراقی)شدا بە هەفتەیەك، یان دوو رۆژ بەپێی بارودۆخ دیاریکراوە.

کەواتە دیاریکردنی ئەو "ماوە گونجاوە" بەپێی دەوڵەتان و بارودۆخەکان دەگۆڕێت.

بەڵام سەبارەت بە جیاوك و پارێزبەندیی ئەندامانی خێزانی دبلۆمات رێککەوتننامەکە باسی ئەو ماوە گونجاوەی نەکردووە، تەنها لە حاڵەتی وەفاتی دبلۆماتەکەدا نەبێت، ئەویش بۆ ئەوەی حاڵەتی خۆیان رێکبخەنەوە، دوای وەفاتی دبلۆماتەکە، خاکی ئەو دەوڵەتە جێبهێڵن، خۆ ئەگەر "ماوە گونجاوەکە" کۆتایی هات و دبلۆمات خاکی دەوڵەتی میوانداری

جێنەهێشتبوو، ئەوا لە سیفەتە دبلۆماسییەکەی دادەڕنرێت و وەك بیانییەکی ئاسایی مامەلەی لەگەڵ دەکرێت[١].

بەگشتی بەپێی ڕێککەوتننامەکە دروست نییە، دبلۆمات لەو کارانـەی کـە لە کاتی سیفەتداریی دبلۆماسییدا ئەنجامی داون لێپێچینەوەی لێ بکرێت.

## ٢. چوارچێوەی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکان لـەرووی شوێنەوە:

ئاشکرایە کە دبلۆمات ئەو جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییانەی کە بـۆی بڕیـاردراوە لـە دەوڵەتەکـەی خۆیـدا نییـەتی، بـەڵکو تـەنها لـەو دەوڵەتـەدا هەیەتی، کە بۆی نێراوە و کاری دبلۆماسـیی تێـدا ئەنجامبـدات، جیاوازیشـی نییە لە بارەگای نێراوە دبلۆماسییەکەدا لە پایتەخت ئەو کارە ئەنجامبـدات، یان لە شارێك، یان ناوچەیەك، لە مومارەسـەی کـاری فـەرمی، یـان تایبەتـدا بێت.

کاتێکیش کە دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، هەنـدێکجار پێویسـت دەکـات بە دەوڵەتی سییەمدا تێپەڕێت، بۆ ئەم حاڵەتە نـەریتی نێودەوڵـەتی زۆربـەی کـات تـەواوی جیـاوك و پارێزبەندییـەکان دەدات، بـە دبلۆمـات لـە کـاتی هاتوچۆکردنیدا بـۆ وڵاتەکـەی، چـونکە دەوڵـەتان بەرژەوەنـدیی هاوبەشـیان هەیە لەو ڕێنەگرتنە لـە کەسـی دبلۆمـات، واتـە ئەگـەر دەوڵـەتێك ئـەو کـارە نەکات دواتر بەرانبەرەکەشی هەمان کاری بەرانبەر دەکاتەوە.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣/٣٩)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

ڕێککەوتننامـەی ڤیـەنناش بـۆ پەیوەندییـە دبلۆماسـییەکان هـەر بـەو ئاڕاستەیەدا کاری کردووە، سەبارەت بە دبلۆمات و ئەندامانی خێزانەکەشـی، جیاوازیشـی نییـە ئەگـەر لەگەڵیـدا بـن، یـان بەتـەنیا بـن، بـە مـەرجێك پاسپۆرتەکانیان ڤیزەی ئەو دەوڵەتەی پێوە بێت کە پێیدا تێپەڕ دەبن.

خـۆ ئەگـەر دبلۆماتەکـە لـە پلـە پێشـکەوتووەکان بـوو، ئـەوا پێویسـتە دەوڵـەتی سـێیەم پێویسـتییەکانی تێپـەڕبوونی بـە خاکەکەیـدا بـۆ فەراهـەم بکات، هەروەها ئاسانکاری بۆ بکات و لە گومرگ بیبەخشێت.

بەڵام ئەگەر تێپەڕبوونەکەی بەدەوڵەتی سییەمدا بۆ مەبەسـتی خۆشـی و سەیران، یان مەبەستێك بـوو، کـە پەیوەنـدی بـە ئەرکـە دبلۆماسـییەکەیەوە نـەبوو، ئـەوا جیـاوك و پارێزبەنـدیی دبلۆماسـیی نابێـت، تەنانـەت ئەگـەر پاســـپۆرتی دبلۆماسییشـــی هـــەڵگرتبێت، تـــەنها کـــاری هاتنـــەناوەوەو چـوونەدەرەوەی لـەو دەوڵەتـە بـۆ ئاسـاندەکرێت، واتـە ئەگـەر تاوانێـك ئەنجامبدات ئەوا پارێزبەندیی دادوەریی نابێت.

# بەشی حەوتەم
# نێراوە کونسوڵییەکان

باسی یەکەم: پەرەسەندنی سیستمی کونسوڵیی

باسی دووەم: کونسوڵەکان

باسی سێیەم: ئەرك و کاری کونسوڵی

باسی چوارەم: جیاوك و پارێزبەندییە کونسوڵییەکان

باسی پێنجەم: کۆتاییهاتنی کاری کونسوڵ

## بەشی حەوتەم: نێراوە کونسوڵییەکان (البعثات القنصلية)

➢ ئامانج لە بابەتەکە:

١. ئاشنابوون بە بابەتی کونسوڵی و زانینی ئەو جیاوازییەی، کە لەنێوان دبلۆمات و کونسوڵدا هەیە لە هەموو ڕووەکانی پلەو ئیمتیازات و ڕۆڵ و کارکردنەوە.

٢. دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان کونسوڵگەری و باڵوێزخانەی وڵاتێك لە وڵاتێکی تردا.

٣. ئاشنابوون بە ئەرکە سەرەکییەکانی کونسوڵخانەو تێگەیشتن لەوەی، ئایا کاری دبلۆماسی گرنگترە بۆ وڵات یا کاری کونسوڵی.

٤. زانینی چۆنێتیی دیاریکردنی کونسوڵ و پلەکانیان و کاتی دەستپێکردنی کارەکانیان و تەواوبوونی و ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی کە هەیانە.

➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە:

**دەستپێك..**

نوێنەرایەتیی کونسوڵ بە کۆنترین نوێنەرایەتی دبلۆماسیی ئەژماردەکرێت، چونکە پەرەسەندنی سیستمی کونسوڵ وابەستەی پەرەسەندنی پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتان بووە، کە لەپێش پەیوەندییە دبلۆماسییەکاندا بوونی هەبووە.

لەگەڵ ئەوەی سیستمی کونسوڵیی ئێستا دانراوی ئەورووپای کۆنە، دەتوانین بڵێین سیستمی کونسوڵی لەگەڵ بوونی بازرگانیدا بوونی هەبووە.

پاشــان چــەندین قۆنــاغی بــەخۆوە بینیــوە تــا پەرەیســەندووەو ئــەرکی کونســولگەرانیش گــۆڕاوەو سیســتمی کونســولی ئەرکگــەلێکی دیــاریکراوی هێناوەتە کایەوە، بۆیە کوسولگەرانیش، لەپێناو ئەوەی بتــوانن کارەکانیــان بــە رێکــوپێکی ئەنجامبــدەن، جیــاوك و پارێزبەنــدیی دیــاریکراوی خۆیــان بۆدیاریکراوە(١).

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٢٣.

## باسی یەکەم: پەرەسەندنی سیستمی کونسوڵی

سیستمی کونسوڵی بە چەندین قۆناغی پەرەسەندندا تێپەڕیوە، ئێمە لێرەدا بەکورتی باس لە قۆناغەکانی ڕێکخستنی کونسوڵی دەکەین:

### یەکەم: کونسوڵی بازرگان و کونسوڵی دادوەر

سیستمی کونسوڵ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گریکە کۆنەکان لە سەدەی شەشی زاینی، کە لەو کاتەدا دەزگایەکی فەرمی سەر بە دەوڵەت نەبوو. لەبەرئەوەی دەوڵەتان گرنگییان بە کاروباری هاووڵاتیانی خۆیان لە دەرەوە نەدەدا، بیانییەکانی چەند دەوڵەتێکی جیاواز کەسێکیان لەنێوخۆیاندا هەڵدەبژاردو ئەرکی ئەوەیان پێدەسپارد، کە ببێتە نێوەندی ئەوان لە کاروباری دادوەری و گشتییەکاندا و چارەسەرکردنی کێشەکانیان لای دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی تێیدا دەژیان. بۆ نموونە: ئەو یۆنانییانەی کە لە (میسر)دا دەژیان سیستمێکی هاوشێوەیان پیادەدەکرد[١].

هەروەها دوای رووخانی ئیمپڕاتۆرییەتی رۆمای رۆژئاوا لە ساڵی (٤٧٦ز) (ئیمپڕاتۆرییەتی رۆمای رۆژهەلات) بوو بە ناوەندێکی بازرگانیی گرنگ،پەیوەندییەکانی درێژبوونەوە بۆ (فەڕەنسا) و (ئیتاڵیا) و شارە ئەوروپییەکانی تر، وای لێهات هەرگرووپێك لە بیانییەکان لە گەڕەکێکی تایبەتدا دەژیان، کە گەنجینەی کەلوپەل و شمەکەکانیان و نووسینگەی بەڕێوەبردنی کاروباری بازرگانییانی تێدا بوو، هەڵدەستان بە هەڵبژاردنی کەسێك لە رەگەزی خۆیان بۆ ئەوەی نمایندەیان بێت لەو دەوڵەتەی کە تێیدا دەمانەوە. دەوڵەتیش رێگەی پێدان هەرگرووپێك دادوەرێکی تایبەت بە خۆی

(١) م.ن، ص٢٢٤.

هەبێت، کە کاری بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان و چارەسەرکردنی کێشەکانیانی لەئەستۆدا بوو، کە لە سەدەی دوازدەدا پێی وترا (کونسوڵ)[1].

(ئیتاڵیا) لە ریزی پێشەوەی ئەو دەوڵەتانەدا بوو، کە لە (قوستەنتینە) کونسوڵی هەبوو. دواتر وایلێهات دەوڵەتان داوایان لە (دەوڵەتی ڕۆمانی) کرد، کە لەنێو هاووڵاتیانی نیشتەجێیان لەو دەوڵەتە دادوەرێك دیارییبکرێت بۆئەوەی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە لەئەستۆ بگرێت، کە لەنێوان ئەوان و هاووڵاتیانی ئەو ئیمپڕاتۆریەتەدا دروستدەبن.

جەنگی خاچپەرستان (١٠٩٥-١٢٧٢) یارمەتیدەر بوو بۆ بڵاوبوونەوەی سیستمی کونسوڵی بۆ دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست، لەوانە: (بەیروت، ئەنتاکیا، تەڕابلوس، قوبروس و ئیسکەندەرییە)[2]، تا وایلێهات دیاریکردنی کونسوڵ لەنێو ئەو کەسانەی کە هاووڵاتیی ئەو وڵاتانەن و لە وڵاتی بەرانبەر ماونەتەوە بوو بە شتێکی باو، کونسوڵگەلێکیان لێ هەڵدەبژاردن، کە بە "کونسوڵی دادوەر" و "کونسوڵی بازرگان" دەناسران، بۆ ئەوەی لە کێشەو ناکۆکییە بازرگانییەکاندا دادوەری بکەن. تەنانەت لە ساڵی (١٢٧٩) جۆرە کونسوڵێکی تر پەیدابوو، کە پێیدەوترا (کونسوڵە دەریاییەکان)، کە دادوەری فەرمی بوون و یاوەریی گەشتی کەشتییەکانیان دەکرد[3].

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص٢٨٣.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص٢٨٤.

(٣) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٦٨.

دواتــر دەســەڵاتی کونســوڵەکان لــە ڕێگــەی بەســتنی پەیماننامــەی جیاوکەکانەوە –کـە لـەنێوان وڵاتانـدا دەبەسـترا– فراوانترکـرا. بـۆ نموونـە: (بوندوقیە) لە ساڵی (١٤٥٤) و (فەڕەنسا) لـە سـاڵی (١٣٥٣) پـەیماننامـەیان لەگـەڵ (تورکیـا) بەسـت و دەسـەڵاتی بینـینی ئـەو کەیسـە شارسـتانی و سزاییانەیان دا بە کونسوڵەکانیان، کە هی ئەو هاوڵاتییانەی خۆیان بوو، کـە لە (تورکیا) مابوونەوە[1].

## دووەم: کونسوڵی نوێنەری دەوڵەت

لە ئەنجامی نەمانی سیستمی فیوداڵی و دەستگرتنی حوکومـەت بەسـەر کاروباری گشتیدا، لـە سـەرەتای سـەدەی شـازدەدا، لـە دوای پـەرەسـەندنی بارودۆخە سیاسـی و کۆمەڵایەتییـە نوێیـەکان و دەرکـەوتنی بیرۆکـەی نـوێی دەوڵەتــداری، سیســتمی کونســوڵی گوێزرایـــەوە بـــۆ ژێـــر ڕکێفـــی دەوڵەت،دەســەڵاتە دادوەرییەکــەی نــەما و ســیفەتێکی فــەرمی وەرگــرت، ئەمــەش یارمەتیـدەر بـوو بـۆ بووژانـەوەی ئـاڵوگۆڕی بازرگـانی و دۆزینـەوە جوگرافییەکان و پەرەسەندنی هاتوچۆو گەیاندنی نێودەوڵەتی.

لەبەر نەبوونی نێراوی دبلۆماسیی کـە هەسـتێت بـە ئـەرکی بـەڕێوەبردنی پەیوەندییــە نێودەوڵەتییــەکان، نێــراوە کونســوڵییەکان ئــەو ئەرکــەیان گرتەئەســتۆ، وایلێهـات کونسـوڵگەرییەکان هەڵدەسـتان بــە بــەڕێوەبردنی بەرژەوەندیی دەوڵەتان و پێگەیەکی یاساییان وەرگرت، ئەمەش وای خواست کە دەسـەڵاتێکی دیـاریکراوی هـەبێت، کـە یارمـەتی بـدات بـۆ بـەڕێوەبردنی

---

(١) بڕوانە: م.ن.

کارەکانی، بۆیە دەسەڵاتێکی فراوانی وەرگرت بۆ مومارەسەکردنی کارە دبلۆماسییەکان، هەروەها وای لێهات حوکومەتەکان کونسوڵەکانیان دیاریدەکرد، بۆئەوەی ببن بە نوێنەری خۆیان، نەك بۆ نوێنەرایەتیی بیانییەکان[1].

## سێیەم: کەمبوونەوەی سیستمی کونسوڵیی (تقليص النظام القنصلي)

دوای پەرەسەندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و بەردەوامبوونی کونسوڵەکان لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی دادوەری، و دەستگرتنی دەوڵەتان بە بنەمای سەروەریی دەوڵەتانەوە، وا پێویستی کرد، کە دەوڵەتان ئەرك و کاری کونسوڵەکان تەنها لەوەدا کورتبکەنەوە، کە بریتی بێت لە چاودێریکردنی کاروباری بازرگانی و پیشەسازی و چەند کارێکی تری دەوڵەتان و هاووڵاتیانیان، ئەمە لەگەڵ ملکەچبوونی ئەو کونسوڵانە بۆ دەسەڵاتی دادوەریی دەوڵەت، چونکە لە ئەنجامی فراوانبوونی پسپۆڕییەکانیان، کونسوڵەکان دەستیانکرد بە بەزاندنی سنووری کاری بنەڕەتیی خۆیان و دەستیان وەردەدا لە کاروباری نێوخۆیی ئەو دەوڵەتانەی، کە بۆی نێرابوون بۆیە دەوڵەتان پەییان بەوە برد، کە پێویستە سنوور بۆ دەسەڵاتیان دابنرێت، ئەمەش پاڵی نا بە دەوڵەتانەوە، کە کاروبارەکانیان کەمبکەنەوە بەتایبەت دەسەڵاتی دادوەرییان، بۆیە پەنایان بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکانیان برد[2].

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص ص٢٨٦-٢٨٧..

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص٢٢٥.

بەتايبەت ئەمە لەدواى دەركەوتنى چەمكى دەوڵەتى نەتەوە و دواتر سەرهەڵدانى نێراوە دبلۆماسييە هەميشەييەكان روويدا، پاش بەستنى پەيماننامەى ويستڤاليا (١٦٤٨)، كە بووە هۆى كەمبوونەوەى دەسەڵاتى كونسوڵەكان، چونكە ئەو پەيماننامەيە رێگرى لە كونسوڵەكان كرد، كە كارى دبلۆماسى بكەن، كە بە كارێكى سەرەكيى سەروەريى دەوڵەتان دانراو لەگەڵ سەروەريى هەرێمى دەوڵەتى پێشوازيكەردا نەدەگونجا[1].

## چوارەم: جياكردنەوەى سيستمى كونسوڵى لە دبلۆماسى (الفصل بين النظام القنصلي والدبلوماسي)

لە ئەنجامى پەرەسەندنى پەيوەندييە سياسى و ئابوورييە نێودەوڵەتييەكان و دەركەوتنى زۆرێك لە دەوڵەتان و پەرەسەندنى سيستمى دبلۆماسى و زيادبوونى پاشكۆ بازرگانييەكان لە نێراوە دبلۆماسييەكاندا، نێراوە دبلۆماسييەكان رێكخستنى ئەو پەيوەندييانەيان لەئەستۆ گرت، هەروەك چۆن دامەزراوە سەرمايەدارييەكان ئەوەيانلەئەستۆ گرت، كە پەيوەندى و مامەڵەى راستەوخۆ لەگەڵ كۆمپانيا بيانييەكاندا بكەن. بەمەش پێويستييان بە كونسولگەرييەكان لە دەرەوە نەما. هەروەها دەوڵەتە سۆسياليستييەكانيش ئەركى بەرێوەبردنى بازرگانيى دەرەكيى خۆى خستە ئەستۆى نێراوەكانى خۆى، ياخود دامەزراوە دبلۆماسييەكانى. لە ئەنجامدا كارى كونسولگەرى كورتكرايەوە بۆ چاودێريكردنى كاروبارى تاكەكان[2].

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٦٩-١٧٠.

(٢) د. سهيل حسين الفتلاوي، ام.س.ذ، ص٢٢٦.

بەم شێوەیە لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەوە رۆڵی کونسولْ گەڕایەوە، ئەویش لەژێر کاریگەریی شۆڕشی پیشەسازی و ئەو لێکەوتانەی کە پەیوەست بوون بە ئابووری و دانیشتووان و جوولەی بازرگانی و گواستنەوەو دەریاوانییەوە، کە وایانکرد رۆڵی کونسولْ گرنگی زیاتری پێبدرێت و بیووژێنرێتەوە. هەر ئەمەش وایکرد دەوڵەتان هەوڵبدەن جیاوك و پارێزیەندیی تایبەت بە کونسولْ، لە رێگەی پەیماننامەی دووانەییەوە لەنێوانیاندا، جێگیربکەن، یەکەم پەیماننامەش بۆ ئەو مەبەستە لە ساڵی (١٧٦٩) لەنێوان (فەڕەنسا) و (ئیسپانیا)دا بەستراو دواتر چەندین یاساو رێسای نێوخۆیی دەوڵەتان بۆ رێکخستنی کاری کونسوڵی دارێژرا[١].

ئەمە لەکاتێکدا کە پێشتر پەیوەندییە کونسوڵییەکان ملکەچی دابونەریتی نێودەوڵەتی بوون، بەڵام پەرەسەندنی پەیوەندییەکان دەوڵەتانی ناچارکرد، کە لەپێناو رێکخستنی کاری کونسوڵەکان و دیاریکردنی ئەرك و ماف و پارێزبەندییەکانیان پەیماننامەی دووانەیی و نێودەوڵەتی ببەستن. لەبەرئەوەی کە دابونەریتە نێودەوڵەتییەکان و رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی سەبارەت بە نوێنەرایەتیی کونسولگەری جیاواز بوون، ئەحکامەکانی رێکخستنی کونسولگەریش لە دەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی تر، بەپێی دابونەریت و رێککەوتننامەکان، جیاواز دەبوون.

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص١٩٨. و: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٧٠-١٧١.

**پێنجەم: بەیاساییکردنی کاری کونسوڵی**

**(ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان):**

لەگەڵ ئەوەی چەند هەوڵێك هەبووە بۆ بەیاساییکردنی نەریتە باوەکانی بواری کاری کونسوڵی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و بۆ داڕشتنی چەند یاسایەکی نوێ بۆ ئەو بوارە، لەوانە[1]:

- سەرەتا هەوڵەکان لە بوارێکی هەرێمیی بەرتەسکدا بوون، کاتێك لە ساڵی (١٨٩٦) (پەیمانگای یاسای نێودەوڵەتی) لە (برۆکسل) و (پاریس) پریاسایەکی تایبەت بە پارێزبەندیی کونسوڵەکان دەرکرد.
- (ڕێککەوتننامەی هاڤانا) کە لە کۆنگرەی شەشەمی دەوڵەتە ئەمەریکییەکان لە ساڵی (١٩٢٨) جێگیرکرا، کە (٢٥) ماددەی پەیوەست بوون بە مامەڵەی کونسوڵی و پارێزبەندییەکان، ئەمە وێڕای هەوڵە شکستخواردووەکانی ڕێکخراوی "کۆمەڵەی گەلان" بۆ بەیاساییکردنی ڕێسا کونسوڵییەکان. جگە لەم هەولانە، چەند هەوڵێکی تر هەبوون بۆ بەیاساییکردنی کاری کونسوڵی بە چاودێریی ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان، بەڵام وەکو پێویست سەرکەوتوو نەبوون. بەو شێوەیە تا دەیەی شەشەمی سەدەی بیستەم نەتوانرا ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی گشتگیر لەو بوارەدا مۆربکرێت.

لە ساڵی (١٩٦٣) لە شاری ڤیەننا کۆنگرەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان بەسترا، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی، کە بەشداربوون تێیدا گەیشتە (٩٢) دەوڵەت، لە ئەنجامدا (ڕێککەوتننامەی

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.ن، ص١٩٩. و: د. هاني الرضا، م.ن، ص١٧١.

ڤیــەننا بــۆ پەیوەندییــە کونســـوڵییەکان) و دوو پرۆتۆکــۆلی ئیختیــاریی لێکەوتەوە، کە یەکێکیان سەبارەت بە دەسخستنی رەگەزنامەو ئـەوی دیـش سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئیلزامییانەی ئەو ناکۆکییانـە بـوو، کـە لەسـەر چۆنێتیی جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکە دروستدەبن.

رێککەوتننامەکە ئەحکامە گشتییەکانی رێکخسـتنی سیسـتمی کونسـوڵی دیاریکرد، مافی دانانی هەر رێسایەکی تریشی بـۆ دەوڵـەتان بەجێهێشـت، کـە خۆیان بە باشی بزانن و بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان لەسەری رێکبکەون.

ئـــەم رێککەوتننامەیـــە ســـێ دەروازەی لـــەخۆگرتووە: یەکـــەمیان بـــە شێوەیەکی گشتی باس لە پەیوەندییە کونسوڵییەکان دەکات، دووەمیشـیان بـــاس لـــە ئاســـانکاری و مـــاف و پارێزبەندییـــەکانی نێـــراوی کونســـوڵی و کونسوڵەکان دەکات، هەرچـی سێیەمیشـە بـاس لـەو سیسـتمە دەکـات، کـە بەســـەر فەرمانبـــەرە کونســـوڵییە فەخرییـــەکان و ئـــەو نێـــراوە کونســـوڵیانەدا جێبەجێ دەکرێت، کە سەرپەرشتییان دەکەن.

هەروەها رێککەوتننامەکە تەبەننی (پشتیوانی)ی ئـەو دابونەریتـە بـاوەی کرد، کە لەنێو دەوڵەتاندا هەیەو تایبەتن بە کاری کونسولگەرییەوە.

لەراستیدا رێسا رێکخەرەکانی کاری کونسوڵی و یاسـای کونسـوڵی چـەند سەرچـاوەیەکیان هەیـە، کـە بـریتین لـە هەریـەك لـە رێسـا نێوخـۆیی و نێودەوڵەتییەکان. یاسا و رێسا نێوخۆییەکان، کـە جـۆر و ئاسـت و شـێوازی کـاری کونسـوڵەکان دیاریدەکـەن، کـە سەرچـاوەکانیان بریتییـە لـە یاسـای نێوخۆیی، هەرچی یاسا و رێسا نێودەوڵەتییەکانیشە سیستمی گشتیی کاری کونسوڵی دادەرێژن، کە سەرچاوەکەیان یاسـای گشـتیی نێودەوڵەتییـە، کـە

ئەویش لـە رێسـا نەریتییـەکان و رێککەوتننامـە کۆمـەڵی و دووانەییەکانـەوە سەرچـاوەی گرتـووە، هـەردوو ئاسـتە نێوخـۆیی و نێودەوڵەتییەکـەش تەواوکـەری یـەکترین و یاسـای کونسـوڵی پێکـدەهێنن[١]. کەواتـە یاسـای نێودەوڵەتی رێسا گشتییەکانی دیاریکردووە و وردەکارییـەکانی جێهێشـتووە بۆ یاسای نێوخۆیی، بۆیە پێویستە کونسوڵ ئاگـای لـە یاسـای نێودەوڵـەتی کونسـوڵی و یاسـای نێوخـۆیی وڵاتـی خـۆی و ئـەو وڵاتـەش بێـت، کـە بـۆی دەنێرێت.

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص ص٢٩١-٢٩٦.

## باسی دووەم: کونسوڵەکان

### یەکەم: دروستکردنی پەیوەندیی کونسوڵیی:

هەموو دەوڵەتێك دەتوانێت لەگەڵ دەوڵەتانی تردا پەیوەندیی کونسوڵی ببەستێت، ئەویش لەسەر بنەمای رەزامەندی و لە رێگەی رێککەوتنی نێوانیانەوە ئەنجامدەدرێت، واتە هەردەوڵەتێك لە بەستن، یان نەبەستنی پەیوەندیی کونسوڵی ئازادە، یان قبووڵکردن، یان نەکردنی داوای پەیوەندیی کونسوڵی لەلایەن وڵاتانی ترەوە، هەرچەند پێویستە دەوڵەتان رێگر نەبن لە هاریکاری و پەرەپێدانی بەرژەوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی لەگەڵ وڵاتانی تردا، مەگەر لەبەر هۆکاری جیددی تایبەت بێت، کە شیاوی ئەوەی بێت، کە لەپێناویدا بەستنی پەیوەندیی کونسوڵی رەتبکاتەوە[١].

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشەوە: ئایا پەیوەندییە کونسوڵییەکان پاشکۆی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانن؟

بە جۆرێك لە جۆرەکان، بەڵێ، چونکە ئەگەر لە بنەڕەتدا پەیوەندیی دبلۆماسیی لەنێوان دوو دەوڵەتدا هەبوو، ئەوا بۆ دروستکردنی پەیوەندیی کونسوڵی پێویست بە بەستنی رێککەوتننامەی تر ناکات، دەتوانرێت مومارەسەبکرێت، بەڵام ئەگەر هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەنێوانیاندا نەبوو، ئەوا بۆ دروستکردنی پەیوەندیی کونسوڵی پێویست دەکات، رێککەوتن بکرێت لەسەر دامەزراندنی پەیوەندیی کونسوڵی. ئەمە بەپێی رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان، کە ئاماژە بۆ ئەوە

---

(١) م.ن، ص ص٣٠١-٣٠٢.

دەکات، کە ڕێککەوتنی نێوان دوو دەوڵەت بۆ دروستکردنی پەیوەندیی دبلۆماسیی، ڕەزامەندییش لەخۆ دەگرێت لەسەر دروستکردنی پەیوەندیی کونسوڵی، ئەگەر لە ڕێککەوتنەکەدا پێوانەی ئەوە نەهاتبێت، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە پچڕانی پەیوەندیی دبلۆماسییەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پچڕانی پەیوەندییە کونسوڵییەکانی لێناکەوێتەوە[١].

هەر لە هەمان ڕێککەوتننامەدا هاتووە، کە بۆ دامەزراندنی کونسوڵخانە لە وڵاتی بەرانبەر پێویستە ڕەزامەندیی ئەو وڵاتە وەربگیرێت، هەروەها پێویستە بارەگای کونسوڵخانەکەو پلەکەی و بازنەی دەسەڵاتەکانی بە ئاگاداریی دەوڵەتی پێشوازیکەر و ڕەزامەندیی ئەو بێت، هەروەك چۆن پێویستە هەر گۆڕانکارییەك لە بارەگاکەیدا، یان لە دەسەڵاتەکانیدا پاش ڕەزامەندیی ئەو ئەنجامبدرێت، هەرکاتێکیش کونسوڵخانەیەکی گشتی، یان کونسوڵخانەیەك ویستی نوێنەرایەتییەکی کونسوڵخانە، یان بریکاریگەیەکی کونسوڵخانە، یاخود نووسینگەیەکی سەر بە کونسوڵخانەکە، لە ناوچەیەکی تردا بکاتەوە، پێویستە ڕەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر وەربگرێت[٢].

هەروەها بەپێی هەمان ڕێککەوتننامە پێویستە دەوڵەتی خانەخوێ لە چوارچێوەی یاسا و ڕێنمایی خۆیدا ئاسانکاریی بۆ دەوڵەتی میوان بکات، بۆ گرتنی باڵەخانە و شوێنی نیشتەجێبوونی کونسوڵەکان[٣].

---

**(١) بڕوانە: ماددەی (٢/ أ ، ب ، ج)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).**

**(٢) بڕوانە: ماددەی (٤)ی هەمان ڕێککەوتننامە.**

**(٣) بڕوانە: ماددەی (٣٠)ی هەمان ڕێککەوتننامە.**

هەر بەپێی ئەو ڕێككەوتننامەیە، پێویستە لەكاتی دانانی كونسوڵدا ئەم كارانە ئەنجامبدرێن[1]:

١. ئاگاداركردنەوەی وەزارەتی دەرەكی لە دانانی كونسوڵەكانی و ڕێككەوتی گەیشتنیان دوای دامەزراندنیان لە نێراوێكی كونسوڵیدا، ئەمە وێڕای ئاگاداركردنەوەی لە ڕێككەوتی جێهێشتنی كۆتاییان، لەكاتی تەواوبوونی كارەكانیان، هەموو گۆڕانكارییەكی گرنگ كە لە كاتی ڕاژەكەیاندا بەسەریاندا بێت.

٢. ئاگاداركردنەوەی وەزارەتی دەرەكی لە ڕێككەوتی گەیشتن و جێهێشتنی كۆتایی هەركەسێك لە خێزانی ئەندامانی نێراوە كونسوڵییەكە لەوانەی، كە لەگەڵیاندا ژیان بەسەردەبەن، هەر گۆڕانكارییەكی تری وەك لەدایكبوون و مردن و...هتد.

٣. ئاگاداركردنەوەی وەزارەتی دەرەكی لە ڕێكەوتی گەیشتن و جێهێشتنی كۆتایی و تەواوبوونی ڕاژەی ئەندامانی خزمەتگوزاریی تایبەت بە كونسولگەرییەكە لە كرێكار و پاسەوان و هونەرییەكان.

٤. ئاگاداركردنەوەی وەزارەتی دەرەكی لە بەكارهێنان و كۆتاییهێنان بەكاری كەسانێك، كە لەو دەوڵەتەدا ماونەتەوە كە كونسولگەرییەكەی لێیە، جا ئەندامانی نێراوە كونسوڵییەكە بن، یان ئەندامانی خزمەتگوزاریی تایبەت بن لەوانەی كە مافی بوونی ئیمیازات و پارێزبەندییان هەیە.

ژمارەی ئەو كونسوڵانەی، كە دەوڵەتێك دەتوانێت لە كونسولگەرییەكی خۆیدا دایان بنێت، بەپێی ئەو ڕێككەوتنە دەبێت كە لەنێوان ئەو دوو

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢٤)ی هەمان ڕێككەوتننامە.

دەوڵەتەدا دەکرێت، ئەگەر ڕێککەوتنێکیش لەو بارەیەوە بوونی نەبوو، ئەوا دەوڵەتی میواندار بۆی هەیە ژمارەکەیان لە سنوورێکی مەعقولدا دیاریبکات، لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخی باو و پێداویستییەکانی نێراوە کونسوڵییەکە.

**ئایا کونسوڵ دەتوانێت کاری دبلۆماسی ئەنجامبدات؟**

ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦٣) بەوردی باس لە ئەنجامدانی کاری دبلۆماسی، لەلایەن کونسوڵەوە بەم شێوەیە دەکات[١]:

أ. ئەگەر دەوڵەتی نێرەر نێراوی دبلۆماسیی لە دەوڵەتێکدا نەبوو، هەروەها نێراوی دبلۆماسیی دەوڵەتێکی سێیەمیش نوێنەرایەتی نەدەکرد، دروستە ڕێگە بە فەرمانبەرێکی کونسوڵی بدرێت، بە ڕەزامەنیی دەوڵەتی پێشوازیکەر و بەبێ ئەوەی سیفەتە کونسوڵییەکەی لەدەستبدات، کاری دبلۆماسی ئەنجامبدات، هەستانی فەرمانبەرە کونسوڵییەکە بەو کارانە مافی داواکردنی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەکانی ناداتێ.

ب. دروستە فەرمانبەرێکی کونسوڵی، پاش ئاراستەکردنی ئاگادارکردنەوەیەك بۆ دەوڵەتی پێشوازیکەر، کە بەو سیفەتەی نوێنەری دەوڵەتی نێرەرە لای ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کاربکات. کاتێکیش بەو کارە هەڵدەستێت، مافی بوونی هەموو ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی هەیە، کە یاسای نێودەوڵەتی نەریتی، یان ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بەو نوێنەرەی دەبەخشن، بەڵام سەبارەت بە ئەنجامدانی بۆ هەر کارێکی

(١) بڕوانە: ماددەی (١٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

کونسوڵی، مافی پارێزبەندیی دادوەری نییە زیاتر لەو پارێزبەندییەی، کە فەرمانبەرێکی کونسوڵی بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە هەیەتی.

کەواتە ئەگەر فەرمانبەری کونسوڵی، پاش ڕەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر، کاری دبلۆماسییش بکات، مافی داواکردنی پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییەکانی نابێت.

## دووەم: پلەی کونسوڵەکان

کونسوڵەکان بەپێی یاسا نێوخۆییەکان هەڵدەبژێرێن، ڕێسایەکی نێودەوڵەتییش، کە سنوور بۆ ئازادیی دەوڵەتان دابنێت نییە، سەبارەت بەو مەرجانەی، کە پێویستە لەو کەسانەدا کە دەکرێن بە کونسوڵ بوونیان هەبێت.

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکانی ساڵی (١٩٦٣) پلەی کونسوڵەکانی بەم شێوەیە دیاریکردووە[١]:

١. **کونسوڵی گشتی**: ئەو کەسەیە کە سەرۆکایەتیی کونسوڵگەرییەکە لەو دەوڵەتەدا دەگرێتەئەستۆ، کە بۆی نێراوە، و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دادەنرێت و هەموو ئەندامانی تری دەستەی کونسوڵگەرییەکە لەژێر سەرپەرشتیی ئەودا دەبن. لە کارەکانیدا چەند جێگرێکی کونسوڵی پسپۆڕ هاوکاری دەکەن، خۆ ئەگەر لە دەوڵەتی میوانداردا لە کونسوڵگەرییەك زیاتر هەبوو، ئەوا کونسوڵی گشتی سەرپەرشتیی هەموویان دەکات.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٩)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

٢. **کونسولْ**: کەسێکە دادەنرێت بۆ سەرۆکایەتیی لقێکی کونسولگەریی دیاریکراو، لەوانەی زیاتر لە شارو بەندەرەکاندا دەبن، کاتێك بارودۆخەکە وا دەخوازێت زیاتر لە کونسولگەرییەك هەبێت، بەپێی رێککەوتنی هەردوو دەوڵەتەکە.

٣. **جێگری کونسولْ**: کەسێکە دەنێرێت بۆ ئەو ناوەندە بازرگانییانەی، کە گرنگییەکی تا رادەیەك کەمیان هەیە، هاوکاریی سەرۆکی کونسولْ، یان کونسولْ دەکات، هەروەها سیفەتی کونسوڵی هەیە، لە کاتی ئامادەنەبوونی یەکێك لەو دووانەی سەرەوە دەتوانێت بە کاری ئەوان هەستێت. بەپێی رێنمایی ناوخۆیی هەندێك دەوڵەت، کونسوڵەکان مافی دیاریکردنی بریکاریان هەیە بۆ خۆیان، بەمەرجێك دەوڵەتەکەیان پێی رازی بێت.

٤. **بریکاری کونسوڵی**: فەرمانبەرێکە کە سیفەتی کونسوڵی هەیە، کونسوڵی گشتی، یان کونسولْ دوای رەزامەندیی دەوڵەتەکەیان دایدەنێن بۆ ئەوەی هەستێت بە هەموو کارە کونسوڵییەکان لە شارێکدا، کە دەکەوێتە بازنەی دەسەڵاتی ئەوانەوە، بەڵام بریکاری کونسولْ مافی پەیوەندیکردنی راستەوخۆی بە دەسەڵاتی دەوڵەتەکەیەوە نییە، بەڵکو لەژێر چاودێریی ئەو کونسوڵەدا کاردەکات، کە دایناوە.

**سێیەم: کونسوڵە نێراوەکان و کونسوڵە هەڵبژێراوەکان(١):**

**کونسوڵە نێراوەکان** (**القناصل المبعوثون أو المعینون**): ئەو کونسوڵانەن، کە دەوڵەتێك دەیاننێرێت بۆ گرتنەئەستۆی کاروبارە کونسوڵییەکان لەو دەوڵەتەی، کە بۆی دەنێرێن. کە پێویستە لە فەرمانبەران

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص ص٣١٧-٣١٨.

و هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە بن کە دەیاننێرێت، بۆیە مافی ئەوەیان نییە بە هیچ کار و پیشەیەکی ئازادەوە، یان هەر کارێکی بازرگانیی تایبەتەوە سەرقاڵ بن، واتە لەمەدا وەك فەرمانبەرانی ترن.

**بەڵام کونسوڵە هەڵبژێراوەکان (القناصل المختارون أو الفخريون):** ئەو کەسانەن کە دەوڵەت لەنێو ئەو کەسانەدا دیارییان دەکات، کە لەو شوێنەدا دەمێننەوە کە ئەو دەوڵەتە دەیەوێت نوێنەرایەتیی کونسوڵی تێیدا هەبێت، ئەوان لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە دەبن کە هەڵیان دەبژێرێت، دروستیشە لە هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە بن، کە کاری کونسوڵی تێدا ئەنجامدەدەن، یاخود لە هاووڵاتییانی دەوڵەتی سێیەم بن.

### خاڵەکانی جیاکاری لەنێوان کونسوڵە نێراوەکان و کونسوڵە فەخرییەکان[1]:

١. **مووچە و پەیوەستیی وەزیفی:** یەکێك لە خاڵەکانی جیاکاریی ئەوەیە، کە کونسوڵە نێراوەکان مووچەیەکی دیاریکراو لە حوکومەتەکەیانەوە وەردەگرن، بەو پێیەی کە فەرمانبەرن و لە کارەکانیاندا ملکەچی یاساکانی وەزیفەی وڵاتەکەی خۆیان دەبن، بەڵام کونسوڵە فەخرییەکان لە بەرانبەر ئەو کارەی پێی هەڵدەستن، مووچەیەکی جێگیر وەرناگرن، بۆیە دروستە مومارەسەی کاری تایبەتییش بکەن، پێشیان دەوترێت "کونسوڵی فەخری– القنصل الفخري". کەواتە کونسوڵە هەڵبژێراوەکان بە نوێنەری ئەو دەوڵەتە دانانرێن، کە داینـاون، بەڵکو تەنها

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٢٤٣-٢٤٥.

بریکاری ئەوانن لەو کاروبارانەدا کە پێیان دەسپێرن، بۆیە وەك فەرمانبەری هەمیشەیی مامەڵەیان لەگەڵ ناکرێت.

٢. **ڕەگەزنامە:** زۆربەی کات دەوڵەتان کونسوڵە نێراوەکان لە هاووڵاتییانی خۆیان دیاریدەکەن، بەڵام کونسوڵە فەخرییەکان، یان لەو کەسانە دیاریدەکەن، کە لە وڵاتی پێشوازیکەر موقیمن، جا هاووڵاتی خۆیان بن، یان هاووڵاتیی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان دەوڵەتی سێیەم بن، بەڵام پێویستە ڕەزامەندیی ئەو دەوڵەتە وەربگیرێت[١].

٣. **جیاوك و پارێزبەندی:** تەنانەت ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەشی، کە کونسوڵە فەخرییەکان هەیانە کەمترن لەوانەی کە کونسوڵە نێراوەکان هەیانە، بەگشتی دەتوانین بڵێین ئەندامانی خێزانی کونسوڵی فەخری جیاوك و پارێزبەندییە کونسوڵییەکانیان نییە، تەنانەت فەرمانبەرە کونسوڵییەکانیش پارێزبەندی و جیاوکیان نامێنێت، ئەگەر سەرۆکی کونسوڵخانەکە فەخری بێت. هەروەها کونسوڵی فەخری ئەو پارێزبەندییە دادوەرییەی نییە، کە کونسوڵی نێراو هەیەتی. هەروەها لە باج و ڕەسمی ئەو کرێ و پاداشتانە دەبەخشرێت، کە بەهۆی کارە کونسوڵییەکەیەوە لەو حوکومەتەی وەردەگرێت، کە بەکاریدەهێنێت، هەروەها لە ئەرکە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان و غرامەی سەربازیی ئەو وڵاتە دەبەخشرێت کە کاری تێدادەکات[٢]. بەڵام ئەو شوێنە کونسوڵییانەی، کە کونسوڵە فەخرییەکان بەڕێوەی دەبەن لە باج دەبەخشرێن و ئەرشیف و بەڵگەنامە کونسوڵییەکانیان پارێزراو دەبن، ڕەسمی گومرگییان

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص ص١٧٤-١٧٥. و: د.سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص٢٣٠.

(٢) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٩٧-١٠١.

بەسـەردا ناسـەپێنرێت[١]. لەڕاسـتیدا ڕێککەوتننامـەی ڤیـەننا بـۆ پەیوەندییـە کونسـوڵییەکان دەروازەی سـێیەمی خـۆی، کـە دەکاتـە ماددەکـانی (٥٨-٦٨) تەرخانکردووە، بۆ ئەو ئەحکامانـەی کـە تایبـەتن بـە کونسـوڵی فـەخری و کـارو پارێزبەندی و جیاوکەکانیان.

## چوارەم: دیاریکردنی کونسوڵەکان و قبوڵکردنیان

بـــەپێی ڕێککەوتننامـــەی ڤیـــەننای ســـاڵی (١٩٦٣) ســـەرۆکی نێـــراوە کونسوڵییەکان لەلایەن دەوڵەتی نێرەرەوە دیاریدەکرێن، دەوڵـەتی پێشـوازیکەر ڕێگـەی کارکردنیـان پێـدەدات. بـەڵام مـەرج و ڕێوشـوێنەکانی دامەزرانـدن و قبووڵکردنیان، بە ڕەچاوکردنی ئەحکامەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە، بەپێی یاسـا و ڕێساو نەریتی دەوڵەتی نێرەر و پێشوازیکەر دەبێت[٢].

بـەو پێیـە هـەموو کونسـوڵەکان، بـەبێ ڕەچـاوکردنی پلـەکانیان، پێویسـتە لەلایـەن وڵاتەکانیانـەوە بەڵگەنامەیـەکی فـەرمیان پێبـدرێت، کـەپێی دەوترێـت پاکانەی کونسوڵیی (البراءة القنصلية)، ئەو بەڵگەنامەیە نـاوی سـەرۆکی دەسـتە کونسوڵییەکەو نازناو و پلەکەی و بازنەی دەسـەڵاتە کونسـوڵییەکەی و بارەگـای ئەو نێراوە کونسوڵییەکەی، کە سەرۆکایەتی دەکات[٣].

پێویسـتە ئـەوە بـزانین کـە پاکانـەی کونسـوڵی وەك نووسـراوی دامەزرانـدن (كتاب الاعتماد) نییە، کە دەدرێت بە سەرۆکی نێـراوە دبلۆماسـییەکان، چـونکە پاکانەی کونسوڵیی ئاڕاسـتەی سـەرۆکی دەوڵـەتی پێشـوازیکەر ناکرێـت، بـەڵکو

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٦٠، ٦١، ٦٢)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

(٢) بڕوانە: ماددەی (١٠)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

(٣) بڕوانە: ماددەی (١١)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

زۆربەی کات بەمشێوەی (بۆ لایەنی پەیوەندیدار) ئاڕاستەدەکرێت. هەروەها ناردنیشی لە ڕێگەی نێراوی دبلۆماسیی دەوڵەتی نێرەرەوە –ئەگەر پەیوەندیی دبلۆماسیی لەنێوانیاندا هەبوو– دەبێت، یان لە ڕێگەی نێراوی کونسوڵییەوە، یاخود لە ڕێگەی نێراوی دبلۆماسیی دەوڵەتی سێیەمەوە، یان لە ڕێگەی پۆستەوە دەبێت[١].

ئەگەر دەوڵەتی پێشوازیکەر ڕەزامەند بوو لەسەر ئەو کەسە، کە دیاریکراوە بۆ سەرۆکایەتیکردنی نێراوە کونسوڵییەکە، ئەوا دەوڵەتی پێشوازیکەر ڕێگەی پێدەدات، مومارەسەی کارەکانی بکات ئەویش بە پێدانی مۆڵەتی کونسوڵی (الإجازة القنصلية)، خۆ ئەگەر ئەو دەوڵەتە بەخشینی ئەو مۆڵەتە کونسوڵییەی ڕەتکردەوە، ئەوا ناچارناکرێت بە باسکردنی هۆکارەکەی بۆ دەوڵەتی نێرەر، تاوەکو مۆڵەتەکەشی وەرنەگرێت نابێت دەست بە کارەکانی بکات، بەڵام دەتوانرێت ڕێگە بە کونسوڵەکە بدرێت، کە کارەکانی بەشێوەیەکی کاتی ئەنجامبدات، تا ئەو کاتەی مۆڵەتی کونسوڵی پێدەدرێت[٢].

---

(١) بڕوانە: د. هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٧٦.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١٢، ١٣)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

## باسی سێیەم: ئەرك و کاری کونسوڵی

کاری کونوسوڵی لە کاری دبلۆماسی جیاوازە. کونسولگەری نێراوێکی هەمیشەییە دەوڵەتێك بۆ دەوڵەتێکی تری دەنێرێت، لەگەڵ ئەوەی کە سەر بە وەزارەتی دەرەوەیەو هەر ئەو وەزارەتەش فەرمانبەرەکانی دیاریدەکات، سەرپەرشتی دەکات، بەڵام ئەرك و کارەکەی کارێکی دبلۆماسیی نییە، بەڵکو زیاتر سیفەتی ئابووری و کارگێری بەسەر کارەکانیدا زاڵە، ئەمە وێڕای چاودێریکردنی کاروباری هاووڵاتییانی دەوڵەتەکەی، لە دەرەوەو بەدواداچوونی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات[١].

رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسولییەکانی ساڵی (١٩٦٣) کارە کونسولییەکانی لەم خاڵانەدا دیاریکردووە[٢]:

١. پاراستنی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی و هاوڵاتییانی وڵاتەکەی خۆی، لەو دەوڵەتەی کە تێیدایە، هەروەها پاراستنی بەرژەوەندیی ئەو تاك و کەسە مەعنەوییانەی، کە سەر بە دەوڵەتەکەی ئەون، وەك کۆمپانیا و دامەزراوەکان.

٢. کارکردن بۆ گەشەپێدانی پەیوەندییە بازرگانی و ئابووری و کولتووری و زانستییەکان لەنێوان وڵاتەکەی و ئەو دەوڵەتەی، کە بۆی

---

(١) تا ئێستا (ئازار/٢٠١٧) لە هەرێمی کوردستاندا (٣٤) کونسوڵخانە و نووسینگە و نوێنەرایەتیی وڵاتان هەیە، لەنێویاندا پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاساییش، کە دواتر بە خشتە دەیانخەینەڕوو.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٥)ی هەمان رێککەوتننامە.

نێراوەو کـاری تێـدادەکات، ئەمـە وێـڕای هانـدان و بـەهێزکردنی پەیوەنـدیی دۆستانە.

٣. ئاگـاداربوون و بەدواداچـوون بـۆ بارودۆخـە بازرگـانی و ئـابووری و کولتـووری و زانسـتییەکان و ئـەو پەرەسـەندنانەی، کـە لـەو دەوڵەتـەدا دەگـوزەرێن، کـە کـاری تێـدادەکات، بـە هـەموو رێگـە یاسـایی و رێگەپێدراوەکان، هەروەها پێشکەشکردنی راپۆرت بە حوکومـەتی وڵاتەکـەی لەبارەیەوە و پێدانی زانیاری بە کەس و لایەنە پەیوەندیدارەکان.

٤. دەرکردنـی پاسـپۆرت و بەڵگـەی گەشـتکردنی هاوڵاتییـانی دەوڵەتەکەی،بەخشـینی بەڵگـەی پێویسـت بـەو کەسـانەی خوازیـاری گەشتکردنن بۆ وڵاتەکەی.

٥. پێشکەشـکردنی کۆمـەك و هاوکـاری بـە هاوڵاتییـانی وڵاتەکـەی لـەو دەوڵەتەی کاری تێدادەکات، جا هـاوڵاتی بـن، یـان کەسـی مەعنـەوی، وەك: هاوکاریی دارایی و چارەسەرکردنی کێشە.

٦. هەسـتان بـەکاری دادنـووس بـۆ بەبەڵگەنامـەکردنی بەڵگـەکان و راستاندنیان (تصدیق)، و رراپەڕاندنی کاروباری شارستانی (الأحوال المدنیة) تایبەت بە لەدایکبوون و مردنی ئەو هاووڵاتییانەی وڵاتەکەی، کە لەو دەوڵەتە ماونەتەوە.

٧. پاراسـتنی بەرژەوەنـدیی ئـەو هاووڵاتییانـەی وڵاتەکـەی، کـە لـەو دەوڵەتەی ماونەتەوە لە تاك و کەسە مەعنەوییەکان، سەبارەت بە کاروبـاری میرات لەو دەوڵەتەی، کە ئەو کاری تێدادەکات.

٨. پاراسـتنی بەرژەوەنـدیی کەسـە ناکامـەکان و ئەوانـەی، کـە ئەهلییەتیان ناتەواوە (القاصرین و ناقصي الأهلیة) —وەك منداڵی بێ بـاوك و

شێت- بەتایبەت لە حاڵەتی پێویستبوونی وەصیە و قیوامە لەسەریان لە چوارچێوەی یاسا و سیستمی ئەو دەوڵەتەی تێیدا ماونەتەوە.

٩. نوێنەرایەتیکردنی هاوولاتییانی دەوڵەتەکەی، یان وەرگرتنی ڕێوشوێنی زامنکردنی نوێنەرایەتیکردنی پێویست بۆیان لەبەردەم دادگاکان و دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی کاری تێدادەکات، لەپێناو وەرگرتنی ڕێوشوێنی کاتیی بۆ پاراستنی مافەکانیان لەو کاتانەی کە ناتوانن بەرگری لە ماف و بەرژەوەندییەکانیان لەکاتی پێویستدا بکەن، بەهۆی ئامادەنەبوونییان، یان بە هەر هۆیەکی ترەوە، ئەویش بەپێی سیستم و یاساکانی ئەو دەوڵەتەی، کە ئەو کاری تێدادەکات.

١٠. ناردن (تحویل)ی بڕیارە دادوەرییەکان، واتە ڕادەستکردنی بڕیارە دادوەری و نادادوەرییەکان و ئەنجامدانی کاری نوێنەرایەتیکردنی دادوەری (الإنابة القضائیة)، بەپێی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، لەکاتی نەبوونیڕێککەوتننامەی لەو جۆرە، ئەوا بە شێوەیەك دەبێت کە لەگەڵ سیستم و یاساکانی ئەو دەوڵەتەی، کە ئەو کاری تێدادەکات بگونجێت.

١١. مومارەسەکردنی مافی چاودێریکردن و پشکنینی کەشتیی دەریا و رووبارەکان، لەوانەی کە ڕەگەزنامەی دەوڵەتەکەی ئەویان هەڵگرتووە، هەروەها ئەو فڕۆکانەی، کە لە وڵاتەکەی ئەودا تۆمارکراون و فڕۆکەوانەکانیشیان، بەپێی سیستم و یاسای وڵاتەکەی خۆی.

١٢. پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ کەشتی و باخیرە و فڕۆکەکان و ستافەکانیان و وەرگرتنی ڕێگەپێدانی گەشتکردنیان و پشکنینی بەڵگەنامە و ڤیزەکانیان، بەبێ ڕێگریکردن لە دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی مانەوە و لێکۆڵینەوەیان، لەو رووداوە کوتوپڕانەی کە لە ماوەی گەشتەکەیاندا

روودەدەن، هەروەها لە چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانەی کە لەنێوان ستافەکانیاندا روودەدات، تا ئەو ئاستەی کە سیستەم و یاساکانی دەوڵەتی میواندار رێگەی پێدەدەن.

١٣. ممارەسەکردنی هەموو ئەو وەزیفانەی تر، کە لەلایەن دەوڵەتی خاوەن کونسولگەرییەکەوە داوای لێدەکرێت، بە مەرجێك پێچەوانەی سیستەم و یاساکانی دەوڵەتی مانەوە نەبن، یان ئەو دەوڵەتە رەخنەو تێبینییان لەسەریان نەبێت.

## باسی چوارەم: جیاوك و پارێزبەندییە كونسوڵییەكان
## (الإمتيازات والحصانات القنصلية)

بەو پێیەی، كە كونسوڵ سیفەتی نوێنەریی ئەو دەوڵەتەی نییە كە دەینێرێت، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی، كە كونسوڵەكان هەیانە كەمترن لەوانەی كە ئەندامانی سلكی دبلۆماسی هەیانە.

لەراستیدا جیاكاری لەنێوان نێراوی دبلۆماسیی و كونسوڵی و لەنێوان دبلۆمات و كونسوڵدا لەرووی واقیعییەوە هیچ بەهانەیەكی نییە، چونكە هەردووكیان خزمەتی گشتی پێشكەش دەكەن، هەروەك چۆن هەردووكیان سەر بە دەوڵەتێكی بیانین، ئەمە وێڕای ئەوەی كە كاری كونسوڵی زۆر لە كاری دبلۆماسی فراوانترە.

لەراستیدا پێویست وابوو، كە كونسوڵەكان پارێزبەندی و جیاوك لە دبلۆماتەكان زیاتر بێت، لەبەرئەوەی كونسوڵ كارەكەی لە كاری دبلۆمات فراوانترەو لە بەریەككەوتنی راستەوخۆدایە، لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی كاری تێدادەكات و لەگەڵ هاوڵاتییانیشی بە هەمان شێوە، ئەمە وێڕای ئەوەی كە ئەگەری هەڵبەستنی تۆمەت لە دژیان لەئارادایە، بۆیە پێویستە پارێزگاری و پارێزبەندیی زیاتر لەوەی دبلۆماتیان هەبێت، بەڵام لەرووی یاساییەوە لە بار و پێگەیەكی نزمتر لە پێگەی دبلۆماتدان.

بۆیە زۆرێك لە دەوڵەتان جۆرە فێڵێك لە سیستمی كونسوڵییدا دەكەن، ئەویش بریتییە لەوەی كە كاری كونسوڵی لەنێو نێراوە دبلۆماسییەكاندا جێ دەكەنەوە، ئەمەش بۆئەوەی كە هەمان ئەو پارێزبەندییە دبلۆماسییەیان پێببەخشرێت كە نوێنەری دبلۆماسیی هەیەتی، هەروەك چۆن دەوڵەتان

پلەی دبلۆماسی دەبەخشن بە کونسوڵەکان و تەنسیبیان دەکەن بۆ کاری کونسوڵی، ئەمەش لەپێناو ئەوەی کە ئەو پارێزبەندی و جیاوکە دبلۆماسییانەیان هەبێت، کە دبلۆمات هەیەتی و خۆیان لە سیستمی کونسوڵی بدزنەوە.

هەروەها کونسوڵخانەکان پارێزبەندی و جیاوکیان هەیە، هەروەك چۆن کونسوڵەکان جیاوکیان هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

**یەکەم: جیاوك و پارێزبەندیی بارەگای کونسوڵخانە (امتيازات وحصانات مقر البعثة القنصلية):**

کاری کونسوڵگەری زۆر لە کاری دبلۆماسی فراوانترە، چونکە کونسوڵخانە چەند کارێك دەکات، کە باڵوێزخانە نایانکات، و کاری کونسوڵگەری پەیوەندیی بە بەرژەوەندییە ئابووری و بازرگانییەکانی دەوڵەت و بەرژەوەندیی هاوڵاتییانی لە دەرەوە هەیە، ئەمە وێڕای کارئاسانیکردن بۆ گەشتی هاوڵاتییانی ئەو دەوڵەتەی کە تێیدا کار بۆ وڵاتەکەی خۆی دەکات.

**بۆیە پێویستە دەوڵەتی میواندار ئەم جیاوك و پارێزبەندییانە بۆ کونسوڵخانە دابینبکات[١]:**

١. **ئاسانکاری بۆ کاری کونسوڵخانەکە:**

یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بڕیاری رێزگرتنی تایبەتی بۆ بارەگای کونسوڵخانە داوە، کە پێویستە ئەو دەوڵەتەی ئەو بارەگایەی لێیە رەچاوی بکات، بەڵام ناگاتە ئاستی ئەو پارێزبەندییەی کە باڵوێزخانە هەیەتی.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣١)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

بارەگای کونسوڵخانە ئەم ماف و پارێزبەندییانەی هەیە:

أ. ئەگەر بارەگای کونسوڵخانەکە لەناو باڵوێزخانەکەدا بوو، ئەوا هەمان ئەو پارێزبەندی و جیاوکانەی هەیە، کە بارەگای باڵوێزخانەکە هەیەتی.

ب. ئەگەر دەوڵەتی خاوەن کونسوڵ، کونسوڵخانەیەکی تری لە دەوڵەتی میوانداردا هەبوو، لەبەرئەوەی نێراوی دبلۆماسیی نییە، ئەوا لە حاڵەتی داخستنی یەکێك لەو دوو کونسوڵخانەیە، دروستە کە کونسوڵخانەی دووەم پاسەوانیی کونسوڵخانە داخراوەکە بکات،مومارەسەی کارەکانیشی بکات.

ج. کونسوڵخانە ماف بەرزکردنەوەی ئاڵای دەوڵەتەکەی و دروشمی نەتەوەیی لە خاکی ئەو دەوڵەتەدا هەیە، کە تێیدا دەمێنێتەوە، واتە لەسەربانی هەموو ئەو بینایانەی، کە هەیەتی و کاری تێدادەکات و لەسەر ئەو ئۆتۆمبێلانەش، کە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاریان دەهێنێت.

د. پێویستە دەوڵەتی میواندار پابەندبێت بە ئاسانکاری و یارمەتیدانی نێراوە کونسوڵییەکە بۆ دەستکەوتنی بارەگا و بینای تایبەت بە خۆی.

هـ. دەوڵەتی میواندار ماف دەستێوەردانی لە کارەکانی کونسوڵخانەدا نییە، بەڵکو کونسوڵخانەکە ماف خۆیەتی کاتژمێرەکانی کارکردن و شێوازی کارو ڕۆژانی پشووی خۆی دیاریبکات.

### ٢. ڕێزی بارەگای کونسوڵخانە (حرمة مقر القنصلية)

دەسەڵاتی دەوڵەتی میواندار ماف ئەوەی نییە بچێتە ناو ئەو بینایانەی کونسوڵخانەوە، کە نێراوە کونسوڵییەکە بۆ جێبەجێکرنی کارەکانی بەکاریان

دەهێنێت، مەگەر بە رەزامەندیی سەرۆکی نێراوە کونسوڵییەکە، یان کەسی پەیوەندیدار، یان سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی بێت لە دەوڵەتی میوانداردا. بەڵام لە حاڵەتی ئاگرکەوتنەوەو ئەو کارەساتانەی کە پێویست بە رێوشوێنی پاێزگاریکردنی بەپەلە دەکەن، پێویست بە وەرگرتنی رەزامەندیی سەرۆکی نێراوە کونسوڵییەکە ناکات، مەگەر خۆی ئەو رێوشوێنە رەتبکاتەوە، کە بۆ پاراستنی ئەوانە. پێویستە دەوڵەتی میواندار هەموو رێوشوێنێکی گونجاو بگرێتە بەر بۆ رێگریکردن لەوەی کەسانێك بیانەوێت بەزۆر بچنە ناو کونسولخانەکەوە، بۆیە پێویستە هەموو پێداویستییەکانی پاراستنی باڵوێزخانەکەو ئارامی و ئاسایشی بۆ دابینبکات، بۆ زامنکردنی باشبەرێوەچوونی کارەکانی ئەو کونسولخانەیە، و رێگریکردن لە هەر هەڕەشەیەك کە ئاسایش و رێزی کوسولخانەکە بشێوێنێت.

هەروەها بە هیچ شێوەیەك نابێت بارەگاو ئەساسی ناو کونسولخانەکە و هۆکارەکانی گواستنەوەی بە مەبەستی بەرگریی شارستانی، یان بەرژەوەندیی گشتی بەکاربهێنرێن. لە حاڵەتی دەستبەسەراگرتنی پێویستیش بۆ ئەو مەبەستانە، پێویستە هەموو رێوشوێنێکی گونجاو بگیرێتەبەر، لەپێناو دوورخستنەوەی هەرلەمپەرێك لەبەردەم مومارەسەکردنی کارە کونسوڵییەکان، هەروەك چۆن دەبێت دەوڵەتی میواندار لە بەرانبەردا قەرەبوویەکی گونجاو بدات بەو دەوڵەتەی خاوەنی کونسولخانەکەیە. هەروەها دروست نییە لەکاتی روودانی کارەساتەکاندا بۆ مەبەستی فریاگوزاری و بەهاناوەچوون، دەست بەسەر بارەگای کونسولخانەو ئەو شت و ئۆتۆمبێلانەش کە تێیدایەتی بگیرێت.

پێویستە ئەوەش بزانین هەموو ئەرشیف و بەڵگەنامەکانی باڵوێزخانە رێزو پارێزبەندییان هەیە لە هەرکاتێکدا بێت و لە هەرشوێنێکدا بن.

### ٣. بەخشین لە باجەکان (الإعفاء من الضرائب)

بینا و بارەگاکانی کونسوڵخانە و شوێنی بنەڕەتیی نیشتەجێبوونی سەرۆکی نێراوە کونسوڵییەکە، کە هەیەتی، یان بەکرێ گرتوویەتی لە دەوڵەتی میواندار، یان هەرکەسێکی تر کە لە بەرژەوەندیی کونسوڵخانە کاربکات، لە هەموو جۆرە باج و رەسمێك دەبەخشرێت، جا نیشتمانی بێت، یان هەرێمی، یان شارەوانی، تەنها ئەو رسومانە نەبێت کە لە بەرانبەر خزمەتێکدا وەردەگیرێن، وەك: رسومی ئاو و کارەبا[١].

### ٤. ئازادیی گەڕان و هاتوچۆکردن (حرية التنقل)

ئەندامانی نێراوی کونسوڵی لەپێناو بەجێهێنانی ئەرکە فەرمییەکانیان مافی گەڕان و هاتوچۆکرنیان لەناو دەوڵەتی میوانداردا هەیە، هەروەك چۆن هەرکاتێك کارەکەیان بیخوازێت مافی گواستنەوەو جموجوولیان هەیە، دەوڵەتی میوانداریش مافی ئەوەی نییە رێگرییان لێ بکات لەگەڵ رەچاوکردنی یاساکانی ئەو دەوڵەتە و ئەو سیستەمەی کە پەیوەستە بە رێکخستن، یان رێگریکردن لە هاتنەناوەوە لەبەر هۆکاری ئەمنی.

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٣٢)ی هەمان رێککەوتننامە.

٥.   ئازادیی پەیوەندیکردن (حریة الاتصال)

**پێویستە ئەو دەوڵەتەی باڵوێزخانەکەی لێیە پابەندبێت بەم خاڵانەوە، کە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان) دیاریکردووە[١]:**

١.   پێویستە ئەو دەوڵەتەی، کە نێراوی کونسوڵیی بۆ دەنێرێت ئـازادیی پەیوەندیکردنی پێبدات، لەوەی کە پەیوەستە بـە کـارە فەرمییەکانییـەوە. نوێنەری دبلۆماسی مـاف ئـەوەی هەیـە هـەموو ئامرازەکـانی پەیوەنـدیکردن لەگـــەڵ حوکومەتەکـــەی و نێـــراوە دبلۆماســـی و کونســـوڵییەکانی تـــری دەوڵەتەکەی لە دەوڵەتانی تردا بەکاربهێنێت، لەنێویشـاندا هـەڵگری جانتـای دبلۆماسی، یان کونسوڵی و نامە ڕەمزییەکان، تەنیا ئەوە نەبێت، کە نێراوی کونسوڵی بۆ نییە وێستگەی بێتەل دابمەزرێنێت و بەکاریبهێنێت، مەگـەر بـە ڕەزامەندیی ئەو دەوڵەتە بێت کە بۆی نێراوە.

٢.   هـەموو نامەکارییـە فەرمییـەکان (المراسـلات الرسمیـة)ی نێـراوی کونسوڵی ڕێزی خۆی هەیە، زاراوەی "نامەکارییە فەرمییەکان"یش واتە کۆی ئەو نامەکارییانەی، کە پەیوەستن بە نێراوە کونسوڵییەکەو کارەکانییەوە.

٣.   دروســت نییــە جانتــای کونســوڵی بکرێتــەوە، یــان دەســتی بەســەردا بگیرێت. بەڵام –ئەگەر لە حاڵەتێکدا، کە دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتـە هۆکارگـەلێکی جیددی لابێت، بۆ ئەو بڕوایەی کە جانتاکە شتانێکی تری تێدایە لـە غـەیری ئـەو نامەکاری و بەڵگەنامەو شتانەی، کە لـە بڕگـەی (د)ی ئـەم ماددەیـەدا هـاتوون– ئەوا ئەو دەسەڵاتە بۆی هەیە، داوای کردنەوەی جانتاکە بـە ئامـادەبوونی خـۆی و ئاگاداریی نوێنەرێکی ڕاسپێراو لە دەوڵەتی نێرەرەوە بکات.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣٥)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

٤. پێویسته ئەو بەشانەی، کە جانتا کونسوڵییەکەیان لێ پێکدێت نیشانەگەلێکی دەرەکیی دیاریان پێوەبێت، کە سروشتەکەیان بناسێنێت و جگە لە نامەکاریی فەرمی و بەڵگەنامەو کاری تایبەت بە بەکارهێنانی فەرمی، نابێت هیچی تر لەخۆ بگرێت.

٥. پێویسته هەڵگری جانتای کونسوڵ بەڵگەنامەیەکی فەرمی پێبێت، کە سیفەتەکەی بسەلمێنێت و ژمارەی بەشەپێکهێنەرەکانی جانتا کونسوڵییەکە دیارییبکات، نابێت هەڵگری جانتای کونسوڵی بەبێ ڕەزامەندیی ئەو دەوڵەتەی بۆی دەنێرێت لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە بێت، یان لەوانە بێت کە بە هەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە، هەروەها پێویستە ڕێزی تایبەتی هەبێت و دووچاری هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی دەستگیرکردن، یان دەستبەسەراگرتن نەکرێت.

٦. دەوڵەتی نێرەر و نێراوە دبلۆماسی و کونسوڵییەکانی، دەتوانن هەڵگری جانتای کونسوڵی بۆ ئەرکێکی تایبەت دیارییبکەن.

٧. دروستە جانتای کونسوڵی بدرێتە قبتانی پاپۆڕێك، یان سەرۆکی فڕۆکەیەکی بازرگانی، بەڵام لەم حاڵەتەدا پێویستە بەڵگەیەکی فەرمی پێ بێت، کە ژمارەی ئەو بەشانە روونبکاتەوە، کە جانتاکەی لێ پێکهاتووە، بەڵام بە هەڵگری جانتای کونسوڵی هەژمارناکرێن. دواتر کونسوڵخانەکە یەکێك لە ئەندامانی خۆی دەنێرێت بۆ ئەوەی جانتاکە لە قبتانەکە، یان سەرۆکی فڕۆکەکە بە هەموو ئازادییەکەوە و بە ڕێککەوتن لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە وەربگرێت.

### ٦. پەیوەندیی کونسوڵخانە بە هاووڵاتیانی وڵاتەکەیەوە (اتصال القنصلية برعايا دولتها)

کونسوڵەکان ئازادیی پەیوەندیکردنیان هەیە بە هاوڵاتییانی وڵاتەکەیانەوە، هەروەك چۆن ئازادیی ئەوەیان هەیە بچن بۆ لایان و کۆبوونەوەیان پێ بکەن، بەدوای کێشەکانیاندا بچن لە هەرناوچەیەکدا بن، بەتایبەت لەم حاڵەتانەدا:

أ. لە حاڵەتی زیندانیکردنی یەکێك لە هاوڵاتییانی وڵاتەکەی، یان دەستگیرکردنی لەرووی خۆپارێزییەوە، یان دەستبەسەرکردنی بە هەر جۆرێك بێت، ئەوا پێویستە دەوڵەتی میواندار کونسوڵخانەکە لەو رێوشوێنانە ئاگاداربکاتەوە، کە لە بەرانبەر ئەو کەسەدا گیراوەتەبەر، هەروەها پێویستە رێگە بەو کەسە بدرێت، کە پەیوەندی بە کونسوڵخانەی وڵاتەکەیەوە بکات. هەروەها فەرمانبەرانی کونسوڵخانە مافی چاوکەوتنیان بەو هاوڵاتییانەی وڵاتەکەیان هەیە کە زیندانی، یان دەستبەسەرکراون، هەروەها قسەیان لەگەڵدا بکەن و نامەیان لەگەڵدا بگۆڕنەوە، هەروەها پێویستە پارێزەریان بۆ دابینبکرێت، بۆئەوەی لەبەردەم دادگادا بەرگرییان لێ بکەن، بە مەرجێك دەست وەرنەدەنە کاروباری دادگاوە،بەدواداچوونیان بۆ کێشەی هاوڵاتییانی وڵاتەکەیان لە چوارچێوەی یاسا و سیستمی دەوڵەتی میوانداردا بێت.

ب. لە حاڵەتی وەفاتی یەکێك لە هاووڵاتییانی دەوڵەتی خاوەن کونسوڵخانەدا، پێویستە دەوڵەتی میواندار کونسوڵخانەکەی لێ

ئاگاداربکاتـــەوە، پێســپێراو (وصـــي)، یـان وەلـی (ولـي)یـەك[١] بـۆ منداڵـە ناکامەکان دیاری بکرێت.

ج. دروسـتە بـۆ فەرمانبـەرانی کونسـوڵخانە پەیوەنـدیی بـە دەسـەڵاتی نـاوخۆیی تایبەتمەنـدەوە بکـەن، لـە چوارچـێوەی پسـپۆڕییاندا، هـەروەها پەیوەندیی بە دەسەڵاتی باڵاوە بکەن، بەو ئەندازەیەی کە یاسـاو سیسـتم و رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان رێگەیان پێداوە.

### ٧. وەرگرتنی رسومات و باج (تقاضي الرسوم والضرائب)

دروســتە کونســوڵخانە رســوم و بــاج وەربگرێــت لــە بەرانبــەر راســتاندن (تصدیق)، یان بەخشینی ڤیزە بۆ چوونە ناو دەوڵەتەکەیـەوە، یـان لـە بەرانبـەر هەر کارێکی تر کە ئەنجامی بدات، جا ئەو کارانە بـۆ هاووڵاتییـانی دەوڵەتەکـەی بێت، یان بۆ هاووڵاتییانی ئـەو دەوڵەتـە بێـت، کـە کـاری تێـدادەکات، دەوڵـەتی میوانـداریش بـۆی نییـە رێگریـی لێبکـات، تـەنیا ئـەوە نـەبێت کـە دەتوانێـت پەیڕەوی بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە (مبدأ المعاملة بالمثل) بگرێتەبەر.

### دووەم: جیاوك و پارێزبەندیی کونسوڵ:

ئەگەر دەوڵەتێك کونسوڵەکانی خۆی دیاریبکـات، سـیفەتی دبلۆماسـییان نەداتێ، ئەوا ئەم جیاوك و پارێزبەندییانەیان هەیە:

---

(١) وەسی: پێسپێراو؛ ئەو کەسەیە کە کۆچکردووەکە دیاریکردووە, بۆئەوەی وەسییەتەکەی جێبەجێ بکات، یان لە وەسییەتنامەکەیدا بۆ ئەوە دیارییکردووە, کە چاودێریی منداڵە ناکامەکانی بکات، لەدوای خۆی سەرپەرشتی و چاودێریی کاروبارەکانیان بکات. وەلی: ئەو کەسەیە, کە دادوەر بۆ چاودێریکردنی منداڵی ناکام و سەرپەرشتیکردنی کاروبار و سامانیان دیاریدەکات.

### ١. ڕێزی کەسی

أ. پێویستە دەوڵەتی میواندار ڕێزی کونسوڵەکان بگرێت و ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆ ڕێگریکردن لە هەر دەستدرێژیکردنێك بۆ سەر کەسی خۆیان، یان پێشێلکردنی ئازادی و کەرامەتیان. هەروەها نابێت دەستیان بۆ ببرێت، یان ڕێیان لێ بگیرێت لە مومارەسەکردنی کارەکانیان و ژیانی ئاسایی خۆیان، جگە لەمە، پێویستە شوێنی نیشتەجێبوونیشیان پێویستە بپارێزرێت و بەبێ ڕەزامەندیی ڕاشکاوانەی خۆیان کەس نەچێتە ناویەوە، هەروەها نابێت هیچ فشارێکیشیان لەسەر دروستبکرێت.

ب. دروست نییە کونسوڵ دەستبەسەر بکرێت، یان وەك ئیحتیات دەستگیربکرێت، تەنیا لە حاڵەتی تاوانێکی مەترسیدار و بەپێی بڕیاری دەسەڵاتی تایبەتمەندی دادوەری نەبێت. لە حاڵەتی دەستبەسەرکردنیشی لەبەر هۆکارگەلێکی ڕاستەقینە پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت و کەسایەتیی بریندارنەکرێت، دەوڵەتەکەشی لێ ئاگاداربکرێتەوە.

ج. دروست نییە کونسوڵ بەند (حبس) بکرێت، یان ئازادیی سنوورداربکرێت، مەگەر بۆ جێبەجێکردنی بڕیارێکی دادوەریی یەکلاکەرەوە بێت، هەروەها نابێت دەسەڵاتە کارگێڕییەکان ئازاریان بدەن.

د. ئەگەر داوایەك لە دژی کونسوڵێك بەرزکرایەوە، ئەوا پێویستە لەبەردەم دەسەڵاتی تایبەتمەندیدا ئامادە بێت، بەڵام پێویستە لایەنە

پەیوەندیـدارەکان رەچـاوی پێگـەو رێـزی کونسـوڵەکە بکـەن،رێگریی ئەنجامدانی کارەکانی لێ نەکەن.

هـ. لـە حاڵـەتی دەستبەسـەرکردن، یـان دەسـتگیرکردنی کونسـوڵێك وەك ئیحتیـات، پێویسـتە دەوڵـەتی میوانـدار سـەرۆکی کونسـوڵخانەکەی لـێ ئاگاداربکاتەوە، بەڵام ئەگەر داواکراوەکە سەرۆکی کونسوڵخانەکە خـۆی بوو، ئەوا دەوڵەتی میواندار دەوڵەتی خاوەن کونسوڵخانەکە، لە رێگـەی دبلۆماسییەوە لێ ئاگاداردەکاتەوە.

٢. پارێزبەندیی دادوەری (الحصانة القضائية)

أ. کونسـوڵەکان پارێزبەنـدیی دادوەرییـان هەیـە لەبەرانبـەر داوا شارسـتانی و جەزائییـەکان تـەنها لەوانـەی، کـە پەیوەنـدییان بـە کـارە فەرمییەکانیانەوە هەیە، بـەڵام پارێزبەنـدیی دادوەرییـان نییـە بەرانبـەر ئـەو داوایانـەی، کـە پەیوەنـدییان بـەکارە تایبەتەکانیانـەوە هەیـە، واتـە لێـرەدا حاڵیان وەك حاڵی دبلۆماتکاران نییە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو کونسوڵ هـەموو کـارە فەرمییەکانیشـی پارێزبەنـدیی دادوەریـی نییـە، بـەڵکو هەنـدێك کـاری شارستانی ملکەچی دەسەڵاتی دادگای ناوخۆیی دەبن[١].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٤٣)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

**ئەم داوا شارستانییانەی کە دێن، ملکەچی دەسەڵاتی دادوەریی نێوخۆیی دەبن[١]:**

- ئەو داوایانەی کە بەهۆی گرێبەستێکەوە دروستدەبن، کە کونسوڵەکە بە سیفەتی تایبەتی کردویەتی، وەك گرێبەستەکانی پەیوەست بە کڕین و فرۆشتن و بریکاری و رەهن و غەیری ئەوانە لەو گرێبەستانەی، کە سەر بە دەوڵەتەکەین.
- ئەو داوایانەی کە پەیوەستن بە زیانێکەوە، کە لە ئەنجامی رووداوێکەوە کەوتووەتەوە، کە لە دەوڵەتی میواندا روویداوەو ئۆتۆمبیلێك، یان باخیرەیەك، یان فڕۆکەیەك بووە بە هۆکار، ئەوانیش ئەو رووداوانەن کە زیانێکی ماددی بە دەوڵەتی میوان، یان هاووڵاتییانی، یان بیانییەکانی سەر خاکەکەی دەگەیەنن، تەنانەت ئەگەر ئەو ئۆتۆمبێل، یان باخیرە، یان فڕۆکەیە سەر بەو دەوڵەتە خۆشی بن.

ب. کونسوڵەکان لە شایەتیدان نابەخشرێن وەك ئەوەی، کە نێراوە دبلۆماسییەکان دەبەخشرێن. بۆیە دروستە کونسوڵ بانگبکرێت بۆ شایەتیدان لەبەردەم دادوەر و ئیدارەدا. بەڵام سەبارەت بە کاری فەرمیی کونسوڵ پێویستە پارێزبەندیی هەبێت لە شایەتیدان، واتە نابێت ناچاربکرێت بە شایەتیدانێك کە پەیوەندیی بەکارە فەرمییەکەیەوە هەبێت، چونکە ئەو کارە بە ئاشکراکردنی نهێنییەکانی دەوڵەت هەژماردەکرێت[٢].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢/٤٣)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/٤٤)ی هەمان رێککەوتننامە.

ج. دەوڵەتی نێرەر دەتوانێت سازش لە پارێزبەندیی دادوەری و ئیداریی کونسوڵەکانی بکات. لەو حاڵەتەشدا دروستە دادگایی بکرێت، تەنانەت ئەگەر ئـەو کـارەی کـە پێـی هەسـتاوە، پەیوەنـدیی بـە کـارە فەرمییەکەشـییەوە هەبێت، بەڵام پێویستە ئەو سازشە ڕاشکاوانەو بە نووسین بێت[١].

**٣. بەخشینی کونسوڵ لەو کۆت و مەرجانەی، کە بۆ بیانی دادەنرێن (الإعفاء من القيود المفروضة على الأجانب)**

**لەم بارەیەوە کونسوڵ ئەم بەخشینانە دەیانگرێتەوە:**

**أ. بەخشین لە مەرجەکانی تۆمارکردنی بیانییەکان و ڕێگەدان بە مانەوە**

کونسوڵ و ئەنـدامانی خێزانـەکانیان لەوانـەی کـە لەگەڵیانـدا دەژیـن، لـە هـەموو ئـەو پابەندییانـە دەبەخشـرێن، کـە لـە یاسـا و سیسـتمی دەوڵـەتی میوانداردا سەبارەت بە تۆمارکردنی کەسانی بیانی و پێدانی مۆڵەتی مانـەوە هاتووە، واتە کونسوڵ، بۆ جێگیرکردنی ئیقامەی خۆی و خێزانـی، سـەردانی فەرمانگەی مانەوە ناکات[٢].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١/٤٥)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٤٦)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

### ب. بەخشین لە مۆڵەتی کارکردن

ئەندامانی نێراوی کونسوڵی لەو پابەندییانە دەبەخشرێن، کە بەپێی ڕێساو سیستمی دەوڵەتی میواندار بەسەر دەستی کاری بیانیدا دەسەپێنرێن و تایبەتن بە مۆڵەتی کارکردن. مەبەست لە مۆڵەتی کارکردن بریتییە لەو کارەی کە کونسوڵ لە کونسوڵخانەکەدا ئەنجامی دەدات(١).

### ج. بەخشین لە سیستمی دڵنیایی کۆمەلایەتی (الإعفاء من نظام التأمين الإجتماعي)

کونسوڵەکان لە ئەحکامەکانی ئەو سیستمی دڵنیایی کۆمەڵایەتییە دەبەخشرێن، کە لە دەوڵەتی میوانداردا بەسەر بیانی و هاووڵاتیانیشدا دەسەپێنرێن. دڵنیایی کۆمەڵایەتی بریتییە لە بڕێك پارە هەرکەسێك دەیدات، لە بەرانبەر قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی کار، یان نەتوانین و پەککەوتن. بەڵام لە بەرانبەردا کونسوڵ مافی وەرگرتنی قەرەبووی لە دەوڵەتی میوانداردا نابێت لەو زیانانەی، کە بەهۆی پێکانی کارەوە، یان بەهۆی پیرییەوە تووشی دێت، بەڵکو ئەو مافەی لە دەوڵەتەکەی خۆیدا هەیە، چونکە هەر دەوڵەتەکەی خۆشییەتی، کە بەشێك لە پارەکەی بۆ دڵنیایی کۆمەڵایەتیی دەبڕێت(٢).

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

(٢) بڕوانە: ماددەی (٤٨)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

### د. بەخشین لە باجە فەرمییەکان

کونسوڵ و ئەو ئەندامانەی خێزانەکەی کە لەگەڵیدا دەژین لە هەموو باج و ڕەسمە کەسی و عەینییە نیشتمانی و هەرێمی و شارەوانییەکان و ڕەسمە گومرگییەکان و پشکنینی گومرگیی دەبەخشرێن، جگە لەم ڕیزپەڕانە[١]:

- ئەو باجە ناڕاستەوخۆیانەی، کە سروشتیان وایە لەگەڵ نرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکاندا تێکەڵ دەبن.
- ئەو باج و ڕسوماتەی کە بەسەر ئەو سامانە نەگوێزراوە تایبەتانەدا دەسەپێنرێن، کە دەکەونە خاکی دەوڵەتی میواندارەوە.
- باجی میرات و بەجێماو و گواستنەوەی موڵکدارێتی.
- باجی داهاتی تایبەت، تەنانەت سوودی ئەو سەرمایەیەی، کە دەکەوێتە خاکی دەوڵەتی میواندارەوە، بەڵام دەوڵەتی میواندار بۆی نییە لەو داهاتە تایبەتە ببڕێت، کە کونسوڵ لەبری کارەکەی وەری دەگرێت.
- ڕسومی تۆمارکردن و دادوەری و ڕەهن و پوول، لەو کاتانەی کە کونسوڵ سەردانی دامودەزگاکانی دەوڵەتی میواندار دەکات لێی وەردەگیرێت.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٤٩)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

## باسی پێنجەم: کۆتاییهاتنی کاری کونسوڵ

هۆکارەکانی کۆتاییهاتنی کاری کونسوڵ، هەمان ئەو هۆکارانەن کە کاری دبلۆماتیان پێ کۆتایی دێت. کە یەکێك لەم بارانە دەگرێتەوە: کۆچیدوایی، یان دەستلەکارکێشانەوە، یان بانگێشتکردنەوەی بۆ وڵاتەکەی، یان کێشانەوەی مۆڵەتەکەی، یان بەتاڵکردنەوەی، یاخود لەناوچوونی وڵاتەکەی، یان ئەو دەوڵەتەی کە کاری تێدادەکات. بەڵام لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگدا کونسوڵ لە کارەکانی بەردەوام دەبێت، چونکە سیفەتێکی سیاسیی نییەو کارەکەی بە پلەی یەکەم چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی هاووڵاتییانی وڵاتەکەیەتی لەو وڵاتەی کە کاری تێدادەکات، خۆ ئەگەر جەنگ پەرەبسێنێت، تەنها لەو حاڵەتەدا کارەکەی کۆتایی دێت، کە لەلایەن وڵاتەکەیەوە بانگێشت بکرێتەوە، یان نەتوانێت بە کارەکانی هەستێت بەهۆی خراپیی پەیوەندیی وڵاتەکەی و ئەو وڵاتەی، کە کاری تێدادەکات[(١)].

ماوەیەکی دیاریکراو نییە بۆ کاری کونسوڵەکان لەو دەوڵەتەی، کە بۆی دەنێرێن، ئەو دەوڵەتەی دەیاننێرێت، یان دیارییان دەکات بەپێی یاساکانی خۆی ئەو ماوەیە دیاریدەکات، بەڵام زۆربەی دەوڵەتان ئەو ماوەیە بەسێ ساڵ دیاری دەکەن بۆ ئەو کونسوڵانەی کە هاووڵاتیی خۆیان بن. هەر لەبەرئەوەی کە کونسوڵ لەرووی سیاسییەوە نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی ناکات، لە حاڵەتی وەفات، یان گۆڕانی سەرۆکی وڵاتەکەی، یان سەرۆکی ئەو وڵاتەی کە کاری تێدادەکات، پێویستی بە وەرگرتنی مۆڵەتێکی نوێ بۆ مومارەسەکردنی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي صادق أبو هيف، م.س.ذ، ص٣٦٧. و: د.هاني الرضا، م.س.ذ، ص١٨٢.

کارەکانی نییە، واتە کونسوڵ، بە پێچەوانەی دبلۆماتەوە، تەنانەت لە حاڵەتی گۆڕانی سیستمی سیاسیی هەریەکێك لەو دوو دەوڵەتە لە کارەکەی بەردەوام دەبێت، ئەمە لەکاتێکدا کە دبلۆمات پێویستە لەو حاڵەتانەدا بەڵگەنامەی دامەزراندنی پێشکەش بکاتەوە[1].

**لەکاتی کۆتاییهاتنی کاری کونسوڵیدا پێویستە چەند کارێك ئەنجام بدرێت (بەپێی رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان):**

١. ئاگادارکردنەوەی ئەو دەوڵەتەی کونسوڵخانەکەی لێیە، لەلایەن دەوڵەتی خاوەن کونسوڵخانەکەوە بە کۆتاییهاتنی کاری ئەو کونسوڵەی، کە لە کونسوڵخانەکەیدا کاری کردووە[2].

٢. ئاگادارکردنەوەی ئەو دەوڵەتەی کونسوڵخانەکەی لێیە، بەوەی کە ئەو کەسەی کە کاری تەواوبووە لەو کەسانە نەماوە، کە لەلای ئەو کاردەکەن[3].

٣. لە حاڵەتی هەڵگیرسانی ناکۆکییەکی چەکداری، یان پچڕانی پەیوەندییە کونسوڵییەکانی نێوانیان، پێویستە ئەو دەوڵەتەی کونسوڵخانەکەی لێیە کات و ئاسانکاریی پێویست بە کونسوڵ و ئەندامانی خێزانەکانیان بدات، بەبێ سەیرکردنی ڕەگەزنامەکانیان بۆئەوەی خۆیان ئامادەبکەن بۆ جێهێشتنی خاکی ئەو دەوڵەتە لە کەمترین ماوەی گونجاودا دوای تەواوبوونی کارەکەیان، لە پێویستیشدا دەبێت هۆکاری گواستنەوەی خۆیان و سامانەکانیان بۆ فەراهەم بکەن[4].

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: المصدرين نفسهما.

(٢) بڕوانە: ماددەی (١/٢٥)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

(٣) بڕوانە: ماددەی (٢/٢٥)ی هەمان رێککەوتننامە.

(٤) بڕوانە: ماددەی (٢٦)ی هەمان رێککەوتننامە.

٤. پێویستە ئەو دەوڵەتەی، کە کونسوڵخانەکەی لێیە بەپێی ئەم خاڵانەی کە دێن ئەوە رابگەیەنێت، کە کەسێك لەلای ئەوان خوازراو نییە و نایەوێت ئەو کەسە لە دەوڵەتەکەیدا کاربکات[1]:

أ. لە هەمووکاتێکدا ئەو دەوڵەتەی کونسوڵخانەکەی لێیە مافی ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی خاوەن کونسوڵی هەیە، بەوەی یەکێك لە کونسوڵەکانی کەسێکی نەخوازراوە، یان هەریەکێك لە ئەندامانی دەستە کونسوڵییەکە قبوولْ نییە. لەو حاڵەتەدا دەوڵەتی خاوەن کونسولْ کەسەکە بانگدەکاتەوە، یان کارەکەی کۆتایی پێدەهێنێت لە کونسوڵخانەکەدا بەپێی بارودۆخەکە.

ب. ئەگەر دەوڵەتی خاوەن کونسولْ کێشانەوەی کونسوڵێکی، یان کۆتاییهێنان بە کارەکەی رەتکردەوە، ئەوا دەوڵەتی میواندار مافی ئەوەی هەیە، مۆڵەتی کونسولگەری لەو کەسە بکێشێتەوە، یان ئیتر بە ئەندامێکی دەستە کونسوڵییەکە هەژماری نەکات.

ج. دەوڵەتی میواندار دەتوانێت پێش ئەوەی کونسوڵەکە بگاتە خاکی دەوڵەتەکەی ئەوە ڕابگەیەنێت، کە ئەو کەسە نەخوازراوە، واتە ئەو کەسە نەخوازراوە، بۆیە پێویستە دەوڵەتی خاوەن کونسوڵەکە بیکێشێتەوە.

د. کاتێك دەوڵەتی میواندار بڕیاری ئەوە دەدات، کە یەکێك لە کونسوڵەکان خوازراو نییە (غير مرغوب فيه)، مافی ئەوەی هەیە، کە هۆکاری ئەو بڕیارەی رووننەکاتەوە.

(١) بڕوانە: ماددەی (٢٣)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

## پچڕانی پەیوەندیی کونسوڵی:

ڕێککەوتننامەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦٣)، لە باری پچڕانی پەیوەندییە کونسوڵییەکاندا، پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر -تەنانەت لە باری ناکۆکیی چەکدارییشدا- زەوی و باڵەخانەکانی کونسوڵخانە و ئەرشیفی بپارێزێت، دەشکرێت کارەکانی کونسوڵ و موڵك و ئەرشیفەکان، یاخود بەرژەوەندییەکانی و بەرژەوەندیی هاووڵاتییەکانی لەلایەن دەوڵەتەکەیەوە بە دەوڵەتێکی سێیەم بسپێرێت، کە دەوڵەتی پێشوازیکەر لەسەری ڕەزامەند بێت، خۆ ئەگەر کونسوڵخانەکە بەشێوازی کاتی، یان هەمیشەیی داخرا، ئەوا پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر ڕێز لە باڵەخانەی کونسوڵخانەکە سامان و ئەرشیفەکانی بگرێت و پارێزگارییان لێبکات.

هەر لە هەمان ماددەدا ئاماژە بەوە کراوە، کە ئەگەر دەوڵەتی نێرەر نێراوی دبلۆماسیی لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا نەبوو و نێراوێکی کونسوڵیی تری هەبوو لە خاکی ئەو وڵاتەدا، ئەوا دەتوانێت پاراستنی باڵەخانەو سامان و ئەرشیفی کونسوڵخانە داخراوەکە بەو کونسوڵخانەیەی تر بسپێرێت، هەروەها -پاش ڕەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر- دروستە کە داوای لێبکات لە بازنەی دەسەڵاتەکانی کونسوڵخانە داخراوەکە، مومارەسەی کارە کونسوڵییەکان بکات[١].

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٢٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

## جیاوازییەکانی نێوان کاری دبلۆماسی و کاری کونسوڵی:

لەگەڵ ئەوەی چوونیەکی و تەواوکاریی رێژەیی لەنێوان کارە کونسوڵی و کارە دبلۆماسییەکاندا بەدیدەکرێت، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە جیاوازییان نەبێت، لە باری یاسایی و سیفەتی نوێنەرایەتیکاریی هەریەکێك لە فەرمانبەری کونسوڵی و فەرمانبەری دبلۆماسیی لە کاتی دەستبەکاربوون و راپەڕاندنی کارەکانیاندا. دەتوانرێت ئەو جیاوازییانە لە سێ ئاستی (دامەزراندن و سیفەتی نوێنەرایەتیکاری و سیستمی جیاوك و پارێزبەندییەکان) باسبکەین[١]:

### ١. لەسەر ئاستی دامەزراندن:

لێرەدا جیاوازییەکە لە شێوازی دامەزراندنی سەرۆکدا دەردەکەوێت، چونکە ناکرێت سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی بەبێ وەرگرتنی را و رەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر دابمەزرێنرێت، پاش قبوولکردنی، بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی لەلایەن سەرۆکی وڵاتی نێرەرەوە ئاراستەی سەرۆکی وڵاتی پێشوازیکەر دەکرێت. واتە سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی لە سەرۆکی دەوڵەتەوە بۆ سەرۆکی دەوڵەت دەنێرێت. ئەمە لەکاتێکدا کە سەرۆکی نێراوی کونسوڵی لەلایەن وەزیری دەرەوەی وڵاتی نێرەرەوە، بەبێ وەرگرتنی رای دەوڵەتی پێشوازیکەر، دەنێرێت، ئەویش لە رێگەی پێدانی نووسراوێکی ڕاسپاردنەوە (كتاب تفويض)، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش بە شێوەی کاتی مۆڵەتی کونسوڵی پێدەبەخشرێت، تا ئەو کاتەی دەوڵەتی

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. علي حسين الشامي، م.س.ذ، ص ص٣٢٩-٣٣٣.

پێشوزایکەر ڕەزامەندیی لەسەر دەردەبڕێت و مۆڵەتی کونسوڵیی کۆتایی پێدەبەخشێت.

سەرباری ئەوە، دەستبەکاربوونی سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی لەو کاتەوە دەستپێدەکات، کە نووسراوی دامەزراندنەکەی پێشکەشدەکات، یان لە کاتی ڕاگەیاندنی گەیشتنی و پێشکەشکردنی وێنەیەکی ئەصڵی لە نووسراوی دامەزراندنەکەی بە وەزارەتی دەرەکی، بەڵام لە دیاریکردنی کاتی دەستبەکاربوونی سەرۆکی نێراوی کونسوڵی، نووسراوی ڕاسپاردن ناکرێت بە پێوەر، بەڵکو بەخشینی مۆڵەتی کونسوڵی کاتی، یان کۆتایی لەلایەن دەوڵەتی پێشوازیکەرەوە بە سەرکونسوڵەکە دەبێتە پێوەر، بۆ دەسپێکی مومارەسەکردنی کارەکانی.

### ٢. لەسەر ئاستی نوێنەرایەتیی سیاسی:

فەرمانبەری کونسوڵی لە بنەڕەتدا سیفەتی نوێنەرایەتی سیاسی نییە، تەنانەت لەکاتێکدا کە مومارەسەی کاری دبلۆماسیش دەکات ئەو سیفەتە، یان سیفەتی دانوستانکار وەرناگرێت[١]، تەنیا لەو کاتەدا ئەو سیفەتە وەردەگرێت، کە نوێنەرایەتیی دەوڵەتی نێرەری لە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی پێبسپێرێت[٢]، بەڵام فەرمانبەری دبلۆماسی لەکاتێکدا کە بە ئەرکی کونسوڵی هەڵدەستێت، ئەوا لەپاڵ سیفەتە دبلۆماسییەکەیدا سیفەتی کونسوڵییش وەردەگرێت.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٥) و (١/١٧)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

(٢) بڕوانە: ماددەی (٢/١٧)ی هەمان ڕێککەوتننامە.

### ٣. ئاستی پەیوەندیدار بە سیستمی جیاوك و پارێزبەندییەكان:

فەرمانبەری كونسوڵی لە كاتی ممارەسەركردنی كاری دبلۆماسیدا سوود لە سیستمی جیاوك و پارێزبەندییە دبلۆماسییەكان وەرناگرێت، بەڵكو تەنها جیاوك و پارێزبەندییە كونسوڵییەكانی دەبێت، بەڵام كاتێك دەبێتە نوێنەری دەوڵەتی نێرەر لە رێكخراوێكی نێودەوڵەتیدا، ئەوا لەپاڵ سیفەتی نمایندەكارییەكەیدا سوود لەو سیستمی جیاوك و پارێزبەندییانە وەردەگرێت، كە پەیوەستە بەو نمایندەكارییەوە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی و نەریت و رێككەوتننامە نێودەوڵەتییەكانی وەك ئەو رێككەوتننامانەی، كە تایبەتن بە بارەگا و "رێككەوتننامەی ڤیەننا بۆ نوێنەرایەتیی دەوڵەتان لە پەیوەندییەكانیان لەگەڵ رێكخراوە نێودەوڵەتییە سروشت جیهانییەكان"ی ساڵی (١٩٧٥). ئەمە لە لایەك، لە لایەكی ترەوە جیاوازییەك هەیە پەیوەندیی بە شوێنی ممارەسەكردنی كاری دبلۆماسیی و كونسوڵییەوە هەیە. كاتێك نێراوێكی دبلۆماسیی هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی كارێكی كونسوڵی، ئەوا بۆی هەیە پەیوەندی بكات بە دەسەڵاتی خۆجێیی ئەو ناوچە كونسوڵییەی، كە كونسوڵخانەكەی لێیە، لە هەمان كاتدا دەتوانێت پەیوەندیی بكات بە دەسەڵاتی ناوەندیی دەوڵەتی پێشوازیكەرەوە ئەگەر یاساكانی ئەو وڵاتە رێگەی پێبدەن[1]، ئەمە لەكاتێكدا كە نێروای كونسوڵ لە كاتی ممارەسەكردنی كارە كونسوڵییەكانیدا تەنیا دەتوانێت پەیوەندی بە دەسەڵاتە خۆجێییەكانەوە بكات، خۆ ئەگەر ویستی پەیوەندی بە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتی پێشوازیكەرەوە بكات، ئەوا پێویستە لە رێگەی نێراوی دبلۆماسیی وڵاتەكەیەوە ئەنجامی بدات.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (٣/٧٠)ی هەمان رێككەوتننامە.

# بەشی هەشتەم
# دبلۆماسی و دانوستان

باسی یەکەم: پێناسەی دانوستان

باسی دووەم: ڕەگەز و قۆناغەکانی دانوستان

باسی سێیەم: ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکەکانی دانوستان

باسی چوارەم: ڕۆڵی زمانی جەستە و پەیوەندیی نازارەکیی لە دانوستاندا

## بەشی هەشتەم: دبلۆماسی و دانوستان

➢ ئامانجەکانی ئەم بابەتە:

١. ئاشنابوون بە پێناسەو چەمکی دانوستان، کە دەبێتە دەروازەیەکی باش بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە.

٢. تێگەیشتن لە ئامانجە سەرەکی و ئاشکراکانی دانوستان و جیاکردنەوەیان لە ئامانجە شاراوەکانی پشت پرۆسەی دانوستان.

٣. وردکردنەوەی قۆناغەکانی دانوستان و زانینی گرنگیی هەرقۆناغێك و ئەرکی دبلۆماتکاران لە قۆناغە جیاوازەکاندا.

٤. شیکردنەوەی ستراتیج و تەکتیك و سیاسەتە جیاوازەکانی دانوستان و جیاکردنەوەیان لە یەکتری و شێوازی بەکارهێنانیان لە یەك چوارچێوەی دیاریکراودا.

٥. تیشکخستنەر سەر تایبەتمەندییەکانی دانوستانکاری پسپۆڕ و ئەو هەڵە کوشندانەی، کە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزێت.

٦. پەیبردن بە گرنگی و بایەخی پەیوەندییە نازارەکییەکان و زمانی جەستە لە پرۆسەی دانوستان و بەکارهێنانی لە جێبەجێکردنی تەکتیك و سیاسەتەکانی دانوستان و دواجار بەدیهێنانی ستراتیجی دانوستانەکان.

➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە:

## دەستپێك..

لەگەڵ ئەوەی دانوستان بە تەوەرێکی سەرەکی و گرنگی دبلۆماسیی هەژماردەکرێت، قووڵاییەکی مێژوویی هەیە، بەڵام بەردەوام لە نوێبوونەوەدایەو گرنگیی خۆی لەدەست نادات، بەڵکو لەگەڵ فراوانبوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئاڵۆزبوونی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازی و فرەڕەهەندبوونیان لە لایەك، زیادبوونی بەرژەوەندیی هاوبەش و هاریکاریی نێوان یەکە نێودەوڵەتییەکان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان و ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەو مەترسییەکانلەلایەکی تر، وایانکردووە یەکە نێودەوڵەتییەکان نەتوانن بەبێ دانوستان کاروبار و بەرژەوەندییەکانیان بەڕێوەببەن.

دانوستانیش ڕێسا و ڕێکارو پرۆسیجەری تایبەت بە خۆی هەیە، کە پێویستە دبلۆماتکاران پێی ئاشنا بن. سەرەتا با بزانین دانوستان چییە؟

## باسی یەکەم: پێناسەی دانوستان (Negotiation)

دانوستان پێناسەی زۆری بۆ کراوە، هەر پسپۆڕ، یان زانایەك لە گۆشەنیگایەکەوە بۆی ڕوانیوە، چونکە دانوستان هێندە گرنگە، تەنها لەڕووی سیاسییەوە جێی بایەخی زانایان نەبووە، بەڵکو لەڕووی یاسایی و دەروونی و کولتووری و بازرگانی و زمانی جەستەوزمانەوانی و ڕەوانبێژی و...هتد، گرنگیی تایبەتی پێدراوە، بە جۆرێك کە هەموو رەهەند و جۆر و قۆناغ و شێوەو ئاستەکانی خراونەتە بەر باس و لێتوێژنەوەی ورد، لەنێو ئەندامانی خێزان و لەنێوان هاوڕێیان و پیشەگەران و لە بازاڕ و بازرگانی و شوێنی پیشەو کارو وەزیفەدا، لە هەموو هەنگاوێکی ژیاندا جۆرێك لە دانوستان بوونی هەیە، تا دەگاتە ئەوەی هەندێك لە نووسەران مرۆڤ بە "بوونەوەرێکی دانوستانکار" ناودەبەن.

لەرووی سیاسیشەوە، بەتایبەت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لەدوای فراوانبوون و زیادبوونی رێژەو جۆری یەکە نێودەوڵەتییەکان و چڕبوونەوەو ئاڵۆزبوون و گەشەکردنی دۆز و پرس و بابەتەکان، دانوستان بایەخێکی یەکجار زۆری بەخۆیەوە بینیوە، بووەتە پێویستیی پرۆسەی بەڕێوەبردنی ژیانی سیاسی و ئابووری و بازرگانی و کولتووریی دەوڵەتان و گەلان بەگشتی.

بەسادەیی دەتوانرێت بوترێت: دانوستان بریتییە لە را و پێشنیازگۆڕینەوە لەنێوان دوو لایەن، یان زیاتر سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو و ملکەچی هیچ پێش مەرجێك نابێت و لەمیانەیدا دید و خواستی

لایەنەكان دەخرێنەروو و گفتوگۆیان لەسەر دەكرێت، بە ئامانجی گەیشتن بە ڕێككەوتنێك كە هەموویان پێی رازی بن[1].

پرۆسەی دانوستان"Negotiation" بەواتای ئەو پەیوەندییە ڕاستەوخۆیانە دێت، كە دوولایەن، یان زیاتر سەبارەت بە كەیسێكی دیاریكراو، یان ناكۆكییەكی ئەوتۆ بەڕێوەی دەبەن، لە هەمان كاتدا، ڕەنگە بۆ ناسینی تێروانین و دیدگاكان، هەندێ گفتوگۆش لەخۆ بگرێت، هەروەها گفتوگۆیەك لەخۆ بگرێت، كە لەمیانەیدا ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەكرێت، بەڵام لەناوەڕۆكدا دانوستانەكە لەدەوری ئەو موساوەمانە دەسووڕێتەوە، كە بە ڕێككەوتن و یەكلاكردنەوەی مەسەلەكانەوە بەستراون[2].

دانوستانی نێودەوڵەتی یەكێكە لە ئامرازەكانی بەڕێوەبردنی ململانێ، بۆ ڕێگریكردن لە توندوتیژی و گەیشتن بە ڕێگەچارەی گونجاو بۆ قەیران و ناكۆكییەكان، لە هەمان كاتدا، یەكێكە لە ئامرازەكانی هاریكاری لە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. عامر مصباح، معجم العلوم السیاسیة والعلاقات الدولیة، دار الكتاب الحدیث،القاهرة، ٢٠١٠، ص ص٢٠٩-٢١٠. لەبەر گرنگیی دانوستان، هەندێك لە پسپۆران لە پێناسەی دانوستاندا پێداگری لەوە دەكەن, كە "دبلۆماسیەت زانست، یان هونەری دانوستانە"، یان "زانست و هونەری نوێنەرایەتیكردنی دەوڵەتان و ئەنجامدانی دانوستانە، یان بەڕێوەبردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەكانە لە ڕێگەی دانوستانەوە". بۆ پێناسەی هەریەك لە (شارل دي ماریتنس، ریفییة، هارولد نیكلسن، وكالفو و تاد)، كە جەختیان لە دانوستان كردووەتەوە لە پێناسەی دبلۆماسیدا، بڕوانە:د. فاضل زكي محمد، م.س. ذ، ص ص٢٦-٢٩. و د.عبدالعزیز بن ناصر بن عبدالرحمن العبیكان، م.س.ذ، ص ص٧٤-٨٨.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە چەمكی دانوستان بڕوانە:د. عطا محمد صالح زهرة، م.س. ذ، ص ص١٤١-١٤٩. وكذلك: شوقي ناجي جواد وعباس غالي أبو التمن، التفاوض مهارة واستراتیج، مطبعة الفنون، بغداد، ١٩٩١. و ولیام أوري، فن التفاوض، ترجمة: د. نیفین غراب، الدار الدولیة للنشر والتوزیع، مصر- كندا، ١٩٩٤.

پەیوەندییــە نێودەوڵەتییەکانــدا، لــەپێناو پــەرەدان بــە بەرژەوەندییــە هاوبەشەکان و تێگەیشتنی زیاتری نێوان یەکە نێودەوڵەتییەکان[1].

بەم شێوەیە (دانوستان) گوزارشتە لە پرۆسـەیەکی بەیەکداچـووی نێـوان دوولایەن، یان زیاتر، بە ئامانجی گەیشتن بە بنچینەیەکی هاوبـەش لـەبارەی پرسێك، یان کۆمەڵە پرسێکەوە، کە بەرژەوەندیی هاوبەش، یاخود نـاکۆکی، لەخۆدەگرێت، لایەنەکان هەوڵی گەیشتن بە رێککەوتنێکی قبووڵکراو دەدەن، کە پێویستە هەریەکە لای خۆیەوە رێز لەو رێککەوتنە بگرێت[2].

کەواتە دانوستان ئامرازێکی ئاشتییانەو رێگایەکی نەرمە بۆ مامەڵـەکردنی نێوان یەکە نێودەوڵەتییەکان، لە کاتی هاریکاری و ئاشتی و لەکاتی ململانـێ و جەنگیشدا، کە لە هەردوو دۆخەکـەدا لایەنـەکان پێویسـتیان بـە گفتوگـۆ و لێکتێگەیشتن هەیە، بۆئەوەی بگەنە چارەسەرێکی ناوەند، کە دەکرێـت ئـەو گفتوگۆیـە بـە نووسـراو بێـت، یـان بـە زارەکـی. هەرلایـەنێکیش سـتراتیج و سیاسـەت و تـەکتیکی تایبـەت بـە خـۆی دەبێـت، بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجـە باڵاکانی لەپشت دانوستانەکانەوە. دانوسـتانەکانیش دەکرێـت ئاشـکرا بـن و دەشکرێت نهێنی بن، دەرەنجامەکەشی دواتر رادەگەیەنرێت[3].

---

(١) بڕوانە: د.محمد بدرالدين زايد، المفاوضات الدولية بين العلم والممارسة، مكتبة الشروق الدولية، القاهرة، ٢٠٠٣، ص١٣.

(٢) بڕوانە: د. فكرت نامق عبدالفتاح العاني، نحو إطار نظري للمفاوضات الدولية (المفهوم والمقومات الأساسية)، مجلة قضايا سياسية، كلية العلوم السياسية، جامعة النهرين، بغداد، المجلد الثاني، العدد الأول، ربيع ٢٠٠١، ص ص١٣٤-١٣٧.

(٣) بەراورد بکە لەگەڵ: د. عامر مصباح، م.س.ذ، ص٢١٠.

دانوستان كۆمەڵێك مەرج و تایبەتمەندی هەیە، كە بە كۆی گشتی چوارچێوەیەكی گشتی بۆ پرۆسەی دانوستان دادەڕێژن، كە بریتین لە[1]:

- دانوستان پرسێكی پەیوەندی (زانیاری گۆڕینەوە)یە، لەسەر دیالۆگ و كارلێك و قەناعەتپێكردن وەستاوە.
- دانوستان لەنێوان دوولایەن، یان زیاتردا ئەنجامدەدرێت.
- هاوسەنگییەكی ڕێژەیی لەنێوان لایەنەكانیدا هەیە.
- پشت بە پرەنسیپی "دان" و "ستاندن" یان "بەخشین" و "وەرگرتن" دەبەستێت.
- پرۆسەی وەرگرتنی زنجیرە بڕیارێكی جیاوازە بە مەبەستی گەیشتن بە ڕێككەوتنێكی دیاریكراو، كە لایەنەكان پێیەوە پابەندبن. (ئەم خاڵە لەسەر جۆری ئامانجی ستراتیجی دانوستانەكە دەوەستێت).

---

(١) بڕوانە: شوقي ناجي جواد و عباس غالي أبو التمن، م.س.ذ، ص٤٥.

## باسی دووەم: رەگەز و قۆناغەکانی دانوستان

### یەکەم: رەگەزەکانی دانوستان:

دانوستان چەند رەگەزێکی سەرەکی لەخۆ دەگرێت، کە خۆیان لەم خاڵانەدا دەبیننەوە[1]:

**١. لایەنەکانی دانوستان:**

هەر دانوستانێکی پێویستە دوولایەن، یان زیاتر تێیدا بەشداربن. دوو جۆر لایەنی دانوستان هەیە: یەکەمیان لایەنە راستەوخۆکانن، کە دانوستانەکە بە راستەوخۆ ئەنجامدەدەن، دووەمیان لایەنە ناڕاستەوخۆکانن، کە بریتین لەو هێزو لایەن، یان دەوڵەت و رێکخراوانەی، کە لە رێگەی فشاری راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەسەر لایەنە ڕاستەوخۆکانی دانوستانەکان، کاریگەریی لەسەر جۆر و شێواز و ئامانج و ئەنجامی دانوستانەکان دروستدەکەن. هەندێکجار لایەنە ناراستەوخۆکانی دانوستان رۆڵ و کاریگەریی گەورەتر لە لایەنە راستەوخۆکان دەبینن، بەجۆرێك کە جاری وا هەیە لایەنە ڕاستەوخۆکان دەبنە بریکارینا راستەوخۆی لایەنە ناراستەوخۆکان. دیارترین نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە دانوستانی (ئەستانە)ی پایتەختی (کازاخستان) سەبارەت دۆز و قەیران و ململانێکانی سووریا لە یەنایەری (٢٠١٧)دا لەنێوان رژێمی سووریا و زۆینەی باڵ و لایەنە جیاوازەکانی ئۆپۆزسیۆنی سوریا، بە چاودێریی (رووسیا) و (تورکیا) و (ئێران)، دەستی پێکرد، کە جگە لەو لایەنانە چەندین لایەنی تر،

(١) بڕوانە: شوقي ناجي جواد و عباس غالي أبو التمن، م.س.ذ، ص٤٥.

ناراســـــتەوخۆ، کاریگـــــەرییان لەســــــەر دروســــــتکردووە، لەنێویانـــــدا (وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا) و هەندێك لە وڵاتە عەرەبییەکان.

### ٢. ئامانجەکانی دانوستان:

ئامانجەکانی دانوستان جۆریان زۆرە، دەگوشنجێت دانوستانەکان خۆیان ئامــانج بــن، دەشــکرێت بــۆ بــەدیهێنانی ئامــانجی تــر بکــرێن بــە ئــامراز. ئەمانجـــەکانی دانوســـتانیش دەکرێـــت ســـتراتیجی و دوورمـــەودا بـــن و دەشگونجێت پەیوەست بن بە قۆناغێکی دیاریکراوەوە.

بەگشتی، چوار جۆر پاڵنەر لەپشت ئەنجامدانی پرۆسەی دانوسـتانەوەن، کە بریتین لە[١]:

أ. فراوانکردنـــی چوارچـــێوەی بەرژەوەندییـــە هاوبەشـــەکان، لـــەرووی ئاسۆیی، یان ستوونییەوە.

ب. دوبارە دەستپێکردنەوەوی پەیوەندیی وەستاو، یان پچڕاوی نێـوان لایەنەکان و ئاساییکردنەوەی.

ج. دووبارە دابەشکردنەوەی ئەرك و پابەندیی لایەنەکان لە چوارچێوەی ڕێککەوتن، یان پەیماننامەیەکی هاوبەشدا.

د. هەوڵـدان بـۆ گەیشـتن بـە جـۆرە ڕێککـەوتنێك کـە بەرژەوەنـدیی هاوبەشی هەموو لایەنەکانی تێدا بێت، وەك بازاڕی هاوبەش.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. إسماعيل صبري مقلد، م.س.ذ، ص ص٤٣٢-٤٣٣. ٢. د. حسن محمد وجيه، مقدمة في علم التفاوض الاجتماعي والسياسي، سلسلة عالم المعرفة، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت، ١٩٩٤، ص ص٧٧-٨١.

بەڵام هەندێکجار ئامانجە راستەقینەکانی دانوستان هەمان ئەو ئامانجانـە نین، کـە راگەدەیـەنرێن. لێـرەوە دەتـوانین شـەش جـۆر لـە ئامـانجی پشـت دانوستانەکان دیاریبکەین[١]:

أ. هێشتنەوەی کـەناڵی پـەیوەنـدیی لەگـەڵ بەرانبـەر، بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجگەلێکی تر، کە راستەوخۆ پـەیوەندییان بە باسی دانوستانەکەوە نییە.

ب. رێگرتن لە رووداني جەنگ، یان هەوڵدان بۆ وەستاندنی جەنگ.

ج. بەدەستهێنانی زانیاری لەسـەر بابـەتێکی گـرنگ (وەك ئامرازێـك بـۆ سیخوڕی)، بۆ زانـینی نییـەت و ئامـانج و ئـامراز و گرنگیپێدانـەکانی لایـەنی بەرانبەر.

د. بەلارێـــدابردنی بەرانبـــەر و داپۆشـــینی بابـــەتێك و دروســـتکردنی هەستێکی هەڵە لەلای ئەو، بۆئەوەی رەفتاری خۆی لەسەر بونیا بنێت.

ه. بۆ پڕوپاگەندەو دروستکردنی هەڵایەك لە راگەیاندن لەمەڕ کەیسێکی دیـاریکراو، یـاخود بـۆ بزوانـدنی رای گشـتی بـۆ ئـەوەی وا دەربکـەوێت، کـە ئاشتیخوازە.

و. بـۆ جێهێشـتنی کاریگـەری لەسـەر لایـەنی سـێیەم لـە دەرەوەی دانوسـتانەکە، واتـە بـەکارهێنانی هەڕەشـە بـە رێککـەوتن وەك ئـامرازی ناچارکردنی لایەنی سێیەم، بۆ قبووڵکردنی بارێکی دیاریکراو.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. إسماعيل صبري مقلد، م.س.ذ، ص ص٤٣٣-٤٣٥.

### ٣. هەڵوێستی دانوستان:

دانوستان هەڵوێستێکی بزواوە، لەسەر جموجووڵ و کارو کاردانەوە وەستاوە، جا بە باش بێت، یان بە خراپ، بە دروستکردنی کاریگەری بێت، یان بە کەوتنەژێر کاریگەرییەوە. هەروەها دانوستان هەڵوێستێکی نەرمە، پێویستی بە تواناگەلێکی زۆر هەیە تا بتوانرێت بە خێرایی و بەردەوامی لەگەڵ کۆی گۆڕاوەکان و پرۆسەی دانوستان هەنگاوبنێت و بەپێی خواستەکانی خۆی بگونجێنێت.

**بەگشتی هەڵوێستی دانوستان چەند ڕەگەزێك لەخۆ دەگرێت:**

أ. وابەستەیی (الترابط): واتە لەسەر ئاستی گشتیی رەگەزەکانی ئەو دۆزەی دانوستانی لەبارەوە دەکرێت وابەستەیی و پێکەوەگرێدانێك هەبێت، بە شێوەیەك کە هەڵوێستی دانوستانەکە ببێت بە (گشت)ێکی پێکەوە گرێدراو، لەگەڵ ئەوەی کە گەیشتن بە ڕەگەز و بەشەکانی کارێکی ئاسان بێت.

ب. رێکخستن و پێکهێنان (الترکیب): واتە پێویستە هەڵوێستی دانوستان لەو بەش و رەگەزانەی پێکبێت، کە دابەشدەبنەوە بەسەریدا و تاووتوێکردنیان لە چوارەچێوە بەشەکییەکەیاندا ئاسان بێت، هەروەها تاووتوێکردن و لێکانەوەی لە شێوە گشتییەکەشیدا ئاسان بێت.

ج. توانای ناسینەوەو جیاکردنەوە (إمکانیة التعرف والتمییز): هەڵوێستی دانوستان پێویستە وا بێت، کە بەبێ لێڵی و ناڕوونی و بەبێ

ونکردنــی هەریــەکێك لــە بەشــەکانی، یــان ڕەهەنــد و تایبەتمەندییــەکانی، بناسرێتەوە.

د. سنووری کات و شوێن (الاتساع المكاني والزماني): مەبەست لێی ئەو قۆناغــە مێژوویيــە و ئــەو شــوێنە جوگرافییەيــە، کــە دۆزی دانوســتانەکە دەیگرێتەوە لە کاتی دانوستانەکاندا.

ه. ئاڵۆزی (التعقيد): هەڵوێستی دانوستان هەڵوێستێکی ئاڵۆزە، چونکە کۆمەڵەفاکتەرێکی جیـاواز کـارلێکی تێدادەکـەن، چـەندین ڕەهەنـد و لایـەنی هەیــە، کــە بــە هــەموویان ئــەو هەڵوێســتە پێکــدەهێنن، بۆیــە پێویســتە تێگەیشتنی تەواو، بۆ هەموو ئـەو لایـەن و فاکتـەر و ڕەهەندانـە هـەبێت، تـا بتوانرێت بە وریایی و سەرکەوتووانە مامەڵە لەگەڵ هەڵوێستەکەدا بکرێت.

أ. نــاروونی (الغمــوض): هەنــدێك بــە (گومــان) نــاوی دەبــەن، چــونکە پێویســتە ســێبەری گومــان و نــاروونی بــە شــێوەیەکی ڕێــژەیی بــاڵ بەســەر هەڵوێستی دانوستاندا بکێشێت، کە پاڵ بە دانوستانکارەوە دەنێت هەوڵبدات بـۆ کەمکردنــەوەی بازنــەی نادڵنیــایی لــە ڕێگــەی کۆکردنــەوەی ئــەو داتــا و زانیارییيانەی، کە ئەو ناروونییە کەمدەکەنەوە، یـان نـایهێڵن، بەتایبـەت کـە هەمیشە گومانەکان پەیوەندییان بە نیـاز و پاڵنـەر و ئاڕاسـتە و بیروبـاوەڕی لایەنی بەرانبەرەوە هەیە.

**٤. دۆز و بابەتی دانوستان:**

پێویستە هەردانوستانێك سەبارەت بە بابەتێك، دۆزێك، مەسەلەیەکی دیاریکراو ئەنجامبدرێت، کە دەبێت بە تەوەری پڕۆسەکانی دانوستان. دەکرێت دۆزەکە، یان بابەتەکە مرۆیی، سیاسی، کەسی، ئابووری و بازرگانی، ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی،...هتد، بێت، بۆیە ئامانجەکانیش بەپێی جۆری بابەتەکە دیاریدەکرێت.

**دووەم: قۆناغەکانی دانوستان**

دانوستان پڕۆسەیەکی ئاڵۆزەو چەندین قۆناغ لەخۆی دەگرێت کە بریتین لە[١]:

**قۆناغی یەکەم: ڕێخۆشکردن و ئامادەکاری بۆ دانوستان**

هەر سەرکەوتن و دەستکەوتێکی دبلۆمات، یان دەستەی دبلۆماسیی لە دانوستاندا بەستراوە بەوەی، ئایا تا چەند خۆیان بۆ ئەو دانوستانە ئامادەکردووە؟

پڕۆسەی ڕێخۆشکردن و ئامادەکاریی بۆ دانوستان لەڕووی ماوەی پێویست و ڕێژەی ئاڵۆزییەکەیەوە، بەپێی جۆری دانوستانەکان دەگۆڕێت. پڕۆسەی ئامادەکاری بۆ دانوستان چەندین بابەت و مەسەلە لەخۆی دەگرێت، دیارترینیان بریتین لە: شوێنی دانوستان، ئامادەکردنی خشتەی کار (ئەجێندا)، زمانی بەکارهێنراو لە دانوستانەکەدا، ڕیزبەندی و ڕێکخستنی شێوازی دانیشتن لەسەر مێزی دانوستان، نهێنیبوون، یان ئاشکرابوونی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صلاح محمد عبدالحمید، فن التفاوض والدبلوماسية، مؤسسة طيبة للنشر والتوزيع، القاهرة، ٢٠١٢، ص ص٤٩-٥٥.

گفتوگۆ و دانوستانەکان، رووماڵی رۆژنامەوانی و شێوازی مامەڵە لەگەڵ راگەیاندنەکان، رۆڵی لایەنی سێیەم (بۆ نموونە: نێوەندگیر)، کاتی دیاریکراو بۆ دانیشتنەکان، شێوازی دانانی ئاڵای لایەنەکان[١] و چەندین شتی تر، کە پێویستە پێشوەخت تێگەیشتن و جۆرێك لە رێککەوتن لەسەریان هەبێت.

ئامادەکاریی باش بۆ دانوستان لەسەر چەند تەوەرێك وەستاوە، کە ئەمانەن[٢]:

أ. ئەکتەرە سەرەکییەکان: کێن ئەو ئەکتەرە سەرەکییانەی بەشداری لە دانوستانەکەدا دەکەن؟ لەڕاستیدا ئەکتەری ڕاستەوخۆ هەیە، کە ئەوانەن کە بەشداریی کردەیی دەکەن لە گفتوگۆکاندا، هەروەها ئەکتەری ناڕاستەوخۆش هەیە، کە بریتین لەوانەی کە راستەوخۆ بەشداری لە دانوستانەکاندا ناکەن، بەڵام دەتوانن وەکو لۆبی رۆڵ و کاریگەرییان لەسەر رەوتی دانوستانەکان و دەرەنجامەکانیشی هەبێت.

ب. شوێن: واتە ئەو خاك و شوێن و شار و پێگەیەی، کە دانوستانەکەی تێدا ئەنجامدەدرێت، کە واتای خۆی هەیە و پێویستە لایەنەکان لەسەری رێکبکەون.

ج. پاڵنەر و ئامانجەکان: واتە ئامانجی باڵا چییە؟ ئامانجی بچووك لە دانوستانەکان چییە؟ هەروەها هۆکاری دوور و نزیك و پاڵنەری دانوستانەکان چین؟

---

(١) بڕوانە: د. فکرت نامق عبدالفتاح العاني، م.س.ذ، ص١٥٦.

(٢) بڕوانە: د. شاکر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٢٤٥.

د. ئاستی کەسانی دانوستانکار: لەرووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و زانستی و تواناکانیان و پێشینەیان و...هتد.

ه. خاڵی بەهێز و لاواز: پێویستە خاڵی بەهێز و لاوازی خود و بەرانبەر خوێندنەوەی وردی بۆ بکرێت، لە سۆنگەیەوە هەڵویستەکان و ئاستی خواستەکان و ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکی دانوستانەکان دیاریبکرێن.

و. دەرەنجامە خوازراوەکان: پێویستە دانوستانکار بڕیاری ئەوە بدات، کە چۆن کۆتایی بە دانوستانەکە بهێنرێت: بە ڕێککەوتن، یان دواخستن، یان ئیمزاکردن بە پیتەکانی یەکەم و هێشتنەوەی بڕیاری کۆتایی بە هەڵواسراوی، بەمەش ستراتیجی دبلۆمات رووندەبێت.

**قۆناغی دووەم: ئەنجامدانی دانوستان (گفتوگۆ و دانیشتنەکان)**

پێویستە لەم قۆناغەدا کەشی هاریکاری و نەهێشتنی دڵەڕاوکێ زاڵ بکرێت، بابەتییانە بچنە ناو تەوەرەکانی ئەجێندای دانیشتنەکانەوەو دووربکەونەوە لە بریندارکردن و سووکایەتیکردن بە یەکتری، ئەمە لەکاتێکدا لایەنەکان ویستیان لەسەر ئەوە بوو، کە بگەن بە ڕێککەوتن.

لەم قۆناغەدا چەند هەنگاوێك کاری لەسەر دەکرێت، لەوانە(١):

- هەڵبژاردنی تەکتیکە گونجاوەکان بۆ دانوستان.
- دیاریکردنی بابەتی دانوستان و تەوەرەسەرەکییەکانی و گفتوگۆکردن لەسەریان.

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صلاح محمد عبدالحمید، م.س.ذ، ص ص٥٢-٥٣.

- پستبەستن بە ئامرازە گونجاوەکانی دانوستان، بەتایبەت ئامادەکردنی بەڵگەنامەکان.
- ئامادەکردنی ئەو داتا و بەڵگانەی کە پاڵپشتیی را و دیدی دانوستانکار دەکەن، یان دژی لایەنی بەرانبەرن.
- مومارەسەکردنی فشار لەسەر لایەنی بەرانبەر، جا لە ناو دانیشتنەکاندا بێت، یان لە دەرەوەیان، ئەو فشارانەش گۆراوەکانی کات، تێچوون، هەوڵ و ماندووبوون، نەگەیشتن بە ئەنجام، فشاری راگەیاندن و سایکۆلۆجی...هتد، دەگرێتەوە.
- ئاڵوگۆڕکردنی دید و پێشنیازەکان لە چوارچێوەی هێڵە پانەکانی پرۆسەی دانوستاندا، لە هەمان کاتدا دیراسەکردنی بژاردە پێشکەشکراوەکان و هەڵبژاردنی باشترینیان.
- بەکارهێنانی هەموو ئەو فاکتەرانەی تر، کە کاریگەریی لەسەر لایەنی بەرانبەر دروستدەکەن، بۆ ناچارکردنی بە وەرگرتنی هەڵوێستێکی دیاریکراو، یان بردنەوەی دانوستانەکە و سەرکەوتن، یان گەیشتن بە رێککەوتن.
-

## قۆناغی سێیەم: واژۆکردنی رێککەوتن(١)

هەردانوستانێك نەگاتە قۆناغی رێککەوتن، لە ئاڵوگۆڕکردنی بیرورا تێناپەرێت، یاخود مەبەست لێیی نەگەیشتن بووە بە رێککەوتن، یاخود لایەنەکان نەیانتوانیوە بگەن بە هێڵێکی تێگەیشتنی ناوەند و پرۆسەکە لە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.محمد بدرالدين زايد، ص ص١٠٥-١٠٧.

ڕێگـا پـەکیکـەوتووە. هـەر دانوسـتانێك کـە دەگاتـە ئـەنجام پێویسـتە لـە چوارچێوەی ڕێککـەوتنێکی گشـتیدا و بـە وردەکارییـەوە بنووسـرێتەوە، بـە شێوەیەك کە داڕشتنێکی ڕوونی هـەبێت و بـۆ هـەردوولا تێگەیشـتنی ئاسـان بێت و وشەکانی چەند واتایەك هەڵنەگرن، بۆئەوەی لە کاتی جێبەجێکردنیدا تووشـی گرفـت نـەبن، هـەروەها پێویسـتە ڕێککـەوتی جێبەجێکردنەکەشـی دیاریبکرێت.

**قۆناغی چوارەم: جێبەجێکردنی ڕێککەوتن**

هە ڕێککەوتنێك کە لە ئەنجامی دانوستان دروستدەبێت، پێویستە بچێتە بواری جێبەجێکردنـەوە، خـۆ ئەگـەر نەچێتە بـواری جێبەجێکردنـەوە ئـەوا بـەهای کرداریـی خـۆی لەدەسـت دەدات، ئـەو جێبەجێکردنـەش پێویسـتە خشتەی زەمەنیی هەبێت و قۆناغبەندیی تێدا بێت و لایەنەکانی جێبەجێکار و میکـانیزمی جێبـەجێکردن، بـەوردی دیـاری کـرابن، هــەروەها پێویســتە لیژنەیەکی هاوبەش هەبێت بۆ بەدواداچـوونی پڕۆسـەی جێبەجێکردنەکـە لـە قۆناغە جیاوازەکانیدا.

**قۆناغی پێنجەم: هەڵسەنگاندنی دانوستان و دەرەنجامەکانی.**

قۆنـاغی دوای ڕێککـەوتن و جێبـەجێکردن قۆنـاغێکی گرنگـە بـۆ هەڵسـەنگاندنی ئاسـتی پابەنـدبوونی لایەنـەکان بـە دەرەنجامـەکانی دانوستانەکانەوەو چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی، کـە دروسـت دەبـن. جگـە لـەوە گرنگـە کـە هەرلایـەنێك دوای ئـەو پرۆسـانە دووبـارە خوێندنـەوە بـۆ

تەرازووی هێز و توانای خۆی و ڕکابەر و ململانێکارەکانی بکات، بۆئەوەی بتوانێت ئامانجەکانی قۆناغی ئاییندەی لەسەر ئەو بنەمایە دابڕێژێت.

لەگەڵ ئەوەی پرۆسەی دانوستان بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕ دەبێت، چەند فاکتەرێك کاریگەری لەسەر دەرەنجامی کۆتایی دانوستانەکان دروستدەکەن، دیارترینیان بریتین لە[1]:

أ. تایبەتمەندییەکانی لایەنەکانی دانوستان: بە دید و تێڕوانین و بیروبۆچوونینانەوە، هەروەها ئاستی فشاری رای گشتی لەسەریان، چونکە ئەم فاکتەرانە کاریگەری لەسەر ڕێژەی توندی و نەرمینواندنیان لە دانوستانەکاندا دیاریدەکەن.

ب. مێژووی پەیوەندیی لایەنەکانی دانوستان: ئایا دۆستانەیە، یان دوژمنانە و تەنگژاوی و قەیراناوییە؟ چونکە هەر لایەنێك جۆرێك لە شارەزایی و هەڵوێستی تایبەت و بڕیاری پێشوەختە بەرانبەر لایەنەکەی تر، پشتبەست بە جۆری مێژووی پەیوەندییەکانیان، وەردەگرێت.

ج. جۆری دابەشبوونی هێز لەنێوان لایەنە بەشداربووەکاندا: هەروەها ئەو توانایانەی، کە لەبەردەستیاندایە.

د. ئاستی یەکگرتنەوەو پێکدادانی بەرژەوەندیی لایەنەکان: بە ئەندازەی زیادبوونی بوارەهاوبەشەکانی بەرژەوەندیی لایەنەکانی دانوستان، پاڵنەرەکانی نەرمینواندن و ناتوندی و نزیکبوونەوەو ڕێککەوتن زیاددەکات، پێچەوانەکەشی ڕاستە.

---

(١) بڕوانە: د. فكرت نامق عبدالفتاح العاني، م.س.ذ، ص ص١٦٠-١٦١.

هـ. ژمـــارەی لایەنـــە بەشـــداربووەکانی دانوســـتان: تـــا لایەنـــەکان و بەرژەوەندییـەکانیان لەسـەر بابـەتی دانوسـتانەکە، زیـاتر بـن، ڕەنگـە هاوسـەنگیی زیـاتر دروسـتبببێت و دواتـر ڕێککـەوتن. ئەمـەش جـۆری پەیوەندییەکان و بابەتی دانوستانەکە تەحەککومی پێوەدەکات.

و. ویســتی لایەنــەکان بــۆ گەیشــتن بــە ڕێککــەوتن و هێڵــی ناوەنــد و چارەسەرکردنی کێشەکان، یان گەیشتن بە خاڵە هاوبەشەکان.

ز. شــارەزایی تــەکتیکی و سیاســی لــە بــواری دانوســتان و پســپۆڕیی دانوســـتانکاران لـــەڕووی توانـــای کاریگـــەری و قەناعـــەتپێکردن و بەکارهێنانی زمانی جەستەو پێچوپەنا لە دانوستاندا.

پێویســتە لــە هەڵســەنگاندن و لێکدانــەوەی دەرەنجــامی دانوســتان و ڕێککەوتن و جێبەجێکردنی دانوستانەکاندا، لێتوێژینەوەو لێکدانەوە بۆ ئـەم لایەن و گۆراو و فاکتەرە جۆراوجۆرانە بکرێت.

## باسی سێیەم: ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکەکانی دانوستان

پێویسته هەرلایەنێکی دانوستان ستراتیجی دانوستانی هەبێت، کە بریتییە لەو ئامانجە باڵاو دوورمەدایانەی، کە ئەو لایەنە دەیەوێت لەپشت دانوستانەکەوە بەدییان بهێنێت، بەدیهێنانی هەر ستراتیجێکیش پێویستی بە چەندین تەکتیکی جۆراوجۆر هەیە.

ستراتیجی وەکو زاراوە بریتییە لە چوارچێوە گشتییە گەورەکە، کە لەرووی قەربارەوە گەورەیە و لەڕووی رووبەر و مەوداوە گەورەو فراوانە، لەڕووی بابەتیشەوە گشتگیر، هەروەها لەڕووی کاتیشەوە درێژتر و دوورمەوداترە. واتە ستراتیجی ئەو چوارچێوە گشتییەیە، کە رێگە و رەوتی دانوستان دیاریدەکات و رێسا و خاڵە سەرەکییەکانی دەستپێکی کارو ئەرکەکانی دانوستان دیاریدەکات، بە واتایەکی تر، پرۆسەیەکی ئامادەسازی و بەکارهێنان، یان بەڕێوەبردنی هەوڵ و توانا ماددی و نامادديیەکانە، بە فاکتەرە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و یاسایی و ئایدیۆلۆجی و تەکنەلۆییەکانەوە بۆ رێخۆشکردن بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی دانوستان بەسەرکەوتوویی[١].

واتە ستراتیجی دانوستان "بریتییە لە وێنای گشتیی ئەو ڕەوتەی، کە پێویستە دانوستان هەیبێت، ئەویش دیاریکردنی ئامانج و مەبەستە خوازراوەکانی دانوستان و ئەو تەکتیك و سیاسەتانە دەگرێتەوە، کە دەمانگەیەنن پێیان"[٢]. بەو پێیە تەکتیکەکان بەشێکن لە ستراتیجی گشتی

---

(١) د. محسن أحمد الخضيري، مبادىء التفاوض، مجموعة النيل العربية، القاهرة، ٢٠٠٣، ص٧٤.

(٢) صلاح محمد عبدالحميد، م.س.ذ، ص٥٥.

دانوستان و دەڕژێنەوە خزمەتی ئەو هێڵە گشتییەی، کە دانوستانکار کاری لەسەر دەکات. لێرەدا وریایی و لێزانی و سەلیقەی دانوستانکار دەردەکەوێت بۆ دارشتنی ستراتیجی کاریگەر بۆ دانوستان و دانانی تەکتیکی گونجاو و هەماهەنگ لەگەڵ ئەو ستراتیجەو بەکارهێنانیان بۆ گەیشتن بە ئامانجە باڵاکانی دانوستان.

ستراتیجی دانوستان پەیوەستە بە هونەری بەکارهێنانی هێزی گشتگیر بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گشتییەکانی دانوستان، بۆیە پێویستە ستراتیجی دانوستان دوو رەگەزی بنچینەیی لەخۆبگرێت و دیارییبکات، کە بریتین لە[1]:

رەگەزی یەکەم/ گشتگیری: واتە ستراتیجییەکە ئەو ئامانجە گشتییە لەخۆبگرێت کە هەموو رەگەزەکانی دانوستانەکە بگرێتەوە.

رەگەزی دووەم/ کات: واتە دیاریکردنی ئەو ماوەیەی، کە پێویستە ئامانجی گشتی، یان کۆتایی دانوستانەکەی تێدا بێتەدی.

لەنێوان ستراتیج و تەکتیکی دانوستاندا سیاسەتی دانوستان هەیە، کە بریتییە لەو هێڵە گشتییەی، کە هەوڵە دانوستانکارییەکانی لەسەر دەڕوات و لە دەرەنجامدا دەمانگەیەنێت بە بەدیهێنانی ستراتیجی دانوستانەکان، واتە سیاسەتی دانوستان لە سۆنگەی ستراتیجەکانەوەو لەپێناویشیاندا دادەڕێژرێن. بەو شێوەیە سیاسەت رێگەی بەردەم تیمی دانوستانکار دەکێشێت و هەوڵی سەرکەوتنی پرۆسەی دانوستان دەدات، لە کاتی هەموو دانیشتنێکیدا. بەو پێیە سیاسەتی دانوستان ماوەکەی لە ستراتیج کورتترە و قەبارەو گشتگیرییەکەشی کەمترە، زۆربەی کات پەیوەستە بە یەك قۆناغ،

---

(١) د. محسن أحمد الخضيري، مبادىء التفاوض، مجموعة النيل العربية، القاهرة، ٢٠٠٣، ص٧٤.

یان زیاتر، یاخود دانیشتنێك، یان زیاتری دانوستانەكان. بەڵام تـەكتیك ئـەو هەڵسوكەوتە كاتی و راستەخۆیەیە، كە هەڵوێستەكانی نێو دانوستانی نێـوان دانوسـتانكاران دەیخـوازن، كـە لـەڕووی كاتــەوە كـورتترە، لـە سـتراتیج و سیاسـەتی دانوسـتان و گشـتگیری و قەبارەكەشـی بەرتەسـك و بچـووكترەو پێویســـتە بـــە ئاڕاســـتەی بـــەدیهێنانی سیاســـەت و ســـتراتیجیەتەكانی دانوستانەكان كاربكەن[1].

راگۆڕینەوەو دانوستان دوو پرۆسەی ئاڵۆزن، دوو فاكتەری سەرەكی زیاتر ئاڵۆزیان دەكەن[2]:

أ. زۆربـەی دەوڵـەتان لـە یـەك كاتـدا دانوسـتان لەسـەر دوو ئاسـت ئەنجامدەدەن: دانوسـتانێكی نێودەوڵـەتی لـەنێوان دوو دەوڵەتـدا، هـەروەها دانوستانی ئەو دوو دەوڵەتە لەسەر ئاستی ناوخۆیی خۆیان، بـۆ گەیشـتن بـە رێككـەوتنی كۆتـایی و ڕازیكردنـی هـەر دوو ئاسـتەكە لـە یـەك كاتـدا، واتـە هاووڵاتییان و هێزە نێوخۆییەكان لە لایەك و دەوڵەتی بەرانبەریش لە لایەكی تـر. كـە هەنـدێك لـە پسـپۆڕان بـە "گەمـە دوو ئاسـتییەكە" نـاوی دەبـەن. دانوسـتانی بازرگـانیی نێودەوڵـەتی لـە چوارچـێوەی رێكخـراوی بازرگـانی نێودەوڵەتیدا نموونەی ئەم گەمە دوو ئاسـتییەیە، كـە پێویسـتە دەوڵـەت لـە یەك كاتدا، بۆ گەیشتن بـە ئامانجـە خوازراوەكـانی دانوسـتانەكان، دەوڵـەتی بەرانبەری و هاووڵاتییان و دەنگدەران و هێزە نێوخۆییەكانیشی رازی بكات. كەواتە دەكرێت هەنگاوی دەوڵەت لـە ئاسـتێكیاندا ئـەقڵانی بێـت، بـەڵام لـە

(١) د. محسن أحمد الخضيري، م.س.ذ، ص٧٥.

(٢) بڕوانە: كارين أ. منغست و إيفان م. أريغوين، م.س.ذ، ص ص١٩٧-١٩٨.

ئاستەکەی تریدا بە پێچەوانەوە بێت. دانوستانکار لێردا ڕۆڵی بەستنەوەی هەردوو ئاستەکەی دانوستانی دەکەوێتە ئەستۆ. ریالیزمییەکان بڕوایان وایە، کە لەو گەمە دوو ئاستییەدا دانوستانکار بە پلەی یەکەم پابەندە بە پێکهاتەی سیستمی نێودەوڵەتییەوە، لەکاتێکدا کە لیبراڵیزمەکان زیاتر ئامادەییان تێدایە بۆ دانان بە فشار و پاڵنەرە نێوخۆییەکاندا.

ب. مساوەمەو دانوستان، بە شێوەیەکی ڕێژەیی، پەیوەستن بە کولتوورەوە. شێوازەکانی دانوستان لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی تر دەگۆڕێت، کە بەشێکی پەیوەندی بە جۆری سیستمی سیاسیی دەوڵەتان و دیدگاکەیانەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا لانیکەم دوو شێوازی سەرەکیی هەیە بۆ دانوستان، کە هەریەکەیان دەرەنجامێکی جیاوازی دەبێت. بۆ نموونە: لەو دانوستانانەی کە لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا لەپێناو بەدیهێنانی سیستمێکی ئابووریی جیهانیی نوێ ئەنجام دران، دەوڵەتانی باشور ڕێبازێکیان گرتبووە بەر کە پشتی بە هەڵهێنجان (استنتاج) لە پرنسیپە گشتییەکانەوە بۆ جێبەجێکردنە تایبەتەکان بەستبوو، ئەم ڕێبازە دەبێتەهۆی ناکۆکی لەسەر وردەکارییەکان تا دوا قۆناغی گفتوگۆکان، لە بەرانبەردا (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) و (بەریتانیا) دژایەتی ئەم ڕێبازەیان کرد و وتیان پێویستە گفتوگۆی وردەکارییە بەرجەستەکان بکەین و لە جەدەلی فەلسەفیی لەمەڕ دۆزە گەورەکان دووربکەوینەوە. ئەم جیاوازییانە لە دیدگا و شێوازی دانوستانەکاندا ڕۆڵیان بینی لە دروستکردنی لەمپەر لەبەردەم دانوستانەکاندا و دواتر شکست لە گەیشتن بە بەدیهێنانی هەر جۆرە کۆدەنگییەکی ئەوتۆ.

کەواتە، جۆر و شێوازی دانوستانەکان و جیاوازیی کولتووریی گەلان و وڵاتان و جیاوازیی دیدگایان بۆ بابەتەکان، کاریگەریی لەسەر جۆر و شێوازی دارشتنی ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکەکانی دانوستان جێدەهێڵن، بۆیە پێویستە لێرەدا تیشك بخەینە سەر ئەو ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکانە و بیانخەینە بەرباس و لێکدانەوە.

**یەکەم: ستراتیجی دانوستان:**

پۆلێنی زۆر بۆ ستراتیجی دانوستان کراوە، ئێمە سەرەتا لێرەدا پۆلێنێکی گشتگیر دەخەینەروو[١]:

١. ستراتجییەتی هاریکاری: کە مەبەست تێیدا هاریکاریی هاوبەشەو تێیدا متمانەو کرانەوە هەیە، گوزارشتکردن لە بیروبۆچونەکان و شێوازی هەڕەشەکردنی تێدا بەدیناکرێت.

٢. ستراتیجی کێبڕکێ: کە تێیدا هەرلایەنێك هەوڵی بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی، لەسەر بەرژەوەندیی (حسابی) ئەوانی دی، دەدات، متمانەش لەنێوان لایەنەکاندا نییە و لایەنەکان بەڕوونی نیازی خۆیان بۆ یەکتر دەرناخەن، یەکێك لە شێوازەکانیشی بریتییە لە کوتوپڕی و هەڕەشە و هێرشکردن بۆ سەر یەکتری.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. نادر أحمد أبو شیخة، أصول التفاوض، دار المسیرة للنشر والتوزیع والطباعة، بدون مکان الطبع، ٢٠٠٨، ص٢١٦.

٣. ستراتيجی پاشكۆيەتی: لەم ستراتيجيەتەدا، لەپێناو دووركەوتنـەوە لە ناكۆكی و رووبەڕووبوونەوە، لايەنێك دەبێتە پاشكۆی لايـەنێكی تـر، بۆيـە ملكەچی ئەو لايەنە دەبێت و خواست و بەرژەوەندييەكانی بەدی دەهێنێت.

٤. سـتراتيجی رووبەڕووبوونـەوە و كوشـتارگەريی (الإسـتراتيجية القتالية): ئەم جۆرەيان لە ستراتيجی كێبڕكێ توندتر و دوژمنانەترە، چونكە ئامانجی بنەڕەتی تەنها بريتی نييە لە بەدەستهێنانی زۆرترين رێژەی قـازانج بۆ خود، بەڵكو گەياندنی زۆرترين رێژەی زيانيشە بە بەرانبەر. هەروەك چۆن شـێوازی تـووڕەكردن و پێنـەدانی زانيـاری و خۆسـەپاندن لـە ديـاريكردنی ئەجێنـدا و هەڕەشـەی كشـانەوەو تەنانـەت شـێوازی ناشـرينی وەك بەرتيلوەرگرتن و سيخوڕيشی تێدا بەكاردێت.

پۆلێنێكی تريش بـۆ ئـەو سـتراتيجييەتانە كـراوە، كـە دەيانكـات بـە دوو بەشی سـەرەكييەوە، لـە دوو ميتـۆدی "هاريكـاری" و "ململانـێ"دا خۆيـان دەبيننەوە، بەم شێوەيەی خوارەوە[1]:

١. سـتراتيجی ميتـۆدی بەرژەوەنـديی هاوبـەش: كـە چـەند جۆرێـك لـەخۆ دەگرێت، لەوانە:

- ستراتيجی تەواوكاريی: ئاسۆيی و ستوونی.

---

(١) بۆ زانياريی زياتر بڕوانە: د. رشيد عمارة ياس و دانا علي صالح، استراتيجيات التفاوض الأوروبية-الإيرانية حول البرنامج النووي الإيراني، مجلة القادسية، العدد الثاني، المجلد الثاني، كانون الأول ٢٠٠٩، ص ص٥٢-٥٨. و: د. محسن أحمد الخضيري، م.س.ذ، ص ص٧٩-٩٦. و: حسان خضر، خطوات ومناهج واستراتيجيات التفاوض، المعهد العربي للتخطيط، الكويت، أبريل ٢٠٠٥, (تأريخ الزيارة٢٠١٧/٢/٢) على موقع:
http://www.arab-api.org/course33/c33_5.htm

- ســتراتیجی پەرەپێــدانی هاریکــاریی ئێســتا: بــە فراوانکرنـــی بــوار و ئاستەکانی.
- ستراتیجی قووڵکردنەوەی پەیوەندیی ئێستا: بۆ نموونە: لە ڕێگـەی ژن و ژنخوازییــەوە، یــان لــە ڕێگــەی دروســتکردنی پارچــە جیاوازەکــانی ئۆتومبێل و کۆمپیوتەر و...هتد لە چەند دەوڵەتێکی جیاواز.
- ستراتیجی فراوانکردنی بازنەی هاریکاری بۆ بواری نوێ: لەرووی کـات و شوێن و بوارەوە.
٢. ستراتیجی میتۆدی ململانێ: کە چەند جۆرێك دەگرێتەوە، دیارترینیان:
- ســتراتیجی شــەکەتکردن، یــان هێزلەبــەربڕین (اســتراتیجیة الإنهــاك أو الاستنزاف): ئەویش لـە ڕێگـەی کاتکوشـتن و مانـدووکردنی دەروونــی و یاسایی و داراییە (پارەپێزایەدان)ـەوە.
- ســتراتیجی پــەرتکردن: بـە دیـاریکردنی خـاڵی بـەهێز و لاوازی سـتاف دانوستانکاری لایـەنی بەرانبـەر، بـۆ بـەکارهێنانیان لـە پەرتپـەرتکردنی تواناکانیــان و لاوازکردنـی یـەکگرتووییان و نانــەوەی نـاکۆکی و ئـاژاوە لەنێوانیاندا.
- ســتراتیجی خۆســەپاندن (ملپێکەچــکردن): کۆکردنــەوەی تواناکــان و بەکارهێنانیان بۆ خۆزاڵکردن، ئەویش بە چەند ڕێگەیەك: یەکەم گـۆڕین و هەمەچەشـنکردنی دەستپێشـخەرییە دانوسـتانکارییەکان، بۆئــەوەی ئێمە بەردەوام خاوەنی دەستپێشخەری بین و بزانین فێڵ و تەڵەکـەکانی لایەنی بەرانبەر چین، تا لایـەنی بەرانبـەر بـەو ڕێگەیـەدا بێـت کـە ئێمـە کێشاومانە، دووەم توانای جووڵەی خێـرا و وەڵامدانـەوەی راسـتەوخۆ و ئامادەباشیی بەردەوام بۆ دانوستان هــەرکاتێك لایـەنی بەرانبـەر نیـەتی

ئەوەی پیشاندا، کە ئامادەیە بۆ دانوستان، ئەمەش بـۆ ئـەوەی جڵـەوی دەستپێشخەرییەکان لەژێر دەستی بەرانبەر دەربهێنین و لە سـەرەتا تـا کۆتـایی دانوسـتانەکان، خۆمـان بسـەپێنین. سـێیەمیش بریتییـە لـە سووربوون لەسەر هێشـتنەوەی لایـەنی بەرانبـەر لـە پاشـکۆیەتیدا، کـە وایلێـدەکات رراوەسـتێت و چـاوەڕێی ئاماژەیـەك بێـت لـە لای ئێمـەوە، یــاخود لــەو چوارچــێوەیەدا بجوولێــت کــە بۆمــان دیــاریکردووە و پێشنیارمان کردووە.

- ستراتیجی لەناوبردن، یان داگیرکردنی رێکخراو (الدحر أو الغزو المنظم): زیاتر لەکاتی کەمیی زانیاری لەسەر لایەنی بەرانبەر بەکاردێت، کـە کـار لەسـەر زاڵبـوونی هـەنگاو بـە هـەنگاو دەکـات، لێـرەدا دانوسـتانکاران توانایـەکی زۆریـان پێویسـتە بۆئـەوەی لـە هـەر قۆناغێکـدا هـەنگاوی پێویست بنێن، سەرەتا بە کۆکردنەوەی زانیـاری و دواتـر بـۆ چـوونەناو باسە سەرەکییەکان و دۆزینەوەی خاڵی بەهێز و لاوازی هەردوولا.
- ستراتیجی خودوێرانکردن، یان خۆکوشتن (التدمير الـذاتي أو الانتحـار): واتە وا لە بەرانبەر بکەیت خۆی تواناکانی و خواست خەونـەکانی پشـت دانوستانی وێرانبکات، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو میکانیزمانـەی کـە وا لەبەرانبەر دەکات، کە ئەگەر سووربێت لەسەر داوا و خواستەکانی، ئەوا لایەنگرانی لەدەسـت دەدات و دۆسـتەکانی دەبـن بـە دوژمـن و دوژمـنی نوێیان بۆ دروست دەبێـت و خاڵـە بـەهێزەکانی دەبـن بـە خـاڵی لاواز و کێشــــە و نــــاکۆکی لــــەنێوان ئەنــــدامانی شــــاندەکەیاندا دروستدەبێت،هەنگاوەکانی پەرتەوازە دەبن. بەمـەش لایـەنی بەرانبـەر

دەتوانێت کات و تواناکانی ئەمان بە شێوی پلەبەندی بەرەو پووکانەوە ببات تا دەگاتە خاڵی لاوازی و کوشتنی خەونەکان.

شیاوی باسە یەکە نێودەوڵەتییەکان لە دانوستانەدرێژکاندا دەتوانن، بەپێی ئامانج و خواستەکانیان، لە قۆناغە جیاوازەکانی دانوستاندا، زیاتر لە یەك جۆر ستراتیج بۆ بەڕێوەبردنی دانوستانەکانیان بەکاربهێنن.

**دووەم: سیاسەتی دانوستان:**

سیاسەتی دانوستان کلیلی زانینی میتۆدی لایەنی بەرانبەر و ئەو ئامانجانەیەتی، کە لە قۆناغێکی دانوستاندا دەیەوێت بیهێنێتەدی، بۆیە بۆ خاڵیکردنەوەی هەر سیاسەتێکی دانوستان لە جەدواکانی پێویستە دژەکەی بەکارهێنرێت. هەرسیاسەتێکی دانوستانیش، کە لە قۆناغێکدا بەکاردێت، پێویستە خزمەتی ستراتیج و میتۆدی گشتیی دانوستانەکان بکات، لە هەمان کاتدا جێبەجێکردنی هەر سیاسەتێکیش پێویستی بە چەند تەکتیکێك هەیە.

لەبەرئەوەی هەرسیاسەتێکی دانوستان دژەکەشی بوونی هەیە، هەوڵ دەدەین، بۆ تێگەیشتنی باشتر، پێکەوە باسیان دەکەین[(١)]:

**١. سیاسەتی سنووربەزاندن/ سیاسەتی دیواری ئاسنین:**

- سیاسەتی سنووربەزاندن: زیاتر لە دانیشتنی یەکەمدا بەکاردێت بۆ وەرگرتنی زانیاریی زیاتر لەلایەنی بەرانبەر و ویستە شاراوەکانی و خاڵی بەهێز و لاوازیی، ئەویش لە ڕێگەی بەزاندنی سنووری دیاریکراوی ڕێگەپێدراو

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. محسن أحمد الخضيري، م.س.ذ، ص ص٩٩-١٠٩.

بۆ زانیارییەکانی بەرانبەر، چونکە هەندێکجار لایەنێك لە چەند لایەکەوە دزە بە چەند زانیارییەکی هەڵە و ناڕاست دەکات، بۆئەوەی بتوانێت بەئاسانی لە دانوستانەکاندا بەسەر لایەنی بەرانبەردا زاڵ بێت. بەپێی ئەم سیاسەتە دانوستانکار پێویستە دانوستانکارانی لایەنی بەرانبەر وەکو خۆیان بناسێت، کێن؟ چییان دەوێت؟ چییان هەیە؟ دەسەڵاتیان چەندە؟ چۆن دەتوانرێت کاریگەرییان لەسەر دروستبکرێت؟ بۆئەوەی بتوانێت بزانێت چۆن مامەڵەیان لەگەڵدابکات.

– سیاسەتی دیواری ئاسنین: بەم جۆرە سیاسەتە رێگە لە سیاسەتی سنووربەزاندن دەگیرێت، بە توندوتۆڵی و وریایی ستافی دبلۆماتکار و نەدرکاندنی هەر جۆرە زانیارییەك، کە لایەنی بەرانبەر سوودی لێوەربگرێت بۆ رووبەڕووبوونەوەمان. بۆ ئەمەش پێویستە کەسانی نهێنیپارێز و بەتوانا دیاریبکرێن و بپارێزرێن لە سیخوڕ و سانسۆری بەرانبەر و چاندنی هەر جۆرە ئامێرێکی چاودێری و تۆمارکردن لەلایەن بەرانبەرەوە.

## ٢. سیاسەتی قووڵکردنەوەی دانوستان/ سیاسەتی بەپەراوێزکردن و رووکەشکردنی دانوستان:

– سیاسەتی قووڵکردنەوەی دانوستان: کاردەکات بۆ پەرەدان بە زانیارییەکان لەسەر لایەنی بەرانبەر و زیادکردن و قووڵکردنەوەو وردکردنەوەی بوارەکانی دانوستان تا گەیشتن بە ناوەڕۆك و کرۆکی بابەتەکانی بۆ زیادکردنی دەستکەوتەکان، ئەمەش دوای دڵنیایی دێت لە بەرانبەر و باشیی ئاستی پەیوەندییەکان لەگەڵیدا.

– سیاسەتی بەپەراوێزکردن و ڕووکەشکردنی دانوستان: کار بۆ ئەوە دەکات، کە دانوستانەکان تەنیا پڕۆسەیەکی رووکەشیی پەراوێزخراو بن و سنووری لایەنە شکڵییەکانی بابەتی دانوستانەکە تێنەپەڕێنێت. ئەم سیاسەتە لە بەرانبەر سیاسەتی قووڵکردنەوەی دانوستاندا بەکاردەهێنرێن، کاتێك کە لایەنێك بیەوێت رێگە لە بەرانبەر بگرێت، کە زانیاریی ورد و دروستی دەستبکەوێت، بۆ ئەمەش گوماندروستکردن و شاردنەوەی زانیارییەکان دەکات بە ئامراز، بەمەش دوودڵی و دڵەڕاوکێ، سەبارەت بە نیەت و ئامانجە راستەقینەکانی لای بەرانبەر، دروستدەکات. کەواتە لەبەرئەوەی کە زانیارییەکان سەبارەت بە لایەنی بەرانبەر کۆنن، یاخود ئەوەشی کە نوێیە کەمن و جێی گومانن، یان دژیەك و ئاڵۆزن و بەشی لێکدانەوەی تەواو و گشتگیر ناکەن، بۆیە لەم حاڵەتەدا باشتروایە دانوستانکار زیاتر لایەنە رووکەشییەکان تاووتوێ بکات و بابەتی سەرەکیی دانوستانەکە پەراوێزبخات، چونکە هەرلایەنێك لە باری کەمیی و ناتەواوی زانیارییەکانیدا، ئەگەری شکست و دۆڕان و زیانی زۆرە.

**٣. سیاسەتی فراوانبوون و بڵاوبوونەوە/ سیاسەتی بەرتەسککردنەوەو گەمارۆدان:**

– سیاسەتی فراوانبوون و بڵاوبوونەوە: یەکێکە لەو سیاسەتە کاریگەر و زیرەکانەیەی، کە بەردەوام دانیشتنەکان گەرمدەکات و وا لە بەرانبەر دەکات، بە ماندوویی و شەکەتییەوە بەدوای ئەو بوار و لایەنانەدا رابکات، کە لانیکەم بە بەردەوامی بۆ بابەتی دانیشتنەکانی زیاددەکات، ئەمە وێڕای خێرایی خستنەڕووی ئەو خاڵە زۆرانە بە شێوەیەك کە زەینی بەرانبەر

پەرتبکات، بەو شێوەیە ڕرەنگە چەند خاڵێکی گرنگ ببەیتەوە، کە لایەنی بەرانبەر –لەبەر زۆریی خاڵەکان و خێرایی خستنەڕوویان– نەیتوانیوە بەتەواوی پەییان پێببات و لایەنی باش و خراپیان بەوردی لێکبداتەوە.

– سیاسەتی بەرتەسککردنەوەو گەمارۆدان: لەم سیاسەتەدا ڕێگە بە لایەنی بەرانبەر نادرێت، کە بابەتی دانوستانەکان لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر بگوێزێتەوە، تا ئەو خاڵەی خراوەتە بەر باس تەواونەکرێت، واتە لە یەك کاتدا تەنیا یەك دۆسیە، یان لایەنی دانوستانەکە تاووتوێ دەکرێت، بەتایبەت کاتێك لایەنی بەرانبەر فرۆفێڵاوی بێت و هەوڵ بدات پەلەپەل بکات و نەهێڵێت بەتەواوی لەلایەنە جیاوازەکانی بابەتی دانوستانەکە یەکە بە یەکە و لەسەرخۆ تێبگەین.

٤. سیاسەتی دروستکردنی دڵەڕاوکێ/ سیاسەتی خاوبوونەوە، یان پاڵدانەوە (الاسترخاء):

– سیاسەتی دروستکردنی دڵەڕاوکێ: دروستکردنی دڵەڕاوکێ هۆکارێکە بۆ سەرلێشێواندنی بەرانبەر و سەرکەوتن بەسەریدا، ئەویش بە دروستکردنی دوودڵی لای بەرانبەر بە ناجێگیریی هەڵوێستەکان لە دانوستاندا، دانانی چەندین گۆڕاو و فاکتەری جیاواز لە دانوستانەکەدا پێکەوە، کە هەر یەکێکیان پێویستی بە زانیاری و کەسانی پسپۆڕ هەبێت، وەك زیادکردنی ڕێژەو قەبارەی لایەنە هونەرییەکانی بابەتی دانوستانەکە، بۆ نموونە: (فاکتەری جوگرافی، ئەندازەیی، یاسایی، ئابووری، بازرگانی، سیاسی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و...هتد)، ئەمەش بەرانبەر ناچاردەکات،

پـــەنا بـــۆ پســـپۆڕیی جیـــاواز ببـــات و ئەنـــدامانی ســـتافی دانوســـتانکاری زیادبکات،هەندێکیان بگۆڕێت، ئەمەش ڕەنگە دوودڵی و ناکۆکی لەنێوانیانـدا دروستبکات، وێڕای کوشتنی کات و هـەوڵی بەرانبـەر و زیـادکردنی تێچـوونی دانوستانەکانی.

- سیاسەتی خاوبوونـەوە، یـان پاڵدانـەوە: هەنـدێکجار بـە سیاسـەتی فەرامۆشکردن، یـان سیاسـەتی پشـوودرێژیی نـاو دەبرێـت، کـە بریتییـە لـە گرنگینـەدان بـە خواسـتەکانی لایـەنی بەرانبـەر و نەکەوتنـە ژێـر کاریگـەریی فشـارەکانییەوە، بـەڵکو چـاوەڕێکردن و دانبـەخۆداگرتن تـا روونبوونــەوەی ئاستی گرنگیی ئەو شتانەی، کە لایەنی بەرانبەر، بۆ دەرکەوتنی دیـوە روون و شاراوەکانیشی، دەیانخاتەروو. لێرەدا ئارامگرتن پێویستە، وێـڕای ئـەوەی کە زۆرێك جێدەهێڵرێت تا بە تێپەربوونی کات خۆیان چارەسەر ببن.

**٥. سیاسەتی هێرشبردن/ سیاسەتی بەرگریکردن:**

-سیاسەتی هێرشبردن: واتە بەکارهێنانی هێرشی فشاردروستکەر لەسەر بەرانبەر بۆ ناچارکردنی بە قـایلبوون بـە ڕاوبۆچـوون و خواسـتەکانی ئێمـە و وازهێنان لە خواست و ئامانجەکانی خۆی لە دانوستاندا، هەروەها ڕێنەدان بە پاشەکشەکردنی لە پرۆسەی دانوستان.

- سیاسەتی بەرگریکردن: واتە کارکردن بۆ کەمکردنەوەی فشاری لایەنی بەرانبەر وڕێگەپێنەدانی لە بـەردەوامبوون لـە کۆکردنـەوەی دەسـتکەوت لـە دانوستانەکاندا، کە لە ئەنجامدا بریتین لە زیانی ئێمە. ئەم بەرگریکردنە بەوە دەبێت، کـە بـە دیـدێکی هوشـیارانەی کـراوەوە و بـە لێتوێژینـەوەی قـووڵ، پێشوازی لە کۆی دەستپێشخەرییەکانی نەیارەکەت بکـەیت، بـۆ دۆزینـەوەی

ئامانجـە راسـتەقینەکانی و جیاکردنـەوەی لـە ئامانجـە سـاختەکانی، بـۆ دوورخستنەوەیان و مامەڵەلەگەڵکردنیان بە دژەهێرشی گونجاو.

**٦. سیاسەتی تاووتوێکردنی پلەبەپلەی بابەتی دانوستان/ سیاسەتی یەك گوژمی، یان یەك پاکێجی (سیاسة الصفقة الواحدة):**

– سیاسەتی تاووتوێکردنی پلەبەپلەی بابەتی دانوستان: واتە رێکخستنی رەگەز و بەشـەکانی بابـەتی دانوسـتانەکە بـە شـێوەی پلەبەنـدی، لـە رێسـا بنچـینەییەکانی بابەتەکـەوە دەسـتپێدەکات، پلەبەپلـە سـەردەکەوێت بـۆ لووتکە، یان وێنەی کۆتایی، یاخود بە پێچەوانەوە، پلەبەپلە لە لووتکە دێتە خوارەوە بۆ بنچینەی بابەتـەکانی دانوسـتان، یـاخود پلەبەپلـە لـە ناوەنـدی بازنەیەکەوە دەچێت بۆ دەوروبەری، یان بە پێچەوانەوە، واتـە پرۆسـەکە لـە بەشەوە هەنگاودەنێت بۆ گشت، یان لە گشتەوە بۆ بەش، یان لە بەشێکەوە بـۆ بەشـەکانی تـر لـە بابـەتی دانوسـتانەکان. واتـە هـەنگاو بـە هـەنگاو لـە رەگەزێکەوە بـۆ ڕەگـەزێکی تـر، تـا لەسـەر بابـەتی هـەنگاوی یەکـەم تـەواو رێکنەکەون ناچنە سەر بابـەتی دووەم و بـەو شـێوەیە. ئەمـەش یارمەتیـدەر دەبێت بۆ مامەڵەکردن بە تێروتەسەلی لەگەڵ هـەموو رەهەنـد و بابەتـەکانی دانوستانەکە، هەروەك چۆن پرۆسەی دانوسـتانەکە ئاسـاندەکات و بـوارێکی دەروونیی ساف بۆ لایەنەکانی دەڕەخسێنێت، لە بەرانبـەردا کـات و هـەوڵ و خەرجیی زیاتری دەوێت.

– سیاسەتی یەك گوژمی، یان یەك پاکێجی: ئەم جۆرە سیاسەتە لە کۆن و نوێـدا زۆرتـرین بـەکارهێنانی هـەبووە، چـونکە زۆرکـات لایەنـەکان هـەلی رەخسـاو بـۆ دانوسـتان بەدەگمـەن و گـرنگ دەزانـن و دەیقۆزنـەوە بـۆ رێککەوتنی یەکجاری و یەکپارچەیی لەسەر هەموو بابەتەکان پێکەوە.

**٧. سیاسەتی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ و راشکاوانە/ سیاسەتی پێچوپەناکردن (المراوغة والالتفاف):**

– سیاسەتی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ و راشکاوانە: واتە روونی و راشکاوی لە مامەڵەکردن لەگەڵ رەگەزەکانی دانوستان، بەتایبەت کاتێك کە بەرژەوەندیی هاوبەش هەبێت لەنێوان لایەنەکانی دانوستاندا وا بخوازێت، کە لایەنەکان بارودۆخ و تواناکانی یەکتری بزانن. بەپێچەوانەوە هەر جۆرە فێڵێك رەنگدانەوەی نەرێنی لەسەر پابەندییەکانیان بەرانبەر یەکتری دەبێت.

– سیاسەتی پێچوپەناکردن: دانوستان لە کاتی ململانێ و ناکۆکیدا هەندێکجار وا دەخوازێت، کە بۆ ئاشکرانەکردنی ئامانجە راستەقینەکانی پشت دانوستانەکان، پشت بە پێچوپەنا و شاردنەوەی راستییەکان ببەستێت.

**٨. سیاسەتی پەرەپێدان/ سیاسەتی وەستاندن (سڕکردن) (التجمید):**

– سیاسەتی پەرەپێدان: واتە پەرەپێدان بە بوارەکانی دانوستانەکە لەپێناو بەهێزکردنی پەیوەندییەکان و بەردەوامبوونی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان و گەیشتن بە پلە باڵاکانی هاریکاری.

– سیاسەتی وەستاندن: واتە وەستاندنی پرۆسەی دانوستانەکان لە ئاستێکی دیاریکراودا بۆ سنووردانان بۆ نزیکبوونەوەو هاریکاریی زیاتر.

### سێیەم: تەکتیکی دانوستان:

تەکتیکی دانوستان بریتییە لەو میکانیزم و هەڵوێست و ئاڕاستەکردن و جموجووڵ و بزاوتانەی، کە لە قۆناغە جیاوازەکانی دانوستاندا لە بەرانبەر لایەنەکانی تردا، بەکاردێن.

ئەو تەکتیکانەی کە لە کاتی دانوستاندا بەکاردێن، پێویستە لە خزمەتی ستراتیجی باڵای دانوستانەکەدا بن و بە ئاراستەی بەدیهێنانی ئەو ستراتیجانە هەنگاو بنێن. دیارترین ئەو تەکتیکانەش بریتین لەمانەی خوارەوە[(١)]:

١. فێڵکردن: شێوازی زۆرە، بۆ نموونە: لایەنی بەهێز وایدەربخات، کە ئەو دەستکەوتانە کە ئەو هەوڵی بەدیهێنانیان دەدات، گرنگییەکی ئەوتۆیان نییەو لەو رووەوە زانیاریی ناورد بدات بە بەرانبەر، بەمەش رەنگە لایەنی لاواز سازشی زیاتر بکات.

٢. بانگەشەکردن: بە تۆمەتخستنەپاڵ لایەنی لاواز، بەوەی کە ئەو هەوڵی لەباربردنی هەوڵەکانی دانوستان دەدات، یان بەوەی کە شایستەی زیاتر لە مافی خۆی دراوەتیّ، یان لە دۆخەکە و هاوسەنگی و لاسەنگیی هێز تێناگات و...هتد.

٣. پێچوپەناکردن: لە رێگەی هەوڵدانی بەردەوام بۆ دەرنەبڕینی هەوڵوێستێکی دیاریکراو و روون سەبارەت بەو پرسانەی دانوستانیان لەبارەوە دەکرێت.

٤. کوتوپڕی: واتە جموجووڵێکی کوتوپڕ لە کاتی پرۆسەی دانوستاندا، بۆ نموونە: کشانەوەیەکی رووکەشانە، یاخود هەڕەشەی کشانەوە، لەو پرۆسەیە. سەرکەوتن و کاریگەریی ئەم جۆرە تەکتیکە بەستراوە بەوەی، کە ئەو لایەنە تا چەند دەتوانێت قەناعەت بەلایەنەکەی تر بێنێت، کە ئەو جیددیە لەو هەڵوێستەیدا، لە بەرانبەریشدا توانای لایەنی بەرانبەر بۆ سنووردارکردنی کاریگەریی ئەو جۆرە هەڵوێستانە لەسەر ئەوە وەستاوە، کە

---

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٢٧٣.

تا چـەند دەتوانێـت خـۆی لەبـەر ئـەو هەڵوێسـتەدا بگرێـت و ئـەو کتوپڕییـە هەڵمژێت و بە ئاسایی وەریبگرێت.

جگە لەمانە، پێویسـتە دانوسـتانکار لـەکاتی دانوسـتاندا هـەموو جووڵـەو ئامازەکانی جەستەی و تەنانەت لەرەکانی دەنگیشی لەگەڵ ئامانجە بالاکانی دانوسـتانەکان و سـتراتیجەکەی هەماهـەنگ بـن. بـەدەر لەمـە، پێویسـتە دانوستانکار لە ڕێگەی زمانی جەستەیەوە، ئەلتەرناتیڤی گونجاوی هەبێت بۆ ئـەو وشـانەی کـە دەیـەوێت بیڵێـت، بـە شـێوەیەك متمانـە لای بەرانبـەر بەهێزبکات[1]، بۆ ئەوەش پێویستی بە وەڵامدانەوەی خێـرا هەیـە، هـەروەها بتوانێت زمانی جەستەی هاوئاهەنگ بێت لەگـەڵ سیاسـەت و سـتراتیجەکانی دانوستانەکەی، بەمـەش دەتوانێـت زمـانی جەسـتە بکاتـە ئـامرازێکی باشـی پراکتیزەکردنی تەکتیکە دانوستانکارییەکانی، دواتر بەدیهێنانی سیاسـەت و ستراتیجییە دانوستانکارییە خوازراوەکانی.

هەندێك لە نووسەران سـتراتیج و تەکتیکـەکان پێکـەوە پـۆلێن دەکـەن و جۆرێك لە تێکەڵی تێدا دەکـەن وسیاسـەت و تەکتیکـەکان بـە سـتراتیج نـاو دەبـەن. بـەو پێیـە، دەڵـێن: بەگشـتی سـتراتیجەکان دوو جـۆری سـەرەکین هەریەکێك لەو ستراتیجانەش چەند تەکتیك و میکانیزمێکی بۆ دیاریدەکەن بۆ جێبەجێکردنی، بەڵام بە رای ئێمە ئەو جـۆرەی، کـە ناویـان نـاوە سـتراتیج، هەر سیاسەت، یـان تـەکتیکن و بەشـێوازی جیـاواز و لـە کـاتی جیـاوازدا لـە

---

(1) Sally Hall, 9 Body Language Tricks To Improve Your Negotiation Skills, on:<http://www.fastcompany.com/3032560/work-smart/9-body-language-tricks-to-improve-your-negotiation-skills

دانوستانەکاندا بەکاردەهێنرێن. ئەو جۆرە سیاسەت و تەکتیکانە (کە ئەوان بە ستراتیج ناوی دەبەن) بریتین لە[1]:

### ١. ستراتیجی کەی؟

ئەم جۆرە چەند جۆرێك شێواز و تەکتیك لەخۆ دەگرێت:

أ. ئارامگرتن و دانبەخۆداگرتن Forbearance: دروشمی ئەم تەکتیکە بریتییە لەم وتەیە:"بە ئارامگرتن دەگەینە ئەوەی دەمانەوێت"، ئامانج لێی سوودوەرگرتنە لە کات. لە ئامرازەکانی سوودوەرگرتن لە کات: وەڵامنەدانەوەی راستەوخۆی پرسیار، وەڵامدانەوە بە دژەپرسیار و گۆڕینی ئاڕاستەی قسە و گفتوگۆ، لەپێناو هەناسەدانێك و هەلڕەخساندن بۆ بیرکردنەوە و بڕیاردان لەوەی، کە پێویستە بکرێت.

ب. سەپرایز (المفاجأة/ Surprise): واتە گۆڕینی لەپڕی شێوازی مامەڵە، یان قسە، یان هەڵوێست، بە ئامانجی تێکدانی دۆخ و زەینی لایەنی بەرانبەر و سازشکردنی، بۆ نموونە: دەنگ بەرزکردنەوە، یان بەکارهێنانی توندوتیژی، یان پاشگەزبوونەوە. ئەم جۆرە لەگەڵ ئەوەی زۆرجار دەستکەوتی باش بۆ بەکارهێنەرەکەی دێنێتەدی، رەنگە ببێتەهۆی لەبارچوونی دانوستانەکان.

ت. ئەمری واقیع Fait Accompli: دروشمی ئەم جۆرە بریتییە لەوەی لایەنێك بڵێت: "کارەکە لەسەر لایەنەکەی تر وەستاوە" و لایەنی بەرانبەر بخاتە ئەمری واقیعەوە، ئەمەش لەکاتێکدا کە گومانێك هەبێت لە

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: صلاح محمد عبدالحمید، م.س.ذ، ص ص٥٥-٦٤.

گەیشتن بە کارێکی دیاریکراو، یان ئەنجامێکی دیاریکراو. نموونەی کلاسیکیی ئەم جۆرە بریتییە لە هاوسەرگیریی کوڕ و کچێك، لە دوو خێزانی ئاستجیاواز، بەبێ ئاگاداریی خێزانەکانیان، لەکاتێکدا هەست بەوە بکەن، کە ئاڕاستەیەکی بەهێز بۆ ڕازینەبوون لەسەر هاوسەرگیرییەکەیان هەیە، بۆیە دوای تەواوبوونی هاوسەرگیرییەکەیان ئەو پرۆسەیە بۆ خێزانەکانیان رادەگەیەنن. ئەم جۆرە تەکتیکە مەترسیی خۆی هەیە، بۆیە، چەند مەرجێك هەیە، بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت:

- پێویستە ئەگەری رازیبوونی لایەنی بەرانبەر بە دەرەنجامەکە لەکۆتاییدا ئەگەرێکی گەورە بێت.
- پێویستە زیانی لایەنی بەرانبەر، لە باری بەردەوامبوونی لەسەر رازینەبوونی، لەرووی ماددی و مەعنەوییەوە، لە زیانی رازینەبوونی بە ئەمری واقیع، گەورەتر بن.

ث. کشانەوەی هێمنانە Bland withdrawal: لێرەدا دانوستانکار بە شێوازێك ڕەفتاردەکات، کە بەو رەفتارە چەند دەستکەوتێك دەستدەخات، پاشان هەوڵی کشانەوە لە دۆخەکە دەدات، خۆی لە پابەندبوونی تر رزگار دەکات،رایدەگەیەنێت کە ئامادەیە لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا هاوڕا بێت.

ج. کشانەوەی رووکەشی Apparent Wthdrawal: واتە راگەیاندنی کشانەوە لەلایەن یەکێك لە لایەنەکانی دانوستانەوە لە کاتێکی یەکلاکەرەوە و هەستیاردا بە ئامانجی سازشکردنی زیاتری لایەنی بەرانبەر، ئەمەش جۆرێك لە دواخستن و فێڵی تێدایە.

ح. پاشەکشەو هەڵگەڕانەوە Reversal: واتە دانوستانکار بەپێی بارودۆخی دانوستانەکان هەڵوێستەکانی دەگۆڕێت و بەرز و نزمی و پاشەکشە لە هەڵوێستەکانیدا ئەنجامدەدات.

خ. کۆتوبەند (القیود): دروشمی ئەم جۆرە بریتییە لە "دوا وێستگە"، لێرەدا دانوستانکار چەند کۆتوبەندێك لەسەر چەند لایەنێکی دانوستانەکە دادەنێت، بۆ نموونە: پەیوەندییەکان و ژمارەی بەشدارانی دانوستان و ئەوەی، کە کێ لە کاتی دانوستاندا دەتوانێت قسە بکات و بە چ ڕێزبەندییەك، یاخود کات و شوێنی دانوستان.

د. فێڵکردن (الخداع): بریتییە لە گرتنەبەری رەفتارێك، یان وەرگرتنی هەڵوێستێك بەشێوەیەك کە زەین و هۆشی لایەنی بەرانبەر بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراودا ببات، دوور لە ئاڕاستە دروستەکەی. یاخود بریتییە لەوەی لایەنێك وا خۆی دەربخات، کە زانیاریی زۆر لەوە زیاتر لایە کە لە واقیعدا هەیەتی. جاری واش هەیە کە دانوستانکار دزە بە هەندێك زانیاریی هەڵە دەکات، بە مەبەستی بەهەڵەدابردنی لایەنی بەرانبەر، یاخود یەکێك لە ئەندامانی شاندی دانوستانکار دەردەچێت و ڕایدەگەیەنێت، کە دانوستانەکە بە بنبەست گەیشتووەو...هتد، بەمانەش ڕەنگە لایەنی بەرانبەر جۆرە هەڵوێستێکی خوازراو بنوێنێت، یاخود سازشێکی زیاتر پێشکەشبکات، یان زانیاریی زیاتر بەدەستەوە بدات.

## ٢. ستراتیجی چۆن و لە کوێ؟

لێرەدا چەند جۆرێك بە نموونە دەهێنرێتەوە:

أ. بەشداریپێکردن Participation: واتە هەوڵی دەستکەوتنی هاریکاریی چەند لایەنێکی تر، بەشێوەی ڕاستەوخۆ، یان ناراستەوخۆ، بۆ یارمەتیدانی لایەنێك لە هەڵوێستێك، یان قۆناغێکی دانوستاندا، ئەم جۆرە زیاتر لەنێوان ئەندامانی ئەو ڕێکخراوانەدا پیادەدەکرێت، کە چوارچێوەیەك کۆیان دەکاتەوە، وەك: (یەکێتیی ئەورووپا و ڕێکخراوی ئۆپیك).

ب. هاوبەشیکردن Association: دروشمەکەی بریتییە لەم وشەیە: "دەستم بگرە دەستت دەگرم"، واتە ئاڵوگۆڕکردنی مەرجی ڕێککەوتن بە شێوەیەك هەرلایەك جۆرێك لە سازش لە شتێك دەکات بۆئەوەی لە بەرانبەردا دەستەوتێکی گرنگی تری دەستبکەوێت. بۆ نموونە: کۆمپانیایەك، لە بەرانبەر کردنەوەی بواری کاری نوێ و دەستکەوتنی بازاڕی نوێ، سازش لە جۆرە قازانجێك دەکات بۆ کۆمپانیایەکی تر.

ت. پلەبەندی: واتە هەنگاو بە هەنگاو، کە تێیدا بابەتی دانوستانەکە دەکرێت بە چەند بەشێکەوە، بۆئەوەی هەر بەشێکی بەجیا گفتوگۆی لەسەر بکرێت و بڕیاری لەبارەوە بدرێت، پاشان باسی بەشێکی تر بکرێت. ئەمە زیاتر لە دۆزە ئاڵۆزەکاندا پێڕەو دەکرێت، یان لەو کاتانەدا کە لایەنە دانوستانکارەکان شارەزایی زۆریان نەبێت.

ث. دانانی بریکار (التوكيل): واتە دیاریکردنی هەندێك لایەن بۆ ئەوەی هەستن بە نێوەندگیری، یان بەناوی چەند لایەنێکەوە قسەبکەن. لەلایەنە باشەکانی ئەم جۆرە ئەوەیە، کە لایەنەکان تووشی شەرمەزاری، یان ڕووگیری نابن.

ج. ئاستگۆڕین Shifting Levels: واتە دانوستانەکان لە ئاستی نزمتر لە سەرۆك، یان بەرپرسی یەکەمەوە دەستپێدەکات، پاشان کە دەگاتە هەڵدێر، یان بنبەست، ئاستی دانوستانکارەکان بەرزدەکرێتەوە، یان کەسێکی پلە بالاتر بۆ شاندی دانوستانکار زیاددەکرێت، تا ئەوەی هەندێکجار وا دەخوازێت بالاترین کەس، بۆ باش بەڕێوەچوونی دانوستانەکان، دەستێوەردان بکات. ئەو ئاستبەرزکردنەوەیە کاریگەریی دەروونیی گەورەی دەبێت و پاڵنەرێکیش دەبێت بۆ بەرانبەر، کە جیددییانەتر لە پرۆسەی دانوستانەکان بەردەوام بن.

بەگشتی دەتوانین بلێین: ئەگەر دانوستانکار بەپێی ستراتیجییە دانوستانکارییەکانی مەبەستی بێت، بگات بە ڕێککەوتن، ئەوا بەو ئاڕاستەیەدا سیاسەت و تەکتیکەکانیشی بەکاردەهێنێت، بەڵام ئەگەر مەبەستی نەگەیشتن بوو بە ڕێککەوتن لەگەڵ لایەنی بەرانبەر، بۆ نموونە: کاتێك ئامانجی دانوستانکاریی پەیوەست بێت بە ڕێکخستنی باری ناوخۆیی و بەفیڕۆدانی کات بەبێ ئەوەی بگات بە ڕێککەوتن، ئەوا هەوڵدەدات سوود لە کات وەربگرێت و دانوستانەکان بۆ مەبەستە سەرەکییەکەی خۆی بەکار بهێنێت، بەبێ گەیشتن بە ڕێککەوتن، لەم کاتەشدا دانوستانکار پێویستە خاوەنی لێهاتوویی بالا بێت، لەبەکارهێنانی زمانی جەستەی هەتا ئامانجەکەی لە ڕێکنەکەوتن لەگەڵ لایەنی بەرانبەر بەدەست بهێنێت، بەبێ ئەوەی دانوستانکار ئەم ئامانجە دانوستانکارییەی بە دەربڕینی زارەکی بڵێت.

## چوارەم: تایبەتمەندییەكانی دانوستانكاری پسپۆڕ و بەتوانا و هەڵە كوشندەكانی

دانوستانكار، بۆئەوەی ببێت بە دانوستانكارێكی پسپۆڕ و لێهاتوو و ئەركەكەی بە باشی جێبەجێ بكات، پێویستە كەسایەتییەكی تەواو و شارەزاییەكی باشی هەبێت. دیارترین تایبەتمەندییەكانی دانوستانكاری سەركەوتوو لەم چەند تەوەرەدا دەخەینەروو(١):

*أ. تایبەتمەندییە بابەتییەكان:*

١. توانای لێكدانەوە: هونەری شیكارو شیكردنەوەی بابەتە ئاڵۆزەكان و رەگەزەكانی و بەستنەوەی هۆكارەكان بە دەرەنجامەكان.

٢. شارەزایی ئابووری: بۆ لێكدانەوەی قەبارەی تێچوون و بڕی ئەو سوود و قازانجەی، كە دەگەڕێتەوە بۆ هەر لایەك.

٣. شارەزایی یاسایی: كە یارمەتیی دانوستانكار دەدات بۆ ئەنجامدانی دانوستانەكانی، لە هەموو قۆناغەكانی دانوستاندا، بەبێ ئەوەی بكەوێتە هەڵەی یاساییەوە.

٤. شارەزایی دەروونی: بۆ دیاریكردن و هەڵسەنگاندنی سروشت و لایەنی دەروونیی بەرانبەر، لە هەمان كاتدا توانای زاڵبوون بەسەر رەفتار و زمانی جەستەی خۆیدا و بەكارهێنانی فشاری دەروونی. شارەزایی رەهەندە دەروونییەكانی دانوستان تەنها بۆ دانوستانكار گرنگ و پێویست نییە، بەڵكو

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: م.ن، ص ص٩٠-٩٣. و: د. نبية إبراهيم إسماعيل، البعد النفسي للتفاوض، مركز الإسكندرية للكتاب، الإسكندرية، ٢٠٠٧، ص ص٤٠-٥٣.

پێویستە لە کۆی پرۆسەی دانوستاندا، لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ و دەوڵەتیش، رەچاوی لایەنە دەروونییەکان بکرێت، چونکە پرۆسەی دانوستان رەهەندێکی مرۆیی هەیە، کە پەیوەستە بە دوو لایەنی کەسایەتیی مرۆیی، کە بریتین لە ئەقڵ و دەروون.

٥. شارەزایی زمانەوانی: پێویستە رۆشنبیرییەکی گشتیی لەسەر زمانەوانی هەبێت، توانای ئەوەی هەبێت جیاوازیی لەنێوان واتای زاراوەیی چەمکەکاندا و واتا فەرهەنگییەکانیان و واتا بازاڕی و گشتییەکانیان بکات.

٦. ڕۆشنبیریی گشتیی: واتە ڕۆشنبیرییەکی گشتیی لە بوارەکانی ژیاندا هەبێت، کە یارمەتی بدات لە دانوستانەکان بۆ تێگەیشتنی گشتی و هەڵسەنگاندنی هەڵوێست و دەرەنجامەکان. بەتایبەت شارەزایی مێژوویی، کە نموونەی زۆر دانوستان و دەرەنجامەکانی و زانیاریی زۆر بۆ دانوستانکار فەراهەم دەکات.

خۆ ئەگەر دبلۆمات، بەتایبەت سەرۆکی شاندی دانوستانکار، لەرووی ئابووری و یاسایی و دەروونی و زمانەوانییەوە خۆی شارەزایی تەواوی نەبوو، ئەوا پێویستە پشت بە کەسانی پسپۆڕ لەو بوارانەدا ببەستێت، چونکە توناکان رێژەیین و زەحمەتە هەموو ئەم سیفەتانە لە کەسێکدا کۆببێتەوە، بۆیە پێویستە دەوڵەت لە کاتی دیاریکردنی ئەندامانی شاندەکان ئەو لایەنانە بەهەند وەربگرێت.

## ب. ***تایبەتمەندییە کەسییەکان:***

١. خودناسین، پەیبردن بە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی خود، ئەو توانا و شارەزاییانەی کە هەیەتی، هەروەها ناسینی جۆری کەسایەتیی خۆی.

٢. بابەتیبوون لە بڕیارداندا، سەبارەت بە بابەتی دانوستان و کەسایەتیی دانوستانکارانی بەرانبەر.

٣. پێگەیشتوویی و توانای ئارامگرتن: کەسێتیی بەهێز و خاوەن کاریگەریی و سەرنجڕاکێش و بەئارام لە تایبەتمەندییە گرنگە کەسییەکانی دبلۆماتن.

٤. توانای سوودوەرگرتن لە کات بە باشترین شێوە.

٥. زیرەکی و وریایی: بۆ دیاریکردنی خاڵی بەهێز و لاواز و هەڵسەنگاندنی خێرا و پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکان و سوودوەرگرتن لە خاڵی لاوازی بەرانبەر.

٦. جوان و خێرا مامەڵەکردن: ئەمەش پشت بە جۆر و رەهەندەکانی دانوستانەکە دەبەستێت.

٧. متمانەبەخۆبوون و بوونی کەسایەتییەکی دەروونئارام و سەنگین و بەڕێز.

٨. باشزانینی هونەری گوێگرتن و بێدەنگبوون: کە سەرچاوەی گرنگن بۆ دەستکەوتنی زانیاری و هەڵسەنگاندنی دروست.

٩. رێز و مامەڵەی جوان: کە یارمەتیی داگیرکردنی دڵی بەرانبەر و قەناعەتپێکردنی دەدەن.

١٠. خێرایی تێبینیکردن و تێگەیشتن: بۆ پەیبردن بە شتە وردەکان و زمانی جەستەی بەرانبەر و سوودوەرگرتن لێیان و وەڵامدانەوەیان.

١١. نەرمی لە وەرگرتنی دید و بۆچونی جیاواز و دیراسەکردنی.

بەگشتی هەندێك لەم تایبەتمەندییانە بۆماوەیین و هەندێکیشیان پێویستە دانوستانکار فێریان بێت و مومارەسەی بکات، لێرەدا ڕۆڵی ئەکادیمیا و پەیمانگا و زانکۆکان دەردەکەوێت، لە پێگەیاندنی تواناکانی دبلۆماتکاراندا.

بۆئەوەی دانوستانکار بتوانێت کارەکەی بە سەرکەوتوویی و پسپۆڕانە جێبەجێ بکات، پێویستە چەند تایبەتمەندییەکی هەبێت، دیارتینیان ئەمانەن(١):

١. پێویستە پێش ئەوەی بچێتە نێو دانوستانەوە ئامانجە باڵاکانی بزانێت.
٢. پێویستە تایبەتمەندی و ئاست و توانا و کارامەیی بەرانبەرەکانی بزانێت.
٣. پێشبینیی ئەوە بکات، کە بە خەیاڵی بەرانبەرەکەیدا دێت.
٤. کاربکات بۆ دروستکردنی متمانە لەنێوان خۆی و بەرانبەرەکەیدا.
٥. پێویستە پەرە بە کارامەیی و شارەزایی پەیوەندیکردن لەگەڵ بەرانبەرەکەیدا بدات، ئەویش بە ئاگاداربوونی لە ئاماژە نازارەکییەکانی خۆی و نەیارەکانیشی لە یەك کاتدا.
٦. پێویستە دبلۆماتکار لە سەرەتادا هەموو کارتەکانی خۆی دەرنەخات، بۆئەوەی سەرەتا لە خواست و ویستەکانی بەرانبەر تێبگات.
٧. خستنەڕوو و هەڵسەنگاندنی سەرچاوەی هێز و لێهاتوویی خود و بەرانبەریش لەسەر ئاستی کەسی و بابەتی، لەپێناو بەراوردکارییەکی تەواو بۆ خاڵی هێز و لاوازی هەردوولا.

---

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٢٧٨-٢٨١.

٨. دیاریکردنی بژاردەو ئەلتەرناتیڤە جیاوازەکان بۆ دیاریکردنی نزمترین و بەرزترین ئاستی خواست و ئامانجی پشت دانوستانەکان.

لە هەمان کاتدا چەند هەڵەیەکی کوشندە هەن، کە پێویستە دبلۆماتکار خۆی لێیان بپارێزێت، مەگەر لە هەندێك باردا ستراتیج و سیاسەتی دانوستانکاریی وا بخوازن، کە لە سنوورێکی دیاریکراودا بەکاربهێنرێن. دیارترینیانی ئەو هەڵە کوشندانە ئەمانەن(١):

١. باش خۆئامادەنەکردن: بە دیارینەکردنی ستراتیج و سیاسەت و تەکتیکی دانوستان و نەبوونی زانیاریی ورد و تەواو لەسەر بابەتی دانوستانەکە.

٢. پشتگوێخستنی و ئیشنەکردن بە پرەنسیپی "دان" و "ستاندن": واتە نکوڵیکردن و راسەپاندن و مەرجسەپاندن و حسابنەکردن بۆ راوبۆچوونی بەرانبەر، کە هەندێکجار سەردەکێشێت بۆ شکستی دانوستانەکان، واتە پێویستە بە گەمەی سفری مامەڵە نەکرێت، کە پێیان وابێت پێویستە هەموو خاڵەکان لە بەرژەوەندیی ئەمان تەواو بێت، چونکە سروشتی دانوستان بریتییە لە ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی، ئەمەش نەرمی دەخوازێت.

٣. بەکارهێنانی شێوازی تۆقاندن: بەکارهێنانی هەڕەشەو تۆقاندن تەنها سەردەکێشێت بۆ هەڵەتێگەیشتن و نکوڵیکردن و توندوتیژیی لایەنەکان بەرانبەر بە یەکتری، هەرچەندە لایەنی بەرانبەر لاوازیش بێت.

٤. نەمانی ئارامی: نەمانی ئارامی رەنگە سروشتی هەڵچوون و دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی ئەقڵ بەدوای خۆیدا بهێنێت. دانوستان بۆ دۆزینەوەی ئەو

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صلاح محمد عبدالحمید، م.س.ذ، ص ص٨٩-٩٠.

خاڵە هاوبەشانەی، کە پردی پەیوەندیی دروستدەکەن و لایەنەکان پێی رازی دەبن، پێویستی بە ئارامی و بەردەوامی هەیە.

٥. تووڕەبوون و هەڵچوون: کە وادەکەن نەتوانین بەسەر خۆمان و هەست و هەڵسوکەوتماندا زاڵ ببین، کە هەندێك دەگاتە ئەوەی کەسایەتیی بەرانبەر بریندار بکەین،لە بابەتیبوون دووربکەوینەوە، ئەمەش وا دەکات، کە نەتوانین تەحەککوم بە هەڵوێستی خۆمانەوە بکەین، ئەمەش زیان بە ئامانجەکانمان دەگەیەنێت.

٦. زۆربلێیی و کەمگوێگرتن: ئەمەش وا دەکات، کە دانوستانکار زیاتر سەرقاڵی قسەکردن بێت و بواری کەم بێت بۆ چاودێریکردنی هەڵسوکەوت و قسەو زمانی جەستەی بەرانبەرەکەی، لە هەمان کاتدا ئەم زیاتر دەکەوێتە ژێر چاودێریی بەرانبەرەکەیەوە، کە بواری بیرکردنەوەی زیاترە.

٧. دەمەقاڵێ و موجادەلە لەبریی قەناعەتپێکردن: دەمەقاڵێ و دەمەدەمێی زۆر دڵەڕاوکێ و تێگەیشتنی هەڵە دەخولقێنێت، بۆیە پێویستە دانوستانکار لەبری ئەوە پەنا بۆ شێوازی زانستی و بابەتییانە ببات بۆ قەناعەتپێکردنی بەرانبەرەکەی.

٨. چاوداخستن لە ناکۆکی: پێویستە دانوستانکار لەگەڵ خۆی و بابەتی دانوستانەکەیدا ڕاستگۆ بێت و نەیکات بە قوربانی موجامەلەکردن بۆ بەرانبەرەکەی، بەڵکو مامەڵەی دروست و بابەتییانە لەگەڵ ئەو واقیعەدا بکات کە هەیە، چونکە تا دان بە ناکۆکییەکەدا نەنێن، ناتوانن چارەسەری گونجاویشی بۆ بدۆزنەوە.

## باسی چوارەم: رۆڵی زمانی جەستە و پەیوەندیی نازارەکی لە دانوستاندا

سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، کە پەیوەندییە نازارەکییەکان جۆریان زۆرە و زمانی جەستە بەشێکی گرنگی ئەو پەیوەندییانەیە. لەگەڵ ئەوەی کە بەشێك لە پسپۆڕانی ئەو بوارە لەرەی دەنگ و رێژە و خێرایی شێوازی قسەکردنیش بە بەشێك لە زمانی جەستە هەژماردەکەن، بەڵام، بە دیدی ئێمە، پەیوەندییە نازارەکییەکان لە زمانی جەستە فراوانترن، چونکە پەیوەندییە نازارەکییەکان رەگەزە دەنگییەکانی وەك: تۆنی دەنگ، یان ئاوازەکەی، پلەی بەرزیی دەنگ، رێژەی قسەکردن...، لەخۆدەگرن، لە هەمان کاتدا رەگەزە نادەنگییەکانیش لەخۆدەگرن، کە بریتیین لە خودی زمانی جەستە، وەك: (ئاماژەبۆکردن، بزاوت، دەربرینەکانی روخسار، پەیوەندیی چاو،...هتد). لە دەرەنجامدا هەموو پەیوەندییە نازارەکییەکان، بەتایبەتیش زمانی جەستەو شێوازی بەکارهێنانیان و تێگەیشتن لە زمانی جەستەی لایەنی بەرانبەر، رۆڵ و کاریگەریی خۆیان هەیە لە دانوستانەکاندا، پێویستە دبلۆمات بتوانێت زمانی جەستەی خۆی بە باشترین شێوە بەکاربهێنێت و هەوڵبدات، ئاگای لە جووڵەو ئاماژە نازارەکییەکانی لایەنی بەرانبەر بێت[1].

بەپێی دەرەنجامەکانی ئەو تاقیکردنەوانەی کە (ئەلبێرت میهرابیان – Albert Mehrabian)، مامۆستا لە (زانکۆی کالیفۆرنیا) و دانەری

(١) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر رۆڵی زمانی جەستە لە دانوستانەکاندا بڕوانە: د. دانا علي صالح، أثر لغة الجسد في المفاوضات السياسية، مجلة جامعة السليمانية/ القسم/B، العدد ٤٨، أيلول ٢٠١٥، ص ص١٦٧-١٩٦.

کتێبــــــەکانی پەیامەبێدەنگــــــەکان -*Silent Messages* و پەیوەندییەنازارەکییـەکان – Nonverbal Communication)، لـە سـاڵی (١٩٦٧)، ئـەنجامی داون، ئامرازەکـانی پەیوەنـدیکردن بەگشـتی لای مرۆڤ پێکدێن لە: زمانی زارەکـی (وتـراو)، ئـامرازی سەرەکیشـی بریتییـە لـە وشە، کە کۆی رێژەکەی لە سەرجەمی ئامرازەکانی پەیوەندیکردندا، دەگاتە تەنها (٧٪)، زمانی دەنگـی (تـۆن و لـەرەی دەنـگ)، کـە ریژەکـەی دەگاتـە (٣٨٪)، بەڵام رێژە گەورە و زۆرەکەی نە بە دەنـگ و نـە بـەزارە، بـەڵکو لـە زمانی جەستەی پێکدێت و رێژەکەی دەگاتە (٥٥٪)[1]، ئەمەش بەدڵنیاییەوە

---

(1) See:Albert Mehrabian, Silent Messages, Wadsworth Publishing Company, California, 1971. At: https://www.scribd.com/doc/98446772/Albert-Mehrabian-Silent-Messages-1971

هەروەها بڕوانە: د. إبراهيم الفقي، البرمجة اللغوية العصبية وفن الاتصال اللامحدود، إبداع للإعلام والنشر، القاهرة، ٢٠٠٨، ص ص ٩٦-٩٧. و د.خليل حسين الخرقاني و د.صارم داخل أحمد، توظيف تقنيات لغة الجسد في أداء الممثل المسرحي، مجلة كلية اللغات، جامعة بغداد، العدد ٢٥، سنة ٢٠١٢، ص٤٨.

ئەو دەرەنجام و رێسایەی کە (میهرابیان) سەبارەت بە رۆڵی وشە و نەغمە، یان تۆنی دەنگ و پەیوەندیی نازارەکی، بە ژمارە باسی دەکات، لەلایەن هەندێك لە پسپۆڕانەوە، رووبەڕووی رەخنە بووەتەوە؛ هەندێکیان بڕوایان وایە، کە ئەو دەرەنجامە زیادەڕۆیی تێدایە، تاقیکردنەوەکانیش، کە لەسەر چەند خوێندکارێکی زانکۆی کالیفۆڕنیا، لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمدا ئەنجامدراون، جۆرێك لە سادەییان تێدایە، بۆیە پێویستە گرنگیی بە هەموو ڕەگەزەکانی وشە و نەغمەی دەنگ و زمانی جەستەش پێکەوە بدرێت، لە هەموو کاتێکیشدا ئەوە رێسایەی (میهرابیان) باسی دەکات(واتە: رێسای رێژەکانی ٥٥٪، ٣٨٪، ٧٪)، رەنگە راست دەرنەچێت، دیارە ئەم رەخنەیە لەجێی خۆیەتی و ئەم بابەتەش پێویستیی بە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەی زیاتر هەیە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

– Herb Oestreich, Let’s Dump the 55%, 38%, 7% Rule, Transitions, (National Transit Institute), Vol. 7, No. 2, November 1999, pp. 11-14. At: www.bdrp.nl/documenten/mehrabian_oestreich.pdf

گرنگیی زمانی جەستەمان لە پرۆسەی پەیوەندیکردن و گەیاندن لە ژیانی مرۆڤەکاندا پیشاندەدات، کە نماییندەی نێوان (٦٠_٨٠٪)ی ئەو کاریگەرییە دەکات، کە لەسەر مێزی دانوستانەکان دروست دەبێت، هەروەها هەندێك لە لێکۆڵینەوەکان دەریدەخەن و ئاشکرای دەکەن، کەلەکاتی دانوستان لە رێگەی تەلەفۆنەوە، زۆرکات، ئەو کەسەی کە خاوەنی بەڵگەی بەهێزە، دەیباتەوە، بەڵام کارەکە، لە دانوستانی رووبەڕوودا، بەو شێوەیە نییە، لەبەرئەوەی مرۆڤ بڕیارەکانی کۆتایی بە پشتبەستن بەوە دەدات، کە دەیبینێت، زیاتر لەوەی گوێیلێدەبێت[١].

پێویستە دانوستانکار لەمیانەی پرۆسەی دانوستاندا کۆمەڵێك رەفتاری دیاریکراو لە رێگەی زمانی جەستەیەوە ئەنجام بدات، کە بە ئاراستەی بەدەستهێنانی ئامانجە باڵاکانی، شوێنەواری ئەرێنی بەجێدەهێڵن، کە لە گرنگترینیان ئەمانەن[٢]:

١. هەنگاوی یەکەم لە بەکارهێنانی زمانی جەستە لە دانوستانەکاندا لە ساتی چوونەژوورەوە بۆ ژووری دانوستان دەستپێدەکات، بۆیە پێویستە دانوستانکار چاودێریی زمانی جەستەی خۆی بکات، لە رێگەیی ئاگاداربوونی لە هەموو جووڵە و ئاماژەکانی جەستەی، لەبەرئەوە تێڕوانینەکانی ساتی یەکەم لەسەر مێزی دانوستانەکان زۆر گرنگە.

---

(1)See: Allan & Barbara Pease, The Definitive Book of Body Language, Pease International, Australia, 2004, p10.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. دانا علي صالح، أثر لغة الجسد في المفاوضات السياسية، م.س.ذ، ص ص١٨٣-١٨٤.

٢. پێویستە دانوستانکار ئاگاداری جلوبەرگی بێت و بزانێت، بەپێی قۆناغەکانی دانوستان، چی دەپۆشێت، چونکە رێکوپێکی جلوبەرگ چەکێکی گەورەیە لە بەڕێوەبردنی تێڕوانینەکاندا، بەو پێیەی دەزانین، کە زۆرینەی خەڵك یەکەمین تێڕوانین بە گرنگییەوە وەردەگرن، بەتایبەتی لە (حەوت) چرکەی یەکەمی چاوپێکەوتندا، کە هەر ئەوەشە، لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا، بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

٣. زەردەخەنە و هێمنی و لەسەرخۆیی، ئەو زەردەخەنەیەی کە وێنەدانەوەی جۆرێك لە دڵەوشاوەیی و رووخۆشی و گەشبینی و هەڵنەچوونە لە هەڵوێست و دۆخەکان لە کاتی دانوستانەکاندا، کە لە دەرەنجامدا دەبێتە کلیلی سەرکەوتن، بەڵام پێویستە دانوستانکار بەردەوام نەبێت لە زەردەخەنەکردن، چونکە ساختەکردنی زەردەخەنەی راستەقینە بەدرێژای کات کارێکی گرانە، ئەوەش لەبەرئەوەیە، کە ئەگەر چاوەکان هەماهەنگ نەبن لەگەڵ زەردەخەنەکردندا، ئەوا زەردەخەنەی دەم بە دڵەڕاوکێ راڤە دەکرێت، هەروەها زەردەخەنەی زۆر دانوستانکار بەچەشنێك دەردەخات، کە هەوڵی رازیکردنی لایەنی بەرانبەر دەدات، یان ملکەچیەتی. کەواتە دانوستانکاری سەرکەوتوو کاتێك زەردەخەنە دەکات، کە خۆی دەیەوێت و هەڵوێست و بارودۆخەکە دەیخوازێت.

٤. دەستپێنەکردنی گفتوگۆی دانوستانکاری بە روانینێکی دوژمنکارانەوە، یاخود هەر جووڵەیەك کە گوزارشت لە ڕق و رووبەڕووبوونەوە و بەرهەڵستکاری بکات، چونکە دەربڕینی جووڵەی دوژمنکارانە دەبێتەهۆی وروژاندنی بەرانبەر و ئەمەش توندوتیژیی لایەنی بەرانبەری لێدەکەوێتەوە.

٥. پێویستە دانوستانکاری سەرکەوتوو فێری کارامەیی کۆنترۆڵکردنی باری سۆزداریی خۆی بێت، بۆئەوەی بتوانێت ئاستی نواندنی جەستەی زیادبکات، لە توانایدا بێت تواناکانی خۆی باشتر بکات لە زاڵبوون بەسەر حاڵەتەکانی شپرزەیی و دڵەڕاوکێ و رووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگ و ئاڵینگاری و بارودۆخە چاوەڕواننەکراوەکاندا.

٦. نمایشکردن و نواندنی رەگەزەکانی زمانی جەستەی دەستەی دانوستانکار، دیاریکردنی شوێنی دانیشتن، بەتایبەت شوێنی سەرۆکی دەستەی دانوستانکار، دیاریکردنی شێوازی دانیشتن لەسەر کورسیی هەژموونکەر، ئەوەی کە زۆرکات لەسەرووی مێزەکە و بەرانبەر سەرۆکی نێرداروە (دەستە) دانوستانکارییەکەی ترە، بێجگە لە شێوازی نیشاندانی پەرۆشی و گرِوتین و ئاگایی بۆ پەیوەندی بە چاو و شێوازی تەوقەکردن، کە هەموو ئەوانەش پێویستە بەپێی ستراتیجیەتی دانوستانکاری بێت، ئەمە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی کولتووری گرووپی بەرانبەر لە پرۆسەی دانوستاندا، بۆ نموونە: شێوازی سڵاوکردن و تەوقکردنی کەسێکی ژاپۆنیی جیاوازە لە ئەمەریکییەك.

٧. پێویستە شێوازی وەستان و دانیشتن، بەپێی باودۆخ و هەڵوێستەکان و کاردانەوەکان لە چوارچێوەی تەکتیکی دانوستانکاریدا، بگۆڕدرێن.

ماوەتەوە بڵێین: هەر دبلۆماتکارێك، یان هەر ستافێکی دبلۆماسی، یان هەر دەوڵەتێك، گرنگی و پێگە و کاریگەریی پەیوەندییە نازارەکییەکان، بەتایبەت زمانی جەستە، لە کاتی دانوستانەکانیدا، نادیدە بگرێت، لە زۆرێك

له پەیامە شاراوەکانی لایەنی بەرانبەر تێناگات، کە بەشێوەی نازارەکی گوزارشتیان لێدەکات و بە زار نایان درکێنێت.

لەلایەکی ترەوە، پەیامە نازارەکییەکان بە باشترین چەکی دبلۆمات هەژماردەکرێن بۆ پراکتیزەکردنی تەکتیکە دانوستانکارییەکان، کە دواجار دەچنەوە خزمەتی سیاسەت و ستراتیجی خوازراوی دانوستانەکان.

لێرەوە دەگەینە ئەو راستییەی، کە هەر لایەنێکی دانوستانکار گرنگیی بە پەیوەندییە نازارەکییەکان و زمانی جەستە و شارەزایی تێیاندا لە لایەنی بەرانبەرەکەی زیاتر بێت، هەلی سەرکەوتنی لە دانوستانەکاندا زیاتردەبێت، پێچەوانەی ئەمەش راستە.

# بەشی نۆیەم
# ئاراستە و پەرەسەندنە نوێیەکانی دبلۆماسییەتی هاوچەرخ

باسی یەکەم: دبلۆماسیی و تەکنۆلۆجیای پەیوەندی و زانیاری

باسی دووەم: دبلۆماسی و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان

باسی سێیەم: دبلۆماسیی رێکخراوە ناحوکومییە نێودەوڵەتییەکان

باسی چوارەم: دبلۆماسیی و رەهەندی ئایینی

## بەشی نۆیەم:
## ئاراستەو پەرەسەندنە نوێیەکانی دبلۆماسییەتی هاوچەرخ

➢ **ئامانجەکانی ئەم بابەتە:**

١. کردنەوەی دەروازەیەکی گرنگی تێگەیشتن بەرووی ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی بوارە جیاوازەکانی ژیانی گرتووەتەوەو لە ئەنجامدا کاریگەریی لەسەر جۆر و شێوازی کارو پیشە و مامەڵەی دبلۆماسیی بەجێهێشتووە، دیارترین ئەو بوارانەی پەرەسەندن بریتین لە شۆڕشی زانیارییەکان، کە وایکردووە زۆرێك لە چەمك و بوارە نێودەوڵەتییەکان داڕشتنەوەیان بۆ بکرێت، چاوخشاندنەوە بە شێوازی مامەڵەلەگەڵکردیان بکرێت.

٢. ئاشنابوون بە شێوازی مامەڵەی هاوچەرخ لە کۆنگرەو کۆبوونەوەو بۆنە نێودەوڵەتییەکان و شارەزابوون بە مەراسیم و پرۆسیجەرە پێویستەکانی ئەو بۆنە و دانیشتنانە.

٣. تێگەیشتن لە رۆڵی تازەهەڵکشاوی دبلۆماسیی رێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحوکومییەکان و شێوازی مامەڵەکردنیان لە جیهانی دبلۆماسییدا.

٤. تیشکخستنەسەر رەهەندی ئایینیی و رۆڵی بەهاکان لە پەیوەندییە دبلۆماسیی و نێودەوڵەتییەکاندا.

## ➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە:

**دەستپێك..**

لە سایەی ئەو پەرەسەندنە گەورە و بەردەوام و فرەلایەنەی هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی گرتووەتەوە، دبلۆماسییش بەو پێیەی پەیوەندیی بە بەشێکی گرنگ و زیندووی لایەنە سیاسی و ئابووری و کولتووری و ئایینی و...هتدەوە هەیە، بۆیە بەریەککەوتن و کارلێك و کاریگەرییان لەسەر یەکتری دەبێت، بۆیە ئەم بەشە تەرخاندەکەین بۆ شیکردنەوەی ئەو کارلێك و کاریگەرییانەو مامەڵەو رۆڵی هاوچەرخی دبلۆماسی لەو بوارانەدا.

## باسی یەكەم: دبلۆماسی و تەكنۆلۆجیای پەیوەندی و زانیاری

شۆرشـــی زانیارییـــەكان، كـــە جیهـــان و ژیـــان و میكـــانیزم و چـــەمكە سیاسییەكانیشی گۆڕیوە، وای لە وڵاتان كردووە بێ قەڵغان بمێننـەوە، واتـە نەتوانن سنوورێك بۆ ئەو لێشـاوە گەورەیـەی زانیـاری دابنـێن، كـە سـنووری وڵاتەكانیان دەبەزێنێت و كاریگەری لەسەر ژیان و كولتوورو شێوازی مامەڵـە و تێگەیشتنی هاووڵاتیانیان بەجێ دەهێڵێت، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت ئـــەو تەكنۆلۆجیایـــە گۆڕانكـــاری بەســـەر چـــەمكە یاســـایی و سیاســـییە سەرەكییەكانی وەك: سەروەریی رەها و دەستێوەرنەداندا هێناوە، هـەروەها بەربەست و سنووری نێوان سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەكی و سنووری نێـوان پـرس و دۆزە نێوخـۆیی و هـەرێمی و نێوەوڵەتییـەكان و جـەنگ و ئاشـتی و دەوڵەت و گەلدا كاڵكردووەتەوە، یان هەر نەیهێشتووە، بەشێوەیەكی بـەهێز تێكەڵ و وابەستەی یەكتر بوون، كـە ناتوانرێـت لەیـەك جیـا بكرێنـەوە، یـان دوور بخرێنەوە[١].

لەلایـــەكی تـــرەوە ئینتـــەرنێت و میـــدیاكان، بـــە هـــەموو جـــۆر و شـــێوازەكانیانەوە، شـــەپۆلی گـــەورەی زانیـــاری لـــە رێگـــەی مانگەدەستكردەكانەوە بە شێوەیەك دەگوێزنـەوە، كـە دەوڵـەتان بەئاسـانی ناتوانن كۆنترۆڵی ئاست و جۆر و رێژەی ئەو زانیارییانە دیارییبكـەن، بەمـەش ئاسۆ و سنوورەكانی دبلۆماسیی وەكو جاران نـەماوە، چـونكە ئینتـەرنێت و میدیا گەلانی دونیای لە یەكتر نزیك كردووەتەوە، دەتـوانن بەئاسـانی ئاشـنا

---

(١) بڕوانە: د. عبدالفتاح علي الرشدان و د. محمد خليل الموسى، أصول العلاقات الدبلوماسية والقنصلية، المركز العلمي للدراسات السياسية، عمان – الأردن، ٢٠٠٥، ص٢١١.

ببن بە ئەزموونی یەکتری و کاریگەری لەسەر یەکتری ئاڵوگۆڕ بکەن، رووداوو شۆڕش و راپەڕینەکانی وڵاتانی عەرەبیی ساڵی ٢٠١١ و دواتر، کە بەخێرایی بەدوای یەکدا هاتن، بەڵگەی زیندووی ئەم حاڵەتەن، کە لە هەمان کاتدا رۆڵی ئینتەرنێت (بەتایبەت تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەك فەیسبووك و تویتەر و...هتد) و کەناڵە تەلەفیزیۆنییە ئاسمانییەکانی وەك (ئەلجەزیرە) و کاریگەریی راستەوخۆیان لەسەر رووداوەکان، دەرخەری ئەو راستییەن، کە دانانی کاریگەریی لەسەر گەلانی دنیا و سیستمە سیاسییەکانیان سنوورێکی زۆر زیاتری لە چوارچێوەی دبلۆماسییەتە کلاسیکییەکەی بەزاندووە، لە ئێستادا کاریگەریی لەسەر رای گشتیی نێوخۆیی و جیهانی و تەنانەت دارشتنی سیاسەتی وڵاتانیش داناوە[١]. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین، کە لە جیهانی دبلۆماسییدا میدیا بە چەند شێوازێك رۆڵ دەگێڕێت و بە چەند جۆرێکیش بەکاردێت، کە هەر جۆرێکیان چەمکێکی بۆ بەکاردێت.

کاتێك کە میدیا وەك ئامرازێکی سەرەکیی سیاسەتی دەرەوەو دانوستانە نێودەوڵەتییەکان بەکاردێت، ئەوا چەمکی دبلۆماسی گشتی ( Public Diplomacy) بەسەردا دەچەسپێت، چونکە دەوڵەتان و ئەکتەرە نادەوڵەتییەکانیش میدیا و کەناڵەکانی تری پەیوەندی، بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر رای گشتی لە کۆمەڵگەکانی دەرەوە، بەکاردەهێنن. بەڵام کاتێك بەرپرسان میدیا بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەکتەرەکانی تردا، بۆ چارەسەری ناکۆکی و کێشەکان بەکاربهێنن، ئەوا چەمکی دبلۆماسیەتی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە کاریگەرییەکانی شۆڕشی زانیارییەکان بەگشتی بڕوانە بەشی پێنجەمی: د. دانا علي صالح البرزنجي، ثورة الاتصالات والتعاون الدولي في ظل العولمة، مركز الزهاوي للدراسات الفكرية، السليمانية، ٢٠١٣.

میـدیا (Media Diplomacy) بەرجەسـتە دەبێـت، بـەڵام هەنـدێکجار چــەمکی دبلۆماســییەتی ناوەنــدگیری میــدیایی ( Media-Broker Diplomacy) دێتــەئاراوە، کـە چـەمکێکی نوێیـە، ئـەویش کاتێکـە کـە ڕۆژنامەنووسـان بەشـێوەیەکی کـاتی ڕۆڵـی دبلۆماتکـار دەگێـڕن و وەکـو میدیاکار لـە دانوسـتانە نێودەوڵەتییەکانـدا ڕۆڵ دەگێـڕن[١]. واتـە دەبـن بـە "ناوەنــدگێڕی سیاســی نێودەوڵــەتیی". لێــرەدا جیــاوازیی نێــوان "دبلۆماسیەتی میدیا" و "دبلۆماسییەتی ناوەندگیریی میدیایی" لە چالاکیی ڕاسـتەقینەی ڕۆژنامەنووسـان لـە هەریـەکێك لـەو جـۆرە دبلۆماسـییەتانەو هەندێکجار لە سەرچاوەی ئەو چالاکییانەدا دەردەکەوێت. لە "دبلۆماسییەتی میدیا"دا ڕاپۆرتنووسـەکان پابەنـدی کـاری ڕۆژنامەگەرییانـەی پرۆفیشـناڵانە دەبــن و بڕیاربەدەســتە سیاســییەکان شــوێن ئــەو کــارە دەکــەون و بەکاریــدەهێنن. بــەڵام لــە "دبلۆماســییەتی ناوەنــدگیری میــدیایی"دا ڕۆژنامەنووسان کاری زیـاتر دەکـەن، وەك دبلۆماتکـاران، هەنـدێکجار شـوێن جووڵـە دبلۆماسـییە بنەڕەتییـەکان دەکـەون. واتــە ڕاپۆرتنووســەکان ئــەو لایەنانـە پیشـانی دبلۆماتـە فەرمییـەکان دەدەن کـە، بـەپێی کـاری فـەرمیی خۆیان، یان بەهۆی کۆتوبەندی ترەوە، نادیارن[٢].

---

(1) See: Eytan Gilboa, Diplomacy in the Media Age: Three Models of Uses and Effects, Diplomacy & Statecraft, Vol.12, No.2 (June 2001), pp.1-28. <http://dx.doi.org/10.1080/09592290108406201>

(2) See:Eytan Gilboa, Mass Communication and Diplomacy: A TheoreticalFramework, Communication Theory, International Communication Association,August 2000,pp. 298-299. <https://www.researchgate.net/publication/229915361>

لەم سـەردەمی پێشـکەوتنە تەکنۆلۆجییـەی بـواری زانیـاری و گەیاندنـدا کـارو پیشـەی دبلۆماسـی و ڕۆڵـی دبلۆماتکـاران و جـۆری مومارەسـەکردنی کارەکـەیان کەوتووەتـە، ژێـر کاریگەرییـەوەو گۆڕانکـاری لـە زۆر بـواردا دروستکردووە.

دەتوانین دیارترین ئەو گۆڕانکارییانەی، کە شۆڕشی زانیارییـەکان لەسـەر دبلۆماسی و ئەرکەکانی دروستیکردووە، لە چـەند خاڵێکـدا پوختبکەینـەوە، کە بریتین لە[1]:

١. کەمبوونەوەی پـەراوێزی ئـازادیی کـاری دبلۆمـات لـە نوێنەرایـەتیی وڵاتەکەی لە وڵاتی بەرانبەر. جاران زۆربەی کات بالۆێز دانوسـتانی دەکـرد و رێککەوتننامەی واژۆدەکرد و جگـە لـە رێنماییـەکانی وڵاتەکـەی شـتێکی تـر نەبوو ئازادی سنووردار بکات، بەڵام ئێستا بەهۆی ئاسانیی پەیوەندییکردن و پەرەسەندنی و فرەچەشـنییەوە وا بـاوە کـە زۆرکـات سـەرۆکی وڵاتـان، یـان نوێنەری تایبەتی خۆیان، یاخود وەزیری دەرەوەیـان ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی بەیەکەوە دەکەن و تەنگژەو قـەیران و کێشـەکان تـاووتوێ دەکـەن، یـاخود پیرۆزبایی و پرسەنامە ئاڕاستەی یەکتری دەکەن، هەروەها بـەهۆی ئاسـانیی هاتوچـــۆوە زۆرجـــار خـــودی خۆیـــان ئـــەرکی دانوســـتان و بەســـتنی رێککەوتننامـەکان، بەشـێوەی راسـتەوخۆ، لەئەسـتۆ دەگـرن. کەواتـە ڕۆڵـی دبلۆمات زۆرکات لە دانوسـتانکارەوە دەگۆڕێـت بـۆ رێککخـەری شـوێنکات و ئەجێنـــدای دانوســـتانەکان و ئامـــادەکردنی زانیـــاریی پێویســـت بـــۆ دانوستانەکە،شیکردنەوەیان و پێشکەشکردنیان بە شاندی دانوستانکار.

---

(١) بڕوانە: د. عبدالفتاح علي الرشدان و د. محمد خليل الموسى، م.س.ذ، ص٢١٣-٢١٦.

کەواتــە لەگــەڵ ئــەوەی هەنــدێکجار دەوترێــت پەیوەندییــە ئەلیکترۆنییــە ڕاستەوخۆکان دواجار کارێك دەکـەن، کـە دبلۆماسـیی هەمیشـەیی وەك کـارێکی ناپێویست و بارگرانی بێنە هەژمار، بەڵام پێشـبینی ئـەوە ناکرێـت، کەبەتـەواوی کۆتـایی پێبێـت و دەوڵـەتان پێویسـتیان پێـی نـەمێنێت[١]، بـەڵکو پێویسـتە کارەکـانی دبلۆماسـیی هەمیشـەیی جـارێکی تـر لــە سـۆنگەی گۆڕانکـاری و پەرەسندنە نوێیـەکانی تـەکنۆلۆجیا و بەرژەنـدیی دەوڵـەتان ڕێکبخرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش کـاتێکی وای پێویسـتە کـە هـەم نەریتـەکان و هـەم یاسـاکانی بـواری دبلۆماسی هاوئاهەنگ لەگەڵ پەرەسەندنە تەکنۆلۆجییە خێراکاندا هەنگاوبنێن.

٢. خێرایـی گواسـتنەوەی زانیـاری لەلایەکـەوە کـاری دبلۆمـاتی ئاسانکردووە، لە لایەکی ترەوە گرانـی کـردووە، چـونکە خێرایـی ئـاڵوگۆڕی زانیاری سەردەکێشێت بـۆ خێرایـی و ئاسـانی و پەیوەنـدی و بڵاوبوونـەوەی ڕاسـتییەکان، بـەڵام ئـەو خێراییـە وا دەخوازێـت، کـە دبلۆمـات خـاوەنی لێهاتوویـیـەکی بـاڵاو توانایـەکی بـاش بێـت بـۆ پـۆلێنکردن و شـیکردنەوەی زانیارییەکان، ئەمەش پێویستی بە مومارەسە و ڕاهێنان هەیە، بۆ بڕیـاردانی پێویست لەکاتی گونجاودا. هەروەها پێویستە دبلۆمات زۆر بەوریایی مامەڵـە لەگـەڵ میـدیادا بکـات و بزانێـت کـەی و چـۆن زانیـاری دەدرکێنێـت، کـەی پێچوپەنای پێچ دەکات و دەیشارێتەوە، چونکە لـە سـەردەمی شـەفافییەتدا شاردنەوەی هەنـدێك لـەو ڕاسـتییانەی کـە ڕای گشـتی لـە ڕێگـەی میـدیاوە پێیان دەگات، کاریگەریی نەرێنیی گـەورە لەسـەر ڕای گشـتی جێدەهێڵێت،

---

(١) بڕوانە: فرانك بيلي، معجم بلاكويل للعلوم السياسية، ترجمة ونشر: مركز الخليج للأبحاث، دبي، ٢٠٠٤، ص٢٠٣.

هەندێك كات كۆی گشتیی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانیش دەكەونە ژێر كاریگەریی ئەو دركاندنانەوە، جا ئەرێنی بێت، یان نەرێنی.

٣. پەرەسەندنی تەكنۆلۆجیای پەیوەندی و زانیارییەكان سەریكێشاوە بۆ دەركەوتنی چەمكی (دبلۆماسیی هەنووكەیی/ الدبلوماسية الآنية)، ئەویش لە ئەنجامی كاری هاوبەشی مانگەدەستكردەكان و پەخشی راستەوخۆی تەلەفزیۆنی و كۆمپیوتەر و مۆبایل و بەرنامەكانیانەوە، كە وایكردووە دبلۆماسیی میدیایی و دبلۆماسیی فەرمی بەناویەكدا بچن و تێكەڵ ببن و رووبەری هاوبەشی نێوانیان فراوانتر بێت. بۆ نموونە: پەیوەندیی راستەوخۆی سەرۆكی وڵاتان، كە پەخش دەكرێت كاریگەری و لێكەوتەكانی ڕاستەخۆ دەبن لەسەر بڕیاربەدەستانی وڵاتانی دی لەلایەك، لەلایەكی تریشەوە پشتبەستن بە دبلۆماسیی كلاسیكی كەمدەكاتەوە.

٤. تەكنۆلۆجیای گەیاندن چەندین جۆری نوێی تری دبلۆماسیی هێنایەكایەوە، گرنگترینیان: دبلۆماسیی دیجیتاڵی و دبلۆماسیی ئەلیكترۆنی، ئەمەش بە مانای ئەوە دێت، كە دبلۆماسییەكی جیهانیی نوێ دەركەوتووە، كە چالاكوانو رێكخراوە تایبەت و گشتییەكان و سەركردە سیاسییەكان و جەماوەر بە شێوازێكی بەرفراوان بەكاری دەهێنن، بۆ نموونە: تۆڕە كۆمەڵایەتییەكانی وەك فەیسبووك و تویتەر و...هتد، كە وایانكردوە ناویان لێبنرێت دبلۆماسیی تویتەر "تویپلۆماسییTwiplomacy" و دبلۆماسیی فەیسبووك Facebook Diplomacy. واتە بوارێكی نوێ بۆ مومارەسەكردنی دبلۆماسی هاتووەتە كایە، كە دەتوانرێت سوودی زۆری لێببینرێت، بەتایبەت لە بواری دبلۆماسیی هاووڵاتی، یان گشتی، یان

جەماوەری، بۆ دروستکردنی وێنـەی زەینـیلای گـەلانی دنیـا و دروسـتکردنی پەیوەندیی دوورمەودا لەگەڵ گەلانی تردا[١].

٥. ئاسانیی ئاڕاستەکردنی گوتاری تایبەت بە گەلانی تر، یـەکێکی تـرە لـە دەرهاویشـتەکانی شۆڕشـی زانیارییـەکان، ئـەوەتا تەنانـەت لـەکاتی جـەنگ و قەیرانەکانیشـدا سـەرۆکی وڵاتـان گوتـار ئاڕاسـتەی گـەلانی وڵاتـی بەرانبـەریان دەکـەن. بـۆ نموونـە: لـە کـاتی جـەنگی کەنـداوی دووەمـدا، هەیـەك لـە (سـەدام حوسـەین) و (جـۆرج بـۆش)ی بـاوك گوتـاری خۆیـان لـە ڕێگـەی کـەناڵی (CNN)ـەوە ئاڕاسـتەی گـەلانی یـەکتری کـرد، واتـە بەربەسـتە سـنوورییە سیاسییەکان لە سایەی ئـەو تـەکنۆلۆجیا پێشـکەوتووەی گەیاندنـدا، بەتـەواوی کاڵبوونەتەوە.

٦. کەمکردنـەوەی ڕۆڵ و پێگـەی جانتـای دبلۆماسـی، کـە پێشـتر سـومبولێکی دیـاری بـاڵوێز بـوو و هـەموو ئـەو شـت و زانیارییـە گرنگانـەی لەخۆدەگرت، کە باڵوێز لە وڵاتی خۆیەوە دەیهێنا، یاخود لـە وڵاتـی خانـەخوێوە دەینارددەوە بۆ وڵاتی خـۆی، بـەڵام ئێسـتا جانتـای دبلۆماسـی خەریکـە دەبێتـە سومبولێکی کۆنی دبلۆماسی، چونکە لە ئێسـتادا زانیارییـەکان زووتـر لـە جانتـا کلاسـیکییەکان دەگـەن، دنیـای ئـەلکترۆنی جێگـەی گرتووەتـەوەو زیـاتر ئـەو زانیاری و دیکۆمێنتانەی پێدەگوێزرێتەوە، کە بەهایان بەهۆی تێپەڕینی کاتـەوە کەمبووەتـەوە، کـۆن بـوون، واتـە خێرایـی ڕووداوەکـان و گواسـتنەوەی ڕاستەوخۆیان لە میدیاوە و شیکردنەوەی زیانیارییەکان لەسەریان، وایـانکردووە کە جانتای دبلۆماسی ڕۆڵێکی لاوەکی ببینێت، چـونکە ڕەنگـە گرنگیـی هـەواڵ و زانیارییەکان پێش گەیشتنیان بە جانتاکە کۆتایی پێبێت.

---

(١) بڕوانە: د. سليمان صالح، م.س.ذ، ص٢.

٧.  میدیا و ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان باشترین ئامرازیان بۆ دبلۆمات فەراهەم کردووە، بۆ گەیاندن و روونکردنەوەی سیاسەت و گوتار و پەیامی وڵاتەکەی و دروستکردنی تێگەیشتنی جەماوەری بۆیان، هەروەها بۆ خۆناساندنی و زیادکردنی کاریگەریی خۆی و نێراوە دبلۆماسییەکەی و جوانکردنی وێنەی وڵاتەکەی لای جەماوەری وڵاتی خانەخوێ[١].

٨.  میدیا و تەکنۆلۆجیای گەیاندن و زانیاری زۆرجار، کاریگەریی بەهێز لەسەر رەوتی دانوستانە نێودەوڵەتییەکان لەپێش دانوستان و لەکاتی دانوستانەکانیشدا دروستدەکەن، واتە هەندێکجار دەبنە یارمەتیدەر بۆ پرۆسەی دانوستان، هەندێکجاری تریش دەبنە رێگر لەبەردەم دانوستانەکاندا[٢]، چونکە میدیا و تەکنۆلۆجیای گەیاندن و زانیاری بە هەموو جۆرەکانییەوە دەکرێنە ئامرازێکی فشاری بەهێز و بە مەبەستی جیاواز لەلایەن دەوڵەتانی دانوستانکار، یاخود لەلایەن رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا گەورەکانی ڕاگەیاندنەوە بەکاردەهێنرێن.

---

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٢٥٣.

(2) See:Eytan Gilboa, Op. Cit,pp. 303-304.

## باسی دووەم: دبلۆماسی و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان

کۆنگرەنێودەوڵەتییەکان و ئەو گفتوگۆیانەی تێیاندا ئەنجامدەدرێن، رێگەیەکی نایابن بۆ گەیشتن بە رێککەوتننامە دووانەیی و کۆمەڵییەکان. پاش ئالۆزبوون و فرەرەهەندبوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، جۆر و ئاست و شێوازی بوارەکانی ململانێ و هاریکاریش زیادیان کردووە، کە هەردووکیان لە رێگەی گفتوگۆ و دانوستان و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانەوە بەرێوەدەبرێن، ئەمە وێرای ئەو کێشەو پرسانەی، کە هەرەشەن بۆ هەموو لایەك و دەوڵەتان و رێکخراوەکان بەرژەوەندیی هاوبەشیان لە رووبەرووبوونەوەیاندا هەیە، بۆ نموونە: تیرۆر و پیسبوونی ژینگە و کۆچی نایاسایی و نەخۆشییە درمەکان و...هتد، بۆ ئەو رووبەرووبوونەوەیەش کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان دەکرێنە رێگەی گەیشتن بە رێککەوتن و دۆزینەوەی رێگەچارەی هاوبەش. کۆنگرەو گفتوگۆ نێودەوڵەتییەکانیش چەندین رێسا و رێوشوێنی دبلۆماسیی تایبەتیان پێویستە، لێرەدا هەوڵدەدەین گرنگترینیان روونبکەینەوە.

### رێساکانی مەراسیمی گرێدانی کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان:

### رێساکانی مەراسیم

پێویستە هەرکۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی رێسای نووسراوی خۆی هەبێت،رێنمایی پێشکەش بە بەشداربووانی دەکات و کارەکانیان دیاریدەکات. ئەو رێسایانەش پێویستە رێسای هەمیشەیی بن، یاخود لە کۆنگرەی پێشوودا بڕیاریان لەسەر درابێت، چونکە ئەو رێسایانە دەبنە پێوەری مەراسیم و رێکارەکانی کۆنگرە[1].

### خشتەی کار (ئەجێندا)

---

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٢٣٥.

خشتەی کاری کۆنگرە ئەو پرسانە لەخۆ دەگرێت، کە بڕیارە بخرێنە بەر باس. پڕۆژەی خشتەکە لەلایەن ئەندامانی لیژنەیەکەوە، یان سکرتاریەتی گشتیی کۆنگرە، یان ڕێکخراوەوە ئامادەدەکرێت، لەکاتی بەستنی ئاسایی کۆنگرەشدا ئەجێندا ئەمانە لەخۆ دەگرێت[١]:

أ. بڕگە ناچارییەکان (وەك: داننان بە پڕۆتۆکۆلی دانیشتنی پێشوو).

ب. ئەو پرسانەی کە لە دانیشتنی پێشوو دانراون بۆ گفتوگۆلەسەرکردن، بەڵام بەبێ گفتوگۆلەسەرکردن ماونەتەوە).

ت. ئەو پرسە نوێیانەی، کە پێشنیاز کراون بۆ گفتوگۆلەسەرکردن.

پێویستە ئەجێنداکە پێش بەستنی کۆنگرەکە دابەشبکرێت، بەسەر ئەندامەکانیدا، بۆ ئەوەی بواریان هەبێت خۆیانی بۆ ئامادەبکەن.

### ئەندامانی شاندەکان

لەکاتی دیاریکردنی ڕێساکانی بەستنی کۆنگرەدا ژمارەی ئەندامانی وەفدەکە دیاریدەکرێت، بۆ نموونە: هەر شاندێك لە پێنج کەس پێکبێت، یەکێکیان کە شارەزایی هەبێت، سەرۆکایەتی شاندەکە دەکات[٢].

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٣٦.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٥٦٦-٥٦٨.

### بەڵگەنامەی بەشاندکردن (أوراق الاعتماد)

بەڵگەنامەی بەشاندکردن ئەو دۆکیومێنتەیە، کە کەسایەتی نوێنـەرەکان دەســـەلمێنێت بـــۆ بەشـــداریکردنیان لـــە کۆنگرەکـــە، کـــە لەلایـــەن حوکومەتەکەیانـەوە دەبەخشـرێت و پێویسـتە لەگـەڵ ڕێسـاکانی بەسـتنی کۆنگرەکـەدا گونجـاو بێـت، لـە هەنـدێك بـاردا وا دەخوازێـت نوێنەرەکـە دەسـەڵاتی تـەواوی پـێ بسـپێرێت، بـۆ نموونـە: دەسـەڵاتی ئیمزاکردنـی پەیماننامەیەك[1].

### ئەندامی چاودێر

ڕێساکانی کۆنگرە باری ئەندامانی چاودێر دیاریدەکەن، ئەنـدامی چـاودێر مـافی دەنگـدانی نییـە، بـەڵام لـە کۆمەڵـەی گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان، بەشێوەی ڕیزپەڕ، بۆیان هەیـە بەشـداری لـە گفتوگۆکانـدا بکـەن، بـەڵام لـە ئەنجوومەنی ئاساییش پێویستە پابەندی ڕێسا کارپێکراوەکان بن.

### زمانی فەرمیی بەکارهاتوو

ئەو زمانانە کە دەق و بڕیارەکانی پێ بڵاودەکرێنەوەو ئەو زمانانـەی، کـە لە گفتوگۆکاندا بەکاردێن بە زمانی فەرمی دادەنرێن. بـەهۆی ئـەوەی کـە لـە کـۆنگرە نێودەوڵەتییەکانـدا زۆر جـار زمـانی جیـاوازی تێدایـە، ئەنـدامانی بەناچاری لەسەر بەکارهێنانی زمـانێکی دبلۆماسـی ڕێکدەکـەون کـە لەیـەکتر تێبگەن، بەڵام لەبەرئەوەی پرەنسـیپی یەکسـانی نێـوان دەوڵـەتان زمـانیش

---

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٢٣٦. و: : د. غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص٢٩١-٢٩٣.

دەگرێتەوە، واتە هەردەوڵەتێکی ئەندامی کۆنگرە دەتوانێت داوابکات، کە زمانی وڵاتەکەی بکرێت بە زمانی فەرمی و دبلۆماسی. پێشتر زمانی لاتینی و دوای ئەویش فەرەنسی، ماوەیەکی زۆر، وەکو زمانی دبلۆماسی بەکارهاتوون (زمانی فەرەنسی تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیی وەك تاکە زمانی دبلۆماسی بەکارهاتووە، دواتر زمانی ئینگلیزی جێگەی ئەوی گرتووەتەوە).

ئێستا وا نەریتە، کە هەردەوڵەتێك لە پەیوەندیی لەگەڵ وڵاتانی تر و نوێنەرەکانیاندا زمانی خۆی بەکاردەهێنێت و وەرگێڕاوەکەی بە زمانی ئەو وڵاتەی بۆی دەنێرێت، یاخود بە زمانێکی دبلۆماسیی –وەك فەرەنسی، یان ئینگلیزی– هاوپێچ دەکات. لە هەمان کاتدا وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتان و نێراوە دبلۆماسییەکانی دەوڵەتانی تر، کە لە وڵاتەکەی ئەودا کاردەکەن، دەتوانن لەنێوان خۆیاندا تەنها بە یەکێك لەو دوو زمانە نامەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەن، بەبێ ئەوەی پەنا بۆ زمانی نیشتمانی تایبەتی خۆیان ببەن.

نەتەوەیەکگرتووەکان شەش زمانی فەرمی بەکاردەهێنێت، بریتین لە: ئینگلیزی، فەرەنسی، چینی، رووسی، ئیسپانی و عەرەبی. هەرنوێنەرێکیش دەتوانێت بە زمانی نەتەوەیی خۆی قسەبکات، بە مەرجێك وەرگێڕانی راستەوخۆی بۆ یەکێك لەو زمانانە دابینکرابێت[١].

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٣٧.

## تۆمارکردنی پرۆتۆکۆلی

پێویسته هەر شتێك کە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت لە کۆنگرەدا، جا قبوولّبکرێت و بڕیاری لەسەر بدرێت، یاخود رەتبکرێتەوە، تۆماربکرێت و بەشداربووان لە راستێتییان دڵنیا بکرێنەوە، ئەو جۆرە تۆمارکردنانەش دابەشدەبن بۆ سێ بەش[(١)]:

- راپۆرتی کۆکەرەوە (التقرير المختزل) (نووسینەوە بە دەست، یان تۆمارکردن بە ئامێر). بەشداربووان بۆیان هەیە بە رێژەیەکی زۆر کەم دەستکاری بکەن لەپێناو باشترکردن و جوانکردنی ئەو دەرەنجام و بەڵگەنامەیەی پێشکەشی دەکەن، بە مەرجێك لە ناوەڕۆکی بابەتەکان نەگۆڕێت، ئەو گۆڕانکارییانەش کاتێك دەکرێن، کە بابەتەکە وەکو پڕۆژە دابەش دەکرێت.
- پوختە راپۆرت، کە بەگشتی سکرتاریەتی گشتیی کۆنگرەکە لەژێر چاودێریی بڕیاردەری تایبەتدا ئامادەی دەکات.
- دەقی بڕیار و رێککەوتننامەکان.

## رۆڵی سەرۆکی کۆنگرە

سەرۆکی کۆنگرە رۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانداو ئەرکەکانی بۆ دوو جۆر پۆلێن دەکرێت[(٢)]:

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٣٨-٢٣٩.

(٢) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٤٣-٢٤٤.

**١. ئەركە رێكارییەكان (المهمات الإجرائية):**

أ. كردنەوەو كۆتاییهێنان و راگەیاندنی كاتەكانی پشوو لە كۆنگرەدا.

ب. بانگهێشتی سەرۆكی دەوڵەتان بۆ سەر سەكۆ، یان بواردانیان بۆ پێشكەشكردنی وتەكانیان.

ج. دیاریكردنی كاتی وتەكان ئەگەر پێویستی كرد، یان ئەگەر رێساكان باسیان كردبوو.

د. داواكردن لە بەشداربوون بۆئەوەی خۆیان لە هەر جۆرە وشەو قسەیەك بپارێزن، كە لە جێی خۆیدا نەبێت، یان كێشەیەك دروستبكات.

ه. گرێنتیكردنی باش بەرێوەچوونی كۆنگرەكە، بەپێی رێسا و رێنماییەكان.

**٢. ئەركە بنچینەییەكان:**

أ. جێبەجێكردنی ئەو ئەركە تایبەتەنەی، كە ئامادەبووان بۆ سەرۆكی جێدەهێڵن بۆ ئەوەی سەیری بكات، بڕیاری لێبدات، بۆ نموونە: هەڵبژاردنی ئەو وڵات، یان ئەندامانەی كە بۆ لیژنەی نوێ دیاریدەكرێن.

ب. هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە باڵاكانی كۆنگرە، ئەمەش دەكرێت ئەم شێوازانە لەخۆ بگرێت:

- دیاریكردنی كات بۆ گفتوگۆی نافەرمی.
- یارمەتیدانی ئەو گفتوگۆ نافەرمییانەی، كە سەرۆك بەشدارییان تێدا ناكات.
- گفتوگۆكردن لەگەڵ كۆی سەرۆكی وڵاتانی ئەندام، پێكەوەو بە جیا لەگەڵ هەریەكێكیان، بە مەبەستی گەیشتن بە رێگەچارەی گونجاو و

دۆزینــەوەی دەرچــە بــۆ ڕێگــە داخراوەکــان، لــە ڕێگــەی هەوڵــدان بــۆ دۆزینەوەی ڕێسا و ڕێگەچارەیەك کە هەموو لایەك پێی ڕرازی بن.

سەرۆك هەوڵدەدات پێشنیارە پێشکەشکراوەکان بخاتە بـەر بـاس، دواتـر دەنگدانی ئاسایی، یان ئەلکترۆنییان لەسەر دەکرێت تا دەگەنـە ڕێککـەوتنی کۆتایی.

## ڕۆڵی سکرتاریەت

سکرتاریەتی گشتی هەڵدەسـتێت بـە پاڵپشـتیی بەڕێوەچـوونی کـۆنگرە، یارمەتیی سەرۆکی کۆنگرەو بەشداربووانی دەدات، کۆنگرەکە ئامادەدەکات، کۆتایشـی پێـدەهێنێت. سـکرتاریەتی گشـتی دوای زانـینی شـوێنی بەسـتنی کــۆنگرە هەڵدەســتێت بــە دابەشــکردنی داوەتنامــەکان و ئامادەکــاریی پرۆتۆکۆلەکان و پێشوازیکردن، هەروەها ئامادەکردنی هۆکاری گواسـتنەوەو پەیوەندیکردن لەگەڵ دەسەڵاتە خۆجێییەکان و ئامادەکردنی هۆڵی کۆنگرە، ئەمە وێڕای ئامادەو دابەشکردنی ئەجێندا، یان پڕۆژەی ئەجێندای کۆنگرە و بەڵگەنامە پێویستەکانی ترو ڕێساکانی بەڕێوەچوونی کۆنگرە(١).

جگـە لەمانـە، سـکرتاریەتی گشـتیی پرسـە کارگێڕییـەکانی تـری کـاتی کۆنگرەکەی لەئەستۆیە، وەك: دابینکردنی وەرگێڕ و ئامادەکردنی ڕاپـۆرت و مەراسـیمی دانیشـتنەکان. دوای تـەواوبوونی کـۆنگرەش دوو ئـەرکی گرنگـی هەیە، کە بریتین لە: بڵاوکردنەوەی ئەو ڕاپۆرتانەی کە بەشێوازی بەرایی و لە شـێوەی پـڕۆژەدا دەردەچـن (کـە ئەمـە بەگشـتی بـۆ ڕاپـۆرتی کۆکـەرەوە

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٤٥.

"التقريـر المختـزل" ئەنجامـدەدرێت)، بۆئـەوەی بەشـداربووان بتـوانن هەڵـە بچووکە ئیملایی و ڕێزمـانی و پۆلێنییـەکان ڕاسـتبکەنەوە، هـەروەها ئـەرکی بەدواداچوونی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە جۆربەجۆرانەیە کە کۆنگرە بڕیـاری لێیان داوە[(١)].

## کۆتاییهاتنی کارەکانی کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان:

وەکـو ڕێسـایەکی گشـتی، هـەر کۆنگرەیـەکی نێودەوڵـەتی، لـە حاڵـەتی سەرکەوتنیدا، کارەکانی بە چەند دەقێك کۆتایی پێـدەهێنێت، کـە دەکرێـت یەکێك یان زیاتر لەمانە لەخۆ بگرێت: پەیماننامە، ڕێککەوتننامـە، پێشـنیاز، پرۆتۆکۆل، ئاڵوگۆڕی یاداشت، جاڕنامە، بڕیار و بەیاننامەی کۆتایی..هتد[(٢)].

هەریەکێك لەمانەش ئاستێکی جیاوازی یاسایی هەیـە و پلـەی پابەنـدی و جۆری مامەڵەکردن لەگەڵیاندا جیـاوازە، بـۆ نموونـە: بەگشـتی پەیماننامـە و ڕێککەوتننامــەکان پابەندکــەرن، لــە کاتێکـدا کــە جاڕنامــە و یاداشــتەکان پابەندکـەر نـین، بەیاننامــەی کۆتـاییش پوختــەی ڕووداو و دەرەنجامــەکانی کۆنگرە لەخۆ دەگرێت.

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص ص٢٤٥.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.غازي حسن صباريني، م.س.ذ، ص ص٢٩٦-٣٠٤.

## باسی سێیەم: دبلۆماسیی ڕێکخراوە ناحوکومییە نێودەوڵەتییەکان

ڕێکخـــراوە نێودەوڵەتییــە ناحوکومییــەکان Nongovernmental organizations(NGOs) ئــەو کیــان و گــرووپ و بــزاڤ و کۆمەڵــە قازانجنەویستانەن، کە بەشێوەیەکی بەردەوام لەلایەن کۆمەڵە کەسێکی ئاسایی یان واتایی خۆبەخشەوە بەڕێوەدەبرێن، کە مەبەستگەلێکی هاوبەشیان هەیەو هاووڵاتیی چەند وڵاتێکی جیاوازن، بە مەبەستگەلێکی جۆراوجۆر، مرۆیی، یان ژینگەیی، یان ئایدیۆلۆجی، یان کۆمەڵایەتی، یان تەندروستی، یان وەرزشی، یان سیاسی کاردەکەن. چوونەپاڵیان ئازادانەیە و دەوڵەتان ناچنە ریزی پێکهاتەی یاسایی ئەم کۆمەڵانەوە. ملکەچن بۆ یاسای نیشتمانیی ئەو دەوڵەتەی بارەگای سەرەکییانی لێیە[(١)].

لەگەڵ پەرەسەندنی خێرای تەکنۆلۆجیا و هۆکارەکانی پەیوەندی و گەیاندن و فراوانبوونی بوارەکانی ژیان و خواستە هاوبەشەکانی مرۆڤ، ژمارەو جۆری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحوکومییەکانیش، لەپێناو بەدیهێنانی ئامانج و خواستە هاوبەشەکانی دەستەو تاك و گرووپەکان، زیادیان کردووە.

---

(١) بڕوانە: هيلاري بايندر، دليل المنظمات غير الحكومية، مكتب برامج الإعلام الخرجي، وزارة الخارجية الأمريكية، ٢٠١٢، على الرابط التالي: (تأريخ الزيارة: ٢٠١٧/٣/٢٧)
http://photos.state.gov/libraries/amgov/30145/publications-arabic/B_NGO_Handbook_Arabic.pdf

و: الموسوعة العربية، المنظمات الدولية غير الحكومية، على الرابط التالي: (تأريخ الزيارة: ٢٠١٧/٣/٢٧)
https://www.arab-ency.com/ar/البحوث/المنظمات-الدولية-غير-الحكومية

دیارترین تایبەتمەندییەکانی ڕێکخراوە ناحکومییەکان بریتییە لە[1]:

أ. زیادبوونی ژمارەیان بە شێوەیەکی بەرچاو. (تا ئایاری ٢٠٠٤ ڕێژەیان گەیشتووەتە ٢٥٣٥ ڕێکخراو).

ب. بڵاوبوونەوەیان بە شێوەی پلەبەپلە لە هەموو کیشوەر و دەوڵەتاندا، هەرچەندە ناوەندی سەرەکییان بریتییە لە (ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا) و (ئەورووپای ڕۆژئاوا).

ج. گشتیگریی چالاکییەکانیان، کە وایلێهاتووە هەموو بوارەکانی ژیانی گرتووەتەوە.

لە ئێستادا ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحوکومییەکان لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا ڕۆڵێکی دیار دەگێڕن، بەڵام ئاستی کاریگەرییان لەسەر سیاسەتی دەوڵەتان و ڕێکخراوە حوکومییەکان بەپێی بابەتەکان دەگۆڕێت، بۆ نموونە: کاریگەرییان لەسەر بابەتە ژینگەییەکان زیاترە لەو بابەتانەی پەیوەندیی راستەوخۆیان بە بەرژەوەندیی زیندووی دەوڵەتانەوە هەیە.

ئەم ڕێکخراوانە توانیویانە جێدەستی خۆیان دیاریبکەن و کاریگەرییان لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا هەبێت، بۆ نموونە: کۆنگرەی لووتکەی زەوی لە (ریو دی جانیرۆ)، کۆنگرەی دانیشتووان لە (قاهیرە)، کۆنگرەی ئافرەت لە (پەکین)، کۆنگرەی مافی مرۆڤ لە (ڤیەننا). لە دیارترین ئەو ڕێکخراوانە لە بواری ژینگەدا (ڕێکخراوی ئاشتیی سەوز)، لە بواری مافی مرۆڤدا (ڕێکخراوی

(١) بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٢٢٧.

لێبوردنی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ و ڕێکخراوەکانی خاچ، یان مانگی سووری نێودەوڵەتی)[1].

لە جیهانی ئەمڕۆدا زۆرێك لە کێشەو گرفت و دۆزەکان بە نێودەوڵەتی بوون، چارەسەرکردنیشیان پێویستی بە هەوڵی هەموو لایەك هەیە، کە زۆرجار دەوڵەتان سوود لە شارەزایی و توانای ڕێکخراوە ناحوکومییەکان وەردەگرن. لێرەدا ڕۆڵی دبلۆماسییەتی ڕێکخراوە ناحوکومییەکان دەردەکەوێت، کە دەتوانن فشاری دبلۆماسی بە میکانیزمی نوێ لەسەر دەوڵەتان، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دۆزە مەترسیدارەکان بۆ ئاسایشی مرۆڤ بەگشتی، دروست بکەن، وەك دۆزی پیسبوونی ژینگە، گەرمبوونی زەوی و قەتیسبوونی هەوا، بەبیابانبوون، زیادبوونی زۆری دانیشتووان، مافەکانی مرۆڤ، بەتایبەتی مافەکانی مێ و منداڵ و مافە سیاسی و مەدەنییەکان، تیرۆر و توندڕەوی، مادده هۆشبەرەکان.

ئەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحوکومییانە، لە ڕێگەی چالاکییە فراوان و فرەچەشنەکانییانەوە، و لە ڕێی ئەو ڕۆڵەی کە بە بەشدارییان لە کۆنگرەو کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکاندا دەیگێڕن، هەروەها لە ڕێگەی فشارە جۆراوجۆرەکانییانەوە، بە بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرت و هوشیارکردنەوەی رای گشتی و...هتد، توانیویانە جۆرێك لە جۆرەکانی دبلۆماسی نافەرمیی مومارەسەبکەن، بەشدار بن لە چارەسەرکردنی هەندێك لە کێشە و کەیسە نێودەوڵەتی و نیشتمانییەکان و تا ڕاددەیەك لە هێنانەدیی ئاشتی و ئارامی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا هاوکاربن. بەم کارەیان بوونەتە هاوشانێکی

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٢٨.

پاڵپشت بۆ دبلۆماسی فەرمیی، دوانەیی و فرەلایەنی. لە هەمان کاتدا حوکومەتی دەوڵەتانیان ناچارکردووە، کە مامەڵە لەگەڵ خۆیان و چالاکییەکانیان بکەن و بەهەند وەربیگرن و لە دارِشتنی سیاسەتی دەرەوەیاندا رەچاوی سانسۆر و کارو چالاکیی ئەو رێکخراوانە بکەن[1].

هەر لەم سۆنگەیەوە پێویستە کار و چالاکی و رۆڵ و پێگەی ئەم رێکخراوانە، کە لەرووی ئاسۆیی و ستوونییەوە لە گەشەکردندان، زیاتر بایەخی کردەیی و ئەکادیمییانەی پێبدرێت، تا بتوانن زیاتر لە دروستکردن و پاراستنی ئاشتی و ئارامیی نێودەوڵەتی و پاراستنی مافەکانی مرۆڤدا بەشداریبکەن.

---

(١) بەراورد بکە لەگەڵ: م.ن، ص٢٢٩.

## باسی چوارەم: دبلۆماسی و ڕەهەندی ئایینی

زۆرێك لە ململانێکانی جیهانی ئەمڕۆ سروشتێکی ئایینی و ئایینزایی، یان ڕەگەزی و نەتەوەیی هەیە، هەر لە سەرەتای کۆتاییهاتنی جەنگی ساردیشدا (سامۆیل هانتنگتن) تیۆری (پێکدادانی ژیارەکان)ی هێنا، کە تێیدا باسی لەوە کرد، کە ئیتر ئابووری، یان ئایدیۆلۆجیا نابنە سەرچاوەی ململانێ، بەڵکو ململانێ لەنێوان ژیارەکاندا سەرهەڵدەدەن، بۆیە ژیارەکانی کرد بە هەشت ژیارەوە و بڕوای وابوو، کە لەکۆتاییدا ململانێ لەنێوان ژیارەکاندا دەبێت، سەرکردەکانی ڕۆژئاواشی هاندا بۆ دابەشکردنی جیهان بۆ ڕۆژئاواو ئەوانی دی و بڕوای وابوو سەرکەوتنیش بۆ ژیاری ڕۆژئاوایی دەبێت!

هەندێك لە پسپۆڕان جەخت لەڕۆڵ و پێگە و کاریگەریی ڕەهەندی ئایینی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دەکەنەوە، هەروەها زۆریی ژمارەی ململانێکان دەگەڕێننەوە بۆ نەبوونی ڕەهەندی ئەخلاقی و ئایینی لە بەڕێوەبردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، بۆیە پێویستە هەوڵێکی زۆر بدرێت بۆ بەگەڕخستنی دبلۆماسییەتێکی نوێ، کە لە بەها ئەخلاقییەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەپێناو دوورکەوتنەوە لە کاولکاری و ململانێ و پێکدادان، ئەم جۆرە دبلۆماسییە ناوی لێنرا دبلۆماسیی هەزارە ( The Millennium Diplomacy)[١].

لە ئێستا ڕەگوڕیشەی بەشێکی زۆر لە ململانێ و جەنگ و ناکۆکییەکان هۆکارەکەی ئایینی و کولتوورییە، هەروەها بەشێکی زۆری ئەو تیرۆرەی، کە ئێستا وڵاتانی جیهان پێوەی دەناڵێنن لەپاڵ دەقە ئاینییەکاندا و پشتبەست

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٢٣.

به تێگەیشتنە هەڵـەکان بـۆ ئـایین سەرچـاوەی گرتـووە، بەشـەکەی تریشـی پەیوەندی و مومارەسەی دبلۆماسیی ناجۆر و ناتەندروست لە لایەك و سـتەم و نادادپـــەروەری و بێبەشــکردن و بێکــاری و نەخوێنــدەواری و...هتــدەوە سەرچـاوەی گرتـووە، کــە لەلایــەن سیســتمە دیکتاتۆرەکانــەوە بەرانبــەر گەلەکانیان پیادەدەکرێت، لەلایەکی ترەوە. بۆیە دەوڵـەتان پێویسـتیان بـە جۆرێك لە مامەڵە و دبلۆماسـییەتی نوێیـە بـۆ چارەسـەرکردن و بنـەبڕکردنی تــیرۆر، لــەڕووی فیکـری و ئایـدۆلۆجی و سیاســی و کولتوورییــەوە، پــێش چارەسەرکردنی بە ڕێگای ئەمنی و تۆقاندن و زەبروزەنگ.

کۆمەڵـەی گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان، بــە بڕیــاری ژمــارە (٢٢) لــە نیسانی ساڵی (١٩٩٨)دا، رایگەیاند، کە ساڵی (٢٠٠١) ساڵێك بێت بۆ دیالۆگ لـەنێوان ژیارەکانـدا، ئەمــەش وەڵامێکـی کۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتیی بـوو بـۆ ئەوانــەی بانگەشــەی ململانــێ و پێکــدادانی ژیارەکانیــان دەکــرد و تێــزی "کۆتاییهاتنی مێژوو"یان دەدا بە گوێی خەڵکیدا[١].

ئەو دبلۆماسییەتە نوێیە پشت بە چەند خاڵ و بنەمایەك دەبەستێت[٢]:

أ. بڵاوکردنــەوەی کولتــووری دانوســتانی ئەرێنییانــە لــەنێوان کولتــوورە جیاوازەکاندا، لەسەر بنەما زانستی و ئەخلاقییەکان، هەروەها کـارکردن بــۆ نەهێشــتنی هەوڵــەکانی ناشــرینکردنی ئــاینی پــیرۆزی ئیســلام، خســتنەڕووی هــەموو ئــەو تێــزە گرنگانــەی کــە ئــەو ئایینــە بــۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی مرۆڤایەتی پێیەتی بە کرانەوەو نوێبوونەوە.

---

(١) بڕوانە: م.ن، ص٢٢٤.

(٢) بڕوانە: م.ن، ص٢٢٤.

ب. دبلۆماسییەتێکە کە بانگەشەی بەها مرۆییەکان دەکات، بە مەبەستی ڕێنموویی‌کردنی رەفتاری مرۆڤ، هەروەها بانگهێشتی جیهانی ئیسلامیی بۆ دادپەروەری و دەسەڵاتی دادپەروەرانە دەکات.

ج. ئامانجی هێنانەدی دیالۆگێکی ڕاستەقینەو کاریگەرە لەنێوان هەموو ئایینەکاندا،سوودوەرگرتن لە رووبەری هاوبەشی نێوانیان بۆ قووڵکردنەوەی ئاشتیی دادگەرانە و دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرەکانی توندوتیژی و پەڕگیری.

د. ئەم دبلۆماسییەتە نوێیە رەوتی دووەمی خۆی دەکات بە بواری سەرەکیی کارەکەی، بۆیە پەیوەست نابێت بە کۆتوبەندەکانی رەوتی یەکەمی، کە ڕەوتی فەرمییە، بۆیە زیاتر نزیکترە لە دبلۆماسیی جەماوەرییەوە،پشت بە چاوپێکەوتنە نافەرمییەکان و میدیا و رۆژنامەکان و کۆنفرانسەکان و شێوازی نوێ دەبەستێت بۆ قووڵکردنەوەی رەهەندی ئەخلاقی لە بەڕێوەبردنی ململانێکاندا.

بەڵام ئەوەی تا ئێستا بەدیدەکرێت فەرامۆشکردنێکی دیاری رەهەندی ئەخلاقییە لە دبلۆماسییەتدا، ئەم حاڵەتەش لەدوای رووداوەکانی (١١/سسێپتەمبر/٢٠٠١)ـەوە زیاتر بەزەقی دەرکەوتووە.

# بەشی دەیەم
# ڕێساکانی پرۆتۆکۆل و ئەتەکێت و پێشبەندی و پێشوازیکردن

باسی یەکەم: ناساندنی چەمکەکان

باسی دووەم: پێشبەندی

باسی سێیەم: پرۆتۆکۆلەکانی یەکترناسین و سەردان و سڵاو و تەوقەکردن

باسی چوارەم: پێشوازیکردن لە کاتی داوەتی خواندا

## بەشی دەیەم:
## ڕێساکانی پرۆتۆکۆڵ و ئەتەکێت و پێشبەندی و پێشوازیکردن

➢ ئامانجەکانی ئەم بابەتە:

١. لە بواری دبلۆماسیدا، لەگەڵ ئەوەی گرنگی زۆر بە ناوەڕۆکی بابەتەکە دەدرێت، بە هەمان شێوە گرنگیی زۆر بە روخسارو شێوەی دەرەوە و هەڵسوکەوت و ڕێساکانی کۆبوونەوە و سەردان و دانیشتن دەدرێت. دەمانەوێت لەم بەشەدا تیشك بخەینە سەر چۆنێتیی هەڵسوکەوتی کردارەکی لە کۆڕ و کۆبوونەوەو کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا، سەبارەت بە شێوازی پێشبەندی و ریزبەندی و پێشوازیکردن.

٢. نەهێشتن و کەمکردنەوەی کێشە و گرفت لەسەر، بابەتە ڕۆتینییەکان و دڵنیایی و ئارامی و دڵسافیی هەموو لایەك و پابەند بوون بە ڕێسا گشتییەکانی پرۆتۆکۆل و ئەتەکێت لە بواری دبلۆماسیدا، کە ئەمەش یارمەتیدەری دبلۆماتە بۆ لەدەستنەچوونی مافەکانی خۆی و وڵاتەکەی لەکاتی بەستنی کۆنگرە و دانیشتن و کۆبونەوەو پێشوازی و سەردانەکاندا.

➢ ناوەڕۆکی بابەتەکە:

## باسی یەکەم: ناساندنی چەمکەکان

### یەکەم: چەمکی پرۆتۆکۆل و ئەتەکێت و موجامەلە و پەیوەندیی نێوانیان

لەگـــەڵ نزیکییـــان لـــە یـــەکتری، هەریـــەك لـــە وشـــەکانی "پرۆتۆکـــۆل" و "ئەتـــەکێت" و "موجامەلـــە"، لـــە یـــەکتری جیـــاوازن. بەســـادەیی دەتوانرێـــت بوترێت: "پرۆتۆکۆل" ئەو سنووورە دیاریکراوەیە کە دبلۆمات بەپێی رێسا دانـراو و باوەکان لە مامەڵە فەرمییەکاندا پێوەی پابەندە و چالاکی لـەو چوارچێوەیەدا ئەنجامدەدات، "ئەتەکێت"یش ئاکارو شـێوازی رەفتـارە لـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ کەسانی تردا، هەرچی "موجامەلە"شە رێسایەکی نووسراو نییـە بـۆ پابەنـدبوون پێوەی، بەڵکو هەستکردنی کەسێکە بەوەی، کە ئەو جۆرە مامەڵەیەی ئـەنجامی دەدات خۆشـــی دەخاتـــە دەروونـــی کەســـانی تـــرەوە[١]، هەرچـــەندە لـــەرووی یاسـاییەوە پابەنـدیش نییـە بـەو جـۆرە مامەڵەیـەوە، بـەڵام ئەنجامـدانی، یـان ئەنجامنـــەدانی، دەبێتـــەهۆی دروســـتبوونی مامەڵـــەی هاوشـــێوە لەلایـــەن بەرانبەرەکانییەوە.

**پرۆتۆکۆل:** جۆرە درەختێکە، کە یەکێك لە گەڵاکانی خراوەتە سەر یەکێك لە رێککەوتننامە گرنگەکان و شێوازی جێبەجێکردنی هەنـدێك لـە بڕگـەکانی ئەو رێککەوتننامەیەی لەسەر نووسراوەتەوە، دواتر بووە بە باو کە ئەو نـاوە بۆ ئاماژەکردن بۆ جۆرێك، یان پلەیەك لە پلەکانی ئەو بەڵگەنامانە بەکاربێت، کـە رێککـەوتنیان لەســەر دەکرێـت. بـۆ نموونـە: دەوترێـت پرۆتۆکـۆلێکی هاریکاریی لەنێوان وەزارەتەکانی گواستنەوەی فەڕەنسا و ئەڵمانیا واژۆ کرا.

---

(١) عبدالفتاح شبانة، الدبلوماسية، القواعد الأساسية – الممارسات العملية – المشكلات الفعلية، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص٩.

بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین پرۆتۆکۆل –لە یەکێك لە واتاکانیدا– جۆرێکە لە بەڵگەنامە، کە چوارچێوەیەکی یاسایی و ماددی دیاریکراوی هەیە، کە لە رێککەوتننامە و پەیماننامەکان جیای دەکاتەوە، کە لەرووی هێزی پابەندکردنەوە پلەیەکی باڵاتریان هەیە، یان لە یاداشتی لێکتێگەیشتنانە جیای دەکاتەوە، کە لەرووی هێزی پابەندکردنەوە پلەیەکی نزمتریان هەیە. هەرچەندە لە کوردی و عەرەبیدا لە بەرانبەریدا وشەی مەراسیم، یان (المراسم)، یان (التشريفات) بەکاردێت، بەڵام لەڕاستیدا مەراسیم –لە یەکێك لە واتاکانی تریدا– جۆرێکە لە جۆرەکانی زانستی کارگێڕی و گرنگیی بە رێکخستن و جێبەجێکردنی ئەو رێکارانە دەدات، کە رێککەوتنیان لەسەر کراوەو پەیوەندییان بە رووداو، یان بۆنە، یان دیدارێکەوە هەیە، ئەمە لەکاتێکدا کە بەڵگەیە لەسەر جۆرێك لە رێککەوتن، یان دۆکیۆمێنت[1].

کەواتە بەگشتی دەتوانرێت بوترێت: مەراسیم بریتییە لە هەموو ئەو رێکار و نەریت و رێسایانەی کە لە مامەڵە و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا باون و لەسەر بنەمای رێسا نێودەوڵەتی و گشتییەکان، یاخود لەسەر بنەمای نەریتی نێودەوڵەتی بونیادنراون[2]. پرۆتۆکۆلی دبلۆماسییش هەموو ئەو یاسا و نەریتانەیە، کە لەلایەن حوکومەتی وڵاتان و وەزارەتی دەرەکی و نێراوە دبلۆماسیی و کەسایەتییە فەرمییەکانەوە، لە کۆمەڵگەی نێوەوڵەتیدا، ڕەچاودەکرێن، یان ئەو سنوورەیە کە تێیدا دبلۆمات بەپێی رێسا دانراو و باوەکان لە مامەڵە فەرمییەکانیدا، کاردەکات. روونتر بڵێین: پرۆتۆکۆلی

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٣٠٣-٣٠٤.

(٢) عبدالفتاح شبانة، م.س.ذ، ص٢٣.

دبلۆماسیی ئاکار و رەفتاری فەرمیی نێوان پیاوانی دەوڵەت و ئەندامانی سلکی دبلۆماسییە[١].

کەواتە پرۆتۆکۆل بە واتا یاساییەکەی بریتییە لە کۆی رێسا و نەریتە رەچاوکراوەکان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتی و دبلۆماسییەکاندا بۆ رێکخستنی بۆنە فەرمییەکانی وەك: پێشوازی و کۆبوونەوە و ئاهەنگ و خوانەکان. لە هەمان کاتدا، ئەگەر بە واتا فراوانەکەی سەیری پرۆتۆکۆل بکەین، دەتوانرێت بوترێت بریتییە لە دبلۆماسی بە واتا بەرتەسکەکەی، واتا لێزانی و وریایی و کارامەیی لە مامەڵەکردندا[٢].

**<u>ئەتەکێت:</u>** بنەڕەتی وشەکە فەڕەنسی – لاتینییە، بە واتای ئەو لەزگەیە دێت، کە لە بەرهەمێك دەدرێت، بۆ روونکردنەوەی بڕ و پێکهاتەو مێژووی بەرهەمهێنانەکەی و زانیارییە پێویستەکانی تر، کە بەکاربەر پێویستییەتی، کە لە (فەرەنسا) بەکاردەهات. دواتر ئەو وشەیە بۆ دەلالەتکردن لەو کارتانە بەکاردەهات، کە لە کۆشکی پادشادا بەسەر ئەو کەسانەدا دابەشدەکرا، کە چاوپێکەونیان لەگەڵ پادشاو میر و وەزیرەکان و گەورەبەرپرساندا هەبووایە، ئەو زانیارییانەی تێدادەنووسرا، کە بۆ شێوازی مامەڵەکردن لەلای ئەو بەرپرسانە، پێویست بوون، هەر لە جۆر و دیزاین و رەنگی جلوبەرگەوە تا چۆنێتیی چوونەژوورەوەو سڵاوکردن و ماڵاواییکردن و...هتد. دواتر ئەم وشەیە ئەو سنووری بەکارهێنانەی تێپەڕاند و وایلێهات، کە وابەستەبکرێت بە

---

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٦٠٩-٦١٠.

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: المعهد التطويري لتنمية الموارد البشرية، الأتكيت، السلسلة التطويرية رقم (١١)، بلا مكان الطبع، ٢٠١١، ص ص٩-١١.

"ڕەوشتەکانی ڕەفتارکردن"ەوە، و دواتریش وشـەی ئەتـەکێت بەگشـتی بـۆ ڕەفتاری شیاو و جوان بەکارهێنرا، بۆیە دەتوانرێت بوترێت: ئەتەکێت کـۆی ڕەفتار و ڕەوشت و مامەڵە نموونەییەیە، کە کەسێك، یان کۆمەڵەکەسـێك لـە کـاتێکی دیـاریکراودا، یـان هەڵوێسـتێکی دیـاریکراودا دەینـوێنن. وشـەی نموونەییش بەپێی نەتەوە وئایین و کولتووره جیاوازەکان دەگۆڕێت[١].

**پەیوەندیی پرۆتۆکۆڵ و ئەتـەکێت:** بەسـادەیی پەیوەنـدیی نێـوان گشـت و تایبەت، یان گشت و بەشـە، بـۆ نموونـە: کاتێـك لـەڕووی پرۆتۆکۆلییـەوە جـۆرە قافڵەیەکی تایبەتی ئوتومبێل بۆ شاندێکی میـوان دیاریـدەکرێت، کـە هاتوچـۆی پێبکات بـەپێی بەرنامەیـەکی پێشـوەختە دیـاریکراو، ئـەوا شـێوازی ڕێکخسـتنی ئوتومبێلـەکان لـە قافڵەکـەدا و شـێواز و شـوێنی دانیشـتنی میوانـەکان، ئـەو وردەکارییانەن، کە دەچنە نێـو بازنـەی ئەتەکێتـەوە. هـەروەها پێشکەشـکردنی چـا، یـان قـاوە، یـان سـاردەمەنی، لـە کـاتی گەیشـتنی میـوان دەچـنە ئـەو چوارچێوەیەوە[٢].

بەگشتی پێویسـتە دبلۆمـات و نێـراوی دبلۆماسـیی و وڵاتـانیش لـە کـاتی مامەڵـەکردنیان لەگـەڵ یـەکتری، ڕەچـاوی ئـەو پرۆترۆکۆلانـە بکـەن، کـە لەسەریان ڕێککـەوتوون. لـە هـەمان کاتـدا، پێویسـتە لـەکاتی مامەڵەکردنـدا ئەتـەکێتی گونجـاو لەگـەڵ یـەکتری بـەکاربهێنن، چـونکە دبلۆمـات تـەنها نمایندەی خۆی ناکات، بەڵکو نوێنەری هەموو وڵاتەکەیەتی.

---

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٣٠٤.

(٢) م.ن، ص٣٠٤.

**موجامەلـە**: پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان، لـە روویەکییـەوە، وەکـو پەیوەندیی تاکەکان وایە، کە لـە زۆر لایەنـەوە لـە کارلێکـە ئاشـتییانەکانیدا پشـت بـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان دەبەسـتێت، لەبەرئـەوەی کـاری دبلۆماسـیش بڕبـڕەی پشـتی پەیوەنـدیی نێـوان دەوڵەتانـە، جۆرێـك لـە پەیوەنـدیی کۆمەڵایـەتیی تێکـەڵ دەبێـت کـە وەردەگێڕێـت بـۆ موجامەلـە، موجامەلـەش لـە ناوەڕۆکـدا بریتییـە لـە هونـەری ڕازیکـردن و دڵڕاگـرتن و ئاسانگەیشـتن بـە بـەڵێ بەرامبـەر. ئەمـەش پێویسـتی بـە رەچـاوکردنی روخسـارگەرییەکی دیـاریکراو هەیـە لـە سـەردان و دانوسـتان و خـوان و چـاوپێکەوتن و نامەگۆڕینەوەکانـدا ڕەچـاوبکرێت، کـە بـاش بـەکارهێنانیان دەرەنجامی پۆزەتیڤی دەبێت. ئەویش بـە ڕێـزی ئـاڵوگۆڕکراو و ئاسـانکاریی شێوازی مامەڵەی نێوان دەوڵەتان دێتە دی[١].

موجامەلە جۆری زۆرە: موجامەلەی نێوان دەوڵەتان، لەوانـە: پیرۆزبـایی، سەرەخۆشی، ئـاڵوگۆڕی دیـاری و خـەڵاتی ڕێزلێنـان، سـەردانی شـوێنەوارە مێــژوویی و شــوێنە نیشــتمانییە گــرنگ و بەبایەخــەکان، هاریکــاری و پێشکەشکردنی کۆمەك، داوای لێبوردنکردن و پۆزش هێنانەوە)، ئەمە وێڕای بەشــداریکردن لــە بۆنــەکان و ماتــەمگێڕان، بانهێشــتکردن بــۆ خوانــە فەرمییەکان[٢].

**دووەم: پێشبەندی و پێشوازیکردن**

---

(١) إسماعيل ذياب خليل العزاوي، الأسبقية والمجاملات الدبلوماسية في العلاقات الدولية، مجلة العلوم القانونية والسياسية، جامعة ديالى، المجلد الثالث، العدد الثاني، ٢٠١٤، ص٣١٩.

(٢) م.ن، ص ص٣٢٠-٣٢٥.

پرەنسیپی یەکسانیی لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتیدا ئەوە دەخوازێت، کە دەوڵەتان بەبێ سەیرکردنی گەورەیی و بچووکییان لە ئەرك و مافەکاندا یەکسان بن، دەستگرتنی هەریەکێکیشیان بە سەروەریی خۆیەوە رێگر دەبێت لەوەی کە لە مەراسیم و بۆنەو دانیشتنەکاندا نوێنەری یەکێکیان پێش ئەوی تریان بکەوێت. لەبەرئەوەی بەردەوام رێژەیەکی زۆر کۆنگرە و کۆنفرانس و کۆبوونەوە لەنێوان سەرۆکی دەوڵەتان، یان وەزیرانی دەرەکی، یان نوێنەرانیان دەبەسترێت، پێویستە رێساگەلێکی دیاریکراو هەبێت بۆ رێکخستنی دانیشتن و قسەکردن و پێشخستن (التقديم)، بۆ رێگریکردن لە هەرناکۆکییەك کە لەو بارەیەوە لەنێوان دەوڵەتاندا دروستبێت[(١)].

پێشبەندی و پێشوازیکردن دەچنە بازنەی ئەتەکێت، یان پرۆتۆکۆڵەوە. سیستمی پێشبەندی و پێشکەوتن لە رێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی نییە، بەڵکو بە رێساکانی موجامەلەی نێودەوڵەتی و ئەخلاقی نێودەوڵەتی هەژماردەکرێت. بۆیە پێشێلکردنی دەوڵەت تووشی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی ناکات، ئەوەندە نەبێت بەرپرسیارێتییەکی ئەخلاقی دەخاتەئەستۆ، جاری واش هەیە پێشێکردنی ئەو رێسایانە سەردەکێشێت بۆ تێکچوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، یان جەنگ، یان پچڕانی پەیوەندیی نێوان دوو دەوڵەت، یاخود لانیکەم جێبەجێکردنی بنەمای مامەڵە بە هاوشێوە[(٢)].

---

**(١) د. سهيل حسين الفتلاوي، الدبلوماسية...، م.س.ذ، ص ص٢٤٣.**

**(٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٣. و: فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٦١٧-٦٢٠.**

## باسی دووەم: پێشبەندی (الأسبقية)

مەبەست لە پێشبەندی: پێشخستنی لایەنێکە بەسەر یەکێکی تردا بەپێی سیستمێکی دیاریکراو، بەبێ ئەوەی فەزڵدانی لایەکی بەسەر لایەکی تردا لێبکەوێتەوە. کەواتە سیستمی پێشبەندی ئەوە ناگەیەنێت کاتێك دەوڵەتێك پێش دەوڵەتێکی تر کەوت ئیتر ئەو دەوڵەتە لەوانی تر باشتربێت، بەڵکو مەبەست لێی نەهێشتنی ئەو فەزڵدانەیە لەنێوان دەوڵەتاندان ئەویش بە پەنابردنە بەر سیستمێکی ڕیزبەندی کە پشت بە ڕێساگەلێکی ماددی واقیعی ببەستێت، کە هیچ لایەك تووڕە نەکات.

نموونەی ئەو کێشانەی کە بەهۆی پێشبەندییەوە دروستبوون لە مێژوودا زۆرن، کە هەندێکجار کێشەکان سەیر و سەمەرە و پێکەنیناوی بوون. لێرەدا با چەند کێشە و ناکۆکییەك لەو بارەیەوە، بۆ وێنە، باسبکەین[(١)]:

- لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا لە لاهای ماشێنی باڵوێزانی (ئیسپانیا) و (فەرەنسا) لە کۆڵانێکی تەسکدا بە یەك گەیشتن، هەریەکێکیان بەتوندی نکوڵییان کرد، کە بوار بەوەی تریان بدات ماشێنەکەی تێپەڕێت، چونکە ئەوە بە جۆرێك لە سازش و لێدانی شکۆی پادشاکانیان هەژماردەکرا! ناچار دوای چەلەحانێ و شەڕەقسەیەکی زۆر و توند، بڕیاریان دا دیواری لایەکی ڕێگاکە بڕوخێنن! بۆئەوەی هەردووکیان بتوانن، بەبێ سازشکردن بۆ یەکتری، بە ڕێگاکەدا تێپەڕن!
- لەکاتی گەیشتنی باڵوێزی فەرەنسی بۆ ئاهەنگێکی پێشوازیی شاییستە، کە کۆشکی پادشایی لە لەندەن لە ساڵی (١٧٦٨) سازی کردبوو، کاتێك

---

(١) بڕوانە: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص٩٦.

بـینی بـاڵوێزی رووسـی لـە دانیشـتنی شـوێنی شـکۆ و رێـزدا پـێش ئـەو کەوتووە، لە لای دەستەراسـتی بـاڵوێزی نەمسـا، نوێنـەری ئیمپڕاتـۆری رۆمانیی پیرۆز، زۆر تووڕەبوو و ئەوەی بـە سـووکایەتی بـە ئیمپڕاتـۆری مـەزنی فەرەنسـا لەقەڵـەم دا، کـە خـۆی لـە ئیمپڕاتـۆری رووسـیا بـە پلەبەرزتر دەزانی، بۆیە بە شوێنی دانیشتنی پشت هەردوو باڵوێزەکـەدا هەڵگـەڕا و خـۆی بـە هـەوادا هەڵـدا و کەوتـە نێـوان هـەردوو بـاڵوێزی (رووسیا) و (نەمسا)وە ! ئەم کارە باڵوێزی رووسیای زۆر تووڕەکرد و بە جنێـوی پـیس و بریندارکـەر جنێوبـارانی کـرد، بۆیـە وەکـو دوو کەسـی ناودار بۆ شاردنەوەی ئەو عەیبەیە، تـەنیا ئـەوەیان لەبەردەمـدا مایـەوە کە پاڵەوانبازی بکەن !

بۆ کەمکردنەوە، یـان بنبڕکردنـی ئـەو حاڵەتانـە و رێکخسـتن و داڕشـتنی رێسـاکانی پێشـبەندیی، کـۆنگرەی ڤیننـای سـاڵی (١٨١٥) رێسـاکانی پێشـبەندیی نێـوان سـەرۆکی نێراوەکـانی رێکخسـت، دواتـر رێککەوتنامـەی ڤیەننای ساڵی (١٩٦١)یش جەختی لێکردنەوە[١].

(١) بڕوانە: ماددەکانی (١٤-١٨)ی (رێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١).

**مامەڵەی نێودەوڵەتی سیستمێکی بۆ پێشبەندی داناوە بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**یەکەم: پێشبەندی لەنێوان دەوڵەتاندا**

لە کاتی دانیشتن لە کۆنگرەو کۆبوونەوەکان و قسەکردن تێیاندا، هەروەها لە کاتی واژۆکردنی پەیماننامە فرەلایەنەکاندا پێشبەندیی لەنێوان دەوڵەتاندا بەپێی پیتە ئەبجەدییە لاتینییەکان، یان عەرەبییەکان، بەپێی زمانی دەوڵەتە بەشداربووەکان، دیاریدەکرێت.

**لە حاڵەتی بەستنی کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا ئەم رێسایانە لە پێشبەندیدا رەچاودەکرێن[1]:**

١. ئەگەر کۆنگرەکە جیهانیی بوو پێویستە دانیشتنەکە بەپێی پیتە ئەبجەدییە لاتینییەکان بێت، بەڵام ئەگەر کۆنگرەکە هەرێمی بوو، ئەوا رەچاوی پیتە ئەبجەدییەکانی ئەو زمانە دەکرێت، کە ئەندامانی کۆنگرەکە قسەی پێدەکەن.

٢. ئەگەر لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا دوو دەوڵەتی ناکۆك هەبوو و رێزبەندیی پیتە ئەبجەدییەکانیش وا بکات، کە شوێنی دانیشتنیان لە یەکەوە نزیك بێت، ئەوا شوێنی یەکێکیان دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر.

٣. پێویستە وەفدی دەوڵەتی میواندار، یان ئەو دەوڵەتەی، کە خاوەنی بیرۆکەی بەستنی کۆنگرەکەیە سەرۆکایەتیی کۆنگرەکە بکات، ئەگەر وەفدی

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٥٠-٥١. و د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٤-٢٤٥. و عبدالفتاح شبانة، م.س.ذ، ص٧٨.

دەوڵەتی میوانداریش بەشدار نەبوو لە کۆنگرەکەدا، ئەوا ئەو دەوڵەتەی، کە بەپێی ڕیزبەندیی پیتە ئەبجەدییەکان، یان ڕێسا پێڕەوکراوەکان، لەدوای ئەوەوە دێت، سەرۆکایەتیی کۆنگرەکە دەکات.

٤. وتەی کردنەوەی کۆنگرە لەلایەن وەفدی دەوڵەتی میواندارەوە پێشکەشدەکرێت، ئەگەر لە کۆنگرەکەشدا بەشدار نەبوو، ئەوا ئەو دەوڵەتە پێشکەشی دەکات، کە بەپێی ڕێسا پێڕەوکراوەکان سەرۆکایەتیی کۆنگرەکە دەکات.

٥. پێشکەشکردنی وتەکان لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکاندا بەپێی ڕیزبەندیی پیتە ئەبجەدییەکان دەبێت، ئەگەر لەسەر شتێکی تر ڕێک نەکەوتبن. بەڵام سەبارەت بە گفتوگۆ، یان هاتنەناوەوە و بەشداری و سەرنجەکانی دوایی، ئەوا پێشبەندیی بۆ ئەوەیە، کە داوای قسەکردن بکات.

### دووەم: پێشبەندی لەنێوان سەرۆکی دەوڵەتاندا

ئەگەر چاوپێکەوتنەکە تەنیا لەنێوان سەرۆکی دوو دەوڵەتدا بوو، ئەوا سەرۆکی دەوڵەتی میواندار پێشبەندیی بۆ هەیە لە بەخێرهێنانی میوانەکەیدا، پاشان لە هەموو شتەکانی تردا پێشبەندیی دەبەخشێت بە میوانەکەی.

لە حاڵەتی چاوپێکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتان بەخێرهێنان، وتەی کردنەوە بۆ سەرۆکی دەوڵەتی میواندار دەبێت. دواتر یەکێك لە ڕێگەکان پێڕەو دەکرێت بۆ ڕێکخستنی پێشبەندی بە بڕیاری سەرۆکی دەوڵەتی میواندار، یاخود بە ڕێککەوتن دەبێت لەنێوان دەوڵەتەکاندا، لەمەشدا هیچ حسابێك بۆ سیفەتی سەرۆکی دەوڵەتەکان ناکرێت، وەك ئەوەی ئیمپڕاتۆر،

یان پاشا، یان سەرۆککۆمار، یان میرو سوڵتان بێت، بەڵکو سەرۆکی هەموو دەوڵەتەکان هەمان پلە و ئاستیان هەیە، جا هەر ناو و نازناو و هەر جۆرە سیستمێکیان هەبێت.

**أ. پێشبەندی لەنێوان سەرۆکی دەوڵەتاندا بەپێی یەکێك لەم ڕێسایانە دەبێت[١]:**

١. ڕێکخستنی پێشبەندی بەپێی ڕیزبەندیی ناوی دەوڵەتان بەو زمانەی، کە سەرۆکی دەوڵەتان قسەی پێدەکەن، خۆ ئەگەر زمانیشیان جیاواز بوو ئەوا بە زمانی لاتینی ڕێك دەخرێت.

٢. ئەوەی کە بەپێی ڕێککەوتن هەر سەرۆك دەوڵەتێك لە یەکێك لە بۆنەکاندا پێش ئەوانی تر بکەوێت.

٣. ڕێکخستنی پێشبەندیی بەپێی تەمەن، واتە گەورەترینیان لە تەمەندا پێشدەکەوێت، دواتر ئەوی دوای ئەو دێت و بەو شێوەیە.

٤. ڕێککەوتن لەسەر نەبوونی پێشبەندی، و ئەوەی کە هەموویان هەمان پلەیان هەبێت.

٥. ڕێکەوتی گرتنەدەستی فەرمانڕەوایی هەریەکێکیان، واتە کۆنترینیان لە وەرگرتنی دەسەڵات لە دەوڵەتەکەیدا پێشبەندی بۆ هەیە، دواتر بۆ ئەو کەسەیە، کە دوای ئەو دێت و بەو شێوەیە.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٥١-٥٢. و د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٥-٢٤٦. و عبدالفتاح شبانة، م.س.ذ، ص٧٩. و: د. فؤاد شباط، م.س.ذ، ص١٨١. و: د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٦٣١-٦٣٢. و: إسماعيل ذياب خليل العزاوي، م.س.ذ، ص ص٣١٠-٣١١.

**سێیەم: پێشبەندی لەنێوان نێراوە دبلۆماسییەکاندا**

✓ **پێشبەندی لەنێوان نێراوە دبلۆماسییەکاندا بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت**[(١)]:

١. پێشبەندییەکەیان بەپێی ڕێکەوتی پێشکەشکردنی بەڵگەنامە و بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەیان دەبێت بەو دەوڵەتەی،کە کاری تێدادەکەن، خۆ ئەگەر ئەو بەڵگەنامەیە بەهۆی نەخۆشی، یان وەفات، یان گۆڕانی سەرۆکی ئەو دەوڵەتەوە پێشکەش نەکرا بێت، ئەوا ئەو ڕۆژەی وادەی پێشکەشکردنی ئەو بەڵگەنامانە بووە، بە ڕێککەوتی پێکەشکردنیان دادەنرێت، پێشبەندییەکەشی هەر لەو ڕێکەوتەوە بۆ هەژماردەکرێت.

٢. ڕاگری سلکی دبلۆماسیی کۆنترین باڵوێزە لە وڵاتی میوانداردا (واتە زۆرترین ماوە لە پایتەختی وڵاتی پێشوازیکەردا ماوەتەوە)، بەرزترین پلەی باڵوێزی هەیە، دوای تەواوبوونی کارەکەی ئەو کەسەی دوای ئەو دێت دەبێتە ڕاگر، بەڵام لە هەندێك لە وڵاتە کاتۆلیکییەکانی وەك: (ئیسپانیا، فلیپین، نەمسا)، نوێنەری پاپا بە ڕاگری فەخریی سلکی دبلۆماسیی دادەنرێت، بەبێ ڕەچاوکردنی ماوەی خزمەت و مانەوەکەی. دەسەڵاتەکانی ڕاگر دیاریکراون و زۆربەی مەراسیمین، ئەو لە بۆنە گشتییەکاندا، دەبێتە زمانحاڵی هاوپیشەکانی و پێویستە پارێزگاری لە جیاواك و پارێزبەندییەکانی دبلۆماتکاران بکات، وڵاتی خانەخوێش بە شێوەیەکی نافەرمی ئەو لە

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ٥٢-٥٤. و د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٦-٢٤٧. و عبدالفتاح شبانة، م.س.ذ، ص ص٧٩-٨٠. و: د. عدنان البكري، م.س.ذ، ص ص٩٧-١٠٠. ماددەکانی (١٤-١٨)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١)، بەگشتی باس لەو ڕێسایانە دەکەن.

ڕێنمایی و سیستمی نێوخۆیی خۆی ئاگاداردەکاتەوە، لەو بابەتانەی کە پەیوەندیی بە کاری دبلۆماتکارانەوە هەیە، بۆئەوەی ئەویش هاوپیشەکانی لێ ئاگاداربکاتەوە، هەرکاتێکیش نووسینێك، یان وتارێك پێشکەش بکات، پێویستە پرس بە هاوپیشەکانی بکات و ئەوانیش ڕەزامەندی لە وڵاتی خۆیان وەربگرن. خۆ ئەگەر پەیوەندیی وڵاتێك لەگەڵ وڵاتی ڕاگر باش نەبوو، ئەوا دەتوانێت تەنها بۆ کارە پێویستەکان پەیوەندیی بە ڕاگرەوە بکات. هاوسەری ڕاگریش بە "خانمە ڕاگر/ العميدة" ناودەبرێت و کارەکەشی تەنها پێشکەشکردنی خانمەکانی سلکی دبلۆماسییە بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی و پێشکەشکردنی ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویست بۆ ئەو خانمانەی، کە تازە لەگەڵ هاوسەرەکانیان هاتوونەتە نێو سکلی دبلۆماسییەوە[١].

٣. باڵوێزەکان پێش نێراوی سەرووئاسایی دەکەون، پاشان وەزیرە ڕاسپێراوەکان و دوای ئەوانیش ئەوانەی، کە لە بنەڕەتدا هەڵسووڕێنەری کاروبارەکانن (القائم بالأعمال الأصليون)، ئنجا ئەوانەی، کە بریکاری هەڵسووڕێنەری کاروبارەکانن (القائم بالأعمال بالإنابة)، هەڵسووڕێنەری کاروباری باڵوێزخانەش پێش هەڵسووڕێنەری کاروباری کۆمسیۆن دێت، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێککەوتی پەیوەندیکردنیان بە کارە دبلۆماسییەکەیانەوە.

---

(١) بڕوانە: ياسين ميسر عزيز العباسي، م.س.ذ، ص٩٨. ود. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٥٣.

٤. له هەموو بارەکاندا پێشبەندیی بریکاری هەڵسوڕێنەری کاروبارەکان (القائم بالأعمال بالإنابة)ی باڵوێزخانە، یان کۆمسیۆن، بەپێی ڕێککەوتی یاداشتی ئاگادارکردنەوەی دەستبەکاربوونییەتی بەو سیفەتە[(١)].

٥. لە هەموو حاڵەتەکاندا پێشبەندیی هاوسەری سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکان بەپێی پلەی مێردەکانیان دەبێت، واتە هەمان پێشبەندییان بۆ هەیەو لە ئاهەنگە گشتی و تایبەتەکاندا لەتەنیشت مێردەکانیانەوە دادەنیشن، بەڵام مێردی ژنە دبلۆماتکارەکان هەمان پێشبەندیی ژنەکانیان وەرناگرن، بەڵام لە ئاهەنگە تایبەتەکاندا مێردی ژنەدبلۆمات لەو شوێنەدا دادەنیشێت، کە لەدوای شوێنی یاریدەدەری یەکەمی ژنەکەیەوە دێت، بەڵام ئەم حاڵەتەش دوو ڕیزپەڕی هەیە[(٢)]:

- ئەگەر ئاهەنگەکە وەکو ڕێزلێنانێك بۆ ژنە دبلۆماتکارەکە ڕێکخرابێت.
- ئەگەر مێردەکەی پۆستێکی باڵا، یان نازناوێکی زانستیی بەرزی هەبێت.

٦. لەکاتێکدا دەوڵەتی میواندار هەستێت بە ڕێکخستنی ئاهەنگی فەرمی، ئەوا پێشبەندی لەنێوان ئەندامە بیانییەکانی سلکی دبلۆماسیی و بەرپرسانی دەوڵەت بەپێی ئەو پرۆتۆکۆلە دەبێت، کە ئەو دەوڵەتە پێڕەویی دەکات. هەندێك دەوڵەت باڵوێزە بیانییەکان دەخەنە پێش وەزیرەکانەوە، هەندێکی تریان بە پێچەوانەوە.

---

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٥٣.

(٢) م.ن، ص ص٥٣-٥٤.

٧. لەو خوانانەدا کە باڵوێزخانە بیانییەکان ڕێکی دەخەن، وەزیرەکانی ئەو دەوڵەتەی باڵوێزخانەکەی لێیە پێش هەموو باڵوێزە بیانییەکان دەخرێن، بەو پێیەی نوێنەری دەوڵەتی میواندارن.

٨. نێراوە دبلۆماسییەکان لە نێراوە تایبەتەکاندا هەمان ئەو پێشبەندییەیان هەیە، کە نێراوە دبلۆماسییەکانی نێراوە هەمیشەییەکان هەیانە.

٩. پێشبەندیی بریکاری هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان (القائم بالأعمال بالإنابة)، بەپێی مێژووی دەستبەکاربوونیان بەو سیفەتەوە، دیاریدەکرێت.

١٠. نێراوی دبلۆماسیی، لەو بۆنانەی کە باڵوێزخانەکە ڕێکیاندەخات، میوان پێشدەخات بەسەر ئەو دبلۆماتکارانەی، کە هەمان پلەی ئەویان هەیە.

**چوارەم: پێشبەندی لەنێوان نێراوە تایبەتەکاندا**

پێشبەندی لەنێوان نێراوە تایبەتەکاندا، بەپێی ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان، بەم شێوازە دەبێت[1]:

١. ئەگەر دوو نێراو تایبەت، یان زیاتر، لە وڵاتێکی بیانی بوون، ئەوا پێشبەندی لەسەر بنەمای پیتە ئەبجەدییەکانی ناوی وڵاتەکانیان دەبێت، ئەگەر ڕێککەوتنێکی تایبەت نەبوو لەسەری، وەك ئەوەی کە لە ڕێسا پرۆتۆکۆلییە کارپێکراوەکانی دەوڵەتی پێشوازیکەردا هاتووە.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١٦/ ١، ٢، ٣)ی (ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان)ی ساڵی (١٩٦٩).

٢. ئەگەر دوو نێراوی تایبەت، یان زیاتر، بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگێك، یان بۆنەیەکی فەرمی، لەولاتێکی بیانی بوون، ئەوا ڕێسا پرۆتۆکۆلییە کارپێکراوەکانی دەولەتی پێشوازیکەر پێشبەندیی دیاریدەکات.

٣. پێشبەندیی لەنێوان ئەندامانی هەر نێراوێکی تایبەتدا، بەو ڕیزبەندییە دەبێت، کە لە دەولەتی خانەخوێ یان دەولەتی سێیەم بۆ ئەو حاڵەتانە ڕاگەیەنراوە، کە دوو نێراوی تایبەت یان زیاتر لەسەر خاکەکەیان کۆ دەبنەوە.

## پێنجەم: پێشبەندی لەنێوان کونسوڵەکاندا[1]

ڕاگری سلکی کونسولی کۆنترین کونسولی گشتییە، کە مۆلەتی دەستبەکاربوونی کونسولخانەی (براءة تنفيذ قنصلية) وەرگرتووە، یان دەستی بە مومارەسەکردنی کارەکەی کردووە.

١. پێشبەندیی سەرۆکی نێراوە کونسولییەکان، لە هەر جۆرێکیان بەپێی مێژووی پێدانی مۆڵەتی کونسولی دیاریی دەکرێت.

٢. ئەگەر سەرۆکی نێراوێکی کونسولی، پێش بەدەستهێنانی مۆلەتی کونسولی، بەشێوەیەکی کاتیی ڕێگەی مومارەسەکردنی کارکردنی پێدرا، ئەوا مێژووی ئەو قبوولکردنە کاتییە ڕیزبەندیی پێشبەندییەکەی بۆ دیاری دەکات، پاش وەرگرتنی مۆلەتی کونسولیش پارێزگاری لەو ڕیزبەندییە دەکات.

---

(١) بڕوانە: ماددەی (١٦/ ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦)ی (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسولییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣).

٣. ئەگەر دوو سەرکونسوڵ رێککەوتی وەرگرتنی مۆڵەتی کونسوڵی، یان قبووڵکردنەکاتییەکەیان لە یەك مێژوودا بوو، ئەوا مێژووی پێشکەشکردنی نووسراوی راسپاردنەکەی یان هاوشێوەکەی دەکرێت بە پێوەر.

٤. ریزبەندیی سەرۆکە بریکارەکان دوای هەموو سەرۆکی نێراوە کونسوڵییەکان دێت، ریزبەندییەکەشیان بەپێی مێژووی وەرگرتنی کارەکانیان دەبێت.

٥. رێزبەندیی سەرکونسوڵە فەخرییەکان، لە هەرئاستێك بێت، دوای سەرکونسوڵە بنەڕەتییەکان دێت، بەپێی ئەو سیستم و رێسایانەی لە خاڵەکانی پێشوودا باسکران.

٦. سەرۆکی نێراوە کونسوڵییەکان پێشبەندییان هەیە بەسەر هەموو ئەو فەرمانبەرە کونسوڵییانەدا کە ئەو سیفەتەیان نییە.

## شەشەم: پێشبەندی لە بۆنەکاندا(١)

١. دروستە ئەو کەسانەی کە پێگەیەکی زانستی، یان کۆمەڵایەتیی بەرزیان هەیە پێشبەندییەکی تایبەتیان پێ بدرێت لەنێو کەسایەتییە فەرمییە خاوەن پۆستەکاندا. هەندێکجار لە ئاهەنگە تایبەتەکاندا لەپاڵ پێشبەندییە فەرمییەکاندا رەچاوی تەمەن، یان خزمایەتی دەکرێت، بەپێی بارودۆخی ئاهەنگەکە، دەگرێت.

٢. لەو ئاهەنگانەی کە وتاریان تێدا دەخوێندرێتەوە، گەورەترین کەسایەتی ئەوەیە، کە کۆتاکەس وتار دەخوێنێتەوە و دروست نییە، کەسی تر لەدوای ئەو وتار بخوێنێتەوە.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٨.

٣. لەکاتی رۆیشتن بە پیادە، یان سەرکەوتن بەسەر قادرمەدا، کۆنترین کەس پێشدەکەوێت، جگە لە پیاوانی ئاساییش و پاراستن، کەسی تر بۆی نییە پێشی بکەوێت.

٤. لەو ئاهەنگانەدا کە سەرۆکی دەوڵەت ئامادەی دەبێت، ڕاستەوخۆ ئاهەنگەکە بە گەیشتنی ئەو دەست پێدەکات، دوای ئەویش ڕێگە بە کەس نادرێت بچێتە ژوورەوە، دروست نییە هیچ کەسێکیش لە ئامادەبووان پێش ئەو لە ئاهەنگەکە بچێتە دەرەوە. ئەگەر سەرۆکیش هەستا و ئاهەنگەکەی بەجێهێشت، ئەوا ئەگەر ئاهەنگەکە بڕگەی تری مابێت تەواو نابێت.

## حەوتەم: پێشبەندی لە سواربوونی فڕۆکە و ئوتومبێلدا[1]

١. لە کاتی سواربوونی فڕۆکەدا، سەرەتا هەموو ئەندامانی ستافی هاوڕێ و دەوروبەر سەردەکەون، ئنجا ئەو کەسە سەردەکەوێت، کە پلەی لە هەموویان بەرزترە، بەڵام لە کاتی دابەزیندا بارەکە پێچەوانە دەبێتەوەو کەسی پلە باڵا یەکەم کەس دادەبەزێت و بەڕێوەبەری مەراسیمەکەش لەگەڵیدا دەبێت.

٢. لە کاتی سواربوونی ئوتومبێلدا، کەسی یەکەم لە دەرگای ڕاستی دواوە سەردەکەوێت، چونکە ئەوێ بە شوێنی ڕێز و شکۆ دادەنرێت، میواندارەکەش لە دەرگای چەپی دواوە سەردەکەوێت، کەسی هاورێش جێگەی تەنیشت شۆفێرەکەی بۆ تەرخان دەکرێت. خۆ ئەگەر میواندارەکە خۆی ئوتومبێلەکەی لێخوڕی، ئەوا میوانەکەی لەتەنیشت خۆیەوە دادەنیشێت، چونکە ئەوێ دەبێتە شوێنی ڕێز و شکۆ، بەڵام ئەگەر میوانەکە

(١) د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص٥٦، ٣٧٣.

خێزانەکەی لەگەڵ بوو، ئەوا ئەو لـە پێشـەوەو لای شـوفێرە میواندارەکـەوە دادەنیشێت و مێردەکەشی لـە پشـتەوە لای چـەپی خێزانـی میواندارەکـەوە دادەنیشێت.

٣. باشتر وایە سەرەتا دەرگای ئوتومبێلەکە بـۆ خانمـان بکرێتـەوە بـۆ ئەوەی یەکەمجار سەربکەون.

٤. لەکاتی سەرکەوتنی ئوتومبێلدا خانمان پێش پیاوان دەکەون، بـەڵام لە دابەزیندا بەپێچەوانەوە.

## باسی سێیەم:
## پرۆتۆکۆڵەکانی یەکترناسین و سەردان و سڵاو و تەوقەکردن

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین، کە بۆنە و کاتەکانی یەکتربینین چەند جۆر وشێوازێکیان هەیە، کە هەریەکەیان مامەڵەی تایبەت بە خۆی هەیە. بۆنە و ئاهەنگەکان بەگشتی کەشێکی دۆستانە دەخولقێنن، دبلۆمات دەتوانێت ئەو کاتە بۆ یەکترناسین و بەهێزکردنی پەیوەندی و دەستکەوتنی زانیاری بقۆزێتەوە. بەگشتی سێ جۆر ئاهەنگ هەیە(١):

### ١. ئاهەنگە فەرمییەکان:

ئەم ئاهەنگانە بە بۆنەی دانانی سەرۆکی دەوڵەتان، یان سەردانە فەرمییەکانیان، یان بۆنە نیشتمانی و نەتەوەییەکان و ڕێزنان لە شاندی دەوڵەتان ئەنجامدەدرێن، کە ئاهەنگەکە بە نیوەڕۆخوان، یان ئێوارەخوان، یان ئاهەنگی پێشوازیکردن ئەنجامدەدرێت.

### ٢. ئاهەنگە نیمچە فەرمییەکان:

چەند بۆنەیەکی جیاوازن کە نێراوە دبلۆماسییەکان پێیهەڵدەستن، وەك: ئاهەنگەکانی یەکترناسین، کە لەکاتی گەیشتنیان بە وڵاتی پێشوازیکەر، نمایشکردنی فیلم بۆ دەرخستنی چەند لایەنێکی پێشکەوتن، کردنەوەی پێشانگای بازرگانی، یان یانەیەکی وەرزشی، یان بازارێکی خێرخوازی و...هتد. ئەم بۆنانە سروشتێکی فەرمیی تەواویان نییە، لە هەمان کاتدا لە جۆرێك لە سیفەتی فەرمیبوون هەڵدەگرن.

---

(١) د. فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٦٤٨-٦٤٩.

### ٣. ئاهەنگە نافەرمییەکان:

ئەو ئاهەنگانەیە، کە لەسەر ئاستی تاکەکەسی بۆ دەستەبژێرێك لە هاوڕێ نزیکەکان سازدەکرێن، کە جاری وا هەیە بۆنەیەکی تایبەتیشی نییە و تەنها بۆ نانخواردن و گفتوگۆ و گاڵتەوگەپ ڕێکدەخرێن. دیارترین نموونەی ئەم بۆنە نافەرمییانە بریتین لە: چوونەدەرەوە بۆ سەیران و کاتبەسەربردن لە شوێنە گەشتیارییەکان، بانگێشتی مەلەکردن و نانخواردن. خانمانیش ئاهەنگی قاوەخواردنەوەی چێشتەنگاو، یان ئاهەنگی چاخواردنەوەی دوای نیوەڕۆ سازدەکەن، خانمانی سلکی دبلۆماسی و خانمە هاوسەرەکانی کەسە دیارەکانی دەوڵەتی خانەخوێ و خانمە فەرمانبەرەکانی وەزارەتی دەرەوە بانگهێشت دەکەن.

### یەکەم: ڕێسا گشتییەکانی یەکترناسین [(١)]

١. لەکاتی سەرداندا، پیاو دێتە پێشەوە بۆ لای ئافرەت، ئافرەت نایەت بۆ لای پیاو، تەنها لە حاڵەتی پێشوازیی سەرۆکی دەوڵەتدا نەبێت، کە پێویستە ئافرەت و پیاو بچن بۆ لای، لەکاتێکدا ئەو وەستاوە، یان دانیشتووە.

٢. ئافرەتی گەنج دەچێت بۆ لای ئافرەتی بە تەمەنتر.

٣. ئافرەتی پلەنزمتر دەچێت بۆ لای ئافرەتی پلەبەرزتر لە خۆی.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٣٠٧-٣١١. و د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٤٩-٢٥١. و: د.فاضل زكي محمد، م.س.ذ، ص ص٦٤٣-٦٤٤.

٤. ئافرەتی شوونەکردوو (کچ) دەچێت بۆلای ئافرەتی هاوسەردار، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت، کە کچەکە پێگەیەکی بالاتری هەبێت، وەك ئەوەی شاژن، یان ئەمیرە، یان کچی سەرۆکی دەوڵەت بێت.

٥. پێش پیاوان سڵاو لە ئافرەتان دەکرێت.

٦. ئافرەت ئەگەر دانیشتبوو هەر بەدانیشتنەوە وەڵامی سڵاوەکە دەداتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو پیاوەی سڵاوی کرد بەتەمەن بوو، پێویستە ئافرەتەکە لەکاتی وەڵامی سڵاوەکە، یان تەوقەکردندا هەستێتە سەر پێ. بەڵام ئەو کەسەی کە خاوەن بانگێشت بێت پێویستە بۆ سڵاوکردن لە میوانەکانی بەپێوە بێت، جا پیاو بێت، یان ئافرەت.

٧. پیاو لەکاتی وەڵامدانەوەی سڵاو، یان تەوقەکردندا لە شوێنی خۆی هەڵدەستێتە سەرپێ.

٨. پێویستە ئەو کەسەی، کە شەبقەی لەسەردایە لەکاتی پێشکەشکردندا شەبقەکە بە دەستی چەپییەوە بگرێت.

٩. بۆ پێشکەشکردنی کەسێکی خاوەن نازناو و پێگە، سەرەتا بە نازناوەکەی دەستپێدەکرێت، پاشان ناوەکەی، پاشان کارەکەی.

## دووەم: شێوازی تەوقەکردن[1]

١. جۆرەکانی تەوقەکردن زۆرن، باش وایە دبلۆمات تەوقەیەکی هاوسەنگ بکات و زەردەخەنەی لەگەڵدا بێت، لە هەمان کاتدا ئاگای لە شێوازی تەوقەی بەرانبەر و ئاستی گەرموگوڕییەکەی بێت و بەپێی پێویست

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٣٠٧-٣١١.

وەڵامــی بداتــەوە. دەشــکرێت هەڵوێســت و سیاســەتی وڵاتەکــەی ئاســتی گــەرموگوڕی و شــێوازی تەوقەکــەی، لــە کاتێکــەوە بــۆ کــاتێکی تــر و لــە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی، بگۆڕێت.

٢. ئەگەر ئەو کەسەی کە سڵاوی لێدەکـەین پۆسـتێکی سـەرەکی، یـان دبلۆماسی هەبوو، یاخود پلەیەکی سەربازی، یان ئـایینی، یـاخود نازنـاوێکی بیــانیی هــەبوو (Ser،Lord )، ئــەوا نــاوی نــاهێنین بــەڵکو لەگــەڵ سـڵاوکردنەکەدا سـیفەتەکەی دەڵـێین، بـۆ نموونـە: بـەڕێز سـەرۆك، جـەنابی وەزیر، سەعادەتی باڵوێز، سەماحەتی شێخ، گەورەم.

٣. باشتروایە بەو شێوازە تەوقە بکەین، کە لەو شوێنەی تێیداین بـاوە، جا بە وشەی گوزارشتکەر بێت، یان یان بە ئاماژە بێت، وەك: وەستان، یـان سەربردن بۆ پێشـەوە، یـان دەسـتبەرزکردنەوە، لـە هەنـدێك وڵاتـانی ئاسـیا سـڵاوکردن بــە یــەکێك لــە نیشــانەکانی پەرســتش هــەژماردەکرێت، بۆیــە بەشێوەیەك ئەنجامدەدرێت کە دەستەکان لە پێشەوە کۆدەکرێنەوە، لەگەڵ کەمێك سەردانەواندن.

٤. پێویســتە پیــاو، لــەکاتی نانخواردنیــدا، ئەگــەر دانیشــتبوو، بــۆ سڵاوکردن لە پیاوان و خانمانیش، هەستێتە سەر پێ.

٥. وا باشە بۆ تەوقەکردن لەگەڵ خانمێـك، یـان کەسـێکی گـەورەتر لـە خۆمان لەرووی پێگە، یـان تـەمەنـەوە، دەسـت بـۆ تەوقـەکردن ڕانەکێشـین، بەڵکو پێویستە ساتێکی کەم چـاوەڕێ بـین تـا ئـەو دەسـتی بـۆ تەوقـەکردن درێژدەکات، ئەوکاتە ئێمەش تەوقەی لەگەڵ دەکەین، خۆ ئەگەر دەستی بـۆ تەوقەکردن درێژ نەکرد، ئەوا ئەوەندە بەسە کە بە زەردەخەنەوە بە ئاماژەی سەر سڵاوی لێ بکەین.

٦. رەتکردنەوەی دەستی کەسێك کە دەستی بۆتەوقەکردن هێناوە، بە سەرزەنشت و سووکایەتی دادەنرێت و لەگەڵ ئەتەکێتی جوانی دبلۆماسیدا نایەتەوە، رەنگە تووڕەیی لایەنی بەرانبەر، یان دروستبوونی تەنگژەی پەیوەندیەکانی لێبکەوێتەوە.

٧. گونجاو نییە لەکاتی تەوقەکردن بە دەستی راست، دەستی چەپ لە گیرفانی پانتۆڵ، یان چاکەت، یان شەرواڵدا بێت، چونکە ئاماژەیەکە بۆ رێزنەگرتن و گرنگینەدان. هەروەك چۆن باش نییە، پیاو لە کاتی تەوقەکردندا دەستکێشی لە دەستدا بێت، بەڵکو پێویستە پێش تەوقەکردنەکە بە ماوەیەك لایبردبێت، ئەمە لەکاتێکدا کە بۆ خانمان ئاساییە لە کاتی تەوقەکردندا دەستکێشیان لە دەستدا بێت.

### سێیەم: رێساکانی سەردانەکان

١. سەردانەکان جۆریان زۆرە، هەندێك لە سەردانەکان بۆ یەکترناسین، یان باسکردنی چەند بابەتێك لە چوارچێوەیەکی نافەرمیدا، تەرخاندەکرێن، قسەکردنیش تێیاندا نافەرمی دەبێت، بەڵام گوزارشت دەبێت لە ڕای حوکومەت. پێویستە دبلۆمات هەر وتەیەك، کە دەیبیستێت بۆ دەوڵەتەکەی بگوێزێتەوە.

٢. پێویستە سەردانەکە لەو کاتە دیاریکراوەدا بێت، کە لەسەری رێکەوتوون، واتە دروست نییە لەپێش، یان لە دوای وادەی خۆی ئەنجامبدرێت، تەنیا لەبەر هۆکاری پێویست نەبێت، ئەویش پێویستە داوای لێبوردن پێشکەشبکرێت.

٣. له كاتی سەردانی سەرۆكی دەوڵەتدا تەوقەی لەگەڵ ناكرێت، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت، كە ئەو خۆی دەست درێژبكات بۆ تەوقەكردن، هەروەها كاتێك دەستی بۆ تەوقەكردن درێژكرد پێویستە سەردانكەرەكە بێتە پێشەوە بۆ لای سەرۆكی دەوڵەت، وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ كرد.

٤. ئەگەر سەرۆك لەجێی خۆی هەستا ئەوا واتای تەواوبوونی سەردانەكە دەگەیەنێت و پێویستە سەردانكەرەكە شوێنەكە جێبهێڵێت.

٥. سەردانكەر شوێنەكە بەجێ ناهێڵێت تا سەرۆكی دەوڵەت، یان یەكێك لە بەرپرسانی دەوڵەت لەو شوێنەدا بن، تەنها لە حاڵەتی پێویستدا نەبێت، ئەگەر سەردانكار ویستی پێش تەواوبوونی ماوەی سەردانەكە بڕوات، ئەوا پێویستە داوای روخسەت لە سەرۆكی دەوڵەت، یان بەرپرسەكە بكات.

٦. لەكاتی سەردانی سەرۆكی دەوڵەت، یان یەكێك لە بەرپرسان، جگەرەكێشان دروست نییە، مەگەر سەرۆكی دەوڵەت، یان بەرپرسەكە خۆی جگەرەكە پێشكەش بكات.

٧. ئەگەر لە ئامادەیی سەرۆكی دەوڵەت، یان بەرپرسێكدا خواردنەوە و شەراب بۆ سەردانكەر دانران، ئەوا بۆی نییە بیخواتەوە تا سەرۆك، یان بەرپرسەكە نەیخۆنەوە، یاخود تا داوای خواردنەوەی شەرابەكەی لێ نەكرێت. هەروەها سەردانكەر بۆی نییە خواردنەوەی شەرابەكە رەتبكاتەوە، مەگەر بەپێی ئایینەكەی ئەو حەرام بێت، یاخود زیان بە تەندروستی بگەیەنێت، پێویستە لەو حاڵەتانەشدا هۆكاری نەخواردنەوەكەی ڕوونبكاتەوە.

٨. هەر باڵوێزێك، كاتێك لە نێراوێكی دبلۆماسییدا لە دەرەوە دادەنرێت، دەستپێشخەری دەكات بە سەردانكردنی هاوتاكانی، لەوانەی كە

له پلەی ئەودان، یان بەرزترن، کارتێکی ناساندنیش بۆ ئەوانە دەنێرێت، کـە پلەی دبلۆماسییان له خۆی نزمتره.

٩. له هەربالۆێزخانەیەکدا هۆلێك بۆ سەردانە فەرمییەکان دابیندەکرێت، ئەگەر ئەوەش نەتوانرا ئـەوا سـەردانەکان لـە نووسـینگەی کەسـی دبلۆماتـدا ئەنجامدەدرێن.

١٠. کاتێك کە سەردانەکە لە نووسینگەی دبلۆماتەکە ئەنجامبدرێت، ئەوا دروست نییە بەدانیشتنەوەو لەپشت مێزەکەیـەوە پێشـوازی لـە میوانـەکانی بکات، بەڵکو ئەگەر لە پلەی خۆیدا بێـت، یـان پلـەبالاتر بێـت، پێویسـتە لـە تەنیشت میوانەکەیەوە دانیشێت، دانیشتنەکەش لەسەر دوو کورسی دەبێـت له تەنیشتەوە.

١١. یەکێك لە خزمەتگوزار (بەکارهێنراو/مستخدم)ەکانی بالۆێزخانە، یان دامەزراوەکە چاوەڕوانیکردنی میوانەکە لەبەردەم دەرگای دەرەوەی باخچە، یـان خانووەکـە لەئەسـتۆ دەگرێـت، هـەروەها یـەکێك لـە هاوکـاران لـەنێو فەرمانبەرانی بالۆێزخانە، یان دامەزراوەکە لەناو دەروازەی ناو بالۆێزخانەکـە له چاوەڕوانیی میوانەکەدا دەبێت، بۆئەوەی لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ لای بـالۆێزی بیهێنێت، کە بەپێوە لە هۆڵەکە، یان نووسینگەی خۆی لە چاوەڕوانیدایە.

١٢. لـەکاتی تـەواوبوونی سـەردانەکەدا دبلۆمـات تـا دەروازەی نـاوخۆیی بیناکە خواحافیزی لە میوانەکەی دەکات، یـاخود لەگەڵیـدا دێـت تـا سـواری ئۆتۆمبێلەکەی دەبێت.

**چوارەم: چاوپێکەوتنی سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی به گەورەبەرپرسانی دەوڵەت**

١. چاوپێکەوتنەکان بۆ کاروباری فەرمی و خێراو بەپەلە تەرخاندەکرێن، خێرایش رروونکردنەوەی هەندێك شتی بەپەلە دەخوازێت، کە دواخستنیان زیان بەبەرژەوەندیی هەردوولا، یان لایەکیان دەگەیەنێت.

٢. سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی دەتوانێت، لەسەر فەرمانی دەوڵەتەکەی، داوای چاوپێکەوتنی سەرۆکی دەوڵەت بکات، ئەویش لە رێگەی یاداشتێکەوە، کە دەنێرێت بۆ وەزارەتی دەرەکی.

٣. ئەگەر چاوپێکەوتنەکە لەسەر رێنمایی سەرۆکی دەوڵەتی خاوەن نێراوە دبلۆماسییەکە بوو، ئەوا وادەیەکی دیاریکراو بۆ سەردانەکە بەپێی گرنگییەکەی دیاریدەکرێت.

٤. دروستە داوا لە دبلۆمات بکرێت، کە هۆکاری سەردانەکە روونبکاتەوە، لە سۆنگەی ئەو ڕوونکردنەوەیەوە داوای چاوپێکەوتنی سەرۆکی دەوڵەت، یان وەزیری دەرەکی، یان سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی لێ دەکرێت، بەپێی گرنگیی بابەتەکەو سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە.

٥. سەرۆکی نێراوی دبلۆماسی مافی داوای چاوپێکەوتنی وەزیری دەرەکی، یان یەکێك لە بریکارەکانی، یان یەکێك لە سەرۆکی فەرمانگەکانی وەزارەتی هەیە.

٦. سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی مافی داوای چاوپێکەوتنی هەر وەزیر، یان بەرپرسێکی دەوڵەتی هەیە، ئەویش لە رێگەی یاداشتێکەوە بۆ وەزارەتی دەرەکی دەبێت، کە بابەتی چاوپێکەوتنەکەو گرنگییەکەی تێدا دیاری دەکرێت، هەروەها دروستە کە وەزیری دەرەکی، داوا لە سەرۆکی نێراوی دبلۆماسیی بکات، کە راستەوخۆ داوای چاوپێکەوتنی ئەو لایەنانە بکات، کە دەیەوێت.

## باسی چوارەم:
## پێشوازیکردن لە کاتی داوەتی خواندا (الاستقبال في المآدب)

لەکاتی پێشوازیکردنی دەستە دبلۆماسییەکان و بەرپرسان لە دەوڵەتی میواندا لە کاتی دروستکردنی خواندا، پێویستە ئەم ڕێسایانە پەیڕەوبکرێت[(١)]:

١. ئەگەر داوەتنامەکە بۆ کەسی دبلۆمات و هاوسەرەکەی بوو، ئەوا دروست نییە بەبێ هاوسەرەکەی بچێت، هەروەها دروست نییە منداڵەکانی، یان کەسانێکی تر کە بانگ نەکراون لەگەڵ خۆی ببات.

٢. پێویستە دبلۆمات لەو کاتەدا ئامادە بێت، کە لە کارتی داوەتنامەکەدا دیاریکراوە، ئەگەر بەهۆی حاڵەتێکی کوتوپڕەوە دواکەوت ئەوا پێویستە داوای لێبوردن بکات، هۆکاری دواکەوتنەکەشی روونبکاتەوە.

٣. پێویستە جلوبەرگی دبلۆمات و هاوسەرەکەی جلوبەرگی تایبەت بن بە دبلۆماتکاران و هاوسەرەکانیان، هەروەها بەپێی سروشتی داوەتنامەکە و ئەو دابونەریتەی، کە هەیە لەو بوارەدا جلوبەرگەکانیان هەڵبژێرن.

٤. ئەگەر داوەتنامەکە بۆ پیاوان و ئافرەتانیش بوو، ئەوا ژن لەکاتی چوونەژوورەوە بۆ هۆڵەکە پێش مێردەکەی دەکەوێت، پاشان تەوقە لەگەڵ ژنی ماڵ دواتر پیاوەکە دەکەن، یان تەنها لەگەڵ پیاوەکە تەوقە دەکەن، بۆ ژنەکەش دەست بە سنگەوە دەگرن.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. سهيل حسين الفتلاوي، م.س.ذ، ص ص٢٥٢-٢٥٤. و د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، م.س.ذ، ص ص٣٥٠-٣٧١. و عبدالفتاح شبانة، م.س.ذ، ص ص٩٩-١١١.

٥. کەسی بانگێشتکراو و هاوسەرەکەی لەو شوێنە دادەنیشن، کە بۆیان دیاریکراوە، یاخود لەو شوێنەی کە خاوەن دەعوەتەکە، یان ئەو کەسەی ڕێکخستنی دانیشتنی پێ سپێراوە دیاریدەکات، بۆیە بانگێشتکراو، یان هاوسەرەکەی بۆیان نییە شوێنی خۆیان جێبهێڵن و لە شوێنێکی تردا دابنیشن.

٦. ئەگەر بانگێشتکراو و هاوسەرەکەی هەستیان کرد، کە ئەو شوێنەی بۆیان دیاریکراوە شیاوی ئەوان نییە، یان ڕێزو کەرامەتیان بریندار دەکات، ئەوا دەتوانن لە داوەتەکە بکشێنەوەو بەهێمنی بێنە دەرەوە، تەنیا لە بارێکدا نەبێت، کە بوونیان پێویست بێت.، یان دەتوانن –ئەگەر زانییان هەڵەیەك هەیە– گوێی پێنەدەن و دواتر بانگهێشتکەرەکە لەو هەڵەیە ئاگاداربکەنەوە بۆئەوەی دووبارە نەبێتەوە.

٧. لە نزیك کاتی دەستپێکی ئاهەنگەکەدا، ژن وپیاوی خاوەن داوەت لەبەردەم هۆڵەکەدا پێشوازی لە میوانەکانیان دەکەن و بەیەکتریان دەناسێنن، دواتر دێنە نێو بانهێشتکراوەکانەوە و دادەنیشن.

٨. ئافرەتی ماڵەکە (ربة البيت) قسە لەگەڵ هەموو لایەکدا دەکات و زەردەخەنەی ناسك بەسەر هەموو بانگێشتکراوەکاندا بەبێ ریزپەڕ دەبەخشێتەوە، پیاوی ماڵەکەش (رب البيت) پێویستە هەمان کار لەگەڵ ئافرەتە بانگێشتکراوەکاندا ئەنجامبدات و سڵاو و زەردەخەنە ئاڕاستەی هەموو ئافرەتەکان بکات.

٩. خواردنەوە بەپێی سروشت و بیروباوەڕی بانگێشتکراوەکان پێشکەشدەکرێت، ژنی ماڵەکە چاودێریی باش بەڕێوەچوونی ئەو کارە دەکات لەلایەن خزمەتگوزارەکانەوە.

١٠. باشتروایە ئەنیشك لەسەر مێزی نانخواردن دانەنرێت، ئەگەر دەستی چەپیش بەکارنەهێنرا، باش وایە لەسەر ران، یان لە کۆشدا دابنرێت.

١١. دوای نزیکەی کاتژمێرێك لە وادەی دەستپێکردنی داوەتەکە سەرۆکی خزمەتگوزارەکان دێت و لەبەردەم هەموولایەکدا بەهێمنی بە ژنیماڵەکە دەڵێت خواردنەکە ئامادەیە، لەو کاتەدا ئەویش هەڵدەستێت بە بانگکردنی میوانەکان بۆ ژووری نانخواردن بە ئاماژەیەکی سادە بۆ ژووری نانخواردنەکە.

١٢. سەرۆکی خزمەتگوزارەکان، کە لەپشت کورسیی ژنی ماڵەکەوە وەستاوە، هەڵدەستێت بە راکێشانی کورسییەکەی بۆ دواوە، بۆ ئەوەی بتوانێت بەئاسانی دابنیشێت، هەروەها بۆ میوانی شەرەف، یان گەورە کەسایەتییە بانگێشتکراوەکە، بە هەمان شێوە، کە لای راستییەوە دادەنیشێت، دوای ئەوەی لە رێگەی نەخشەیەکەوە شێوازی دانیشتنی کەسەکان لەسەر خوانەکە دیاریدەکرێت و لەسەر مێزێکی بچووك دادەنرێت، کە نزیکە لە دەروازەی ژووری نانخواردنەوە، بەشێوەیەك کە هەرکەسێکی بانگکراو بەرەو جێی خۆی دەچێت و دواتر کە چووە پێشەوە، بەهۆی ئەو کارتە بچووکەی کە لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانراوە و ناوی خۆی لەسەرە، لە شوێنی خۆی دڵنیا دەبێتەوە.

١٣. پێشکەشکارانی خواردن و خواردنەوەکە ئەرکی دابەشکردنی بەسەر میوانەکاندا دەگرنە ئەستۆ، بەشێوەیەك کە خواردن لە لای چەپی میوان و خواردنەوەش لەلای ڕاستییەوە پێشکەشدەکرێت. سەرەتاش لە ژنی ماڵەکەوە دەستپێدەکرێت، دواتر ئافرەتەکانی تر، بەپێی رێزبەندیی دانیشتنیان، بەشێوەیەك کە هەرلایەك لە خوانەکە ستافێکی تایبەت بەو کارە هەبێت.

١٤. پێویستە ئەو خواردنەی کە پێشکەش دەکرێت، بۆ هـەمووان بەیـەك ئەندازە بێت، هیچ کەسێك جۆرە خواردنێکی تایبەتی بـۆ دانـەنرێت، چـونکە پێشخســتنی کەســێك بەســەر ئــەوانی تــردا بــە هەڵوێســتی سیاســیی هەژماردەکرێت، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە یەکێك لە میوانەکان، بەهۆی باری تەندروستییەوە، خواردنێکی تایبەتی بۆ ئامادەکرابێت.

١٥. پێویستە هـەمووان بـەپێی نەریتـە دبلۆماسـییەکان خواردنەکـە بخـۆن، زۆرکات دبلۆماتەکان راهێنانیان پێ دەکرێت بۆ فێربوونی چـۆنێتیی نـانخواردن، لە هەموو بارەکاندا زۆرخۆری و زۆرخواردنەوەو چڵێسیکردن قەدەغەیە.

١٦. دبلۆمات مافی ئەوەی نییـە، کـە لەگـەڵ خزمەتگوزارەکانـدا بکەوێتـە قسە، یان موجامەلەکردن، یاخود داوای خزمەتێکی زیادەیان لێبکات.

١٧. پێویستە قسەکردنی پیاو لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی، کە لە لای راست و چەپییەوە دادەنیشن بە یـەك ئەنـدازە بێـت، نـەك تـەنها لەگـەڵ یەکێکیانـدا قسەبکات، باشیش نییـە قسـە لەگـەڵ ئافرەتێکدا بکرێـت، کـە لـە بەرانبـەر خوانەکە دانیشتووە.

١٨. یەکەمجار گەورە کەسـایەتیی بـانگکراو و هاوسـەرەکەی دەسـت بـە رۆیشتن دەکەن، داوای ئیزن لە خـانمی ماڵەکـە و بانگێشـتکارەکە دەکـات و سوپاسی خانمی ماڵەکە دەکات، لەسەر ئەو خوانە خۆشەو ئەو کاتە خۆشەی کە ئەو و هاوسەرەکەی بەسەریان بـردووە، پاشـان میوانـەکانی تـر دەڕۆن و بانگێشـتکار هەریـەکێك لـە میوانــەکان و هاوســەرەکانیان تــا لای دەرگــای ناوەوەی ماڵەکە بەڕێیان دەکات و خواحافیزییان لێدەکات.

# بەشی یازدەیەم
# پێگەی ( هەرێمی کوردستان )
# لە کایەی دبلۆماسیی نێودەوڵەتیدا

- **ئامانجەکانی ئەم بابەتە:**

١. ئاشنابوون بە پێگە و رۆڵ و ئاستی هەرێمی کوردستان لە بواری دبلۆماسیی نێودەوڵەتیدا.

٢. تیشکخستنە سەر چۆنێتیی پراکتیزەکردنی پارادبلۆماسیی و پرۆتۆدبلۆماسیی لەلایەن هەرێمی کوردستانەوە.

٣. پەنجەخستنە سەر لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی مومارەسەی دبلۆماسی لە هەرێمی کوردستان.

٤. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگەچارە و نەخشەرێگای گونجاو بۆ بەرەوپێشبردنی کایەیی دبلۆماسی لە هەرێمی کوردستان.

- **ناوەرۆکی بابەتەکە:**

باشووری کوردستان لە سایەی رووداو و گۆڕاوە ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتییە گەورەکانی سەرەتای دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم، گۆڕانی گەورەی بەخۆیەوە بینی. دیارترین ئەو رووداو و گۆڕانکارییانەش خۆیان لەسەر چەند ئاست و شێوازێك نمایش کرد، هەر لە رووخانی بلۆکی سۆڤیەت و گۆڕانی پەیکەری سیستمی سیاسیی نێودەوڵەتی لە دووجەمسەرییەوە بۆ تاکجەمسەری، تا راگەیاندنی سیستمی نوێی جیهانی لەلایەن (ولایەتەیەکگرتووەکان ئەمەریکا)وە و کاڵبوونەوەی سنوورە تۆخەکانی دەوڵەتی نەتەوەو لاوازبوونی چەمکی سەروەریی رەهای دەوڵەتان و کاڵبوونەوەی سنوورە سیاسییەکان و لاوازبوونی سنوورە سروشتییەکان لە سایەی دیاردەی بەجیهانیبوون و تەکنۆلۆجیای گەیاندن و زانیارییدا.

کورد لە باشووری کوردستان، بە ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی بەهاری ساڵی (١٩٩١) و رووداوەکانی دوایی، بەتایبەت کۆڕەوە مەزنەکە، کە بە کۆڕەوی ملیۆنی ناودەبرێت، هەروەها بە پشتیوانی و هاوکاریی زلهێزە نێودەوڵەتییەکان، توانیی وەکو دیفاکتۆ، کیان و کاریگەریی خۆی لە (عێراق)دا بسەلمێنێت. لەو ساتەوە تا ساڵی (٢٠٠٣) (هەرێمی کوردستان) بە چەندین قەیران و تەنگژەو هەڵەی کوشندە و دەستێوەردانی هەرێمی و نێوەوڵەتیدا تێپەڕی، هەر لە گەمارۆی ئابووری و قەیرانی دارایی تا جەنگی براکوژی و دوو ئیدارەیی و کەمئەزموونی حوکمڕانی و بەڕێوەبردن و نادروستیی کولتووری کێبڕکێ و ململانێی سیاسی.

هەرچەندە (رێککەوتنی واشنتن)ی ساڵی (١٩٩٨)ی نێوان (یەکێتیی نیشتمانی کوردستان) و (پارتی دیموکراتی کوردستان)، کە بە سەرپەرشتیی واشنتن مۆرکرا، جۆرێك لە کرانەوەو چارەسەری هێنایە پێش، بەڵام خاڵی

وەرچەرخانی گرنگ بۆ کرانەوەی (هەرێمی کوردستان) بە رووی دنیادا و زیادبوونی رۆڵ و کاریگەریی لە ناوخۆی (عێراق) و ناوچەکە بە کردەیی لە ساڵی (٢٠٠٣)وە دەستیپێکرد، پاش ئەوەی رژێمی دکتاتۆریی (سەددام حوسەین) لە بەهاری (٢٠٠٣)دا لەلایەن (وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا) و (بەریتانیا) رووخێنرا، کە (هەرێمی کوردستان) توانیی رۆڵی بەرچاوی تێدا بگێڕێت.

پاش ئەوەی کورد بەشێوەیەکی کارا لە بونیادنانەوەی (عێراق) و داڕشتنەوەی یاسای بنەڕەتیی بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی راگوزەر لە (٢٠٠٤) و دەستووری هەمیشەیی عێراق (٢٠٠٥) و پرۆسەی سیاسی و بەگشتی، بەشداریی کرد، لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پاش ئەوەی (هەرێمی کوردستان) بوو بە پێگەیەکی ئاساییش و ئارام بۆ کۆمپانیا و بیانییەکان بۆ کارکردن و وەبەرهێنان، بە بەراورد بە ناوچەکانی تری (عێراق)، کە نائارامی و ئاڵۆزییەکی زۆری بە خۆوە دەبینی، (هەرێمی کوردستان) توانیی ببێتە جێی بایەخی دەوڵەتان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان.

هەرچەندە (هەرێمی کوردستان) پێگەیەکی دیار و گرنگ و دانپێدانراوی هەیە لە دەستووری هەمیشەیی عێراقی ساڵی (٢٠٠٥)، لەرووی سیاسی و یاساییەوە، بەڵام دواجار تا هەنووکە (چارەکی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧) بەپێی ئەو دەستوورە (هەرێمی کوردستان) بە شێکە لە (کۆماری عێراقی فیدراڵ)، لێرەدا پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، کە ئایا (هەرێمی کوردستان) چ جۆرە دبلۆماسییەتێك پیادەدەکات و لەکوێی دبلۆماسیی نێودەوڵەتیدا جێی دەبێتەوە؟

دەتوانین بڵێین (هەرێمی کوردستان) لەدوای رووخانی رژێمی بەعسەوە لە ساڵی (٢٠٠٣)، پێگەیەکی وەرگرتووە، کە بووە بە جێبایەخی

نێودەوڵەتی، لەهەمان کاتدا توانیویەتی جۆرێك لە دبلۆماسیی پێڕەوبکات، کە بە (پارادبلۆماسیی)[١] ناودەبرێت، لە هەمان کاتدا توانیویەتی لە هەندێك باردا پەل بۆ مومارەسەکردنی (پرۆتۆدبلۆماسیی) بهاوێت، بەڵگەی ئەم گریمانەیە لە چەند خاڵێکدا کورتدەکەینەوە:

یەکەم: (هەرێمی کوردستان) توانیویەتی لەرووی کاری پەیوەندیی نێودەوڵەتییەوە هەنگاوی بەرچاو بنێت، دەتوانین ئەو هەنگاوانەش بۆ چەند ئاستێکی جیاواز پۆلێنبکەین:

١. دروستکردنی فەرمانگەی نووسینگەی پەیوەندییەکانی دەرەوەلە ساڵی (٢٠٠٦)، کە لە ئاست و پلەی وەزارەتدایە، کاری سەرەکیی ڕێکخستنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستانە لەگەڵ دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ڕێکخستن و بەدواداچوونی بەشداریکردنی (هەرێمی کوردستان) لە چالاکییە نێودەوڵەتییەکان و کارئاسانی و هەماهەنگی لەگەڵ

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە چەمکی پارادبلۆماسی و پارادبلۆماسی هەرێمی کوردستان بڕوانە:

- Dr. Dana Ali Salih and Bakhan Ako Najmalddin, Op. Cit.
- El-Dessouki, A. Structural Contexts and Paradiplomacy of Iraqi Kurdistan. 2015. Available at: http://www.feps.edu.eg/ar/publications/nahda/vol13/issue2/Ayman%20desouky.pd(Accessed: 11/7/2015).
- Kelly, M. The Kurdish Regional Constitutional within the Framework of the Iraqi Federal Constitution: A Struggle for Sovereignty, Oil, Ethnic, Identity, and the Prospects for a Reverse Supremacy Clause. Penn State Law Review, 114 (3), pp. 707-771. 2010.
- Mansour, R. Diplomacy for Survival. 2015. Available at: http://www.iraqstudies.com/iraq3.pd(Accessed: 13/7/2015).
- Mohammed, H. K., Paradiplomacy of regional governments in international relation: Iraqi Kurdistan as a case study, 2003-2009, MA dissertation, Dept. of Politics and International Relations, University of Kurdistan. 2010.

نووســـینگە دبلۆماســـییەکان و ڕێکخـــراوە نێودەوڵەتییـــەکان و نێـــراوە کونسـوڵییەکان و ڕێکخسـتنی سـەردانی شـاندە سیاسـی و بازرگانییـەکان. ئەمەش، هەرچەندە دامەزراوەیەکە تێبینیی ئەوەی لەسەرە، کە لە شـێوازی دامەزراندنی و پێکهاتەکەی و شوێنی چالاکییەکانی و کادرو فەرمانبەرەکانی، مـۆرکی حیزبـی پێوەدیـارە، بـەڵام خـاڵێکی گرنگـە لـە هـەنگاونان بـەرەو بەدامەزراوەییکردنی پەیوەندییەکانی دەرەوەی (هەرێمی کوردستان).

٢. بەستنی چەندین ڕێککەوتننامەی جۆراوجۆر لەگەڵ چەندین دەوڵەتدا لەنێویانـدا (کۆریـای باشـوور، ئـەڵمانیا، فەڕەنسـا، میرنشـینی عـەرەبیی یەکگرتوو، ئەردەن، قەتەر، میسر، لوبنـان، ئێـران و تورکیـا)، ئەمـە وێـڕای کۆمپانیـا فرەڕەگـەزەکان و ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکانی (بـۆ نموونـە: یۆنسکۆ). ئەو ڕێککەوتنانە چەندین بواری جیاوازی گرتووەتـەوە، بەتایبـەت بازرگـانی و گەشـتیاری و بیناسـازی و ژێرخـان و فێرکـردن و کشـتوکاڵ و گواستنەوە و نەوت و گاز. ئەمە جگە لەوەی کە (هەرێمی کوردستان) هەوڵی داوە، کـە ڕۆڵـی لـەو دانوستانانەشـدا هـەبێت، کـە حوکومـەتی فیـدڕاڵ بـۆ بەستنی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان ئەنجامی دەدات[١]. ئەمەش جۆرێك لە گرنگی و بایەخی بۆ (هەرێمی کوردستان) دروستکردووە، کە دەوڵـەتان و ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان فەرامۆشـی نەکـەن. هـەر بۆیـە دەبیـنین کـە

---

(1)International Crisis Group (2003) *War in Iraq: What's Next for the Kurds?p.12*. Available at: (12/1/2017) http://www.crisisgroup.org/~/media/Files/Middle%20East%20North%20Africa/Iraq%20Syria%20Lebanon/Iraq/War%20In%20Iraq%20Whats%20Next%20For%20The%20Kurds.pd

ڕێژەیەکی زۆری کۆمپانیا بیانییەکان لە (هەرێمی کوردستان) وەبەرهێنان ئەنجامدەدەن.

٣. کردنەوەی نووسینگەی نوێنەرایەتی لە چەندین دەوڵەت، کە بەدواداچوون بۆ پێداویستییە کولتووری و کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنییەکان دەکەن، هەروەها ئامانجیان بەهێزکردنی پێگەی (هەرێمی کوردستان)ـە لە بوارە سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانە بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی عێراقی فیدراڵ.

بۆ ئەو مەبەستە حوکومەتی هەرێمی کوردستان نوێنەرایەتیی خۆی لە (١٣) دەوڵەتی گرنگ و کاریگەر کردووەتەوە، وێڕای یەکێتیی ئەورووپی، کە بریتین لە: (ئوسترالیا، نەمسا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا، ئێران، ئیتاڵیا، پۆڵەندا، رووسیا، ئیسپانیا، سوید، سویسرا، بەریتانیا، ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتیی ئەورووپا) [١].

٤. لەخۆگرتنی و پێشوازیکردنی ڕێژەیەکی بەرچاو نووسینگەو کونسوڵخانەی دەوڵەتان، کە ڕێژەکە تا سەرەتای ساڵی (٢٠١٧) گەیشتووەتە (٣٤) نووسینگە و کونسوڵخانە. کە لە خشتەی ژمارە (٦)دا بەروونی خراونەتەروو.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پێگەی فەرمیی فەرمانگەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی حوکومەتی هەرێمی کوردستان، لەم لینکەی خوارەوە: (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/٢١)
http://www.dfr.gov.krd/p/p.aspx?p=83&l=13&s=030200&r=391

**خشتەی ژمارە (٦)**

**جۆرەکانی کونسولْ و نووسینگەکانی دەرەوە لە (هەرێمی کوردستان)**

| کونسولگەریی فەخری | نووسینگەی بازرگانی | نووسینگەی کونسولگەری | ئاژانس، یان نووسینگەی کونسولگەری، یان نووسینگەی باڵوێزخانە |
| --- | --- | --- | --- |
| شانشینی ئیسپانیا | کۆماری نەمسا | کۆماری ئیتاڵیا | کۆماری پۆڵەند |
| ژاپۆن | ئاژانسی هاریکاریی نێودەوڵەتیی ژاپۆن (JICA) | رۆمانیا | شانشینی سوید |
| شانشینی دانیمارك | ئاژانسی هاریکاریی نێودەوڵەتی کۆیی(KOICA) | کۆماری ئوستراڵیا | یۆنان |
| کۆماری سلۆڤاکیا | نووسینگەی نوێنەرایەتیی هەرێمی یونایمی (UNAMI) | کۆماری عەرەبیی میسر | کۆماری بولگاریا |
| کۆماری فیدراڵیی بەرازیل | نووسینگەی هەرێمیی رێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی(ICRC) | کۆماری کۆریای باشوور | |
| بیلاڕووسیا | | کەنەدا | |

**سەرچاوە: بڕوانە: پێگەی فەرمیی فەرمانگەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی حوکومەتی هەرێمی کوردستان، لەم لینکەی خوارەوە: (خشتەکە نووسەر دروستی کردووە)، (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/٢١)**

http://www.dfr.gov.krd/p/p.aspx?p=82&l=13&s=030100&r=390

هەرچەندە ئەم نووسینگەو کونسولخانان، بە پلەی یەکەم، بەدوای بەرژەوەندیی تاك و کۆمپانیاکانی وڵاتەکانیانەوەن، بەڵام، لەرووی دبلۆماسییەوە، بوونیان لە (هەرێمی کوردستان) رۆڵی ئەرێنی گێڕاوە و هۆکارێکیشن بۆ بووژانەوەی ئابووری و یارمەتیدانی کەرتی تایبەت و هەماهەنگی لەگەڵ حوکومەت.

(هەرێمی کوردستان) هەوڵی داوە زۆرترین رێژەی پەیوەندی لەگەڵ دنیای دەرەوە ببەستێت بۆئەوەی بتوانێت، بناغەیەك بۆ پەیوەندیی دبلۆماسیی دابرێژێت، کە دواتر لە هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی پشتی پێ ببەستێت، یان لایەنی کەم ئاسانکاری بۆ بکات.

دووەم: سەردانە فەرمییەکان: (هەرێمی کوردستان) لەدوای ساڵی (٢٠٠٣)ەوە، کە (هەرێمی کوردستان) بووە بە جێبایەخی دەوڵەتان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، کە تەنیا لە ساڵی (٢٠١٣) نزیکەی (١٧٥) بەرپرسی باڵای جۆراوجۆری وڵاتان سەردانیان کردووە، لەنێویاندا جێگری سەرۆکی ئەمەریکی، سەرۆکوەزیرانی پۆڵەندا، وەزیرانی دەرەوە و بەرگریی (بەریتانیا، وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا، تورکیا، ئیماراتی عەرەبیی یەکگرتوو، بەلجیکا) و گەورە بەرپرسانی رووس، و نوێنەرانی یەکێتیی ئەورووپا و نوێنەری سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان و سکرتێری گشتیی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی[١]. دواتر لە دوای جەنگی رێکخراوی "دەوڵەتی ئیسلامی" (ساڵی ٢٠١٤) –کە بە داعش ناسراوە– و رووبەڕووبونەوەی پێشمەرگە بۆ هێرش و پلانەکانی ئەو رێکخراوە، لەبەر

(1)Dr. Dana Ali Salih and Bakhan Ako Najmalddin, Op. Cit, p.506.

پێگەی گرنگی هەرێم و ئازایەتیی پێشمەرگە، هەرێم گرنگیی زیاتری بەخۆوە بینی، بوو بە شوێنێك بۆ پێشوازیرکردن لە چەندین بەرپرسی باڵای دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان.

ئەمە وێڕای ئەوەی کە گرنگیی زیاتر بە بەرپرسانی باڵای هەرێمی کوردستان دراوە و لە چەندین کۆبوونەوە، کۆنگرە و کۆنفرانسی ئەمنی و سیاسیی نێودەوڵەتیدا بەشدارییان پێکراوە، لەوانە: (کۆنگرەی میونخ) بۆ ئاساییش لە (ئەڵمانیا) لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٧)دا.

جگە لەوە، بەرپرسانی باڵای هەرێم لەلایەن سەرۆکی وڵاتانەوە پێشوازی گەرمیان لێکراوە، بەتایبەت لە کۆشکی سپی لەلایەن (باراك ئۆباما)ی سەرۆکی ئەمەریکا و کۆشکی ئیلیزی لەلایەن (فرانسۆ هۆلاند) سەرۆکی فەڕەنسا و کۆشکی کۆماریی تورکی لەلایەن (ڕەجەب تەیب ئەردۆکان)ەوە پێشوازییان لێکراوە، لە هەندێك لەو سەردانانەشدا ئاڵای (هەرێمی کوردستان) دانراوە و گرنگیی میدیایی پێدراوە. ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، کە گرنگیی پێگەو بایەخی (هەرێمی کوردستان) روو لە هەڵکشانە و ئەو وڵاتانە لە (هەرێمی کوردستان) بەرژەوەندییان هەیە و بایەخی زیاتری پێدەدەن، لە بەرانبەریشدا کرانەوەیەکی دبلۆماسییە بۆ (هەرێمی کوردستان) بە رووی جیهاندا.

(هەرێمی کوردستان) بەم هەنگاوانەی توانیویەتی بە دیوێکدا لە چوارچێوەی دەستوور و پرۆسەی سیاسیی عێراقیدا مامەڵە لەگەڵ پرسی دبلۆماسیدا بکات و پەیوەندییەکانی لە خزمەتی کۆی (عێراق) ئەنجامبدات، بە دیوەکەی تریشیدا، هەوڵی داوە جۆرێك لە سەربەخۆیی بۆ خۆی بپچڕێت و لەژێر هەژموون و سانسۆری بەغدا دەربچێت و خۆی سەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ

دەرەوە بکـات، بەتایبـەت لـە پرسـی ڕێککەوتننامـەکانی نـەوت و گـاز و کۆمپانیاکان و وەبـەرهێنان و سـەردانە فەرمییـەکانی بەرپرسـانی هـەرێم بـۆ دەرەوە و شێوازی پێشوازیکردن لە بەرپرسانی باڵای وڵاتانی بیـانی، کـە بـە جۆرێك لە جۆرەکان ئەم مامەڵەیەی هەرێم بەغدای نیگـەران کردووە،بووەتـە جێی ناکۆکی و ململانێ، بەمەش (هەرێمی کوردستان) لە پارادبلۆماسـییەوە هەنگاوی ناوە بۆ پرۆتۆدبلۆماسیی.

خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگی تر بریتییە لە ریفراندۆم کە لە (٢٠١٧/٩/٢٥) لە هەرێمی کوردستان و ناوچە جێناکۆکەکان ئەنجام درا.

لەگـەڵ هـەبوونی تێبـینی زۆر لەسـەر شـێوازی بڕیـاردان لـە ئەنجامـدانی ریفرانـدۆم بـۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان، کـە لـە دەرەوەی پەرلـەمان و بـە ڕێککـەوتنی زۆرینـەی لایەنـەکان بریـار درا کـە (٢٠١٧/٩/٢٥) ریفراندۆمەکـە ئەنجام بدرێت، هەروەها لەگـەڵ پێنەگەیانـدنی دۆخـی نـاوخۆیی و تـەبایی و یـەکڕیزیی لایەنــەکان و باشــنەکردنی بــژێوو دارایــی هاوڵاتییــانی هــەرێمی کوردستان، ئەمە وێڕای ئەو هەموو فشارە نێوخۆیی و دەرەکییـەش، کـە بـۆ دواخستنی پرۆسەکە کرایە سەر ئەنجومـەنی باڵـای ریفرانـدۆم، بـەڵام ئـەوان دواجار سووربوون لەسـەر ئەنجامـدانی. هـەر چـەندە ڕێـژەی بەشـدابوون لـە پرۆسەکە نزیکەی (٧٢٪) بوو، بەڵام دەنگی بەڵێ (٩٢,١٦٪) بوو.

ئـەم هـەنگاوە گرنگیـی خـۆی هەیـە بـۆ مێـژووی کـورد، بـەڵام هـەر زوو حکومەتی ناوەندیی عێراق و لایەنە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان کاردانەوەیان لە بەرامبەری نواند و هەرێمیش دەرگای گفتوگۆی واڵـا کـرد بـۆ دانوسـتان و چارەسەری کێشەکان.

هــەرێمی کوردســتان لــەم قۆناغــەدا دەتوانێــت ســوو لــە بەرئــەنجامی ریفراندۆمەکە وەربگرێت بۆ بەدەستهێنانی مافـە ڕەواکـانی گـەلانی هـەرێمی کوردستان.

ماوەتەوە بڵێین: (هەرێمی کوردستان) هەرچەندە لە دنیـای دبلۆماسـییدا هەنگاوی گرنگی ناوە، بـەڵام چـەندین کـەموکوڕیی پەیکـەری و دوورمـەودای هەیە، کە پێویستە چارەسەربکرێن، دیارترینیان ئەوەیـە کـە تـا ئێسـتا ئـەو دامەزراوانەی کە بە ئـەرکی دبلۆماسـی هەڵدەسـتن بـە نیشـتمانی نـەکراون و لـەژێر چـنگی حیـزب دەربـاز نـەبوون و مـۆرکی حیزبـی زیـاتر لـە مـۆرکی نیشتمانی بەسـەریاندا زاڵـە، ئەمـەش لـە شـێواز و سـەردانەکان و ئەنـدامانی شاندەکاندا بەروونی دیـارە. وێـڕای ئەمـە، نـاروونی و ناڕۆشـنیی زۆرێـك لـەو پەیوەندییانە، بەتایبەت رێککەوتنامەکانی تایبەت بە نەوت و گازی سروشتی کە وایکردووە، کە خەڵکی (هەرێمی کوردستان) بـەدگومان بێـت لـە هەنـدێك لـەو هەنگاوانــەی بەرپرســان لــەو بارەیــەوە دەینــێن، ئەمــەش دەبێتــەهۆی دروســتنەبوونی کــۆدەنگی لەســەر هــەنگاوە گرنگــەکانی وەك: سیاســەتی ئابووریی سەربەخۆ و هەنگاونان بەرە بڕیادان لە چارەنووس.

لـە لایـەکی تـرەوە، تـا ئێسـتا پارتـە سیاسـییە سـەرەکییەکانی هـەرێم نووسینگەی حیزبییـان لـە هەنـدێك لـە وڵاتـانی دەرەوە هەیـە، کـە ئەمـەش رێگەخۆشکەرە بـۆ نـاکۆکی و نانیشـتمانیبوون و نادامـەزراوەییبوونی پرسـە دبلۆماسییەکان و ناتەبایی لەنێوان لایەنەکاندا دروستدەکات، کە ئەمەش بـە دەردی کوشندەی هەنگاوە دبلۆماسـییە یـەکگرتووە نیشـتمانییە مەزنـەکان هەژماردەکرێت.

جگــه لەمانـــە، دەردە کوشـــندەکانی وەك گەنـــدەڵی و خەوشـــەکانی دیموکراسـی و پێشـێلکارییەکانی مـافی مـرۆڤ و سـووکایەتی و بێرێـزی بـە ڕۆژنامەنووسـان و ڕێگریکـردن لــە ڕرای ئــازاد و میــدیای بێلایــەن و سیسـتماتیکیبوونی گەنـدەڵی و هـەژموونی حیـزب بەسـەر حوکومەتـەوە و ڕێزنــەگرتن بــۆ دەزگــا فــەرمی و شــەرعییەکان و ڕێزنــەگرتن لــە یاســا و سـەروەرییەکەی و دادگاکـان و بەنیشـتمانینەکردنی دامـەزراوە سـەربازی و هەواڵگرییەکان، کۆمەڵە فاکتەرێکن، کە کاریگەریی نەرێنی لەسەر هێز و توانا و پێگـەی دبلۆماسـیی (هـەرێمی کوردسـتان) لـە ناوەنـدە نێودەوڵـەتی و جیهانیەکان جێدەهێڵن، بۆیە پێویستە بـەخێرایی چارەسـەری هەمەلایەنـە و گشـتگیریان بـۆ بدۆزرێتـەوە، باشـترین بەڵگـەش بـۆ ئـەو دەرد و دیاردانـە ڕاپۆرتــەکانی ڕێکخــراوە نێودەوڵەتییــەکانی وەك: (ڕێکخــراوی لێبــوردنی نێودەوڵـەتی و ڕێکخـراوی چـاودێریی مافـەکانی مـرۆڤ و خاچـی سـووری نێودەوڵەتی)ن.

# کۆتایی

تا ژیانی مرۆڤ لە پێشکەوتندا بێت، پەیوەندییەکانیشی لـە پەرەسـەندندا دەبن، بە ئەندازەی پەرەسەندنی پەیوەندییەکانیش، مرۆڤ بۆ بەڕێوەبردنیان پێویسـتی بـە میکـانیزمی هەمەچەشـن دەبێـت، بـە جۆرێـك کـە لـە ئاسـتی ڕۆژگاری خۆیاندا بن.

ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان، بە دەوڵەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، بە حوکـومی و ناحوکومییـەوە، هـەروەها بـە ئەکتـەرە نادەوڵەتییـەکانی تـری گۆڕەپانی جیهانییەوە، بەردەوام لە کارلێکدان، بە شـێوەیەك نـاتوانن بـەبێ پەیوەنـدیی بـەردەوامی بـە بوونیـان بـدەن، واتـە بوونیـان وابەسـتەی پەیوەندییەکانیانە بە جیهانی دەرەوەیان.

بۆ هەنگاونان لەگەڵ گۆڕانکاری و پێشهاتەکان، یەکە نێودەوڵەتییەکان لە دێرزەمانە لە هەوڵی دۆزینەوەی میکانیزمی گونجاودا بوون، بـۆ دروسـتکردن یـان بـەڕێوەبردنی پەیوەنـدی لەگـەڵ جیهـانی دەرەوەی خۆیـان، جـا ئـەو میکانیزمە بۆ دروستکردنی هاریکاری و دۆسـتایەتی ، یـان بـۆ بـەڕێوەبردنی ململانێ و دژایەتی بووبێت. هەرچەندە نەریتـە نێودەوڵەتییـەکان ماوەیـەکی زۆر، بـــە جۆرێـــك لـــە جۆرەکـــان، تەحـــەککومیان بـــە پەیوەندییـــە دبلۆماسییەکانەوە کردووە، بەڵام زۆر لە بابەتە سەرەکییەکان جێی نـاکۆکی و ناتەبایی دەوڵەتان بوون، زۆربەی کاتیش هەڵەتێگەیشتن و ناهەماهەنگی و نەبوونی ڕێسای گشتگیر بوونەتە سەرچاوەی کێشەو ململانێکان.

پەرەسەندنی ژمارە و جۆر و ئاست و شێوازی مامەڵە و پەیوەندیی یەکـە نێودەوڵەتییـەکان لەلایـەك و پەرەسـەندنی بـواری تەکنـەلۆجیی گەیانـدن و

پەیوەندییەکان و کرانەوەی خەڵکی و فشاری رای گشتی لەلایەکی ترەوە بوونە هەوێنی پەرەسەندنی یاساییانەی هەنگاوبەهەنگاوی ڕێسا دبلۆماسییەکان، بە جۆرێك کە ببنە ڕێنما بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان. پێشکەوتووترین نموونەی ئەم حاڵەتەش (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان)ی ساڵی (١٩٦١) و (ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە کونسوڵییەکان)ی ساڵی (١٩٦٣) و (ڕێککەوتننامەی نێراوە تایبەتەکان)ی ساڵی (١٩٦٩) بوو.

ئەم سێ ڕێککەوتننامەیە توانییان ئاستێکی باش لە ڕێکخستن پێشکەشی دنیا فراوانەکەی پەیوەندییە دبلۆماسی و کونسوڵییەکان بکەن، بە نێراوە تایبەت و هەمیشەییەکان و نێراوە کونسوڵییەکانیشەوە.

ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد لەلایەك و پەرەسەندنی شۆڕشی زانیارییەکان لەلایەکی ترەوە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پەیوەندییە دبلۆماسییەکاندا هاتووە، وایان کردووە کە جیهان لە ئێستادا پێویستی بە ڕێسای یاسایی زیاتر و فراوانتر و باشتر هەبێت، چونکە لەلایەك دەوڵەت وەکو تاکە یەکەی کاریگەری سەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی نەماوە، ئەویش بەهۆی زیادبوونی ڕێژەو جۆری یەکەی سەروو دەوڵەت و خوار دەوڵەت، کە پێویستیان بە ڕێسای تایبەت هەیە بۆ مامەڵەی دبلۆماسی و کونسوڵی، لە هەمان کاتدا، بوارەکانی کارو چالاکیی ئەکتەرە ناحوکومییەکان بە ڕێژەیەکی گەورە و ڕەوتێکی خێرا و پانتاییەکی گەورە لە گەشە و فراوانبووندا، کە لەپاڵ کاری لایەنە فەرمییەکاندا، ئەمانیش ڕۆڵ و کاریگەرییان هەیە و جۆرێك لە دبلۆماسییەت پیادەدەکەن، کە بەپێی

پێـوەرە دبلۆماسـییە کلاسـیکییەکان، لـە چوارچـێوەی کـاری دبلۆماسـییدا جێیان نابێتەوە.

هەر لەسەر هەمان ئاڕاستە، ئەمڕۆ لە جیهاندا هـەرێم و شـوێنە کاریگـەرە نادەوڵەتییەکانی وەك هەرێمی کیوبك لە کەنـەدا و کەتـەلۆنیا لـە ئیسـپانیا و سـکۆتلەندا لـە بـەریتانیا و هـەرێمی کوردسـتان لـە عێـراق، ڕۆڵ و پێگـە و کاریگەرییان لە هەڵکشاندایە، بـە شـێوەیەك کـە کـاری کایـەی دبلۆماسـییان تـێکگیران لـەنێوان ڕێسـا نێوخـۆیی و نێودەوڵەتییەکانـدا دروسـت دەکـات، ئەمەش پێویستی بە ڕێگەچارەی یاسایی نوێیە، کە وا بکاتومارەسەی کاری دبلۆماسییان بە جۆرێك بێت کە دوور بێت لە گرژی و ئاڵۆزی، لە هەمان کاتدا مافی ئەم هەرێمانە بپارێزێت.

لەلایـەکی تـرەوە، (ڕێسـای مـۆر) ئامـاژە بـەوە دەکـات، کـە توانـای تەکنەلۆجیای نـوێ هـەموو هـەژدە مـانگ جارێـك دەبێتـە دوو هێنـدەی ئـەو توانایەی کە هەیەتی! ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، کە تەکنەلۆجیا لە واقیعی دبلۆماسی و یاسا دبلۆماسـییەکانیش خێراتـر هـەنگاودەنێت، ئەمـەش یەکـە نێودەوڵەتییەکان ناچاردەکات، کە یاسا و ڕێسای نوێ بۆ دبلۆماسی دابرێژن، بـە جۆرێـك بتوانێـت لەگـەڵ ئـەو پەرەسـەندنە خێرایـەی تەکنـەلۆجیای گواسـتنەوەو گەیانـدن هـەنگاو بنێـت و هـەموو جـۆر و شـێوازەکانی کـاری دبلۆماسـی و پەرەسـەندنەکانی و لێکەوتـەکانی لـەژێر چـەتری خۆیـدا کۆبکاتەوە.

بـەدەر لـەوە، کـاتی ئـەوەی هـاتووە زانـا و پسـپۆڕانیش جـارێکی دی خوێندنـەوەی نـوێ بـۆ چـەمکە بنەڕەتییـەکانی بـواری پەیوەنـدیی

نێودەوڵەتییەکان و پەیوەندییە دبلۆماسییەکان بکەن، بە جۆرێك کە لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان و رەوتی سەردەمدا گونجاوتر بن.

دیارترین ئەو بابەتانەی هەنووکە پێویستیان بە پێداچوونەوەو رێسای نوێ هەیە بریتین لە: جیاوك و پارێزبەندییەکانی دبلۆماتکار و کونسوڵەکان، مافی پەناهەندەی دبلۆماسی، پارادبلۆماسی و پرۆتۆدبلۆماسی و پێگەی یەکەکانی خوار دەوڵەت و رێساکانی کاری دبلۆماسییان، وەستان و پچڕانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان، پێگەی تەکنەلۆجیای گەیاندن و پەیوەندییەکان لە کایەی دبلۆماسیدا..هتد.

ماوەتەوە بڵێین: جیهانی کاری دبلۆماسی هێندە فراوانە، ناتوانرێت بە نووسین هەموو لایەنەکانی باسبکرێت، هەروەك چۆن ناتوانرێت بەتەواوەتی بە یاسای سەر کاغەز رێکبخرێت، چونکە زۆرینەی یەکە نێودەوڵەتییەکان، بە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، جۆرێك لە کێبڕکێ، یان ململانێ پیادەدەکەن، کە یاساکان بەئاسانی ناتوانن رێگە بە کارەکانیان، لەو پێناوەدا بگرن، بەڵام بوونی رێسا و یاساکان رێگریی دەکەن لەوەی کە، لانیکەم، ئەو کارانەی کە نایاساین بەئاشکرا ئەنجامنەدرێن. بە مانایەکی دی، دنیا شاراوەکەی کاری دبلۆماسیی وەك لایەنە شاراوەکەی فراوانە، چونکە یەکە نێودەوڵەتییەکان دواجار بۆ بەرژەوەندیی خۆیان لەپێناو مانەوە و گەشەی خۆیاندا کاردەکەن.

# پاشكۆی ژماره ( ١ )

# ( ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دبلۆماسییەکان )[(١)]

# لە ڤیەننا، لە ( ١٨ )ی نیسانی( ١٩٦١ ) نوسراوە

دەوڵەتانی ئەندام لەم ڕێککەوتننامەیەدا، لە کاتێکدا ئاماژە بەوە دەکەن، کـە گـەلانی هـەموو نەتـەوەکان لـە دێرزەمانـە دانیـان بـە پێگـەی نوێنـەرە دبلۆماسـییەکاندا نـاوە، بـە یادهێنانـەوەی ئامـانج و بنـەماکانی کارنامـەی نەتەوەیـەکگرتووەکانی پەیوەسـت بـە یەکسـانیی سـەروەریی دەوڵـەتان، پاراسـتنی ئاشـتی و ئاساییشـی نێودەوڵـەتیی و بـەهێزکردنی پـەیوەنیی دۆستانەی نێوان نەتەوەکان،

---

(١) لە بنەڕەتدا، دەقی فەرمیی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە پێنج زمان نوسراوەتەوە، کە نە عەرەبی و نە کوردییان تێدایە، بۆیە هەوڵم دا دەقی ڕێککەوتننامەکە بۆ زمانی شیرینی کوردی وەربگێڕم. دیارە وەرگێڕانی دەقێکی یاسایی نێودەوڵەتییئاوا گرنگ، پێویستی بە لیژنەیەکی تایبەت هەیە و کاری تاکەکەس نییە، بۆیە، هەرچەندە هەوڵم داوە لە دەق و جەوهەری ڕێککەوتننامەکە لا نەدەم، بانگەشەی ئەوە ناکەم کە دەقەکە وەرگێڕانی دەقاودەقی ڕێککەوتننامەکەیە. بۆ ئەو وەرگێڕانەش پشتم بە دەقە ئینگلیزییەکە و وەرگێڕانەکەی بۆ عەرەبی بەستووە، دەقە ئینگلیزییەکەیم لە سایتی فەرمیی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەقە عەرەبییەکەشیم لە کتێبە تایبەتەکانی بواری دبلۆماسی، بەتایبەت کتێبەکەی (دکتۆر علی حسێن ئەششامی)، بەناوی (*الدبلوماسية)*، کە ئەویش پشتی بە دەقە فەڕەنسییەکە بەستووە،وەرگرتووە. بۆ دەقە ئینگلیزییەکە بڕوانە: سایتی فەرمیی نەتەوەیەکگرتووەکان: (مێژووی سەردان: ٢٠١٧/٣/٢٦)
Vienna Convention on Diplomatic Relations, 1961, United Nations, Treaty Series, vol. 500, United Nations,2005.
http://legal.un.org/ilc/texts/instruments/english/conventions/9_1_1961.pdf

بە بڕوابوون بەوەی کە بەستنی ڕێککەوتنامەیەکی نێودەوڵەتی بۆ پەیوەندییەکان و جیاوك و پارێزبەندییەکان، بەشداری لە گەشەکردنی پەیوەندیی دۆستانەی نێوان نەتەوەکان دەکات، وێڕای جیاوازیی سیستمە دەستووری و کۆمەڵایەتییەکانیان،

بە پەیبردن بەوەی کە مەبەستی ئەو جیاوك و پارێزبەندییانە بۆ سوودی تاکەکان نییە، بەڵکو بۆ زامنکردنی ئەدائی کاریگەری کاری نێراوە دبلۆماسییەکانە وەك نوێنەری دەوڵەتان،

بە جەختکردنەوە لەوەی کە پێویستە ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتیی نەریتی لە حوکمکردنی ئەو مەسەلانە بەردەوام بن کە حوکمەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بەراشکاوانە ڕێکیان نەخستوون،

لەسەر ئەمانەی خوارەوە ڕێککەوتوون:

***ماددەی (١)***

بۆ مەبەستی ئەم ڕێککەوتننامەیە، ئەو گوزارشتانەی کە دێن، ئەو مەدلوولانەیان هەیە، کە بۆیان دیاری کراوە:

أ. "سەرۆکی نێراوەکە" ئەو کەسەیە، کە لەلایەن دەوڵەتی نێرەرەوە بۆ هەڵسوکەوتکردن بەو سیفەتە دەنێرێت.

ب. "ئەندامانی نێراوەکە" سەرۆکی نێراوەکە و فەرمانبەرانی نێراوەکەن.

ج. "فەرمانبەرانی نێراوەکە" فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان، فەرمانبەرە کارگێڕی و هونەرییەکان،خزمەتگوزارانی نێراوەکەن.

د. "فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان" ئەو فەرمانبەرانەی نێراوەکەن، کە پلەی دبلۆماسییان هەیە.

هـ. "نوێنـــەری دبلۆماســیی" ســەرۆکی نێراوەکــە یــان یــەکێك لــەو فەرمانبەرانەی نێراوەکەیە، کە سیفەتی دبلۆماتیان هەیە.

و. "فەرمانبـــەرە کـــارگێڕی و هونەرییـــەکان" ئـــەو فەرمانبەرانـــەی نێراوەکەن، کە لە خزمەتە کارگێڕی و هونەرییەکاندا کاردەکەن.

ز. "ئەندامانی ستاف خزمەتگوزاریی" ئەو ئەندامانـەی نێراوەکـەن، کـە لە خزمەتگوزاریی ناوخۆی نێراوەکەدا کار دەکەن.

ح. "خزمــەتگوزاری تایبــەت" ئــەو کەســەیە کــە خزمــەتکاریی مــاڵی ئەندامێکی نێراوەکە دەکات،لە خزمەتگوزارانی دەوڵەتی نێرەر نییە.

ط. "بارەگای نێراوەکە" ئەو بینایانە (باڵەخانانە)، یان ئەو بەشە بینا و زەوییانەیە کە سەر بە نێراوەکەن و بۆ مەبەستی نێراوەکـە بـەکاردەهێنرێن، بـــەبێ رەچـــاوکردنی خاوەندارێتییەکـــەی، بـــە خـــانووی ســـەرۆکی نێـــراوە دبلۆماسییەکەشەوە.

***ماددەی (٢)***

دامەزراندنی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی نێوان دەوڵـەتان، دروسـتکردنی نێراوە دبلۆماسییە هەمیشەییەکان، بە رەزامەندیی ئاڵوگۆڕکراو دەبێت.

***ماددەی (٣)***

١- گرنگترین کارەکانی نێراوە دبلۆماسییەکان بریتین لە:

أ. نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەتی نێرەر لە دەوڵەتی پێشوازیکەر.

ب. پاراسـتنی بەرژەوەندییـەکانی دەوڵـەتی نێـرەر و هاوڵاتییـەکانی لـە دەوڵـــەتی پێشـــوازیکەر، لـــە چوارچـــێوەی ئـــەو ســـنوورەی، کـــە یاســـای نێودەوڵەتیی دانی پێدا ناوە.

ج. دانوستان لەگەڵ حوکومەتی دەوڵەتی پێشوازیکەر.

د. بەدواداچوون بۆ بارودۆخ و پەرەسەندنەکان لە دەوڵەتی پێشوازیکەر بە هەموو ئامرازە ڕێگەپێدراوەکان،پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی پێویست لەبارەیانەوە بۆ حوکومەتی وڵاتی نێرەر.

ه. بەهێزکردنی پەیوەندیی دۆستانە لەنێوان دەوڵەتی نێرەر و دەوڵەتی پێشوازیکەردا،پەرەدان بە پەیوەندییە ئابووری و کولتووری و زانستییەکانیان.

٢- نابێت هیچ یەکێك لە حوکمەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە وا راڤەبکرێت، کە ڕێگرە لە ئەنجامدانی ئەرکە کونسوڵییەکان لەلایەن نێراوی دبلۆماسییەوە.

***ماددەی (٤)***

١ – پێویستە دەوڵەتی نێرەر لەوە دڵنیابێت، کە ڕەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەری بۆ ئەو کەسە وەرگرتووە، کە دەیەوێت وەك سەرۆکی نێراوە دبلۆماسییەکە دای بمەزرێنێت.

٢- دەوڵەتی پێشوازیکەر بەوە پابەند ناکرێت، کە هۆکاری قبووڵنەکردنی بۆ دەوڵەتی نێرەر بخاتەروو.

***ماددەی (٥)***

١- دەوڵەتی نێرەر، پاش ناردنی ئاگاداریی پێویست بۆ دەوڵەتانی پێشوازیکەر، دەتوانێت سەرۆکی نێراو یان جێگرێك، بەپێی حاڵەتەکە، لایزیاتر لە دەوڵەتێك دابمەزرێنێت، مەگەر یەکێك لە دەوڵەتانی پێشوازیکەر ڕاشکاوانە ناڕەزایی خۆی دەرببڕێت.

٢- ئەگەر دەوڵەتی نێرەر سەرۆکی نێراوێکی لای دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێك دامەزراند، دەتوانێت نێراوێکی دبلۆماسیی بە سەرۆکایەتیی هەڵسووڕێنەرێکی کاروبارەکان بە لەجیاتی لە هەردەوڵەتێك دروستبکات، کە سەرۆکی نێراوەکەی تێیدا بارەگای هەمیشەیی نییە.

٣- سەرۆکی نێراو یان هەرفەرمانبەرێکی دبلۆماسیی نێراوەکە دەتوانێت نوێنەرایەتیی دەوڵەتی نێرەر لای هەر رێکخراوێکی نێودەوڵەتی بکات.

***ماددەی (٦)***

دوو دەوڵەت، یان زیاتر، دەتوانن یەك کەس بە سەرۆکی نێراو لای دەوڵەتێکی تر دابمەزرێنن، مەگەر دەوڵەتی پێشوازیکەر رەزامەند نەبێت.

***ماددەی (٧)***

دروستە بۆ دەوڵەتی نێرەر، لەگەڵ رەچاوکردنی حوکمەکانی ماددەکانی (٥) و (٨) و (٩) و (١١)، بەئازادانە فەرمانبەرانی نێراوەکەی دابمەزرێنێت. لە حاڵەتی پاشکۆی سەربازیی یان دەریایی یان ئاسمانیدا، دەوڵەتی پێشوایکەر، بۆئەوەی رەزامەندییان لەسەر بدات،دەتوانێت پێشوەختە داوای ناوەکانیان بکات.

***ماددەی (٨)***

١- لە بنەڕەتدا پێویستە فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان هەڵگری رەگەزنامەی دەوڵەتی نێرەر بن.

٢-دروست نییە فەرمانبەرە دبلۆماسییەکان لەو کەسانە دابنرێن، کە رەگەزنامەی دەوڵەتی پێشوازیکەریان هەیە، مەگەر بە رەزامەندیی خۆی، کە دەشتوانێت لە هەرکاتێکدا کە بیەوێت ئەو رەزامەندییە بکشێنێتەوە.

٣– دەوڵـەتی پێشـوازیکەر دەتوانێـت هـەمان مـاف بـۆ خـۆی بپارێزێـت سەبارەت بەو هاوڵاتییانەی دەوڵەتێکی سێیەم، کە لە هەمان کاتدا هـاوڵاتیی دەوڵەتی نێرەر نین.

**ماددەی (٩)**

١- دەوڵەتی پێشوازیکەر، لە هەموو کاتێکدا و بـەبێ راگەیانـدنی هۆکـاری بڕیارەکـەی، دەتوانێـت ئـەوە بـە دەوڵـەتی نێـرەر ڕابگەیـەنێت، کـە سـەرۆکی نێراوەکەی، یان هەر فەرمانبەرێکی دبلۆماسیی تێیدا کەسێکی نەخوازراوە، یـان هـەر فەرمانبـەرێکی تـر تێیـدا قبووڵنـەکراوە. لـەو حاڵەتەشـدا دەوڵـەتی نێـرەر، بـەپێی پێویسـت، یـان کەسـی مەبەسـت بانگێشـت دەکاتـەوە، یـان کۆتـایی بـە راژەکەی لە نێراوەکەدا دەهێنێت. رەنگە راگەیاندنی ئەوەی کە کەسێکی ئـەوتۆ نـــەخوازراوە یـــان قبولْنـــەکراوە، پـــێش گەیشتنیشـــی بـــە هـــەرێمی دەوڵـــەتی پێشوازیکەر بێت.

٢- ئەگـەر دەوڵـەتی نێـرەر رەتیکـردەوە یـان کەمتەرخـەمی کـرد، لـە بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکانەی، کە لە بڕگەی (١)ی ئەم ماددەیە دەکەوێتەوە، لە ماوەیەکی مەعقولدا، ئەوا دەوڵەتی پێشوازیکەر دەتوانێت وەك ئەندامێکی نێراوەکە دان بەو کەسە دیاریکراوەدا نەنێت.

**ماددەی (١٠)**

١- وەزیری دەرەکیی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان هـەروەزارەتێکی تـر، کە دەکرێت لەسەری رێکبکەون، ئەم شتانە ررادەگەیەنێت:

أ. دامەزرانـــدنی ئەنـــدامانی نێراوەکـــە و گەیشـــتنیان و جێهێشـــتنی کۆتاییان، یان کۆتاییهاتنی راژەیان لە نێراوەکەدا.

ب. گەیشتنی هەریەکێك لە ئەندامانی خێزانی یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکە و ڕۆیشتنی کۆتایی و هەر کەمبوون یان زیادبوونێك، کە لە ژمارەی ئەندامانی ئەو خێزانەدا روودەدات.

ج. گەیشتن و ڕۆیشتنی کۆتایی ئەو خزمەتگوزارە تایبەتانەی، کە خزمەتی ئەو کەسانە دەکەن، کە لە بەندی (أ)ی ئەم بڕگەیەدا هاتوون، هەروەها وازهێنانیان لە خزمەتکردنی ئەو کەسانە.

د. دامەزراندن و دابڕاندن (فەسڵکردن)ی ئەو کەسانەی، کە وەك ئەندامی نێراوەکە، یان وەك خزمەتگوزاریی تایبەت لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا ماونەتەوە (موقیمن)، کە مافی بوونی جیاوك و پارێزبەندییان هەیە.

٢- هەروەها، ئەگەر توانرا، ئاگادارکردنەوەیەکی پێشوەختە لەسەر گەیشتن یان رۆیشتنی کۆتایی دەنێرێت.

### ماددەی (١١)

١- لە کاتی نەبوونی رێککەوتنێکی تایبەت بە قەبارەی نێراوەکە، دەوڵەتی نێرەر دەتوانێت قەربارەی نێراوەکە لە سنوورێکدا دیارییبکات، کە بە مەعقول و ئاسایی دەبینێت، لەگەڵ رەچاوکردنی بارودۆخی گشتی لە دەوڵەتی پێشوازیکەر و پێویستییەکانی نێراوەکە.

٢- هەروەها دەوڵەتی نێرەر، لەو سنوورەدا و بەبێ جیاکاری، دەتوانێت قبووڵکردنی هەرفەرمانبەرێك لە هەر پلەیەك رەت بکاتەوە.

**ماددەی (١٢)**

دەوڵەتی نێرەر، بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی پێشوەخت لە دەوڵەتی پێشوازیکەر، ناتوانێت نووسینگە وەك بەشێك لە نێراوەکە، لە غەیری ئەو ناوچانەدا دروستبکات، کە نێراوەکەی تێدا دامەزرێنراوە.

**ماددەی (١٣)**

١- سەرۆکی نێراوەکە لە ساتی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی یان لە ساتی ئاگادارکردنەوەی لە گەیشتنی و پێشکەشکردنی وێنەیەکی ئەسڵیی لە بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەی بۆ وەزارەتی دەرەکیی یان هەروەزارەتێکی تری دەوڵەتی پێشوازیکەر کە لەسەری ڕێکبکەون بە دەستبەکاربوو هەژماردەکرێت، بەپێی ئەوەی کە لەو وڵاتەدا کاری لەسەر دەکرێت، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە پێویستە یەك جۆر مامەڵە جێبەجێ بکرێت.

٢- ریزبەندیی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەکانی دامەزراندن یان وێنەیەکی ئەسڵییان بەپێی مێژوو و ساتی گەیشتنی سەرۆکی نێراوەکە ڕێکدەخرێت.

**ماددەی (١٤)**

١- سەرۆکی نێراوەکان بۆ سێ پلە دابەشدەبن:

أ. باڵوێز یان قاسیدە ڕەسولییەکان، کە بۆ لای سەرۆکی دەوڵەتان دەنێرێن، هەروەها ئەو سەرۆك نێراوانەی تر، کە هەمان پلەیان هەیە.

ب. بریکارەکان، و وەزیرە راسپێراوەکان، کە بۆ لای سەرۆکی دەوڵەتان دەنێرێن.

ج. هەڵسووڕێنەری کاروبارەکان، کە بۆ لای وەزیری دەرەکی دەنێرێن.

٢- دروست نییە بەهۆی پلەکانییانەوە جیاکاریی لەنێوان سەرۆکی نێراوەکاندا بکرێت، تەنها لەوەدا نەبێت، کە بە مافی پێشبەندی و ئەتەکێتەوەپەیوەستە.

***ماددەی (١٥)***

دەوڵەتان لەنێوان خۆیاندا لەسەر پلەی سەرۆك نێراوەکانیان رێکدەکەون.

***ماددەی (١٦)***

١- پێشبەندیی ئەو سەرۆك نێراوانەی کە یەك پلەیان هەیە، بەپێی مێژوو و ساتی وەرگرتنی ئەرکەکەیان، بەپێی حوکمەکانی ماددەی (١٣)، ریزدەکرێت.

٢- هەر گۆڕانکارییەك لە بەڵگەنامەی دامەزراندنی سەرۆکی نێراودا بکرێت، گۆڕانکاری لە پلە و پێشبەندییەکەیدا دروست ناکات.

٣- حوکمەکانی ئەم ماددەیە هیچ زیانێکی نابێت بۆ هەر رێوشوێنێك، کە دەوڵەتی پێشوازیکەر سەبارەت بە پێشبەندیی نوێنەرانی کورسیی پاپاییەوە بیگرێتە بەر.

***ماددەی (١٧)***

سەرۆکی نێراوەکە وەزارەتی دەرەکیی، یان هەر وەزارەتێکی تر کە دەکرێت لەسەری رێکبکەون، لە پلەبەندیی فەرمانبەرە دبلۆماسییەکانی لە نێراوەکەدا ئاگاداردەکاتەوە.

***ماددەی (١٨)***

هەموو دەوڵەتێك لە پێشوازیکردنی ئەو سەرۆك نێراوانەی، کە لە یەك پلەدان، ڕرەچاوی پیادەکردنی یەك جۆر رێوشوێن دەکەن.

**ماددەی (١٩)**

١- کاتێك پۆستی سەرۆکی نێراوەکە چۆڵبوو، یان سەرۆکی نێراوەکە نەیتوانی کارەکانی ئەنجامبدات، سەرۆکایەتیی نێراوەکە بە کاتی بە هەڵسووڕێنەرێکی کاروبارەکان بە لەجیاتی، دەدرێت. سەرۆکی نێراوەکە، یان ئەگەر نەیتوانی وەزیری دەرەکیی دەوڵەتی نێرەر، وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان هەروەزارەتێکی تر کە دەکرێت لەسەری رێکبکەون، لەناوی هەڵسووڕێنەرە کاتییەکەی کاروبارەکان ئاگاداردەکاتەوە.

٢- دەوڵەتی نێرەر، لەکاتی نەبوونی هیچ فەرمانبەرێکی دبلۆماسی لە دەوڵەتی پێشوازیکەر، دەتوانێت، بە رەزامەندیی ئەو دەوڵەتە، یەکێك لە فەرمانبەرە کارگێڕی و هونەرییەکانی بۆ لەئەستۆگرتنی کاروبارە کارگێڕییەکانی نێراوەکە دیارییبکات.

**ماددەی (٢٠)**

سەرۆکی نێراوەکە مافی بەرزکردنەوەی ئاڵا، دروشمی دەوڵەتی نێرەری لەسەر بارەگای نێراوەکە، خانووی سەرۆکی نێراوەکە و هۆکارەکانی گواستنەوەشی هەیە.

**ماددەی (٢١)**

١- پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان بەپێی یاساکانی خۆی، ئاسانکاری بۆ کڕینی خانووی پێویست لە هەرێمەکەیدا بۆ دەوڵەتی نێرەر بکات، یاخود لە دەستخستنیی بە هەر رێگەیەکی تر هاوکاری بکات.

٢- هەروەها پێویستە لەسەری کە لە کاتی پێویستدا هاوکاریی نێراوەکان بکات، لە دەستخستنی شوێنی نیشتەجێبوونی شیاو بۆ ئەندامەکانیان.

***ماددەی (٢٢)***

١- رێـزی بارەگـای نێراوەکـە پـارێزراوە. دروسـت نییـە فەرمانبـەرانی دەوڵەتی پێشوازیکەر بچنە ناویـەوە، تـەنها بـە رەزامەنـدیی سـەرۆکی نێراوەکـە نەبێت.

٢- پابەندییـەکی تایبـەت دەکەوێتـە ئەسـتۆی دەوڵـەتی پێشـوازیکەر، بـە گرتنەبەری هەموو رێکـارێکی گونجـاو بـۆ پاراسـتنی بارەگـای نێراوەکـە لـە هـەر چوونەناوەوە، یان هـەرزیانێك و بـۆ رێگریکـردن لـە هـەر تێکـدانێکی ئاسایيشـی نێراوەکە، یان رووشاندنی شکۆمەندی.

٣- بارەگـای نێراوەکـە و کەلوپەلـەکانی نـاوی و سـامانەکانی تـر، کـە تێیـدان و ئامرازەکـانی گواسـتنەوەی، لـە رێکـاری پشـکنین یـان دەستبەسەراگرتن یان حیجزکردن یان جێبەجێکردن دەبەخشرێن.

***ماددەی (٢٣)***

١- دەوڵەتی نێرەر و سەرۆکی نێراوەکە، سەبارەت بەو کەلوپەلانەی کە بارەگای نێراوەکە خاوەنینی،یان بەکرێی گرتوون، لە هەموو رەسم و باجێکی نەتـەوەیی و هــەرێمی و شــارەوانی دەبەخشــرێن، ئەگــەر لــە بەرانبــەر خزمەتگوزارییەکی دیاریکراودا نەبووبن.

٢- ئـەو بەخشـینەی لـەم ماددەیـەدا هـاتووە، ئـەو رەسـم و گومرگانـە ناگرێتـەوە، کـە بـەپێی یاسـای دەوڵـەتی پێشـوازیکەر لەسـەر ئـەو کەسـانە پێویستن، کە گرێبەستیان لەگەڵ دەوڵەتی نێرەر، یان سـەرۆکی نێراوەکـەدا کردووە.

***ماددەی (٢٤)***

ڕێزی ئەرشیفی نێراوەکە و بەڵگەنامەکانی هەمیشە و لە هەر شوێنێکدا بن پارێزراو دەبن.

***ماددەی (٢٥)***

دەوڵەتی پێشوازیکەر هەموو ئاسانکارییەکی پێویست بۆ دەستبەکاربونی نێراوەکە بە کارەکانی پێشکەشدەکات.

***ماددەی (٢٦)***

دەوڵەتی پێشوازیکەر ئازادیی هاتووچۆ و گەشت لە هەرێمەکەیدا بۆ هەموو ئەندامانی نێراوەکە زامن دەکات، لەگەڵ پێشێلنەکردنی یاسا و سیستمە پەیوەندیدارەکان بەو ناوچانەی، کە چوونەناوەوەیان، لەبەر هۆکاری پەیوەست بە ئاسایشی نەتەوەیی، قەدەغە کراوە، یان ڕێکخراوە.

***ماددەی (٢٧)***

١- دەوڵەتی پێشوازیکەر ڕێگەی ئازادیی پەیوەندیکردن بۆ هەموو مەبەستە فەرمییەکان دەدات، ئەو ئازادییەش دەپارێزێت. نێراوەکەش بۆی هەیە، لەکاتی پەیوەندیکردن بە حوکومەتی دەوڵەتی نێرەر و نێراو و کونسولگەرییەکانی تریەوە، لە هەرشوێنێك بن، هەموو ئامرازە گونجاوەکان بەکاربهێنێت، بە نێردە (المرسل) دبلۆماسییەکان و نامەی نێراو بە ڕەمز، یان جفرەشەوە. لەگەڵ ئەوەدا، دروست نییە ئامێری بەکارهێنانی بێتەل دابنرێت، یان بەکاربهێنرێت، تەنیا بە ڕەزامەندیی دەوڵەتی پێشوازیکەر نەبێت.

٢- رێــزی نامەکارییــە فەرمییــەکانی نێراوەکــە پــارێزراو دەبێــت، مەبەستیش لە نامەکاریی فەرمی، هەموو ئەو نامەکارییانەیە، کە بە نێراوەکە و ئەرکەکانییانەوە پەیوەستن.

٣- دروست نییە جانتـای دبلۆماسـی بکرێتـەوە، یـان دەسـتی بەسـەردا بگیرێت.

٤- پێویستە ئـەو بەشـانەی، کـە جانتـا دبلۆماسـییەکەی لـێ پێکـدێت، نیشــانەگەلێکی دەرەکیــی دیاریــان پێوەبێــت، کــە سروشــتی جانتاکــە روونبکاتــەوە، دروســتیش نییــە، جگــە لــە بەڵگەنامــە دبلۆماســییەکان و کەرەستەی ئامادەکراو بۆ بەکارهێنانی فەرمی، هیچی تر لەخۆ بگرێت.

٥- دەوڵـەتی پێشـوازیکەر پاراسـتنی نێـردە (الرسـول)ی دبلۆماسـیی لەئەسـتۆیە لـە کـاتی ئەنجامـدانی کارەکانیـدا، بـە مـەرجێك ئـەو نێردەیـە بەڵگەنامەیەکی فەرمی پێبێت، کە پێگەکەی و ژمارەی بەشـەپێکهێنەرەکانی جانتـا دبلۆماسـییەکە روون بکاتـەوە، کەسـی خۆیشـی پارێزبەنـدیی هەیـە و دروســت نییــە ملکەچــی هــیچ جۆرێــك لــە جۆرەکــانی گــرتن (القــبض) دەستگیرکردن (الاعتقال) ببێتەوە.

٦- دروســتە دەوڵـەتی نێـرەر یـان نێراوەکـە نێردەیـەکی دبلۆماسـیی تایبەت دابمەزرێنێت. لەم بارەشدا حوکمەکانی بڕگەی (٥)ی ئەم ماددەیـەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، بەردەوامبوونی ئەو پارێزبەندییانـەی، کـە تێیـدا باسکراون، بە ڕادەستکردنی ئەو جانتا دبلۆماسییەی، کە لە ئەستۆیدایە بەو کەسەی کە بۆی نێراوە، کۆتایی دێت.

٧- دروســتە جانتــای دبلۆماســیی بــە کــاپتنی یــەکێك لــەو فرۆکــە بازرگانییانە بسپێرێت، کە بڕیارە لە یەکێك لـە بەنـدەرە رێگەپێدراوەکانـەوە

بنیشێتەوە، پێویستیشە ئەو کاپتنـە بەڵگەنامەیـەکی فـەرمی پێبـدرێت، کـە ژمارەی بەشە پێکهێنەرەکانی جانتا دبلۆماسییەکە ٍوون بکاتـەوە، بـەڵام بـە نێردەی دبلۆماسیی هـەژمارناکرێت. هـەروەها دروسـتە نێراوەکـە یـەکێك لـە ئەندامانی خـۆی بـۆ وەرگـرتنی جانتـا دبلۆماسـییەکە لـە کـاپتنی فڕۆکەکـە، بەشێوەیەکی ئازادانە و راستەوخۆ، وەر بگرێت.

***ماددەی (٢٨)***

ئەو ڕەسـم و داهاتانـەی (العائـدات)، کـە نێراوەکـە لـەکاتی ئەرنجامـدانی ئەرکــە فەرمییەکانیــدا دەســتی دەکــەوێت، لــە هــەموو ڕەســم و باجێــك دەبەخشرێن.

***ماددەی (٢٩)***

ڕێزی کەسیی نوێنەری دبلۆماسیی پارێزراوە. دروست نییە ملکەچی هـیچ جۆرێك لە جۆرەکانی گرتن و دەستگیرکردن بکرێـت. پێویستیشـە دەوڵـەتی پێشــوازیکەر بــە ڕێــزی شاییســتەوە مامەڵــەی لەگەڵــدا بکــات، هــەموو ڕێوشوێنێکی گونجاو بۆ ڕێگرتن لە هەردەستدرێژییەك بۆ سەر کەسی خـۆی، یان ئازادی، یان شکۆی، بگیرێتە بەر.

**ماددەی (٣٠)**

١- ئەو خانووە تایبەتـەی، کـە نوێنـەری دبلۆماسـیی تێیـدا نیشـتەجێ دەبێت، هەمان ئەو پارێزبەندی و پاراسـتنەی هەیـە، کـە بارەگـای نێراوەکـە هەیەتی.

٢- هەروەها پەڕاو و نامەکارییەکانی پارێزبەندییان هەیـە، هەروەکچۆن سامانەکانیشی هەیانە، بە رەچاوکردنی بڕگەی (٣) لە ماددەی (٣١).

**ماددەی (٣١)**

١- نوێنەری دبلۆماسـی، لـەوەی کـە پەیوەنـدیی بـە دادوەریـی سـزایی دەوڵـەتی پێشـوازیکەرەوە هەیـە، پارێزبەنـدیی دادوەری هەیـە. هــەروەها لــەوەی کــە پەیوەنــدیی بــە دادوەریــی شارســتانی و کارگێڕییــەوە هەیــە پارێزبەندیی هەیە، تەنیا لەم بارانەدا نەبێت:

أ. داوا عەینییــەکانی پەیوەســت بــە ســامانی خانووبــەرەی (الأمــوال العقاریــة) تایبــەت، کــە لــە هــەرێمی دەوڵــەتی پێشــوازیکەردان، مەگــەر خاوەندارێتییەکەی بۆ بەرژەوەنـدیی دەوڵـەتی نێـرەر و بـۆ بـەکارهێنانی بـۆ مەبەستەکانی نێراوەکە بێت.

ب. ئەو داواکارییانەی کە پەیوەستن بە کاروبـاری مـیرات و جێمـاوەوە، کە بە سیفەتی جێبەجێکار، یان بەرێوەبەر، یان میراتگر، یان وەسیەتبۆکراو تێیدایـە، ئەمـەش بـە ئەسالەت لـە خـۆدی خـۆی، نـەك بـە نـاوی دەوڵـەتی نێرەرەوە.

ج. ئــەو داوایانــەی کــە پەیوەســتن بــە هەرچـالاکییەکی پیشــەیی یــان بازرگانی، کە نوێنەری دبلۆماسیی لـە دەوڵـەتی پێشـوازیکەردا لـە دەرەوەی فەرمانەکانی خۆی ئەنجامی دەدات.

٢- نوێنەری دبلۆماسی لە گەواهیدان دەبەخشرێت.

٣- دروست نییە هەر ڕێکارێکی جێبەجێکاریی لە بەرانبەر نوێنەری دبلۆماسیی بگیرێتە بەر، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە لە بەندەکان (أ) و (ب) و (ج)ی برگەی (١)ی ئەم ماددەیەدا هاتوون، بە مەرجی ئەوەی، کە بتوانرێت ئەو ڕێکارانە بەبێ لێدان لە ڕێزی کەسیی و خانووی نوێنەرەکە بگیرێتە بەر.

٤- بوونی پاریزبەندیی نوێنەری دبلۆماسی لە دەوڵەتی پێشوازیکەر، لە دادگای دەوڵەتی نێرەر نایبەخشێت.

***ماددەی (٣٢)***

١- دەوڵەتی نێرەر دەتوانێت سازش لە پارێزبەندیی دادوەریی نوێنەرەدبلۆماسییەکانی و ئەو کەسانە بکات، کە بەپێی ماددەی (٣٧) ئەو پارێزبەندییانەیان هەیە.

٢- لە هەموو بارێکدا دەبێت سازشەکە ڕاشکاوانە بدات.

٣- نوێنەری دبلۆماسی و ئەو کەسەشی، کە بەپێی ماددەی (٣٧) پارێزبەندیی دادوەریی هەیە، ئەگەر هەرداوایەك بەرز بکەنەوە، ماف ئەوەیان نییە پشت بە پارێزبەندی دادوەریی ببەستن سەبارەت بە هەر داوایەکی تر، کە ڕاستەوخۆ بە داوا بنەڕەتییەکەوە پەیوەست بێت.

٤- سازشکردن لە پارێزبەندیی دادوەریی سەبارەت بە هەر داوایەکی شارستانی، یان کارگێڕیی، هیچ جۆرە سازشێك لە پارێزبەندیی سەبارەت بە جێبەجێکردنی حوکم لەخۆناگرێت، بەڵکو بۆ جێبەجێکردن حوکم پێویستە سازشێکی سەربەخۆ بکرێت.

***ماددەی (٣٣)***

١- سەبارەت بەو خزمەتگوزارییانـەی کـە پێشکەشـبە دەوڵـەتی نێـرەر دەکرێت، نوێنـەری دبلۆماسـی لـە حوکمـەکانی ئـەو دڵنیاییـە کۆمەڵایەتییـە دەبەخشـرێت، کـە لـە دەوڵـەتی پێشـوازیکەردا بـەکارن، ئەمـە لەگـەڵ ڕەچاوکردنی حوکمەکانی بڕگەی (٣)ی ئەم ماددەیە.

٢- هـەروەها ئـەو بەخشـینەی، کـە لـە بڕگـەی (١)ی ئـەم ماددەیـەدا هاتووە، بەسەر ئەو خزمەتگوزارە تایبەتانەدا جێبەجێ دەبێت، کە تەنها لـە خزمەتی نوێنەری دبلۆماسیدا کاردەکەن:

أ. ئەگـەر لـە هاوڵاتییـانی دەوڵـەتی پێشـوازیکەر، یـان لەوانـە بـن کـە بەهەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە.

ب. هەروەها ملکەچی حوکمەکانی ئەو دڵنیاییە کۆمەڵایەتییە بوون، کـە لە دەوڵەتی نێرەر، یان لە هەردەوڵەتێکی تر کاریان پێدەکرێت.

٣- ئەو نوێنەرە دبلۆماسییەی، کـە کەسـانێك بـەکاردەهێنێت، کـە ئـەو بەخشینەی لە بڕگەی (٢)ی ئەم ماددەیەدا هـاتووە نایانگرێتـەوە، پێویسـتە ڕەچاوی ئەو پابەندییانە بکات، کە حوکمەکانی دڵنیایی کۆمەڵایـەتی بەسـەر خاوەنکارەکاندا دەیسەپێنێت.

٤- ئەو بەخشینەی، کە لە هەردوو بڕگـەی (١) و (٢)ی ئـەم ماددەیـەدا هـاتووە، ڕێگریـی لـە بەشـداریکردنی خۆویسـتانە لـە سیسـتمی دڵنیـایی کۆمەڵایەتی بەکار، لـە دەوڵـەتی پێشـوازیکەر، ناکـات، ئەگـەر ئـەو دەوڵەتـە مۆڵەتی ئەو بەشداریکردنە بدات.

٥- حوکمەکانی ئەم ماددەیە کاریگەرییلەسەر رێککەوتنە دووانەیی و فرەلایەنییە بەکارەکانی دڵنیایی کۆمەڵایەتیی نابێت، لەبەردەم بەستنی هاوشێوەی ئەو رێککەوتنانەشدا رێگر نابێت.

***ماددەی (٣٤)***

نوێنەری دبلۆماسیی لە هەموو رەسم و باجە کەسی یان عەینییەکان،نەتەوەیی یان هەرێمی یان شارەوانییەکان، دەبەخشرێت، جگە لەمانەی کە دێن:

أ. ئەو باجە ناراستەوخۆیانەی کە بەگشتی دەچنە سەر هاوشێوەکانیان لە نرخی سامان و خزمەتگوزارییەکان.

ب. باجە ناڕاستەوخۆ سەپێنراوەکان بەسەر ئەو سامانە خانووبەرەییە تایبەتانەی، کە لە هەرێمی دەوڵەتی پێشوازیکەردان، ئەگەر خاوەنداریێتییان لەبری دەوڵەتی نێرەر و بۆ بەکارهێنانی مەبەستەکانی نێراوەکە نەبن.

ج. ئەو باجانەی کە دەوڵەتی پێشوازیکەر بەسەر جێماودا دەیسەپێنن، لەگەڵ رەچاوکردنی حوکمەکانی بڕگەی (٤)ی ماددەی (٣٩).

د. ئەو رەسم و باجانەی کە بەسەر داهاتی تایبەتی دەستکەوتوو لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا دەسەپێنرێت،ئەو باجانەی بەسەر ئەو سەرمایانەدا سەپێنراون، کە لە پرۆژەی بازرگانیی ئەنجامدراو لەو وڵاتەدا وەبەرهێنراون.

ه. ئەو رەسمانەی کە لە بەرانبەر خزمەتگوزارییەکی تایبەتدا سەپێنراون.

و. رەسمی تۆمارکردن و بەبەڵگەنامەکردن و بارمتەی خانووبەرە و پول و رەسمی دادوەری سەبارەت بە سامانە خانووبەرەییە تایبەتەکان، ئەمەش بەرەچاوکردنی حوکمەکانی ماددەی (٢٣).

**ماددەی (٣٥)**

دەوڵــەتی پێشــوازیکەر نوێنــەرە دبلۆماســییەکان لــە هــەموو جــۆرە خزمەتگوزارییــە کەســی و گشــتییەکان و لــە پابەندییــەکان و ئەرکــە ســەربازییەکانی وەك ملکەچــبوون بــۆ رێوشــوێنی دەستبەســەراگرتن و پێشکەشکردنی کۆمەك و فەراهەمکردنی شوێنی نیشتەجێبوون، دەبەخشێت.

**ماددەی (٣٦)**

١- دەوڵـەتی پێشـوازیکەر، بـەپێی یاسـا و سیسـتمەکانی، رێگـە بـە هاتنــەناوەوەی ئــەو ماددانــەی، کــە دێــن دەدات و لــە هــەموو رەسمــە گومرگییەکان و باج و تێچووەکانی تـر دەیـان بەخشـێت، جگـە لـە تێچـووی عەمبارکردن و گواستنەوە و خزمەتگوزارییە هاوشێوەکان:

أ. ئەو ماددانەی، کە بۆ بەکارهێنانی فەرمیی نێراوەکە ئامادەکراون.

ب. ئەو ماددانەی، کە بۆ بەکارهێنانی تایبەتیی نوێنەری دبلۆماسی، یان ئەو ئەندامانەی خێزانەکەی، کە لەگەڵیدا دەژین، ئامادەکراون، لەنێویاندا ئەو ماددانەی، کە بۆ جێگیربوونی ئامادەکراون.

٢- کەلوپەلی کەسیی نوێنەری دبلۆماسـیی لـە پشـکنین دەبەخشـرێت، مەگــەر هۆکارگــەلێك هــەبن وا بکــەن، کــە گریمانــەی ئــەوە بکرێــت کــە ماددەگەلێکیان تێدایە، کە ئەو بەخشینانەی لە برگەی (١)ی ئەم ماددەیـەدا هاتوون نایان گرێتەوە، یان ماددەگەلێکیان تێدایە کە یاسا هاوردەکردن یان هـەناردەکردنیانی یاسـاغ کـردووە، یـاخود ماددەگـەلێکیان تێدایـە، کـە لـە دەوڵەتی پێشوازیکەردا، ملکەچی سیستمی دەستبەسـەراگرتنی تەندروسـتی دەبنەوە. ئەنجامدانی پشکنینیش، بەبێ ئامادەیی نوێنـەری دبلۆماسـی یـان نمایندەی راسپێراوی نەبێت، دروست نییە ئەنجامبدرێت.

**ماددەی (٣٧)**

١- ئەندمانی خێزانی نوێنەری دبلۆماسیی کە لەگەڵیدا دەژین، ئەگەر لە هاوڵاتیی دەوڵەتی پێشوازیکەر نەبن، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانـەیان هەیـە، کە لە ماددەکانی (٢٩) تا (٣٦)دا هاتوون.

٢- فەرمانبەرە کارگێڕی و هونەرییەکانی نێراوەکە، هەروەها ئەنـدامانی خێزانەکانیان لەوانەی کە لەگەڵیدا دەژیـن، ئەگـەر لـە هاولاتییـانی دەوڵـەتی پێشوازیکەر نەبن، یان لەوانە نەبن کە بەهەمیشـەیی تێیـدا ماونەتـەوە، ئـەو جیاوك و پارێزبەندییانەیان هەیە، کە لە ماددەکانی (٢٩) تا (٣٥)دا هاتوون، بــە مــەرجێك ئــەو پارێزبەندییــەی، کــە لــە بڕگــەی (١)ی مــاددەی (٣١)دا سەبارەت بە دادوەریی شارستانی و کارگێڕیی دەوڵەتی پێشوازیکەر هاتووە، درێژنەبێتەوە بـۆ ئـەو کارانـەی کـە لـە دەرەوەی چوارچـێوەی کارەکانیانـدا ئـەنجامی دەدەن، هـەروەها ئـەو جیاوکانـەیان هەیـە، کـە لـە بڕگـەی (١)ی مــاددەی (٣٦)دا ســەبارەت بــەو ماددانــە هــاتووە، کــە لــەکاتی یەکــەم جێگیربوونیان هاوردەی دەکەن.

٣- ئەنـدامانی سـتاف خزمـەتگوزاریی نێراوەکـە، کـە لـە هاوڵاتییـانی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان لەوانـە نـین کـە بەهەمیشـەیی تێیـدا ماونەتـەوە، پارێزبەنـدییان سـەبارەت بـەو کارانـەی، کـە لـە کـاتی جێبـەجێکردنی ئەرکەکانیاندا جێبەجێی دەکەن هەیـە، هـەروەها لەورەسـم و باجەکانەیکـە پەیوەندییان بەو کرێیەوە هەیە، کە لە بەرانبەر خزمەتکردنیان وەریـدەگرن، دەبەخشـرێن، هـەروەها ئـەو بەخشـینەش دەیـان گرێتـەوە کـە لـە مـاددەی (٣٣)دا هاتووە.

٤- ئەو خزمەتگوزارە تايبەتانەی، کە لای یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکە کاردەکەن، ئەگەر لە هاوڵاتییانی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان لەو کەسانە نەبن، کە بە هەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە، لەورەسم و باجانەی کە پەیوەندییان بەو کرێیەوە هەیە، کە لە بەرانبەر خزمەتکردنیان وەریدەگرن، دەبەخشرێن. لەلایەکی ترەوە، لە غەیری ئەوە جیاوك و پارێزبەندیی تریان نییە، تەنها بەو ئەندازەیە نەبێت، کە دەوڵەتی پێشوازیکەر رێگەی پێدەدات. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتە لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو کەسانەدا وریا بێت، لەوەی پەیوەندی بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی نێراوەکەوە هەیە دەستێوەردانی زیادنەکات.

### ***ماددەی (٣٨)***

١- ئەو نوێنەرە دبلۆماسییەی کە لە هاوڵاتییانی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان لەوانەیە کە بەهەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە، تەنها پارێزبەندیی دادوەری و رێزی کەسیی سەبارەت بەو کارە فەرمییانە هەیە، کە بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئەنجامی دەدات، ئەمە ئەگەر دەوڵەتی پێشوازیکەر جیاوك و پارێزبەندیی زیادەی پێ نەبەخشێت.

٢- فەرمانبەرەکانی تری نێراوەکەو خزمەتگوزارە تایبەتەکان، کە لە هاوڵاتییانی دەوڵەتی پێشوازیکەرن، یان بە هەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە، جیاوك و پارێزبەندییان نییە، جگە لەو ئەندازەیەی کە دەوڵەتی ناوبراو رێگەی پێدەدات. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتە، لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو کەسانەدا وریابێت، لەوەی

پەیوەندیی بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی نێراوەکەوە هەیە دەستێوەردانی زیاد نەکات.

***ماددەی (٣٩)***

١- هەرکەسێك کە جیاوك و پارێزبەندییەکانی هەیە، لە ساتی چوونەناوەوەی بۆ هەرێمی دەوڵەتی پێشوازیکەر بۆ وەرگرتنی پۆستەکەی، یان ئەگەر لەسەر هەرێمەکەی بوو، لە ساتی ئاگادارکردنەوەی وەزارەتی دەرەکی، یان هەر وەزارەتێکی تر کە دەکرێت لەسەری رێك بکەون، لە دامەزراندنەکەی، مافی ئەوەیهەیە سوودیان لێ وەربگرێت.

٢- هەرکاتێك ئەرکەکانی کەسێك کە جیاوك و پارێزبەندیی هەیە، تەواو بوو، ئەوا ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی بە شێوەیەکی ئاسایی، لە ساتی جێهێشتنی وڵات، یان بەسەربردنی ماوەیەکی مەعقول، کە بۆ ئەو مەبەستە پێی دەبەخشرێت، تەواو دەبێت، بەڵام تا ئەو کاتە هەر بەردەوام دەبێت، تەنانەت لە حاڵەتی ناکۆکیی چەکداریشدا. سەبارەت بەو کارانەشی کە کەسێك لە ئەرکەکانیدا، وەك یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکە، ئەنجامی دەدات، پارێزبەندی هەر بەردەوام دەبێت.

٣- ئەندامانی خێزانی کەسێکی کۆچکردوو لە ئەندامانی نێراوەکە، تا بەسەربردنی ماوەیەکی مەعقول، کە بۆ جێهێشتنی ئەو وڵاتە پێیان دەبەخشرێت، ئەو جیاوك و پارێزبەندییانەی شایستەی خۆیانە بەردەوام دەبێت.

٤- ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکە کۆچی دوایی کرد، لە هاووڵاتیانی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان لەوانە بوو کەبەهەمیشەیی تێیدا ماونەتەوە، یاخود ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی، لەوانەی کە

لەگەڵیدا دەژین، کۆچی دوایی کرد، دەوڵەتی پێشوازیکەر رێگە بە رراکێشانی سامانی گواستراوەی کۆچکرووەکە دەدات، جگە لەو سامانانەی کە لەو وڵاتەدا دەستی کەوتوون، کە هەناردەکردنی لەکاتی کۆچکردنیدا یاساغە. هەروەها دروست نییە باجی جێماو لەو سامانە گواستراوانە بدرێت، کە لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا بوونیان هەیە، تەنها لەبەرئەوەی کە کۆچکردووەکە بەو وەسفە تێیدایە، کە یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکە یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیەتی.

***ماددەی (٤٠)***

١- ئەگەر نوێنەرێکی دبلۆماسی بە دەوڵەتی سێیەمدا تێپەڕی، یان لە هەرێمەکەیدا مایەوە، کە ڤیزەی هاتنەناوەوەی پێدابێت، ئەگەر ئەو ڤیزەیە پێویست بێت، ئەوا لەکاتی تێپەڕینی بەو هەرێمەدا بۆ وەرگرتنی پۆستەکەی یان لە کاتی گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی خۆی، پێویستە پارێزبەندیی کەسی و ئەو پارێزبەندییانەی تریشی بداتێ، کە بۆ گرێنتیکردنی تێپەڕینی یان گەڕانەوەی پێویستن. لە حاڵەتی هەر،یەکێك لەو ئەندامانەی خێزانی نوێنەری دبلۆماسی، کە جیاوك و پارێزبەندییان هەیە، لەوانەی کە هاورێیەتی نوێنەری دبلۆماسی دەکەن، یان بەتەنیا دەچن بۆ لای، یاخود کە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان، هەمان شت جێبەجێ دەبێت.

٢- دروست نییە دەوڵەتی سێیەم، لە بارودۆخی هاوشێوەی ئەوەی لە برگەی (١)ی ئەم ماددەیەدا هاتووە، رێگری لە هاتوچۆی فەرمانبەرە کارگێڕی و هونەرییەکان و خزمەتگوزارەکانی یەکێك لە نێراوەکان،ئەندامانی خێزانەکانیان، بە هەرێمەکەیدا بکات.

٣- دەوڵەتی سێیەم، هەمان ئەو ئازادی و پاراستنە بەو نامەکارییە فەرمییانە دەبەخشێت، کە بە هەرێمەکەیدا تێپەڕ دەبن، کە لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا هەیانە، بەو نامانەشەوە کە بە هێما یان بە جفرە دەنێرێن. هەروەها بەو نێردە دبلۆماسییانەی، کە ڤیزەی پاسپۆرتیان وەرگرتووە، ئەگەر ئەو ڤیزەیە پێویست بێت، هەروەها جانتا دبلۆماسییەکان لەکاتی تێپەڕبوون بە هەرێمەکەیدا، هەمان ئەو پارێزبەندی و پارێزگارییەیان هەیە، کە پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر پێیان ببەخشێت.

٤- ئەو پابەندییانەی کە دەوڵەتی سێیەم، بەپێی بڕگەکانی (١) و (٢) و (٣)ی ئەم ماددەیە، لە ئەستۆیدایە، ئەگەر ئەو کەس و نامەکارییە فەرمی و جانتا دبلۆماسییانەی، کە باسکراون بەهۆی هێزی ناچارکەر (القوة القاهرة)ەوە، بکەونە هەرێمەکەیەوە، بە هەمان شێوە بەدوای یەکدا ئەو پابەندییانەی لە ئەستۆدایە.

#### *ماددەی (٤١)*

١- بەبێ زیانگەیاندن بە جیاوك و پارێزبەندییەکانیان، پێویستە هەموو ئەو کەسانەی، کە جیاوك و پارێزبەندییان هەیە، ڕێز لە یاسا و سیستمی دەوڵەتی پێشوازیکەر بگرن، هەروەها پێویستە دەست لە کاروبارە ناوخۆییەکانی وەرنەدەن.

٢- پێویستە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتی پێشوازیکەر، سەبارەت بەو کارە فەرمییانەی، کە دەوڵەتی نێرەر بە نێراوەکەی دەسپێرێت، لەگەڵ وەزارەتی دەرەکیی دەوڵەتی پێشوازیکەر، یان لە ڕێگەیەوە، یان لە ڕێگەی هەر وەزارەتێکی ترەوە کە دەکرێت لەسەری ڕێك بکەون، ئەنجامبدرێت.

٣- پێویستە بارەگای نێراوەکە بە هیچ رێگەیەك بەکارنەیەت، کە لەگەڵ ئەرکەکانی نێراوەکەدا، وەك ئەوەی لەم رێککەوتننامەیەدا، یان لە غەیری ئەو لە رێساکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتیدا، یان لە هەر رێککەوتننامەیەکی تایبەتی بەکاری نێوان دەوڵەتی نێرەر و پێشوازیکەردا هاتووە، دژ بێت.

### ماددەی (٤٢)

دروست نییە نوێنەری دبلۆماسیی لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا هیچ چالاکییەکی پیشەیی یان بازرگانی بۆ بەرژەوەندیی کەسیی خۆی ئەنجامبدات.

### ماددەی (٤٣)

کاری دبلۆماسیی لە چەند حاڵەتێکدا کۆتایی دێت، لەوانە:

أ- ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی پێشوازیکەر لەلایەن دەوڵەتی نێرەرەوە، بەتەواوبوونی کاری نوێنەری دبلۆماسیی.

ب- ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی نێرەرلەلایەن دەوڵەتی پێشوازیکەرەوە، بەوەی کە بەپێی برگەی (٢) لە ماددەی (٩)، ڕەتی دەکاتەوە دان بە نوێنەری دبلۆماسی وەك یەکێك لە ئەندامانی نێراوەکەدا بنێت.

### ماددەی (٤٤)

پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر، تەنانەت لە باری بوونی ناکۆکیی چەکدارییشدا، ئاسانکاریی پێویست ببەخشێت بۆ ئەوەی ئەو بیانییانەی، کە جیاوك و پارێزبەندییان هەیە، هەروەها ئەندامانی خێزانەکانیان، بەبێ

ڕەچاوکردنی ڕەگەزنامەیان، بتوانن لە نزیکترین کاتی گونجاودا جێی بهێڵن. پێویستە، بەتایبەت، لەکاتی پێویستدا هۆکاری گواستنەوەی پێویست بۆ گواستنەوەی خۆیان و سامانیان بخاتە بەردەست.

**ماددەی (٤٥)**

لەباری پچڕانی پەیوەندیی دبلۆماسییەکان لە نێوان دوو دەوڵەتدا، یان لەباری بانگێشتکردنەوەی کاتیی یان هەمیشەیی یەکێك لە نێراوەکان، پێویستە ڕەچاوی ئەم حوکمانە بکرێت:

أ. پێویستە دەوڵەتی پێشوازیکەر لە باری بوونی ناکۆکیی سەربازیدا، ڕێز لە بارەگای نێراوەکە بگرێت و پارێزگاری لیٚ بکات، هەروەها بۆ سامان و ئەرشیفەکانیشی.

ب. دروستە دەوڵەتی نێرەر پاسەوانیکردنی بارەگای نێراوەکە،سامان و ئەرشیفەکانی بە دەوڵەتێکی سێیەم بسپێرێت، کە دەوڵەتی پێشوازیکەر پێی ڕازی بێت.

**ماددەی (٤٦)**

دروستە دەوڵەتی نێرەر، بە ڕەزامەندیی پێشوەختەی دەوڵەتی پێشوازیکەر، پشتبەست بە داوای دەوڵەتێکی سێیەم کە نوێنەرایەتیی لە دەوڵەتی پێشوازیکەردا نییە، بەشێوەیەکی کاتی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی سێیەم و بەرژەوەندیی هاوڵاتییەکانی لەئەستۆ بگرێت.

***ماددەی (٤٧)***

١- دروست نییە دەوڵەتی پێشوازیکەر لە جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا جیاکاری لەنێوان دەوڵەتاندا بکات.

٢- لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمانە بە جیاکاری دانانرێن:

أ. ئەگەر دەوڵەتی پێشوازیکەر یەکێك لە حوکمەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیەی، بەهۆی جێبەجێکردنی بەرتەسکانەی بەسەر نێراوەکەیدا لەلایەن دەوڵەتی نێرەرەوە، بەشێوازێکی بەرتەسکانە جێبەجێی کرد.

ب. ئەگەر دەوڵەتان، بەپێی نەریت یان ڕێککەوتنەوە، مامەڵەیەکی باشتریان لەوەی حوکمەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە داوای دەکات، ئاڵوگۆڕ کرد.

***ماددەی (٤٨)***

ئەم ڕێککەوتننامەیە دەخرێتەروو بۆ واژۆکردنی هەموو دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان، یان لە یەکێك لە ئاژانسە تایبەتەکان، یان لایەنەکانی سیستمی بنەڕەتیی دادگای دادای نێودەوڵەتیی و هەموو دەوڵەتانی تری بانگێشتکراو لەلایەن کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بۆ بوون بە لایەن لەم ڕێککەوتننامەیەدا، بەم شێوەیە: تا (٣١)ی تشرینی یەکەمی (١٩٦١) لای وەزارەتی فیدراڵی بۆ کاروباری دەرەکی لە نەمسا، دواتر تا (٣١)ی ئازاری (١٩٦٢)، لە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان لە نیۆیۆرك.

***ماددەی (٤٩)***

ئەم ڕێککەوتننامەیە ڕاستاندنی بۆ دەکرێت و بەڵگەنامەکانی ڕاستاندن لای سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان سپاردەدەکرێت.

**ماددەی (٥٠)**

خستنەرووی ئەم رێککەوتننامەیە بۆ هاتنەپاڵی هەموو ئـەو دەوڵەتانـەی، کە دەچنە خانەی یەکێك لەو چوار جۆرەی، کە لە ماددەی (٤٨)دا هـاتوون، بەکراوەیی دەمێنێتەوە. بەڵگەنامەی هاتنەپاڵەکانیش لای سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان سپاردەدەکرێن.

**ماددەی (٥١)**

١- ئەم رێککەوتننامەیە لە رۆژی سییەمی دوای مێژووی سـپاردەکردنی بیست و دووەمین بەڵگەنامە لە بەڵگەنامەکانی راستاندن، یـان هاتنـەپاڵ لای سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان، جێبەجێ دەکرێت.

٢- سـەبارەت بـە هەردەوڵـەتێك، کـە لـەدوای سـپاردەکردنی بیسـت و دووەمین بەڵگەنامە لە بەڵگەنامەکانی راستاندن، یان هاتنەپاڵ، راستاندن بۆ ئـەم رێککەوتننامەیـە دەکـات، یـان دێتـە پـاڵی، لـە رۆژی سـییێەمی دوای سـپاردەکردنی بەڵگەنامـەی راسـتاندن یـان هاتنەپاڵەکەیـەوە، ئـەم رێکەوتننامەیە جێبەجێ دەکرێت.

**ماددەی (٥٢)**

سـکرتێری گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان، هەڵدەسـتێت بـە ئاگادارکردنەوەی هەموو ئەو دەوڵەتانەی، کە دەچنە خانەی یەکێك لەو چوار جۆرەی، کە لە ماددەی (٤٨)دا هاتوون، کە:

أ. ئیمزاکردن لەسەر ئەم رێککەوتننامەیە و سپاردەکردنی بەڵگەنامـەی راستاندن، یان هاتنەپاڵ، بەپێی ماددەی (٤٨) و (٤٩) و (٥٠) دەبێت،

ب. مێژووی جێبەجێبوونی ئـەم رێککەوتننامەیـە بـەپێی مـاددەی (٥١) دەبێت.

***ماددەی (٥٣)***

بنــەڕەتی ئــەم رێککەوتننامەیــە، کــە بــە پێــنج زمــانی فــەرمیی یەکســان نووسراوەتەوە، کە ئیسپانی و ئینگلیزی و ڕووسی و چینی و فەڕەنسین، لای سـکرتێری گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان سـپاردەدەکرێت، کـە وێنەیـەکی ڕاستێنراوی بۆ هەموو ئەو دەوڵەتانەی، کە دەچنە خانەی یـەکێك لـەو چـوار جۆرەی، کە لە ماددەی (٤٨)دا هاتوون، دەنێرێت.

بۆ سەلماندنی ئەوەی باسکرا، ئەم راسپێراوانەی کە لـە خـوارەوە ناویـان هاتووە، دوای پێشکەشکردنی راسـپاردنەکانیان، کـە مەرجـە شـکڵییەکانیان بەپێی بنەماکان تێدا بینراوە، واژۆی ئەم رێککەوتننامەیەیان کرد.

لـە ڤیـەننا، لـە رۆژی هـەژدەی مـانگی نیسـانی سـاڵی هـەزار و نۆسـەد و شەست و یەك نووسرا.

# ليستى سەرچاوەكان

**یەکەم: قورئانی پیرۆز**

**دووەم: سەرچاوە کوردییەکان:**

**- كتێب**


١. د. ئەحمەد نەقیب زادە، مێژووی دیپلۆماسی و پێوەندییە نێونەتەوەییەکان (١٦٤٨–٢٠٠٤)، وەرگێڕانی: مستەفا مەعروفی، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢. د. دانا عەلی ساڵح، کاریگەریی زمانی جەستە لە دانوستانە سیاسییەکاندا، وەرگێڕان و زیادکردنی: هاوکار رەفیق، چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٧.

٣. د. سەردار عەزیز، دیپلۆماسیی پەرلەمانیی: چالاککردنی پەرلەمانی کوردستان لەڕووی دیپلۆماسییەوە، ژووری توێژینەوەی سیاسیی بزوتنەوەی گۆڕان، سلێمانی، ٢٠١٦.


**سێیەم: سەرچاوە عەرەبییەکان (المصادر العربية):**

**أ. پەیماننامە و رێککەوتننامە و جاڕنامەکان (المعاهدات والاتفاقيات والإعلانات):**


١. ميثاق الأمم المتحدة، لسنة (١٩٤٥).

٢. اتفاقية امتيازات وحصانات الأمم المتحدة، لسنة (١٩٤٦).

٣. اتفاقية امتيازات وحصانات الوكالات الدولية المتخصصة، لسنة (١٩٤٧).

٤. الإعلان العالمي لحقوق الإنسان، لسنة (١٩٤٨).

٥. اتفاقية فيننا للعلاقات الدبلوماسية، لسنة (١٩٦١).

٦. اتفاقية فيننا للعلاقات القنصلية، لسنة (١٩٦٣).

٧. اتفاقية فيننا للبعثات الخاصة، لسنة (١٩٦٩).
٨. اتفاقية منع الجرائم المرتكبة ضد الأشخاص المتمتعين بحماية دولية، بما فيهم الموظفون الدبلوماسيون، لسنة (١٩٧٣).
٩. اتفاقية فيننا لتمثيل الدول في علاقاتها مع المنظمات الدولي ذات الطابع العالمي، لسنة (١٩٧٥).
١٠. اتفاقية سلامة موظفي الأمم المتحدة والأفراد المرتبطين بها، لسنة (١٩٩٤).

ب. **دەستوور و یاساکان (الدساتير والقوانين):**

١. دستور الجمهورية العراقية الدائم، سنة (٢٠٠٥).
٢. قانون الخدمة الخارجية العراقية رقم (٤٥) لسنة (٢٠٠٨).

ج. **فەرهەنگەکان (الموسوعات):**

١. فرانك بيلي، معجم بلاكويل للعلوم السياسية، ترجمة ونشر: مركز الخليج للأبحاث، دبي، ٢٠٠٤.

د. **کتێبی عەرەبی و بەعەرەبیکراو (الكتب العربية والمعرَّبة):**

١. جمال بركات، الدبلوماسية (ماضيها وحاضرها، مستقبلها)، مطابع الفرزدق، الرياض، ١٩٨٥.
٢. جوزيف إم سيراكوسا، الدبلوماسية: مقدمة قصيرة جدا، ترجمة: كوثرمحمودمحمد، مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة، القاهرة، ٢٠١٥.
٣. حسان خضر، خطوات ومناهج واستراتيجيات التفاوض، المعهد العربي للتخطيط، الكويت، أبريل ٢٠٠٥. (تأريخ الزيارة٢/٢/٢٠١٧) على موقع:
http://www.arab-api.org/course33/c33_5.htm

٤. د. إبراهيم الفقي، البرمجة اللغوية العصبية وفن الاتصال اللامحدود، إبداع للإعلام والنشر، القاهرة، ٢٠٠٨.
٥. د. أحمد أبو الوفا، الوسيط في قانون المنظمات الدولية، دار النهضة العربية، القاهرة، ٢٠١١.
٦. د. إسماعيل صبري مقلد، العلاقات السياسية الدولية: دراسة في الأصول والنظريات، ذات السلاسل للطباعة والنشر والتوزيع، الكويت، ط٥، ١٩٨٧.
٧. د. السيد أمين شلبي، في الدبلوماسية المعاصرة، عالم الكتب، القاهرة، ط٢، ١٩٩٧.
٨. د. حسن محمد وجيه، مقدمة في علم التفاوض الاجتماعي والسياسي، سلسلة عالم المعرفة، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت، ١٩٩٤.
٩. خديجة النبراوي، موسوعة أصول الفكر السياسي والاجتماعي والإقتصادي، المجلد الخامس، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع والترجمة، القاهرة، ٢٠٠٤.
١٠. د. دانا علي صالح البرزنجي، ثورة الاتصالات والتعاون الدولي في ظل العولمة، مركز الزهاوي للدراسات الفكرية، السليمانية، ٢٠١٣.
١١. د. سهيل حسين الفتلاوي، الدبلوماسية بين النظرية والتطبيق، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦.
١٢. د. شاكر محمود وهيب البياتي و د. علي عبد الحسين عبدالله العقابي، الدليل الدبلوماسي، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠١٥.
١٣. د. عامر مصباح، معجم العلوم السياسية والعلاقات الدولية، دار الكتاب الحديث، القاهرة، ٢٠١٠.

١٤. عبدالرزاق أحمد السنهوري، الوسيط في شرح القانون المدني، الجزء الثامن عشر، حق الملكية: مع شرح مفصل للأشياء والأموال، دار إحياء التراث العربي، بيروت، بلا سنة الطبع.

١٥. د. عبدالعزيز بن ناصر بن عبدالرحمن العبيكان، الحصانات والامتيازات الدبلوماسية والقنصلية في القانون الدولي، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٧.

١٦. د. عبدالفتاح علي الرشدان و د. محمد خليل الموسى، أصول العلاقات الدبلوماسية والقنصلية، المركز العلمي للدراسات السياسية، عمان – الأردن، ٢٠٠٥.

١٧. د. عبدالقادر محمد فهمي، المدخل إلى دراسة الاستراتيجية، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان – الأردن، ٢٠٠٦.

١٨. د. عبدالمجيد محمد الأقطش و يحيى سالم الأقطش، في السياسة الشرعية، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، عمان – الأردن، ٢٠١٠.

١٩. د. عدنان البكري، العلاقات الدبلوماسية والقنصلية، دار الشراع للنشر، الكويت، ١٩٨٥.

٢٠. د. عدنان السيد حسين، العلاقات الدولية في الإسلام، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ط٢، ٢٠١٠.

٢١. د. عدنان السيد حسين، نظرية العلاقات الدولية، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ط٣، ٢٠١٠.

٢٢. د. عطا محمد صالح زهرة، في النظرية الدبلوماسية، الإصدار الثاني، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

٢٣. د. علي حسين الشامي، الدبلوماسية: نشأتها وتطورها وقواعدها ونظام الحصانات والامتيازات الدبلوماسية، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٩.

٢٤. د. علي صادق أبو هيف، القانون الدبلوماسي، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠٥.
٢٥. د. فاضل زكي محمد، الدبلوماسية في عالم متغير، جامعة بغداد، كلية العلوم السياسية، ١٩٩٢.
٢٦. د. فخري رشيد المهنا و صلاح ياسين داود، المنظمات الدولية، العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠٠٧.
٢٧. د. فؤاد شباط، الدبلوماسية، مطبعة جامعة دمشق، دمشق، ١٩٩٨.
٢٨. د. كاظم هاشم نعمة، العلاقات الدولية، الجزء الأول، جامعة بغداد، كلية القانون والسياسة، بغداد، ١٩٧٩.
٢٩. د. لطفي لبيب شاكر و مصطفى كافي، مبادىء العلوم السياسية، دار الحامد للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٦.
٣٠. د. مأمون الحموي، الدبلوماسية، مؤسسة النوري، بلا مكان الطبع، ط٢، ١٩٥٨.
٣١. د. محسن أحمد الخضيري، مبادىء التفاوض، مجموعة النيل العربية، القاهرة، ٢٠٠٣.
٣٢. د. محمد نصر مهنا، علم السياسة، دار غريب للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، بلا سنة الطبع.
٣٣. د. نادر أحمد أبو شيخة، أصول التفاوض، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، بدون مكان الطبع، ٢٠٠٨.
٣٤. د. نبية إبراهيم إسماعيل، البعد النفسي للتفاوض، مركز الإسكندرية للكتاب، الإسكندرية، ٢٠٠٧.
٣٥. د. هاني الرضا، العلاقات الدبلوماسية والقنصلية: تأريخها – قوانينها وأصولها، دار المنهل اللبناني، بيروت، ط٢، ٢٠١٠.
٣٦. د. ضرغام عبدالله الدباغ، قوة العمل الدبلوماسي في السياسة، دار آفاق عربية للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٨٥.

٣٧. د. عصام عطية، القانون الدولي العام، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة بغداد، ط٦، ٢٠٠٦.
٣٨. د. غازي حسن صباريني، الدبلوماسية المعاصرة: دراسة قانونية، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، ط٣، ٢٠١١.
٣٩. د. محمد بدرالدين زايد، المفاوضات الدولية بين العلم والممارسة، مكتبة الشروق الدولية، القاهرة، ٢٠٠٣.
٤٠. شادية إبراهيم أحمد حامد محمد عميرة، الحماية القانونية الدولية لرؤساء الدول، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠٧.
٤١. شوقي ناجي جواد وعباس غالي أبو التمن، التفاوض مهارة واستراتيج، مطبعة الفنون، بغداد، ١٩٩١.
٤٢. صلاح محمد عبدالحميد، فن التفاوض والدبلوماسية، مؤسسة طيبة للنشر والتوزيع، القاهرة، ٢٠١٢.
٤٣. عبدالفتاح شبانة، الدبلوماسية، القواعد الأساسية – الممارسات العملية – المشكلات الفعلية، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢.
٤٤. المعهد الدبلوماسي، قواعد وأصول النظيم الدبلوماسي والقنصلي وتطبيقاتها في دولة قطر، المعهد الدبلوماسي– وزارة الخارجية، ط٢، الدوحة، ٢٠١٤.
٤٥. د. منذر الفضل، تأريخ القانون، مطبعة ئاراس، أربيل، ط٢، ٢٠٠٥.
٤٦. هادي نعيم المالكي، قطع العلاقات الدبلوماسية، مكتبة السنهوري، بغداد، ٢٠١١.
٤٧. هيلاري بايندر، دليل المنظمات غير الحكومية، مكتب برامج الإعلام الخرجي، وزارة الخارجية الأمريكية، ٢٠١٢، على الرابط التالي:
http://photos.state.gov/libraries/amgov/30145/publications-arabic/B_NGO_Handbook_Arabic.pdf

٤٨. وليام أوري، فن التفاوض، ترجمة: د. نيفين غراب، الدار الدولية للنشر والتوزيع، مصر– كندا، ١٩٩٤.

٤٩. كارل فون كلاوزفيتز، الوجيز في الحرب، ترجمة: أكرم ديري والهيثم الأيوبي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٧٤.

٥٠. المعهد التطويري لتنمية الموارد البشرية، الأتكيت، السلسلة التطويرية رقم (١١)، بلا مكان الطبع، ٢٠١١.

٥١. يونس طلعت الدباغ، الدبلوماسية المعاصرة في ظل العولمة: اتجاهات ونماذج، التفسير للنشر والإعلان، أربيل ودار الفتح للدراسات والنشر، الأردن، ٢٠١٥.

٥٢. كارين أ. منغست و إيفان م. أريغوين، مبادىء العلاقات الدولية، ترجمة: حسام الدين خضور، دار الفرقد، دمشق، ٢٠١٣.

### هـ. راپۆرت و داتاكان (التقارير والبيانات):

١. الأمم المتحدة، الجمعية العامة، تقرير الأمين العام، الدورةالسبعون، البندان 15و 116 منجدولالأعمال، متابعة نتائجقمةالألفية، Distr.: General، 21 April 2016، AL70/59، في الرابط التالي:

http://www.un.org/pga/70/wp-content/uploads/sites/10/2015/08/21-Apr_Refugees-and-Migrants-21-April-2016.pdf

### و. ديراسه و توێژینەوەکان (الدراسات والبحوث):

١. إسماعيل ذياب خليل العزاوي، الأسبقية والمجاملات الدبلوماسية في العلاقات الدولية، مجلة العلوم القانونية والسياسية، جامعة ديالى، المجلد الثالث، العدد الثاني، ٢٠١٤.

٢. برايان وايت، الدبلوماسية، ضمن كتاب: جون بيليس و ستيف سميث، عولمة السياسة العالمية، مركز الخليج للأبحاث، دبي، ٢٠١٤.

٣. د. خليل حسين الخرقاني و د. صارم داخل أحمد، توظيف تقنيات لغة الجسد في أداء الممثل المسرحي، مجلة كلية اللغات، جامعة بغداد، العدد ٢٥، سنة ٢٠١٢.
٤. د. دانا علي صالح، أثر لغة الجسد في المفاوضات السياسية، مجلة جامعة السليمانية/ القسم/B، العدد ٤٨، أيلول ٢٠١٥.
٥. د. رحاب شادية، الحصانة الدبلوماسية للمبعوث الدبلوماسي وتأثيرها على حقوق الإنسان، مجلة جيل حقوق الإنسان، مركز جيل البحث العلمي، لبنان– طرابلس، العدد ١ شباط/٢٠١٣.
٦. د. رشيد عمارة ياس و دانا علي صالح، استراتيجيات التفاوض الأوروبية– الإيرانية حول البرنامج النووي الإيراني، مجلة القادسية، العدد الثاني، المجلد الثاني، كانون الأول ٢٠٠٩.
٧. د. سليمان صالح، استخدام وسائل التواصل الاجتماعي في الدبلوماسية العامة. دراسة متوفرة على الرابط التالي بتأريخ (٢٠١٧/١/٢١): دراسة متوفرة على الرابط التالي بتأريخ (٢٠١٧/١/٢١):
https://units.imamu.edu.sa/Conferences/smumc/Documents.صالح٪٢٠سليمان٪٢٠د.١ pdf
٨. د.عدنان خزعل عباس الجبوري، الدبلوماسية الوقائية وأثرها في معالجة الخلافات: دراسة مقارنة بين الشريعة الإسلامية والقانون الدولي، مجلة مداد الآداب، الجامعة العراقية، كلية الآداب، المجلد: ١، العدد: ١١، ٢٠١٥.
٩. عمر سليمان ملكاوي، دور الإعلام في تحقيق مفهوم الدبلوماسية الشعبية. تأريخ الزيارة (٢٠١٦/١/٢١): متوفر على موقع شبكة ضياء للمؤتمرات والدراسات الرابط التالي: http://diae.net/29170
١٠. د. فكرت نامق عبدالفتاح العاني، نحو إطار نظري للمفاوضات الدولية (المفهوم والمقومات الأساسية)، مجلة قضايا سياسية، كلية العلوم السياسيية، جامعة النهرين، بغداد، المجلد الثاني، العدد الأول، ربيع ٢٠٠١.

١١. فيليب م. تايلور، الدبلوماسية العامة ومكانتها في السياسة الخارجية، مجلة الدبلوماسي، يصدرها معهد الدراسات الدبلوماسية بوزارة الخارجية السعودية، الرياض، العدد ٥٢، أكتوبر ٢٠١٠.

## ز. تيزى دكتۆرا و نامەى ماستەر (أطاريح الدكتوراه ورسائل الماجستير):

١. شادية رحاب، الحصانة القضائية الجزائية للمبعوث الدبلوماسي: دراسة نظرية وتطبيقية، جامعة الحاج لخضر – باتنة، كلية الحقوق والعلوم القانونية، أطروحة دكتوراه غير منشورة، ٢٠٠٦.
٢. ياسين ميسر عزيز العباسي، الحق في تبادل وانتهاء التمثيل الدبلوماسي: مع إشارة للتمثيل الدبلوماسي الإسلامي، أطروحة دكتوراه غير منشورة، معهد البحوث والدراسات العربية، قسم الدراسات القانونية، القاهرة، ٢٠١٢.
٣. بودردابن منيرة، دور الدبلوماسية غير الرسمية في تنفيذ السياسة الخارجية، رسالة ماجستير، جامعة قسنطينة، كلية الحقوق والعلوم السياسية، ٢٠٠٩.

## چوارەم:/ ماڵپەڕە ئیلكترۆنییە فەرمییەكان (المواقع الإلكترونية):

1. <http://www.dfr.gov.krd/?l=13>
2. <http://www.bbc.com/>
3. <http://hrlibrary.umn.edu/arabic/Convention_UN_Safety.html>
4. <http://www.un.org/arabic/documents/instruments/docs_subj_ar.asp?subj=35>
5. <http://dosfan.lib.uic.edu/usia/>

## پێنجەم: سەرچاوە ئینگلیزییەكان (English Sources):

1. A Dictionary of Diplomacy, G. R. Berridge and Alan James, PALGRAVE MACMILLAN, New York, 2003.

2. Albert Mehrabian, Silent Messages, Wadsworth Publishing Company, California, 1971. At: <https://www.scribd.com/doc/98446772/Albert-Mehrabian-Silent-Messages-1971>
3. Allan & Barbara Pease, The Definitive Book of Body Language, Pease International, Australia, 2004.
4. Andr´e Lecours, Paradiplomacy: Reflections on the Foreign Policy and International Relations of Regions, International Negotiation, 7, 2002, Kluwer Academic Publishers, Netherlands.
5. Dr. Dana Ali Salih and Bakhan Ako Najmalddin, Paradiplomacy of the Kurdistan Region after 2003; present and future, Journal of Law for legal and Political Science, College of Law, University of Kirkuk, Iraq, Vol: 5, part: 2, Num: 18, 2016.
6. David Criekemans, Are the boundaries between paradiplomacy and diplomacy watering down? Preliminary findings and hypotheses from a comparative study of some regions with legislative power and small states, 2nd Global International Studies Conference: "What Keeps Us Apart, What Keeps Us Together? International Order, Justice and Value", Ljubljana, Faculty of Social Sciences, University of Ljubljana, Slovenia, 23-26 July, 2008.
7. El-Dessouki, A. Structural Contexts and Paradiplomacy of Iraqi Kurdistan. 2015. Available at: <http://www.feps.edu.eg/ar/publications/nahda/vol13/issue2/Ayman%20desouky.pd> (Accessed: 11/7/2015).
8. Eytan Gilboa, Diplomacy in the Media Age: Three Models of Uses and Effects, Diplomacy & Statecraft, Vol.12, No.2 (June 2001).
9. <http://dx.doi.org/10.1080/09592290108406201>
10. Eytan Gilboa, Mass Communication and Diplomacy: A TheoreticalFramework, Communication Theory, International Communication Association, August 2000. <https://www.researchgate.net/publication/229915361>

11. Geoffrey Allen Pigman, Contemporary Diplomacy, Polity Press, Cambridge, 2010.
12. Herb Oestreich, Let's Dump the 55%, 38%, 7% Rule, Transitions, (National Transit Institute), Vol. 7, No. 2, November 1999, pp. 11-14. At:<www.bdrp.nl/documenten/mehrabian_oestreich.pdf>
13. International Crisis Group (2003) War in Iraq: What's Next for the Kurds? Available at: (12/1/2017)
14. Jan Melissen, The New Public Diplomacy: Soft Power in International Relations, PALGRAVE MACMILLAN, New York, 2005.
15. John W. MckDonald, Multi-Track Diplomacy: Conflict Resolution for the New Century, University of British Columbia, Faculty of Law,<http://www.politics.ubc.ca /index.php?id=9976,12/09/2008>
16. Kelly, M. The Kurdish Regional Constitutional within the Framework of the Iraqi Federal Constitution: A Struggle for Sovereignty, Oil, Ethnic, Identity, and the Prospects for a Reverse Supremacy Clause. Penn State Law Review, 114 (3), 2010.
17. Mansour, R. Diplomacy for Survival. 2015. Available at: <http://www.iraqstudies.com/iraq3.pd> (Accessed: 13/7/2015).
18. Mohammed, H. K., Paradiplomacy of regional governments in international relation: Iraqi Kurdistan as a case study, 2003-2009, MA dissertation, Dept. of Politics and International Relations, University of Kurdistan. 2010.
19. Sally Hall, 9 Body Language Tricks To Improve Your Negotiation Skills, on:<http://www.fastcompany.com/3032560/work-smart/9-body-language-tricks-to-improve-your-negotiation-skills>

# نوسەر لە چەند دێڕێکدا



ناوی (دانا عەلی ساڵح عەلی بەرزنجی)یە.

لە دایکبووی ناحیەی (بەرزنجە)ی پارێزگای سلێمانییە، ساڵی (١٩٨٠).

تا پۆلی دوازنزەیەمی ئامادەیی لە پارێزگای سلێمانی تەواو کردووە.

بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانستە ڕامیارییەکان لە (زانکۆی سەلاحەددین/ کۆلێجی یاسا و ڕامیاری) لە ساڵی (٢٠٠١–٢٠٠٢)، بە پلەی یەکەم، وەرگرتووە.

پلەی ماستەری لە سیاسەتی نێودەوڵەتی لە (زانکۆی ئەننەهرەین/ کۆلێجی زانستە ڕامیارییەکان) لە (بەغداد) لە ساڵی (٢٠٠٦)،بە پلەی یەکەم، وەرگرتووە.

پلەی دکتۆرای لە زانستە ڕامیارییەکان لە (زانکۆی سلێمانی/ کۆلێجی یاسا و ڕامیاری) لە ساڵی (٢٠١١) بەدەست هێناوە.

لە ساڵی (٢٠١٥) پلەی زانستی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر)ی لە (زانکۆی سلێمانی) لە زانستە ڕامیارییەکاندا وەرگرتووە.

ڕاهێنەری پسپۆڕی باوەڕپێکراوە (PCT) لە سەنتەری جیهانی کەنەدی.

ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی)یە.

چەندین خولی ڕاهێنانی لە بوارەکانی پەرەپێدانی مرۆییدا لە زانکۆی سلێمانی و ڕێکخراوە ناحکومییەکان پێشکەشکردووە، لەوانە: (خولی پلانی ستراتیجی دامەزراوە)، (خولی پلانی ستراتیجی تاکەکەسی)، (خولی ناسینی جۆرەکانی کەسێتی).

بەشداری دەیان کۆنگرە و کۆنفڕانس و دیداری ناوخۆیی و نێودەوڵەتی کردووە.

خاوەنی چەند کتێبێك و چەندین توێژینەوە و وتار و بابەتی ئەکادیمییە لە گۆڤار و ڕۆژنامە و ماڵپەڕەکان، بە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ـ بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

- هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.